# د گەل مرۆڤێن خودێ

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

چاپا چارێ
یا زێدەرکری و ڤەوژارتی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سەرنامەئێ نامە نامێ ئەللاهـ
بێ نامێ وی ناتەمامە وەللاهـ

خانی

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ۝٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ۝٦٣ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ۝٦٤ ﴾

**يونس: ٦٢-٦٤**

عن أنس بن مالك ﷺ قال قال رسول الله ﷺ: **((إن لله أهلين من الناس))** قالوا: من هم يا رسول الله؟ قال: **((أهل القرآن، هم أهل الله وخاصته))**.

رواه الحاكم وأحمد والنسائي وابن ماجه

**یەحیایێ کورێ موعاذی دبێژت: ((خەلکێ دنیایێ خۆشییێ ژ ئاخفتنێ دبینن، و خەلکێ ئاخرەتێ خۆشییێ ژ مەعنایێ دبینن)).**

# دیـــاری

بـۆ:

مرۆڤـێـن خودێ.. بۆ بیـرهاتن.

و بۆ:

مرۆڤـێـن دنیایێ.. بۆ مفاوەرگرتن.

# پێشگۆتن

إن الحمد لله، نحمده و نستعينه و نستغفره، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا، و سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، و من يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمدا عبده و رسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ (آل عمران: ١٠٢).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ (النساء: ١).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ (الأحزاب: ٧٠-٧١).

أما بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله، و أحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، و شر الأمور محدثاتها، و كل محدثة بدعة، و كل بدعة ضلالة، و كل ضلالة في النار.

د ناڤ مرۆڤان دا هندەک کەس هەنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ناڤێ وان یێ کرییە (مرۆڤێن خودێ)؛ چونکی ئەو بۆ خودێ دژین و بۆ خودێ دمرن.. ئەڤ مرۆڤێن ژێگۆتی وەکی مە مرۆڤن، ب وی تشتی کەیفخۆش دبن یێ

مـرۆڤێن دی پێ کـەیفخۆش دبـن، و ب وی تشـتی دئێشـن یێ مـرۆڤێن دی پێ دئێشن، بەلێ تشتێ وان ژ هەمی مرۆڤێن دی جودا دکەت ئەوە ئەو دژیـن نـە بۆ ژیـانێ؛ چـونکی ژیـانێ پێتڤـی ب وان هـەیـە، و گاڤـا ئـەو دمـرن ژی عـەرد و عەسمان، گیاندار و شینکاتی، بۆ دگرین و ژێ خەریب دبن!

توخمەکێ غەریبن، د ناڤ مرۆڤان دا گەلەک دکێمن، بەلێ چو گاڤ و چو دەم ژ وان ڤـالا نـابـن، پترین جـاران ئەو د ناڤ خەلکی دا دڤەشـارتینە؛ چونکی ئارمانجـا وان ئـەو نینـە ئـەو ل پێشـییێ بـن.. دبـەرزەنـە؛ چونکی ئـەو ل دویـڤ دنیایێ نابەزن و دەستێن زەلامێن دنیایێ ماچی ناکەن.. بەلێ یا غـەریـب ئـەوە د گەل ڤێ بەرزەییا خۆ ژی هەمی دەمان وەکی ستێرێن عەسمانی -ئەوێن گەلـەک ژ مە دبلندتر- ئەو گەش دکەن، و ل شەڤێن ڕەش و تاری ڕێڤـنـگ و ڕێبـار ل بـەر ڕۆناهییـا وان ددەنـە ڕێ.. گەلـەک جـاران مـرۆڤ ژ نـەزانینـا خـۆ هزر دکـەت کـو هەیڤ و ستێر دزێدەنە و چو مفا تێدا نینە، بەلێ دەمێ عەورێـن ڕەش خـۆ ددەنـە ئێـک و عـەسـمان دئازریـت و دنیـا دبتـە تبلچـاڤ، هنگی ئـەو بهـایێ هـەیـڤ و ستێران دزانت.

مرۆڤێن خودێ خودان دلەکێ پاقژ و بژوینن، دلـەکێ وەسایە قرێژا دنیـایێ هەمی نەشێت خۆ هندی جهێ دەقـەکێ ژی ژێ ڕەش بکـەت، یـان خـۆ بـەقـەم ژی بکەت.. مرۆڤێن خودێ خودان باوەرییەکا ڕوهـن و گـەشـن، ڕۆناهییـا قـورئـانـێ ل سـەر دێمێ وان دیـار دکـەت، بێـی خـۆوەستاندن ئاخفتنا وان یـا چێکرییـە، و وەسا خـۆش و رحـەت د دلـێ خـەلکی دا دچـت، دێ بێـژی ئاڤـەکا سـارە ل بنـێ بەرییـەکـا ئاریـای، و ل هاڤینـەکـا شـاریای، بـۆ مرۆڤـەکـێ تێهنـی دئێتـە پێشکێشکرن!

چیـا.. ئەگـەر ئـەو سـتوین بـن یـێن عـەرد پـێ دئێتـە ڕاگـرتن دا نـەهژیێت، مرۆڤێن خودێ ئەو ستوینن یێن مرۆڤ پێ دئێنە ڕاگرتن دا ئەو ڕێبەرزە نەبن.

ل دەمەکی خودێ کەرەم د گەل من کر، ئەز د گەل ڤی توخمێ مرۆڤان ژیام.. خودێ گەلەک یێ ب رەحمە!! رۆژ وەسا یا چێکری ئەگەر مرۆڤ نەشێت بگەهتێ ژی یێ ژێ بێبار نابت، هەما ژ دویر ڤە تێهنا وێ، گەرما وێ، رۆناهییا وێ دگەهتێ.. من گۆت: ئەز د گەل ڤی توخمێ مرۆڤان ژیام، نەکو د ناڤ وان دا؛ چونکی ئەم -ئەوێن حەژێکرنا دنیایێ جهێ خۆ د دلێن مە دا کری- یا ژ مە زێدەیە ئەم بشێین بگەهینە رێزا مرۆڤێن خودێ..

ل وی دەمێ ئەز د گەل مرۆڤێن خودێ ژیایم، و من چیرۆک و سەرهاتییێن وان د گەل خۆ ڤەگێڕاین، ئەز ب خۆشییەکا گەلەکا مەزن حەسیام، تامەکا تایبەت من سەحکر، گەلەک هەلویستێن وان، پەیڤێن وان، ئەز هژاندم.. گەلەک جاران من وە هزر دکر ئەز یێ ژ دنیایێ دەرکەفتیم، ئەڤ کەسێن ئەز نوکە د گەل دژیم نفشەکێ جودانە ژ نفشێ مە، بەلێ هەر جارەکا من بیرا خۆ ل هندێ دئیناڤە کو ئەڤە (مرۆڤێن خودێنە) عەجێبییا من ڤەدرەڤی.. بەلێ، ئاخری مرۆڤێن خودێ دڤێت وەکی مە مرۆڤێن دنیایێ نەبن. و پشتی ئەڤ قوناغا شرین، یا کو وەکی هەر تشتەکێ خۆش زوی دبۆرت، ب دووماهی هاتی، پشتی ئەز ژ ڤێ جیهانێ ڤەگەریایم، ئەو جیهانا مرۆڤی تێدا های ژ جهی و دەمی نامینت، من ڤیا ئەز یێ دەست ڤالا نەبم.. من ڤیا خویشک و برایێن خۆ ژ خودان باوەران بێبار نەکەم ژ وێ خۆشییا ئەز دەمەکی پێ حەسیایم، و وان ژی تێدا پشکدار بکەم.. ڤێجا کەرەم بکەن دا دەمەکی د گەل مرۆڤێن خودێ بژین؛ دا بزانین کانێ ئەو کینە؟ و چاوا دئاخڤن؟ و چاوا هزر دکەن؟ وەرن دا پێکڤە گوهـ بدەینە مرۆڤێن خودێ، دا سەحکەینێ کانێ چ بوو ئەو گەهاندینە وێ پێکا بلند کو ب ناڤێ مرۆڤاینییا خودێ بێنە ناسین؟

د ڤان بەرپەڕان دا مە ل بەرە -ب ئانەهییا خودێ- ئەم چەندەکێ خۆ نێزیکی کاروانێ پیرۆزێ ڤان توخمە مرۆڤان بکەین؛ دا دەمەکی د گەل وان دا بژین.. ڕاستە هندەک جاران ئەم د ڤێ گەشتا خۆ دا دێ بەحسێ جهی و دەمی

کەین، بەلێ هزر نەکەن گۆتنێن مە دێ ڤەگێڕانا دیرۆکێ بت، مە نە ل بەرە د ڤێ کتێبا خۆ دا دیرۆکا ڤان مرۆڤان بێن مە هلبژارتین بۆ هەوە ڤەگێڕین؛ چونکی ئەو کارەکێ مەزنترە ژ شیانێن مە، ب تنێ مە دڤێت خواندەڤانێن قەدرگران ل مەزنییا ڤان مرۆڤان ئاگەهدار بکەین، هندەک بەرپەڕان ژ دیرۆکا وان یا گەش هلبژێرین و بەرچاڤ بکەین؛ دا بیرا مە پێ ل وان بێتەڤە، و دا بەلکی هەر ئێک ژ مە ل دویڤ شیانێن خۆ چاڤ ل وان بکەت.

ل دووماهییا ڤێ پێشگۆتنێ یا د جهێ خۆ دایە خواندەڤان ل هندێ هشیار بکەم کو ئەڤ بابەتە د بنیات دا بەرنامەیەک بوو بۆ ڕادیۆیا دهۆکێ (دەنگێ کوردستان) هاتبوو ئامادەکرن، و ل ڕەمەزانا سالا (١٤١٨) مشەختی بەرانبەر (١٩٩٧) زایینی هاتبوو بەلاڤکرن، و ئەڤ بابەتە ژ هژمارەکا نە یا کێم ژ کتێبێن کەڤن و نوی یێ هاتییە وەرگرتن، و ڕەنگە هندەک جاران نیڤ وەرگێڕان ژی بت ژ هندەک ژێدەران، بەلێ چونکی بابەتەکێ ئێزگەیی بوو د دەهمەنان دا ئیشارەت بۆ ژێدەران نەهاتییەدان، و ب ڕاستی من هزرا هندێ ژی نەکربوو کو بابەت ڕۆژەکێ وەک کتێب دێ ئێتە بەلاڤکرن، ئەگەر نە ل سەری دا ژێدەران دەسنیشان کەم.. هیڤییا من ئەوە خودێ ڤی کارێ مە بۆ مە ب خێر بنڤیست و مە ب بەر مەهدەرا پێغەمبەر و چاکێن خۆ بێخت.

دهۆک

ڕەبیعولئەووەلا سالا ١٤٢٢ ک

٢٤ گولانا ٢٠٠١ ز

# سالۆخەتێن مرۆڤێن خودێ

خواندەڤانێن هێژا: بەری ئەم گەشە بەرپەرێن دیرۆکا ئیسلامێ قەلدەین، و د گەل مرۆڤێن خودێ ب گەشتەکا درێژ ڕاببین، یا د جهێ خۆ دایە ئەم ڤی توخمێ مرۆڤان ب هەوە بدەینە ناسین، و هندەک ژ مەزنترین سالۆخەتێن وان بۆ هەوە بەرچاڤ بکەین وەکی ژ گۆتنێن وان ب خۆ دئێنە وەرگرتن، ئەو گۆتنێن هەر ئێک د جهێ خۆ دا دنیایەکێ دئینت؛ چونکی ئەو د گەل کورتییا خۆ دنیایەکا ڕامانان د ناڤ خۆ دا هل دگرت..

من نە باوەرە ئێک ژ مە هەبت نەزانت هندی ئەڤ ژیانەیە یا ئەم تێدا ژیانەکا بەروەختە، یا کورتە، ئەو چەند درێژ ببت دێ ب دووماهی ئێت، بەلێ کێم کەس ژ مە هەنە ڤێ زانینێ بۆ خۆ دکەنە دەرسەکا وەسا کو هەردەم وجێ بۆ خۆ ژێ وەربگرت.. مرۆڤێ ئێکێ ژ مرۆڤێن خودێ و سەروەرێ هەمی مرۆڤان پێغەمبەرێ خۆشتڤی موحەممەد -سلاڤ لێ بن- د گۆتنەکا خۆ دا -یا کو ئیمامێ بوخاری ژێ ڤەدگوهێزت- ڤێ ڕاستییێ ب جوانترین ڕەنگ بۆ مە دنەخشینت دەمێ کەرەم دکەت و دبێژت: ((كُنْ فِي الدُّنيا كأَنَّكَ غريبٌ أو عابرُ سبيلٍ)) یەعنی: تو د دنیایێ دا یێ وەسا بە هەر وەکی تو مرۆڤەکێ غەریب یان مرۆڤەکێ ڕێڤنگ.

باوەرییا خۆ ب دنیایێ نەئینە.. ڕاستە هندی تو بێژی ئەو یا جوانە، یا خۆشە، بەلێ پا ژ بیر نەکە ژی کو ئەو یا هەڤال هێلە، یا خاپینۆکە، جارەکێ هەرە ناڤ قەبران، بەرێ خۆ بدە وان هەمی کێلییێن ب ڕەخ ئێک ڤە، باش هزرا

خۆ تێدا بکە.. دنیایێ ئەو هەمی یێن بن ئاخ کرین! ڤێجا چاوا مرۆڤ باوەرییا خۆ پێ بینت؟

عەبدللاهێ کورێ عەبباسی -ئەوێ حەدیسا بۆری بۆ مە ڤەگوهاستی- هەرگاڤ دگۆت: ((ئەگەر ل تە بوو سپێدە ل هیڤییا ئێڤاری نەبە، و ئەگەر ل تە بوو ئێڤار ل هیڤییا سپێدێ نەبە))، ئەرێ چەند مرۆڤ تە دیتینە د گەل تە، یا ل وان بوویە سپێدە و ئەو نەگەهشتینە ئێڤاری؟ یان ژی یا لێ بوویە ئێڤار و ئەو نەگەهشتینە سپێدێ؟ ئەگەر تو ئەڤرۆ ژ وان نەبی، کی نابێژت سوباهی دێ بییە ئێک ژ وان و دۆر دێ گەهتە تە ژی؟!

مرۆڤێن خودێ ئەون یێن ڤێ ڕاستییێ باش دزانن، دنیایێ باش دناسن، لەو دنیا نەشێتە وان.. بەری هەر تشتەکی ئەو دزانن هاتنا وان بۆ ڤێ دنیایێ و مانا وان د ڤێ ژیانێ دا گەشتەکە، ئەو ب ڕێڤنگی یێن هاتینێ، و پشتی دەمەکی دێ ئێنە زڤڕاندن..

ژین گەشتەکە، ژ کیڤە دەست پێ دکەت؟ و دێ بۆ کیڤە چت؟

مرۆڤێن خودێ دەمێ بەرسڤا ڤێ پسیارێ ددەن دبێژن: ژ نک خودێ.. و بۆ نک خودێ!

﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾ خودێیە یێ ئێکێ و ئەوە یێ دووماهییێ.. ژ نک خودێ ڤویناغا وان دەست پێ دکەت، و بۆ نک وی ڤەدگەڕیێت، ڤێجا چونکی هۆیە دڤێت ئەوا د ناڤبەرا دەستپێکێ و دووماهییێ ژی دا هەر بۆ خودێ بت، ژ بەر ڤێ چەندێ کاروانێ ژییێ وان کاروانەکێ خودایییە، ئەو کیڤە بەرێ خۆ بدەن ژ خودێ پێڤەتر کەسێ نابینن. جارەکێ کۆمەکا مرۆڤێن دنیایێ، ئەوێن تام نەکرییە شرینییا باوەرییێ ب مرۆڤەکێ خودێ وەرهاتن، ژ کێم فامییا خۆ وان هزرکر دێ شێن دەلیڤەیەکێ خودێ ژ بیرا وی بەن، ڕابوون دەست و پێ لێ گرێدان، ل سەر ڤێ تەنشتێ وەرگێڕا سەر تەنشتا دی، شیرێن خۆ باش هوسین، گەفێن مرنێ لێ کرن.. وی چ گۆت؟

گوهێ خۆ بدەنە گۆتنا وی.. وی گۆت:

ولست أبالي حين أُقْتَلُ مسلماً     على أيِ جنبٍ كان في الله مصرعي

یەعنی: مادەم دلێ من باوەری تێدا هەیە بەرێ من هەر دێ ل خودێ بت، و هندی بەرێ من ل خودێ بت ئەز د خەما هندێ نابم هوین ل سەر کیژ تەنشتێ من بکوژن یان بەرێ من بدەنە کیژ لایی؛ چونکی کەفتنا من -ل سەر کیژ تەنشتێ بت- هەر دێ بۆ خودێ بت.

بەلێ.. ب رێڤنگی ئەو یێن هاتین، مێڤانن.. و ما کەنگی ڤەمان بۆ مێڤانی هەیە؟

(حەسەنێ بەصری) ئێک ژ مرۆڤێن خودێ بوو، د کۆشا کابانییەکا پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هاتبوو ب خودانکرن، رۆژەکێ وی گۆتە هندەک هەڤالێن خۆ: ((ب خودێ من حەفتێ زەلام ژ خەلکێ بەدرێ دیتبوون ئەگەر هەوە ئەو دیتبان هوین دا بێژن: ئەڤە ددینن! من دیت ئەو توخمەکێ مرۆڤان بوون دنیا ل نک ئێک ژ وان ژ وێ ئاخێ بێ خێرتر بوو یا وی پێ خۆ ددانا سەر..))! ئەو دنیایا خەلک خۆ سەرا ددەنە کوشتن، ل نک مرۆڤێن خودێ ژ وێ ئاخێ بێ بهاترە یا ئێک ژ وان پێ لێ ددانت، و ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا کو وان د ڤێ دنیایێ دا سەرێ خۆ بۆ خودێ دچەماند ئەو دا ژ دنیایێ هەمییێ رەڤن، ئەگەر جهەکێ رەڤێ هەبا!

مرۆڤێن خودێ د دنیایێ دا دژین، بەلێ ئەو ژیانا خۆ د دنیایێ دا حسێب دکەن گەشتەکا شرین بەر ب کنارێ خودێ ڤە، ژ نک خودێ ئەو دەست پێ دکەن و بۆ نک وی دزڤرن، و حەتا پشتراست ببن کو ئەو د ڤێ دنیایێ دا دێ ب سلامەت بن، ئەو زێرەڤانییێ ل نەفسا خۆ دکەن، دا ئەو وان دسەردا نەبەت، (سەلەمێ کورێ دیناری) دبێژت: ((ترسا من ئەو نینە دوعایێن من نەئێنە قەبویلکرن، ترسا من ئەوە ل من بێت ئەز دوعایان نەکەم)).

بەلێ.. خودایێ مە باشترین خودایە، یێ وەسایە چی گاڤا ئەم بووینە یێن وی ئەو دێ یێ مە بت، و چی گاڤا مە ب دورستی و ژ دل هەوارێن خۆ گەهاندنێ ئەو دێ د هەوارا مە ئێت، وەکی ئەو ب خۆ دبێژت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴾ (غافر: ٦٠) لەو (شەقیقێ کورێ سەلەمەی) دگۆت: ((خودایێ مە چێترین خودایە، ئەگەر ئەم گوهدارییا وی بکەین ئەو نەگوهدارییا مە ناکەت))!

مرۆڤێن خودێ هیڤییەکا هندا مەزن ب خودایێ خۆ هەیە کو ئەو وان بەرنادەت و وان ناهێلتە ب تنێ، هندی ئەو پشتا خۆ نەدەنە وی، لەو ترسا وان ئەوە نەفسا وان هند بێ سەر و بەر ببت کو بۆ شەیتانی ببتە پێرەهەکا شەنبۆز و بەرێ وان بدەتە کەندالێ تێچوونێ، (ئیبراهیمێ نەخەعی) گەلەک جاران دەمێ دوعا بۆ خۆ دکرن دگۆت: ((ئەی خودا! نەفسا من رەحمێ ب من نابەت تو رەحمێ ب من ببە، ئەی خودا! تو نەفسا من بۆ من چێکە)).

ئەگەر نەفسا مرۆڤی چێبوو، پشتییێ گونەهان ل سەر پشتا مرۆڤی نامینت، مرۆڤ دێ ب بارسڤکییێ حسییێت، لەو دەمێ ئەو قەستا خودێ دکەت ئەو دێ یێ سڤک بت، چو گونەه نابن وی ڤەکێشن، و خودێ ب خۆ -ب هەمی مەزنییا خۆ ڤە- دبێژت: ((هەچییێ بهۆستەکێ ب نک من ڤە بێت، ئەز دێ گەزەکێ ب نک وی ڤە چم)).. جارەکێ پشتی هندەک مرۆڤێن خودێ یێن هەژار و دەستڤالا ژ قرێژا دنیایێ خۆ فرۆتییە خودێ، و هاتینە د ناڤ رێزا مرۆڤێن خودێ دا، هندەک ژ ماقویل و مالمەزنێن خودێ نەناس هاتنە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و گۆتنێ: تو دزانی ئەم و فلان نە ل رێزەکێینە، وان ژ نک خۆ بکە دەر دا ئەم بشێین بێینە دیوانا تە، خودایێ وی.. خودایێ وان ئێکسەر فەرمان دا: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝ ﴾ (الأنعام: ٥٢) هەر وەسا گۆت: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم

بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ ﴾ (الكهف: ٢٨) چەند گۆتنەکا مەزنە: (يريدون وجهه) ئەوان خودێ يێ هلبژارتی، کنارێ خودێ يێ ڤيای، و يێ خودێ هلبژێرت خودێ ژی دێ وی هلبژێرت، و يێ خودێ وی هلبژێرت ئەو دێ بتە ئێک ژ مرۆڤێن خودێ، و تە -ئەی موحەممەد- ماف نينە مرۆڤێن من ژ ديوانا خۆ بکەيە دەر، ئەوان ئەزێ هلبژارتيم و من ئەو يێن هلبژارتين!

مرۆڤێن خودێ دئێنە ڤێ دنيايێ و هندی خودێ بۆ وان ڤيای ئەو لێ دمينن پاشی ژێ بار دکەن، بەلێ تشتێ بەرچاڤ ل نک وان ئەوە: دنيا ب هەمی خۆشيێن خۆ ڤە نشێت دەليڤەيەکا ب تنێ ژی وان ژ بيرڤەکەت، يان ئێکا هند ژێ چێ بکەت کو ئەو ئێکێ دی د گەل خودێ ببينن، بەرێ وان هەر يێ ل کنارێ خودێ و هنگی هەدارا وان دئێت گاڤا ئەو ب تنێ د گەل خودايێ خۆ دمينن، ل وی دەمی ئەو ب خۆشييەکا وەسا دحەسيێن دنيايێ هەمييێ ژ بير دکەن، ژ ڤێ ژيانێ دەردکەڤن، بلند دبن، بەر ب (مەلەکووتا) خودێ ڤە دچن.

ئەو ژی وەکی مە د ڤێ دنيايێ دا ددەنە رێ، بەلێ ئەو وەکی مە ناچنە رێ، خۆشيێن رێکێ بەرێ وان ژ ئارمانجێ وەرناگێرت، و دلێ وان ژێ سار ناکەت، و جهی ل ڤيانا وان يا ئێکانە تەنگ ناکت.. راستە رێکەکا دوير وان يا ل بەر هەی، رێکەکا تژی نەخۆشی و ئاستەنگە، بەلێ مرۆڤينييا وان بۆ خودێ ڤێ گرانييێ ل بەر وان سڤک دکەت، هندی ئەو بيرا خۆ ل دووماهييێ دئينن بەراهی وان د سەر دا نابەت، ئێک ژ ڤان مرۆڤێن خودێ يێن ب دورستی دنيا ناسی دبێژت: ((من ئينا بەرچاڤێن خۆ هەر وەکی ئەز يێ ل جەهنەمێ، خوارن و ڤەخوارنا وێ، زنجير و دوکێلا وێ، بێهن يا ل من تەنگکری، من دگۆتە خۆ: ئەرێ تە چ دڤێت؟ نەفسا من دگۆت: خوزی ئەز زڤڕيبامە دنيايێ دا من باشی

کربان بەلکی ئەز نەهاتبامە ڤی جهی.. پاشی من ئینا بەرچاڤێن خۆ هەر وەکی ئەزێ ل بەحەشتێ، د ناڤ خۆشییێن وێ دا، و من دگۆتە خۆ: ئەرێ تە چ دڤێت؟ نەفسا من دگۆت: خوزی ئەز زڤڕیبامە دنیایێ دا من هێشتا باشی کربان بەلکی جهێ من ئەڤرۆ هێشتا یێ خۆشتربا.. ڤێجا ئەز دبێژمە نەفسا خۆ: ئەڤە تو یا د دنیایێ دا، ڤێجا کاری بۆ خۆ بکە)).

ب ڤی ڕەنگی مرۆڤێن خودێ د دنیایێ دگەهن، دنیا جهێ کارییە، زەڤییا چاندنێیە، و تو چو لێ بچینی دێ وی ل ئاخرەتێ هەلینی، و ئەگەر تو ئەو بی یێ تە کارەکێ خراب تێدا کری دێ پەشێمان بی کو تە باشی نەکرین، و ئەگەر تە باشی ژی کربن دێ پەشێمان بی کو تە هێشتا باشی نەکرین! ڤێجا لەزێ بکە، دنیا خۆ ل تە ناگرت و هەچی ڕۆژا ل تە ئاڤابوو نائێتەڤە.. و مەتەلا دنیایێ مەتەلا ئێک ژ هەوەیە دەمێ تبلا خۆ دکەتە د دەریایێ دا، بلا سەح بکەتێ کانێ دێ شێت چ پێڤە ئینت؟

ب ڤی ڕەنگی پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- مەتەلێ ب دنیایێ دئینت!

ژ بەر ڤێ چەندێ مرۆڤێن خودێ ب دنیایێ نائێنە خاپاندن، و (غوروور) بۆ وان چێ نابت، باشییا وان بەرێ وان نادەتە هندێ ئەو هزر بکەن حەقێ خودێ ل سەر وان نەمایە، و بەحەشتا وان یا مسۆگەرە، هەردەم ژ خۆ ب ترسن، زەلامێ ئێکێ د ئوممەتێ دا -پشتی پێغەمبەری سلاڤ لێ بن- ئەبووبەکرێ ڕاستگۆ دبێژت: ((ئەگەر پییەکێ من بچتە د بەحەشتێ دا و یێ دی هێشتا مابتە ژ دەرڤە ئەز ژ (مەکرا) خودێ پشتڕاست نابم))، و عومەر ژی وەکی وی دبێژت: ((ئەگەر ڕۆژا قیامەتێ بێژن: گەلی مرۆڤان هوین هەمی هەرنە بەحەشتێ مرۆڤەک تێ نەبت بلا بچتە ئاگری، ئەز دێ ترسم ئەو مرۆڤ ئەز بم)). هندە مرۆڤێن خودێ ژ غوروورێ ددویرن، شەڤ و ڕۆژێن خۆ ئەو ب عیبادەتی ڤە دبۆرینن، و گاڤا ژێ هاتە خواستن کو باشییێن خۆ هەلسەنگینن دێ بتە هەوار

هەوارا وان، (مالكێ كورێ دیناری) دبێژت: ((گاڤا بەحسێ مرۆڤێن باش دئێتە كرن، ئۆف بۆ من!)).

ئێک ژ مە گاڤا بەحسێ باشان ل نک دئێتەكرن عێجز دبت بۆچی ناڤێ وی بەری یێ هەمییان نەهاتە گۆتن، رۆژەكێ مرۆڤەک هاتە نک (عەلائێ كورێ زیادی) و گۆتێ: شڤێدی من ددیت ئەز و تو ل بەحەشتێ بووین، وی گۆتێ: ((ما شەیتانی ژ بلی من و تە كسێ دی نەدیت بۆ خۆ یارییان پێ بكەت؟))، و (یوونسێ كورێ عوبەیدی) دبێژت: ((هندەک جاران ئەز سەد باشییان دهژمێرم، ئێكا ب تنێ ژی ژ وان ل نک من نینە)). و (سولەیمانێ تەمیمی)، ئەوێ پترییا دەمێ خۆ ب كرنا عیبادەتی ڤە دبۆراند، رۆژەكێ هندەک هەڤالێن وی گۆتێ: خوزییێن تە، خودێ بەرێ تە یێ دایە چاكییێ، وی گۆت: ((وە نەبێژن، هندی ئەزم ئەز نزانم رۆژا قیامەتێ خودێ دێ چ ئینتە سەرێ من ما هەوە گۆتنا خودێ نەخواندییە دەمێ دبێژت: ﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُواْ يَحْتَسِبُونَ ۝٤٧ ﴾)).

تێگەهشتنەكا گەلەكا هویر و كویرە ژ لایێ مرۆڤێن خودێ ڤە بۆ ڤێ راستییێ، هزر نەكەن هەما ئەڤە (تەواضوعەكە) ژ لایێ وان ڤە، نە.. ئەڤە راستییەكە هەمی كەس باش نابینن، ئەڤ باشییێن ئەو دكەن و خەلک دبینن قەنجییەكە خودێ د گەل وان كری، ئەڤە **ئێک**، و یا **دویێ**: ئەڤ باشییێن ئەو دكەن و خەلک دبینن ب كێشان و پیڤانا وان و یا خەلكی یا بەرچاڤ باشینە، كی دبێژت خودێ دێ ژ وان قەبویل كەت و حسێب كەت باشی؟!

یا **سییێ**: ما پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- نەگۆتییە: **((كەس ب عەمەلێ خۆ ناچتە بەحەشتێ))**؟ و دەمێ هندەكان گۆتییێ: خۆ تو ژی ئەی پێغەمبەرێ خودێ؟ وی گۆت: **((خۆ ئەز ژی ئەگەر خودێ رەحمێ ب من نەبەت))**.

ڤێجا چاوا ئەو ب عەمەلێ خۆ خۆ پشتراست بكەن؟

**یا چاری:** ئەو ژ خۆ پشتڕاست نابن کو نەفسا وان بەری وان نادەتە گونەهێ، یان دلێ وان خرابییێ ل بەر وان شرین ناکەت، و بەرێخۆدانا وان بۆ گونەهێ یا وەسایە ئەو هزر دکەن چی گاڤا گونەهەک ل نک خودانی پەیدابوو دێ بتە ئەگەرا ڤەمراندنا ڕۆناهییێ د دلی دا، و دل ئەگەر ژ ڕۆناهییا باوەرییێ ڤالا بوو سەر و چاڤ ژی دێ تاری بن، پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((**هشیاری گونەهێن بچویک بە، هندی گونەهێن بچویکن ل سەر خودانی کۆم دبن و ئەو چو هزرێ بۆ ناکەت حەتا ئەو وی دبەنە هیلاکێ**)).

ژ لایەکێ دی ڤە: دەمێ گونەه ڕێکا خۆ بۆ دلەکی دبینت و جهێ خۆ تێدا دکەت، ئەو هێدی هێدی جهێ خۆ فرەه دکەت حەتا دلی هەمییێ دەستەسەر دکەت، و ژ ڕۆناهییا ئیمانێ ڤالا دکەت، و دا ئەڤ دلە پتر خودانی ژ بیرڤە بکەت دێ بەرێ وی دەتە هژمارتنا خەلەتییێن خەلکی، (ئیبراهیمێ نەخەعی) دبێژت: ((یا ژ من ڤە ئەو کەسێ ل دویڤ عەیبێن خەلکی دگەڕێت وی خۆ یێ ژبیرکری لەوا..)) مەعنا ئەگەر ئەو خۆ ب عەیبێن خۆ ڤە موژیل بکەت، و لێ بگەڕێت وان عەیبان ل نک خۆ نەهێلت، ئەو ناگەهت ل عەیبێن خەلکی بگەڕێت.. تشتەکێ غەریبە عەیبەک ل نک مرۆڤی هەبت ڕابت چاڤێن خۆ ژێ بنقینت، و عەیبێن خەلکی بکەتە هەلامەت!

زانایێ تابعی (ڕەبیعێ کوڕێ خەیثەمی) دبێژت: ((ئەز ژ خۆ ڕازی نابم حەتا من چو خەلەتی نەمینن.. و من نەڤێت ئەز ژ وان کەسان بم یێن ژ بەر گونەهێن خەلکی ژ خودێ دترسن بەلێ گونەهێن خۆ ژبیر دکەن و سەرا وان ژ عەزابا خودێ ناترسن)).

ئەو کینە یێن هند ژ خۆ ڕازی کو ژ ئەنجامێ گونەهێن خۆ دپشتڕاست بن، و هەردەم بەحسێ گونەهێن خەلکی ل سەر ئەزمانێ وان؟

بێ گومان ئەو ئەون یێن کو هندەک باشی کرین، ڤێجا غوروور بۆ چێبووی و هزرکری هندە ئەو ژ عەزابا خودێ خلاس..

ژ بەر ڤێ چەندێ ئێک ژ سالۆخەتێن مرۆڤێن خودێیە نە دنیا وان دخاپینت، نە کریارێن وان یێن باش غورووری بۆ وان چێ دکەت، و خەلەتی و گونەهێن خەلکی بەرێ وان ژ خەلەتی و گونەهێن وان ب خۆ وەرناگێرت.. و ل دۆر ڤێ خالا دووماهییێ ئیمام (جەعفەر ئەلصادق) دبێژت: ((هەچییێ پەردێ ئێکی بهلێڤرت، د مالا وی دا نامویسا وی دێ ئێتە هلێڤرین، و هەچییێ شیرێ زۆرداریێ رویس بکەت ئەو ب خۆ دێ پێ ئێتە کوشتن))، و ئیمام (ئبن قەییم) دبێژت: ((کێمکرنا تە بۆ برایەکێ تە سەرا خەلەتییەکا وی مەزنترە ژ گونەها وی ب خۆ؛ چونکی دبت خۆشکاندنا وی بۆ خودێ سەرا وێ خەلەتییێ پتر مفا تێدا هەبت ژ خۆمەزنکرنا تە کو ئەو خەلەتی ل نک تە نینە، و ئەگەر تو بنڤی یێ گونەهکار و هشیار ببی یێ پەشێمان ل نک خودێ ژ هندێ چێترە تو شەڤا خۆ ب عیبادەتی ڤە ببۆرینی و سپێدێ یێ ب خۆ (موعجب) بی..)).

ئەڤە.. و دڤێت نەئێتە هزرکرن کو مرۆڤێن خودێ ب هێجەتا هندێ کو دڤێت مرۆڤ ل عەیبێن خەلکی نەگەڕیێت چاڤێن خۆ ژ خەلەتییێ دنقینن و بەلاڤبوونا گونەهێ د ناڤ خەلکی دا دلێ وان نائێشینت، نە! پسیار ژ ئیمام (ئەحمەدی) هاتەکرن: ئەرێ مرۆڤ عیبادەتی بکەت چێترە، یان بەحسێ بیدعەچییان و خەلەتییێن وان بۆ خەلکی بکەت؟ ئیمامی گۆت: ((دەمێ تو عیبادەتی دکەی مفا دگەهتە تە ب تنێ، بەلێ دەمێ تو بەحسێ خەلەتییێن بیدعەچییان دکەی مفا دگەهتە هەمی موسلمانان)).

ل نک مرۆڤێن خودێ چو تەقوا د هندێ ڕا نینە تو بێ ئەمرییا خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل نک کەسەکی یان کۆمەکێ ببینی و بێژی: ما من شۆلەژێیە گونەهێن من تێرا من هەنە!

ترسا ژ گونەهێ جهەکێ مەزن د دلێن مرۆڤێن خودێ دا هەیە، و هندی هند ئەو ژ گونەهێ دترسن گەلەک جاران ئەو خۆ ژ تشتێ حەلال ژی ددەنە پاش نەکو سەری بکێشتە گونەهێ.. (ئیسماعیل کوڕێ عولەییەی) سەیدایێ ئیمام

(ئـەحمـەدی) ئـەو بیسـت سـال بـوو ژ ترسـێن خـودێ دا نـەکرییـە کـەنـی، و (ئیبـراهیمێ حەربی) شاگردێ ئیمام (ئەحـمەدی) ئـەو بیسـت سـال بـوو چاڤـەکێ وی تاری بووبوو کسێ نەدزانی، ترسیا ئەگەر بێژت: چاڤێ من یێ تاری بـووی، خودێ بێژتێ: تو ب ئەمرێ من یێ رازی نەبووی.

هندە ئەو ژ گونەهێ دترسان، و گاڤا خودێ وەسا بۆ ئێـک ژ وان نڤیسـیبا کو ئەو گونـەهـەکێ بکـەت، هـەر زوی ئـەو دا رێکا پەشـێمانی و تۆبێ گـرت، و هندی ئەو یێ ساخ با دلـێ وی ژ بـەر وێ گونـەهـێ دا ئێتـە گڤاشتـن، و چاڤێن وی ب شـەڤ و رۆژ دا رۆنـدکان بـارینن، (سـەهلـێ کـورێ عـەبـدللاهی) دبێـژت: ((تۆبە ئەوە تو چو جاران گونەها خۆ ژ بیر نەکەی)) ب دیتنا مرۆڤێن خودێ هـەر جـارەکـا کـەیفا ئێکی ب گونەها وی بێت، یان ئەو گونەها خۆ ژ بیـر بکـەت و ژ بەر وێ یێ ب ترس نەبت، هنگی ئەوی ب دورستی تۆبە نەکرییە..

تۆبـە -ب دیتنـا مـرۆڤێن خودێ- ئـەو دەرمانـە یـێ دلـی ژ قرێـژا گونـەهـێ دشۆت، شیشـەیەکا زەلال ئەگەر تە خەم ژێ نـەخـوار رۆژ بـۆ رۆژێ دێ قرێـژی بـت حـەتـا د قرێـژێ را دمینـت و رەش و تـاری دبـت، ڤێجـا گاڤـا تـە ڤیـا وێ زەلال بکەیەڤە دێ رابی دەرمانەکی لێ رەشینی و پاتەکی تێدەی دا بتەییست، مـەتـەلا دلی و گونەهێ و تۆبێ مەتەلا ڤێ شیشێیە! ژ بەر ڤـێ چـەنـدێ تۆبـە ل نـک وان نە تشتەکێ کێمە، و بەسی تۆبەکەرانە خودێ ب خۆ د قورئانێ دا ئاشکەرا دکەت کو ئـەو حـەز ژ وان دکـەت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ ﴾، (ئیبراهیمـێ نـەخـەعـی) گـەلـەک جاران دگـۆتـە هـەڤالێن خـۆ: ((هـوین ل نـک تۆبـەکـەران رونـن، چونکی ئەو ژ هەمی مرۆڤان د دلنازکترن، و رەحما خودێ نێزیکتری وانە)).

ئـەو مرۆڤـێ ب کـەیف قـەسـتا گونـەهـێ بکـەت، و پشـتـی کرنـا گونـەهـێ پەشێمان نەبت و هزرا تۆبەکرنێ نەکـەت، و رۆنـدکێن لێڤـەبوونێ نـەبارینـت، ئـەو مرۆڤ -ب دیتنـا مـرۆڤێن خودێ- نـەزانتـرین مرۆڤـە (بـەکرێ مـوزەنـی) دبێـژت: ((ئەوێ ب کەنی ڤە قەستا گونەهێ دکەت ئەو ب گری ڤە دێ چتە جەهنـەمـێ))،

و (بلالێ كورێ سەعیدی) دبێژت: ((هەوە خودایەكێ هەی، لەزێ ل عەزابدانا هەوە ناكەت، كەفتنا هەوە ڤەدگرت، و تۆبا هەوە قەبویل دكەت، هەچییێ ل وی بزڤرت ئەو خێرێ ددەتێ، و هەچییێ ل وی پشتەرێ بكەڤت ئەو رەحمێ پێ دبەت)).

مرۆڤێن خودێ نە ب تنێ ژ كریارێن خۆ یێن خراب دترسن، نە! ئەو پتر ژ باشییێن خۆ دترسن، دترسن خودێ وان بهێلتە ب هیڤیا باشییێن وان ڤە، و ئەو باش دزانن كو باشییێن وان هەمی نائێنە بەرانبەر ئێك قەنجییا خودێ د گەل وان كری.. بەرێ وان هەردەم یێ ل هندێ خودێ ب رەحما خۆ د گەل وان بكەت و وان بۆ خۆ چێ بكەت، (مالكێ كورێ دیناری) د دوعایا خۆ دا دگۆت: ((ئەی خودا تە چاك یێن چاككرین، تو مە چاك بكە)).

ل نک مرۆڤێن خودێ كرنا عیبادەتێ ژی تام و رامانەكا تایبەت هەیە..

- عیبادەت هەر چەندە بلندكرنەكە بۆ خودانی بەر ب مەلەكۆتا خودێ ڤە، ئەو نیشانەكە ژی ل سەر وەفادارییا مرۆڤی بۆ خودایێ وی، و ئەو كەسێ د گەل خودایێ خۆ یێ ب وەفا نەبت ل هیڤییێ نەبە ئەو د گەل كەسەكێ دی یێ ب وەفا بت.

- عیبادەت هەر چەندە واجبەكە ل سەر خودانی، بەلێ ئەو دبتە نیشانا شوكرا وی بۆ خودایێ وی، و ئەوێ شوكرا خودایێ خۆ نەكەت ل سەر قەنجییێن وی ل هیڤییێ نەبە ئەو شوكرا كەسەكێ دی ل سەر قەنجییێن وی بكەت.

- عیبادەت هەر چەندە ئەو رێكە یا خودانی دگەهینتە خودێ، ئەو كارە ژی یێ وی پاقژ و بژوین دكەت و وی د چاڤێن خودێ دا بلند دكەت، و ئەو كەسێ د چاڤێن خودێ دا یێ نزم بت، ل هیڤییێ نەبە ئەو ب هیڤیا كەسەكێ دی ڤە بلند ببت.

سەرێ هەر عیبادەتەکی -د فەرهەنگا مرۆڤێن خودێ دا- (ئنیەتا دورستە) نەوا ژ دلەکێ پاقژ و ساخلەم دەردکەڤت، و ئنیەتا دلی هەر جارەکا پاقژبوو کارێ لەشی ژی دێ دورست بت، (ئیبراهیمێ نەخەعی) دگۆت: ((هەچییێ ناڤخۆییا خۆ چاک بکەت، خودێ سەرڤەییا وی دێ چاک کەت))، ژ بەر هندێ پویتەپێکرنا مرۆڤێن خودێ ب ئنیەتا دورست پتر بوویە ژ پویتەپێکرنا وان ب کارێ دورست ب خۆ ژی.. ئنیەت د فێرگەها وان دا هۆنەرەکێ مەزنە، لەو بەری هەر تشتەکی وان خۆ فێری ئنیەتا دورست دکر و وان ئنیەتا دورست نیشا شاگردەیێن خۆ ددا، (سالمێ کورێ عەبدللاهی) دگۆت: ((بزانە هندی هاریکارییا خودێیە بۆ عەبدی ل دویڤ ئنیەتا عەبدییە، هەچییێ ئنیەتا وی یا موکم بت هاریکارییا خودێ ژی بۆ وی دێ یا تمام بت)).

ژ بەر پویتەپێکرنا وان ب ئنیەتا دورست وان های ژ (پێشکێشییا د دنیایێ دا) و (مەنصبێن بلند) نینە، یێ وان ببینت چو هزرێ ژێ ناکەت و چو هزرێ بۆ ناکەت؛ چونکی ئەو ژ هەمی پلپلکێن دنیایێ یێن درەوین دڤالانە، ب پەرتالێ بێ خێرێ دنیایێ ئەو نە وەرمتینە، لەو کورسیک و خودانێن کورسیکان نشێن وان ب نک خۆ ڤە بکێشن یان چاڤان لێ تاری بکەن! (ئەبوو ئدریسێ خەولانی) دگۆت: ((دلەکێ پاقژ د ناڤ جلکەکێ پیس دا چێترە ژ دلەکێ پیس د ناڤ جلکەکێ پاقژ دا)).

د گەل ڤێ خەما وان یا مەزن ژ ئنیەتا دورست خەما وان ژ کارێ دورست ژی یا کێم نەبوو، چو ئاستەنگان نەدشیا بەرێ وان ژ عیبادەتی وەرگێرت، (بێ خیرەتی) و (شراتی) -بۆ نموونە- دو ئاستەنگێن مەزنن یێن کو مرۆڤی ژ کرنا عیبادەتی سست دکەن، لەو (موحەممەد ئەلباقری) شیرەت ل کورێ خۆ دکر و دگۆتێ: ((کورێ من! هشیاری بێ خیرەتی و شراتییێ بە، ئەڤ هەر دووە کلیلا هەمی خرابییانە، ئەگەر تو بێ خیرەت بووی تو چو حەقان ب جه نائینی، و ئەگەر تو شڕ بووی تو صەبرێ ل سەر حەقییێ ناکەی)).

(مەنصووریَ کوڕێ موعتەمری) هەڤالێ شەڤێ بوو، وەستیانێ رێکا خۆ ل نک وی نەددیت، گاڤا دنیا تاری دبوو ئەو دا ڕابت نڤینێن خۆ پێچت و شەملکا خۆ ڕائێخت و دەست ب عیبادەتی کەت، هندی دلێ دەیکا وی دما پێڤە ڕۆژەکێ وێ گۆتێ: کوڕێ من، پیچەکێ بۆ خۆ ڕازێ مانێ چاڤێن تە ژی حەقێ ل سەر تە هەی، وی گۆت: ((دادێ! ژ من بگەڕێ ڕازانەکا درێژ د قەبری دا یا هەی))! و ڕۆژا (مەنصوور) مری کوڕێ جیرانەکا وی پسیار ژ دەیکا خۆ کر و گۆت: هەر شەڤ من ستوینەکا چکلاندی ل مالا (مەنصووری) ددیت، ئێدی ئەز وێ ستوینێ نابینم، ئەو چ لێ هاتییە؟ دەیکا وی گۆت: کوڕێ من ئەو ستوین نەبوو، ئەو (مەنصوور) بوو ب شەڤێ ڕادبوو نڤێژ دکرن!!

(حەسسانێ کوڕێ ئەبوو سنانی) کەفتە بەر مرنێ، هەڤالێن وی چوون سەرا بدەن، ئێک ژ وان گۆتێ: نوکە مرادا دلێ تە چیە؟ وی گۆت: ((خوزی شەڤەکا درێژ ژ شەڤێن زڤستانێ ب سەر من دا هاتبا و ئەز ڕاببام من عیبادەتێ خودێ تێدا کربا..)) هندە ئەو ب تاما خۆشییا کرنا عیبادەتی دحەسیان، (ثابتێ بەنانی) پێنجی سالان نڤێژێن شەڤێ ژێ نەچووبوون، ب شەڤێ نڤێژ دکرن و گاڤا دبوو سپێدە دەستێن خۆ بلند دکرن و دگۆت: ((یا ڕەبی! ئەگەر تە قەنجی د گەل بەنییەکێ خۆ کربت کو ئەو د قەبری دا نڤێژێ بکەت، ئەو ئێک بلا ئەز بم))!

(ڕەبیعێ کوڕێ خەیثەمی) ئێشەک هاتبوویێ نەدشیا ب ڕێڤە بچت، دو زەلامان ملێن وی دگرتن حەتا ئەو دگەهاندە مزگەفتێ بۆ نڤێژا ب جماعەت، وی دگۆت: ((ئەز دزانم بۆ من دورستە نەئێمە مزگەفتێ، بەلێ گاڤا من گوهـ ل (حي على الفلاح) دبت ئەز نەشێم خۆ بگرم، چاوا ئێک بێژتە مرۆڤی: وەرە ئیفلەحێ، و مرۆڤ نەچت؟ ئەگەر خۆ ئەو ل سەر چالەپکان چوویە دڤێت بچت)).

و د گەل ڤی هەمی عیبادەتێ وان ژی شەرما وان ژ خودێ خەو ژ چاڤان دڕەڤاند، ئێک ژ وان ب شەڤێ دما هشیار و هزرا خۆ د هندێ دا دکر: ئەرێ

چاوا ئەز دێ شێم سەرێ خۆ بەرانبەر خودێ ڕاکەمەڤە دەمێ ئەو گونەهێن من ددەتە بەرچاڤێن من؟

(ئەسوەدێ کوڕێ یەزیدێ نەخەعی) ئێک ژ وان خودێناسان بوو یێن ل سەر دەستێ (عەبدللاهێ کوڕێ مەسعوودی) هاتییە پەروەردەکرن، حەشتێ حەج کربوون، و هەر شەش ڕۆژان جارەکێ قورئان ختم دکر، و ل ڕەمەزانێ دو ڕۆژان جارەکێ ختم دکر، گاڤا ئەو کەفتییە بەر مرنێ وی کرە گری، هندەکان گۆتێ: تە خێرە تو هندە دترسی؟ وی گۆت: ((ئەگەر ئەز نەترسم پا کی بترست؟ ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر ئەز بزانم سەدا سەد خودێ دێ من عەفی کەت ژی، شەرما ژ خودێ دێ خەما من گران کەت، ئەگەر مرۆڤ خەلەتییەکا بچویک د دەر حەقا مرۆڤەکی دا بکەت و ئەو مرۆڤی عەفی بکەت ژی گاڤا مرۆڤ وی دبینت دێ شەرم ژێ کەت)).

د گەل ئنیەتا دورست و کارێ دورست مرۆڤێن خودێ لێ دگەڕیێن زانینەکا دورست ژی ب دەست خۆ بێخن؛ چونکی وان باوەری هەیە کو (کارێ) بێ (زانین) دارەکا خرشە، و هەبوونا (زانایەکێ) دورست د ناڤ ئوممەتێ دا ل نک شەیتانی و دویکەفتییێن وی ژ هەبوونا سەد (عیبادەتکەران) نەخۆشترە.. بەلێ ئەو زانینا مرۆڤێن خودێ لێ دگەڕیێن ئەوە یا (تەقوایێ) ل نک خودانێ خۆ پەیدا دکەت، و زانا یێ زانا نابت ئەگەر نە ئەو بت یێ تەقوایێ جهێ خۆ د دلی دا کری، زانین -ل نک مرۆڤێن خودێ- ئەو زانینە یا ژ تەقوایێ دزێت و تەقوایێ دزێت! و ئەگەر تە بڤێت ڤێ گۆتنێ ڤاژی بکە: تەقوا ل نک مرۆڤێن خودێ ئەو تەقوایە یا ژ زانینێ دزێت و زانینێ دزێت. (زیادێ ئەسلەمی) دبێژت: ((ئەو مرۆڤێن زانینا وان تەقوا ل نک پەیدا نەکر بت چو زانین وان نینە)).

زانینا دورست ڕۆناهییەکێ د دلێ خودانی دا پەیدا دکەت، دلێ وی فرەه دکەت، دنیایێ د چاڤێن وی دا دکەتە چوننە، گاڤا تە زانایەکێ بێ تەقوا دیت تو

بزانە چو خێر د سەرێ وی دا نینە، (ئەبوولعالیە) دبێژت: ((هندەک جاران ئەز قویناغا چەند ڕۆژەکان دبڕم دا بچمە نک زانایەکی، گاڤا ئەز دگەهمێ بەری هەمی تشتان دێ سەحکەمێ کانێ ئەو بۆ نڤێژێت خۆ یێ چاوایە، ئەگەر من دیت یێ باشە ئەز دێ مینمە ل نک و زانینێ بۆ خۆ ژێ وەرگرم، ژ خۆ ئەگەر من دیت بۆ نڤێژێ ب کێر نائێت ئەز دێ ژ نک وی ئێم و چو زانینێ ژێ وەرناگرم، و دێ بێژمە خۆ: پا بۆ تشتێن دی ئێکجار ئەو ب کێر نائێت)).

جارەکێ هندەکان گۆتە (ئەبوو یەزیدی): ل فلان باژێڕی زانایەکێ مەزنێ هەی.. ئەو ڕابوو قەستا وی باژێڕی کر و چوو مزگەفتێ دا زانینێ بۆ خۆ ژ وی زانای وەرگرت، ب ڕێکا مزگەفتێ ڤە گەهشتێ، دیت یێ تف دکەتە لایێ قیبلێ، (ئەبوو یەزید) هەر ل وێرێ زڤڕی و گۆت: ((ئەو مرۆڤێ ل سەر ئەدەبەکی ژ ئەدەبێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یێ ئەمین نەبت باوەرییا من ب زانینا وی نائێت)).

مەعنا نە زانینا بێ تەقوا بهایێ خۆ ل نک مرۆڤێن خودێ هەیە، و نە تەقوایا بێ زانین، و گاڤا مرۆڤەکی زانین و تەقوا هەردو ل نک پەیدابوون ئەوە مەزنترین پەرتال ل سەرمالێ ئوممەتێ زێدە دبت، و هەر جارەکا زانایەکێ ب ڤی ڕەنگی دمرت هەر وەکی چرایەکێ گەش ڤەمری لەو ڕێ ل خەلکی تاری دبت، (ئەییووبێ سەختیانی) دبێژت: ((گاڤا من گوهـ ل مرنا زەلامەکی ژ خودانێن سوننەتێ دبت، ئەز وە هزر دکەم هەر وەکی پارچەیەکا لەشێ من ژێ ڤەدبت))، هندە زانایێ دورست بهایێ خۆ ل نک وان هەیە، و هەر جارەکا زانایی خۆ ژ ڤێ بلندییێ ئیناخوارێ و پشتا خۆ دا تەقوایێ و ڕێکا سوننەتێ و بوو ئێک ژ پالێن دنیایێ هنگی -ب دیتنا مرۆڤێن خودێ- ئەو دبتە جهێ گومانێ، ئیمام (جەعفەر ئەلصادق) دبێژت: ((مرۆڤێن زانا ل شوینا پێغەمبەرانە، چی گاڤا هەوە ئەو ل بەر دەرگەهێن مەزنان دیتن لێ بکەڤنە شکێ))!

(ئەبو موسلمێ خەولانی) دبێژت: ((زانا سێ ڕەنگن: یێ ئێکێ ب زانینا خۆ دژیت و مرۆڤ ژی پێ دژین، یێ دویێ ب زانینا خۆ دژیت بەلێ مرۆڤ پێ ناژین، و یێ سییێ مرۆڤ پێ دژین و ئەو خۆ تێ دبەن)).

مەعنا زانایێ دورست ئەوە یێ ب زانینا خۆ یا ڕاست و دورست دژیت، و ڤێ زانینێ ل دەور و بەرێن خۆ ژی بەلاڤ دکەت و خەلک ژی پێ دژین، زانایەکێ ب ڤی ڕەنگی گاڤا تە دیت خۆ ڤێڕا بگەهینە ئەو مرۆڤێ خودێیە، جێگرێ پێغەمبەرییە، ئەگەر تو تویشی دەردێ غەفلەتێ بووی ئەو دێ دلێ تە ساخ کەت..

# زێندیکەرێ دادیێ
# عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی

ئەگەر خودێ خێرا مللەتەکی ڤیا مرۆڤەکی ژ مرۆڤێن خۆ دێ کەتە مەزنێ وان، و مەزنی -دەمێ دکەفتە دەستێ مرۆڤەکی ژ مرۆڤێن خودێ- تاما خۆ یا تایبەت هەیە؛ چونکی ئەو دبتە خودان بەرهەمەکێ تایبەت.

د گەشتا خۆ دا د گەل مرۆڤێن خودێ مە ل بەرە ژ کۆپێ بلند دەست پێ بکەین، دا بیرا خۆ و یا هەوە ژی ل وان دەمان بینینەڤە یێن کو ژ مێژە وەرە دیرۆکا مە ژێ خەریب بووی، دەمێ مرۆڤێن خودێ -ب پشتەڤانییا خودێ- سەرکێشییا کاروانی دکەن.. وەرن دا پێکڤە بەریەرێن دیرۆکا مرۆڤێن خودێ قەلدەین، دا بەرێ خۆ بدەینێ کانێ چاوایە دەمێ مەزنییا مللەتان دکەفتە دەستێ وان.

بەری ئەم قەستا جیهانا عومەرێ دویێ بکەین دەستویرییێ بدەن کو ڤێ سەرهاتییا کورت ڤەگێرین یا کو بۆ مە ئاشکەرا دکەت کانێ دیتنا مرۆڤێن خودێ بۆ ڕێبەرییا مللەتان چیە؟ و کانێ مەتەلا ڕێبەرێن مللەتان -هەر دیسا ب دیتنا مرۆڤێن خودێ- چیە؟

(ئەبوو موسلمێ خەولانی) ڕۆژەکێ چوو دیوانا (موعاویەی) -خودێ ژێ ڕازی بت- دەمێ ئەو خەلیفە، و ل شوینا بێژتێ: سلاڤ ل تە بن ئەی ئەمیر، گۆتێ: سلاڤ ل تە بن ئەی ئەجیر (یەعنی: ئەی کرێگرتی) هندەکان گۆتێ: بێژێ ئەمیر! (موعاویەی) گۆت: ئەبوو موسلمی بهێلن ئەو چێتر دزانت.. ئینا ئەبوو

موسلمی گۆتە موعاویەی: ((هندی مەتەلا تەیە مەتەلا زەلامەکییە مرۆڤەکی بۆ خۆ ب کرێ بگرت دا چاڤێ خۆ بدەتە پەزێ وی، ڤێجا ئەگەر وی ب دورستی چاڤێ خۆ دایێ خەلاتەکێ باش دێ وەرگرت، و ئەگەر چاڤێ خۆ باش نەدایێ خودان دێ ژێ عێجز بت و چو خەلاتان نادەتێ)).

ل جهەکێ دی هەر ئەبوو موسلم دبێژت: ((مەتەلا مەزنی مەتەلا وێ کانییا مەزن و زەلالە یا جۆک و دەراڤ ژ بەر دچنە ڕویبارەکێ بۆش، هندی خەلک هەبن وان جۆکان شێلی بکەن ژی، ئاڤ هەر دێ یا زەلال بت هندی کانی شێلی نەبت، بەلێ چی گاڤا کانی شێلی بوو خۆ ڕویبار ژی دێ شێلی بت..)).

مەعنا مەزنێ هەر مللەتەکی بۆ وان سەرەکانییە، ڤێجا هزر بکەن چەند قەنجییەکا مەزنە خودێ د گەل وی مللەتی دکەت یێ سەرەکانییەکا زەلال ددەتێ؟

## ل بەر دەرازینکا عومەری:

نوکە مە ل بەرە بەربەرێن دیرۆکێ قەلدەین و بزڤرینە دووماهییا سەدسالا ئێکێ ژ ژییێ ئوممەتێ.. ب دورستی ل سالا (٩٩)ێ مشەختی:

ل مالەکێ ژ مالێن دیمەشقێ، دەنگێ گرییێ بلند دبت.. خەلک حێبەتی دمینن: ئەڤە چیە؟ پانێ ئەگەر ئەڤە مالەکا دی بایە دا کەیف کەیفا وان بت، ئەڤە چیە؟ دا پتر خۆ نێزیکی ڤێ مالێ بکەین، بەلکی بزانین دەنگێ گرییێ بۆچی ژێ بلند دبت.. مال مالا ئێک ژ مرۆڤێن خودێیە.. و گری ژ بەر هندێیە چونکی ئەڤرۆ ل مزگەفتا بازێری یا مەزن خەلک ل خودانێ ڤێ مالێ کۆم بووبوون و گۆتبوونێ: پشتی پسمامێ تە نەمای تو ل شوینا وی دێ بییە مەزنێ مە.. دێ بییە مەزنێ مە.. بەلێ! ڤێجا ما ڤێ چەندێ گری پێ دڤێت؟

ل نک مرۆڤێن خودێ.. ئەرێ! نەخۆشترین مزگینی ل نک ئێک ژ وان ئەوە بێژنێ: تو بوویە مەزنێ مە.

دەمێ خەلکێ دیمەشقێ خەلیفێ خۆ (سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکێ ئومەوی) ڤەشارتی، هێشتا ل سەر زیارەتی ل دۆر پسمامێ وی (عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی) کۆمبوون و گۆتنێ: خیلافەت ل تە پیرۆز بت. گاڤا عومەر زڤڕییە باژێڕی قەستا بارەگایێ سیاسی یێ دەولەتا قورئانێ کر، و ب سەر مینبەرێ کەفت، مزگەفت یا تژی زەلام بوو، گوهێ هەمییان ما لێ کانێ عومەر دێ چ بێژت؟

عومەری ب ناڤێ خودێ دەست پێ کر و پشتی حەمدا خودێ کری و سلاڤ دایە سەر پێغەمبەری، گۆت: ((گەلی مرۆڤان! هوین دزانن ئەڤە بەلایەکە بێی پسیارا من هاتییە سەرێ من، من ئەڤ چەندە نەخواستییە و پسیارا هەوە ژی نەهاتییەکرن، لەو هوین شاهد بن کو من ئەڤ بارە ژ سەر ملێن خۆ دانا، و کانێ هەوە کی دڤێت وی بۆ خۆ بکەنە خەلیفە)).

مزگەفت تێک هژیا، ئەڤە چ مرۆڤێ غەریبە، دنیا ئەوا خەلک ل دویڤ دبەزت ب نک وی ڤە دئێت و ئەو ژێ دڕەڤت؟ هەبت نەبت ئەڤە دێ ب کێر مە ئێت، هەمییان ب ئێک دەنگ گۆتێ: ئەم ب تە دڕازینە و تو دێ خەلیفە بی.. عومەر تێکەفت! چو ڕێ نەمان، زڤڕی مال و ئەڤ مزگینییا نەخۆش گەهاندە خەلکێ مالا خۆ.. ئینا دەنگێ گرییێ ب سەر مالێ کەفت!!

**عومەر و پێناسەیەکا کورت:**

مە نە ل بەرە دیرۆکا عومەری ڤەگێڕین، ب تنێ مە دڤێت عومەری ب کورتی ب هەوە بدەینە ناسین، دا بزانن کانێ چاوایە دەمێ مەزنی دکەفتە دەستێ مرۆڤێن خودێ؟ و کانێ ئەو چاوا خەلکی ب ڕێڤە دبەن؟

* عومەر کوڕێ عەبدلعەزیزێ کوڕێ مەروانێ کوڕێ حەکەمێ قورەیشییە، و دەیکا وی (أم عاصم) کچا عاصمێ کوڕێ عومەرێ کوڕێ خەططابییە، ل سالا (٦١)ی مشەختی دەمێ بابێ وی میرێ مصرێ و ب دورستی ل باژێڕێ (حەلوانێ) ئەو هاتبوو سەر دنیایێ.

* هێشتا ئەو یێ بچویک بابێ وی ئەو دانابوو بەر خواندنێ و هەر زوی وی قورئان هەمی ژبەرکر، و چونکی نیشانێن زیرەکییێ لێ ددیار بوون بابێ وی ئەو هنارتە مەدینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا بەردەوامییێ بدەتە خواندنا خۆ و فێری زانینێ و تۆرەیی ببت.

* ل مەدینێ وی تێکەلییا زانایێن حەدیسێ کر، و زانین بۆ خۆ ژ هژمارەکا صەحابییان وەرگرت، وەکی: (ئەنەسێ کورێ مالکی) و (سائبێ کورێ یەزیدی) و (خەولایا کچا حەکیمی)، هەر وەسا مفایەکێ مەزن بۆ خۆ ژ دەرسێن مەزنە زانایێن تابعییان وەرگرت، وەکی: (سەعیدێ کورێ موسەییبی) و (عوروەیێ کورێ زوبەیری) و گەلەکێن دی.

* پویتەیەکێ مەزن وی ددا حەدیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و ئەو دئێتە هژمارتن ئێکەمین خەلیفە فەرمان ب نڤیسینا حەدیسێ کری، و ئەو ب خۆ دئێتە هژمارتن ئێک ژ مەزنترین زانایێن تابعییان، زانایێ ناڤدار (موجاهد) دبێژت: ئەم هاتین دا وی فێر بکەین ئینا مە هند دیت ئەم ژ وی فێر بووین.

* پشتی زانینا خۆ ب دووماهی ئینای و ناڤ ودەنگێن وی ل مەدینێ بەلاڤبووین ئەو زڤڕی مصرێ ل نک بابێ خۆ، و دەمێ بابێ وی مری، مامێ وی یێ خەلیفە (عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی) هنارتە ب دویڤ ڕا و ئەو برە نک خۆ ل شامێ، و پشتی دەمەکی کچا خۆ (فاطما) دایێ.

* دەمێ پسمامێ وی (وەلیدێ کورێ عەبدلمەلکی) بوویە خەلیفە، ئەو کرە والی و هنارتە (مەدینێ)، و حەتا سالا (٩٣)یێ ئەو ما ل وێرێ پاشی زڤڕی شامێ.

* ل سالا (٩٦) دەمێ پسمامێ وی (سولەیمانێ کورێ عەبدلمەلکی) بوویە خەلیفە وی بەیعە بوو عومەری ژ خەلکی وەرگرت و گۆت: پشتی من ئەو دێ بتە خەلیفە. و پشتی سولەیمان مری ل سالا (٩٩)ێ عومەر -و ب وی

ڕەنگێ مە گۆتی- بوو خەلیفە. و ژ بەر دادی و عەدالەتا وی یا کو بیرا خەلکی ل عەدالەتا باپیرێ وی عومەرێ کوڕێ خەططابی ئینایەڤە خەلکی ناڤێ (خەلیفێ ڕاشد) یێ پێنجێ ل سەر دانا.

* ل هەیڤا رەجەبێ ژ سالا (١٠١)ێ مشەختی و ل باژێڕێ دیمەشقێ دەمێ ژیێ وی (٤٠) سال، ئەو چوو بەر دلۆڤانییا خودێ پشتی نێزیکی دو سال و پێنج هەیڤان بوویە خەلیفە.

## ڕۆژا ئێکێ ژ خیلافەتا عومەری:

بەری عومەر ببتە خەلیفە نێزیکی پێنجی و هەشت سالان بنەمالا وی یا کو ب ناڤێ باپیرێ خۆ یێ مەزن (ئومەییە)ی دئێتە ناسین فەرمانداری ل موسلمانان دکر، و هەر ژ دەسپێکا ڤێ بنەمالێ خیلافەت وەرگرتی ل سەر دەمێ (موعاویە)ی -خودێ ژێ رازی بت- ل سالا (٤١) مشەختی، وان خیلافەت کرە مەلکاتی و بابێ ئەو ب میراتگری دا کوڕی، حەتا ڕۆژەک هاتی ئەو کەفتییە دەستێ عومەری.. بەری عومەری هژمارەکا خەلیفێن ئومەوی هاتبوون، و هندەک ژ وان زۆردارییەکا بەرچاڤ ل خەلکی کربوو و مالێ وان ژێ ستاندبوو، و ب حەقێ خوها ئەنییا خەلکی سەرمالێ خۆ زێدە کربوو، و خۆ زەنگین و دەولەمەند کربوو. دەمێ عومەر بوویە خەلیفە واقعەکێ تژی خرابکاری ل هیڤییێ بوو، نال نالێن هەژاران بلند دبوون، و خەلکێ ماف لێ هاتییە خوارن بەر لێ بوو کانێ خەلیفێ نوی دێ چ کەت؟

ل وێ سپێدەیا عومەر ژ ڤەشارتنا پسمامێ خۆ (سولەیمانی) خلاسبووی، و زڤڕییە مزگەفتێ، و خەلکی دەنگێ خۆ دایێ، و کوتەکی لێ کری کو ئەو ببتە خەلیفە، و ئەو زڤڕییە مال -وەکی مە بەری نوکە ڤەگێڕای- ژ بەر خەما مرنا پسمامێ خۆ، و وێ وەستیانا وی دیتی، و نەخۆشییا هلبژاراتنا وی بۆ خیلافەتێ، عومەر پێ حەسیا هەر وەکی سەرێ وی یێ دئێشت، لەو وی ڤیا بێنەکێ بۆ خۆ بنڤت حەتا نیڤرۆ دبت، بەری عومەر سەرێ خۆ بدانت کوڕێ وی

(عەبدلمەلک) ب ژۆرکەفت، دیت هەر وەکی بابێ وی یێ کارێ نڤستنێ دکەت،
ئینا گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین)! تو دێ چ کەی؟

وی گۆت: کورێ من! پیچەکێ ئەز دێ سەرێ خۆ دانم، ئەز گەلەک یێ وەستیایم.

کورێ وی گۆتێ: دێ نڤی بەری حەقێ وی خەلکی یێ زۆرداری لێ هاتییەکرن بۆ بزڤڕینی؟

عومەری گۆت: تو دزانی ئەڤە ژ شڤێدی وەرە ئەم ب جەنازێ مامێ تەڤە دموژیلین، ژ بەر هندێ ئەز تێر نەنڤستیمە، ڤێجا من دڤێت حەتا دبتە نیڤرۆ پیچەکێ بۆ خۆ بنڤم، و پشتی نیڤرۆ -ئەگەر خودێ حەز بکەت- دێ وێ کەم یا تە دڤێت.

عەبدلمەلکی گۆتە بابێ خۆ: ئەی (أمیر المؤمنین) ما تو چ دزانی بەلکی تو حەتا نیڤرۆ نەمینییە ساخ؟

ڤێ گۆتنێ خەو ژ چاڤێن عومەری ڕەڤاند، وەکی وی مرۆڤێ ماری پێڤەدای لەرزی، ڕابووڤە.. دیسا، کی دبێژت ئەز حەتا نیڤرۆ دێ مینمە ساخ؟ ئەگەر پاشی خودێ گۆتە من: دانەکی من تو کرییە مەزنێ موسلمانان و شوینا کو تو بچی مافێ هەژاران بۆ بزڤڕینی تو چووی بنڤی، بۆچی تە لەز نەدکر، هنگی ئەز دێ چ بێژمێ؟

عومەر ڕاست ڕابووڤە، ب ناڤ چاڤێن کورێ خۆ ڤە ماچی کر و گۆت: حەمد بۆ وی خودایی بت یێ کورەکێ وەسا دایە من هاریکارییا من ل سەر دینێ من بکەت.. ئەڤ کورێ عومەری، ئەوێ بەرێ بابێ خۆ دایە حەقییێ، ئەو بوو یێ دگۆت: ب خودێ من کەس وەکی عومەری (بەحسێ بابێ خۆ) نەڤیایە، و ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر خەبەرێ مرنا وی گەهشتبا من، من پێ خۆشتر بوو ژ ڤێ یا من ژێ دیتی. یەعنی کو ئەو بوویە خەلیفە!

ئەگەر من گوھ لێ ببا بابێ من یێ مری، بۆ من خۆشتر بوو ژ هندێ کو من گوھ لێ بووی ئەو یێ بوویە خەلیفە!! ئەرێ ئەو کەسێ هۆسا مەسەلێ ببینت چاوا نەکەتە گری دەمێ خەبەر دگەهتە وی کو بابێ وی یێ بوویە خەلیفە؟!

عومەر ژ مال دەرکەفت قەستا مزگەفتێ کر، هندەک زانایێن باژێری ل خۆ کۆمکرن؛ دا پسیارا خۆ پێ بکەت، گۆتە وان: هوین چ دبێژن، ئەز چ بکەم؟ هوین دزانن زۆرداری ل گەلەک مرۆڤان یا هاتییەکرن، و مالێ گەلەکان بێ حەق یێ ژێ هاتییە ستاندن.. هندەکان گۆتێ: ئەڤە تشتەکە بەری تە یێ هاتییەکرن و گونەھ نە یا تەیە، خودێ ل تە ناگرت. ئەڤ گۆتنە ل دلێ عومەری نەهات، (مەیموونێ کورێ مەهرانی) گۆتێ: ئەز دبێژم ئەگەر تو فرێکەیە ب دویڤ کورێ خۆ عەبدلمەکی ڕا و پسیارا وی بکەی خراب نینە، عومەری ب یا وی کر، گاڤا عەبدلمەلک هاتی، وی گۆت: ئەز دبێژم دڤێت تو هەر حەقەکی بۆ خودانێ وی بزڤرینی، و ئەگەر تو وە نەکەی تو ژی دێ هەڤالێ یێن بەری خۆ بی، فەرقا تە و وان نابت!

عومەری گۆتێ: تو ڕاست دبێژی، و ب یا وی کر.

لەو (یەحیایێ کورێ یەعلایی) دبێژت: زانایێن شامێ دگۆت: کورێ عومەری بەرێ عومەری دابوو عیبادەتی.

## عومەر و سیاسەتا گوهۆڕینێ:

عومەری بڕیار دا ل باژێری بێتە گازیکرن: هەچییێ غەدرەک لێ هاتبتەکرن بلا بێت غەدرا خۆ بێژت؛ دا حەقێ وی بۆ بزڤرینین.. و هەر ژ دانێ ئێکێ خەلیفێ نوی دەست ب گوهۆڕینێ کر.

ب ڕاستی گوهۆڕینا وی دەست و دارێ خەلک فێربوویێ و باب و باپیرێن وان ل سەر چووین، کارەکێ ب ساناهی نینە، و مرۆڤەکێ وەکی عومەری ئەگەر چەند حەز ژ دادییێ بکەت ژی هندی یێ ب تنێ بت نەشێت چو گوهۆڕینێ

بکەت.. عومەری ئەڤە باش دزانی لەو هەر ژ ڕۆژا ئێکێ ژ خیلافەتا خۆ وی ئەو پێگاڤا گرنگ هاڤێت یا کو پێتڤییە ل سەر هەر مەزنەکێ گوهۆڕین بڤێت بهاڤێت:

* وێ دەسهەلاتدارییا خرابکار یا عومەری مەزنییا وێ وەرگرتی زەلامێن خۆ هەبووینە، ئەو زەلامێن پێ زەنگین بووین و هاتینە پێش، بەری هەمییان عومەر ل ڤان زڤڕی و ئەو ڤەوژارتن؛ چونکی وی دزانی ئامیرەتێ خراب خرابییێ ناگوهۆڕت.

* ل شوینا وان عومەری چاڤێ خۆ ل باشان گێڕا، ئەوێن کرمێ حەرامییێ نەکەفتییە زکی، و دەستێ وان چو جاران نەچوویە د ناڤ دەستێن زۆرداران دا، وی ئەو ئینان ل دۆرێن خۆ کۆمکرن؛ دا ئەو بۆ وی ببنە هاریکارێن گوهۆڕینێ. پشتی ڤێ پێگاڤا گرنگ ژ نوی عومەری دەست دا کاری.. لەو وی ئەو بەرهەمێ پیرۆز ب دەست خۆ ڤە ئینا یێ ب دەست خۆ ڤە ئینای!

وەک دەلیل ل سەر ڤێ گۆتنا مە بەرێ خۆ بدەنە ڤێ سەرهاتییێ: دەمێ (سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکی) خەلیفە وی کوشتنەکا مەزن ئێخستە ناڤ ڕێزێن (حەرووریيان) -کو طایەکێ سەرداچوویێن خەوارجانە-، عومەری نەڕازیبوونا خۆ ل سەر ڤی کارێ سولەیمانی ئاشکەرا کر و گۆتێ: ئەز دبێژم شوینا کوشتنێ ئەگەر تو وان بگری حەتا ئەو تۆبە دکەن چێترە.. ڕۆژەکێ لەشکەرێ سولەیمانی زەلامەکێ حەرووری گرت و ئینا دیوانا سولیمانی، خەلیفەی گۆتێ: هەوە چ دڤێت و هەوە چ ل بەرە؟ وی گۆت: مە دڤێت دەڤێ تە شەق کەین فاسقێ کوڕێ فاسقی. خەلیفەی هزرکر ئەڤە هێجەتەکا باش ل نک عومەری کەفتە دەستان، گۆت: هەرن بێژنە عومەری بلا بێت گوهێ خۆ بدەتە ڤی و بلا ئەو حوکمی ل سەر بکەت.. دەمێ عومەر هاتی و سوحبەت زانی خەلیفەی گۆتێ: ئێ تو چ دبێژی؟ عومەری گۆت: ئەز دبێژم کانێ وی چ گۆتییە تە تو ژی وە بێژێ! خەلیفەی گۆتێ: و چ ددی نە؟! عومەری گۆتێ: نە.. ئەڤ حوکمێ

عومەری ل دلێ سولەیمانی نەهات، لەو ل (سەرۆکێ زێرەڤانێن خۆ) خالدێ کورێ رەییانی خورى و گۆتێ: ڤی زەلامی ببە سەرێ وی ببرە.

عومەر ژ دیوانا خەلیفەى دەرکەفت، خالدی دا ب دویڤ ڤە، گاڤا گەهشتییێ گۆتێ: بابێ حەفصی ئەڤە چ گۆتن بوو تە گۆتییە (أمیر المؤمنین)ی؟ ب خودێ ئەز ترسیام ئەو فەرمانێ ل من بکەت کو ئەز سەرێ تە ژى ببرم. عومەری گۆتێ: و تو دا وە کەی؟ وى گۆت: ئەرێ، ئەگەر خەلیفەى فەرمان دابا.

مەعنا (خالد) د ناڤ زەلامێن سولەیمانی دا یێ گەهشتییە رێزا سەرلەشکەرییێ، نە چونکی ئەو مرۆڤەکێ ب کێرهاتییە، یان ژى چونکی ئەو یێ د خێرا مللەتی دا.. نە! بەلکی ئەو یێ گەهشتییە ڤێ رێزێ چونکی د دەستێ خەلیفەى دا یێ بوویە عەبد و کۆلە، ئەوێ ب ساناهی سەران ببڕت دا دلێ خەلیفەى ژێ نەمینت مرۆڤەکە د دەولەتا عومەرى دا چێ نابت تشتەک د دەستی دا بت..

رۆژ بۆرین و رۆژ هاتن، سولەیمان مر، چوو و خالد د گەل خۆ نەبر دا د قەبرى دا زێرەڤانییێ ل وى بکەت.. عومەر بوو خەلیفە، خالد ب ترِ و نەجمێن خۆ ڤە هات، هەمی هزرا وى ئەو بوو عومەر ژى وەکی یێن بەرى خۆیە، کانێ چاوا ژ وان دخوار دێ ژ ڤی ژى خۆت، گاڤا عومەرى خالد دیتی گۆتێ: ئەى خالد چەکێ خۆ بدانە.. پاشی دەستێن خۆ بەر عەسمانی ڤە بلندکرن، و گۆت: یا رەببی من خالدێ کورێ رەییانی بۆ تە ئێخست، تو وى رانەکەیەڤە. و عومەر ل دۆر خۆ زڤری چاڤێن وى ب (عەمرێ کورێ موهاجرى) کەفتن، نێزیکی خۆ کر و گۆتێ: ئەى عەمر! ب خودێ تو باش دزانی کو مرۆڤاینییا من و تە بەس مرۆڤاینییا ئیسلامێیە، بەلێ من ددیت تە گەلەک جاران قورئان دخواند، و جارەکێ من تو دیتی تو یێ ب تنێ بووى، یا ژ تە ڤە کەس تە

نابینت ته نڤێژ دکر، نڤێژا ته یا تازه بوو، و تو مرۆڤەکێ ئەنصاریی، ڕابه چەکێ خالدی هلگره سەرلەشکەرێ من دێ تو بی.

ئـەڤـە ئێـکـەمـیـن پێگاڤ بوو عومەری هاڤێتی، خالد ئێخست و عـەمـر ل شوینا وی دانا، نه چونکی عەمر مرۆڤێ وی بوو، و نه چونکی عـەمـری سۆز دابوویێ فایده یێ ب نیڤی بت، و نـه چـونکی عـەمـر یێ ئامـاده بـوو هـەچییێ بلڤت ئەزمانێ وی بیڕت، یان سەرێ وی لێ بدەت، نـه! بـەلکی ژ بـەر وان هـەر چار سالۆخەتێن باش یێن کو ل نک عەمری هەین:

ئێـک: چـونکی عـەمـر یێ ئـەنصـارییه، ژ نـەڤییێن وانـه یـێن پشـتـەڤانییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کری.

دو: چونکی مرۆڤاینییا وی و یا خەلیفەی مرۆڤاینییا ئیسلامێیه، و نه یا چو مەصلحەتێن دییه.

سێ: چونکی ئەو مرۆڤەکێ قورئانخوینه.

چار: چونکی ئەو مرۆڤـەکـێ ب تـەقوایـه، دوسـەرییـێ نزانـت، کـانێ ل نـک خەلکی یێ چاوایه، دەمێ یێ ب تنێ ژی هەر یێ وەسایه.

**هەڤالێن عومەری:**

پشتی عومەری ستوینێن دەولەتێ یێن خراب گوهاڕتین، و ئـەو ئـامیرەتێن دوهی خرابی پێ دهاتەکرن ژ ڕێکا خۆ لادایـن، چاڤێ خۆ ل هنـدەک مـرۆڤێن دی گێڕان دا ئەو بۆ وی ببنه هەڤال، و هلبژارتـنا وی کـەفتـه سـەر (زانـایێن ڕاسـت و دورست).

زانـا د دەولـەتـا عومـەری دا دمشـەبـوون بـەلێ ئـەو زانـایێن کـو ب کێـر عومـەری دهـاتن دکێم بـوون، چاڤێ عومـەری ب ئێـک ژ وان کـەفت، هـەر زوی هنارته ب دویڤ ڕا.. (مەیموونێ کوڕێ مـەهرانـی).. عومـەری ژێ خواست ئـەو ببته قازی و شیرەتکارێ وی، و دا هوین بزانن کـانێ (مـەیمـوون) چ کـەس بـوو،

بەسە بێژین: ئەو خودانێ وێ گۆتنییە ئەوا دبێژت: ((مەزنان نەنیاسە، و وان ژی نەنیاسە یێن وان دنیاسن)) و د گۆتنەکا دی دا دبێژت: ((ئەگەر ژ روهایێ حەتا حۆرانێ ب پێنج دەرهەمان بدەنە من، من نەڤێت)).. ئەڤە ئەو (مەیموون) بوو یێ عومەری کوتەکی لێ کری دا ببتە قازییێ وی، مەرەڤا وی ئەو نەبوو هەڤالینییا مەزنان بکەت یان دنیایێ ب دەست خۆ ڤە بینت، عومەری ئەڤە باش دزانی لەو ئەو و یێن وەکی وی ل دۆرێن خۆ کۆمکرن و بۆ هەڤالینییا خۆ هلبژارتن.

## سەر و بەرێ دەولەتا عومەری:

دو سال و پێنج هەیڤان عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی مەزنی ل موسلمانان کر، ب هژمارا رۆژ و شەڤان دەمەکێ کورت بوو، بەلێ ئەگەر مرۆڤ ژ لایێ وان گوهۆڕینان ڤە یێن وی کرین بەرێ خۆ بدەتێ، و ژ لایێ وێ خێرێ ڤە یا وی بەلاڤکری، دێ بینت دەمەکێ گەلەکێ درێژبوو.

بەری نوکە مە گۆت: عومری بەری هەر تشتەکی دەست ب گوهۆڕینا وی واقعێ خراب کر یێ کو بەری وی هاتییە دورستکرن، و حەتا ئەو شیای د ڤی دەمێ کورت دا ب دورستی ب کارێ گوهۆڕینێ ڕابیت ئەوی دەستەکەکا باش و خودێناس ژ لەشکەر و زانا و والی و خودان شیانان ل دۆر خۆ کۆمکرن؛ دا ببنە هاریکارێن وی ل سەر باشییێ.

دبێژن: جارەکێ عومەری مرۆڤەک بۆ والیاتییێ هلبژارت و هنارتە باژێرەکی ژ باژێرێن موسلمانان، پاشی هاتە گوهان کو ئەڤ مرۆڤە ل سەر دەمێ (حەججاجی) ژی بووبوو والی، ئینا عومەری هنارتە ب دویڤ ڕا، و گۆتێ: چونکی تو ل سەر دەمێ (حەججاجی) والی بووی مە تو ئێخستی، بوو لاڤەلاڤا وی مرۆڤی و ب سویندان ڕا چوو کو دەمەکێ درێژ وی کار بۆ حەججاجی نەکربوو، عومەری گۆتێ: ئەگەر ڕۆژەکا ب تنێ ژی، یان دانەکی تە هەڤالینییا خرابییێ کربت تێرا تە هەیە کو ئەم تە بێخین!

ئەو مرۆڤێ دانەکێ ڕۆژێ هەڤالینییا زۆرداران کربت و چاڤێن خۆ ب دیتنا وان تێر کربت، ب دیتنا مرۆڤێن خودێ ئەو ب کێر نائێت کارێ خەلکی بکەفتە د دەستان دا.. و ئەو دەسهەلاتدارییا بڤێت دادییێ بەلاف کەت، و خێرێ بگەهینتە هەژارێن مللەتی، بۆ وێ چێ نابت بچت هەر تاوانبارێن دوهی بینت کراسەکێ نوی بکەتە بەر و ل سەر کورسیکا فەرمانبەرییێ بدانت، ئەگەر نە.. مللەتی چو باوەری پێ نامینت، و هەر ئێک ژ لایێ خۆ ڤە دێ بێژت: پەرێ وەکی بەرێ!

ب ڤی ڕەنگی عومەری زەلامێن دەولەتا خۆ هلبژارتن، لەو ئەو هەمی هاریکارێن وی بوون ل سەر باشییێ، ڕۆژا عومەر بوویە خەلیفە د ناڤ خەلکی دا کرە دەنگ: کێ گازندەک هەیە بلا بێتە نک مە.. خەلکی باوەری ب وی هەبوو، وان دزانی ئەو نە ژ وی ڕەنگێ مەزنانە یێن کو یارییان بۆ خۆ ب هەستا خەلکی دکەن، لەو هەمییان پێکڤە قستا وی کر و دلێن خۆ بۆ ڤەکرن.

عومەری دیت گازندێن پترییا خەلکی ژ وێ تەعداییێیە یا کو بنەمالا وی ل وان کری، لەو وی بڕیار دا مرۆڤێن خۆ بینت و ئێک ئێکە حسێبێ د گەل بکەت، کارەکێ ب ساناهی نەبوو، بەلێ عومەری سۆز دابوو خودایێ خۆ کو دادییێ د ناڤ خەلکی دا زێندی بکەت، عومەری مرۆڤێن خۆ گازی کرن و ئێک ئێکە پسیار ژێ کر:

- ئەڤ هەمی مالێ تە هەی، تە ژ کیڤە ئینایە؟

مرۆڤێن دنیایێ دەمێ مەزنی دکەفتە دەستان ڕادبن مرۆڤێن خۆ کۆم دکەن و دبێژنێ: دەستێ هەوە ژ هەوە ڕا، ڤێ دەلیڤەیێ ژ دەست خۆ نەکەن، کۆم بکەن، هوین ژ کیڤە دئینن بینن، ئاخری مللەت یێ مەیە و ئەمین خودانێن مللەتی!! بەلێ مرۆڤێن خودێ ب ڕەنگەکێ دینە، وەکی عومەری مەزنییێ ب ڕێڤە دبەن، دبێژنە مرۆڤێن خۆ: ئەوێ هەوە بەری نوکە ژی هەی هەوە ژ کیڤە ئینایە؟

ئەو مالێ نە ب ڕێکێن دورست بنەمالا ئومەوییان ب دەست خۆ ڤە ئینای عومەری هەمی بۆ خودانان زڤڕاند، و ئەگەر چو خودان پێ نەهاتبانە دەر وی ئەو ل خزینەیا دەولەتێ دزڤڕاند، گاڤا خەلکی ئەڤ چەندە ژێ دیتی باوەرییا وان پێ هات.. دادی ئەو دادییە یا کو مرۆڤ ل سەر خۆ و بنەمالا خۆ ب کار بینت.

(عامرێ کورێ عوبەیدەی) دبێژت: ل وان ڕۆژێن عومەر ژ نوی بوویە خەلیفە ئەو د گەل مرییەکی دەرکەفتە موغبەرێ، مەحفیرەک هەبوو هەر جارێن هۆسا دا بۆ خەلیفەی ئینن دا ئەو ل سەر ڕوینت حەتا زەلام ژ سەر و بەرێ مری خلاس ببان، هندەکان ئەو مەحفیر ئینا بۆ عومەری دانا، گاڤا عومەری مەحفیر دیتی پێ خۆ لێدا و ویڤە هاڤێت و ڕوینشتە سەر ئاخێ، خەلک ژێ مەندەهۆش بوون، دارەک د دەستان دا بوو وی پالێ خۆ دابوو سەر، زەلامەک ب نک ڤە چوو گۆتێ: ئەی (أمير المؤمنين)! ئەز مرۆڤەکێ بێ حالم من چو د مال دا نەمایە، سوباهی دەمێ تو دچییە نک خودێ ئەو پسیارا من دێ ژ تە کەت.. عومەری سەرێ خۆ بلند کر و گۆتێ: کا بێژە ڤە تە چ گۆت؟ وی گۆتنا خۆ دوبارە کر، گاڤا وی بەحسێ خودێ و ڕۆژا قیامەتێ کری، بیرا عومەری ل وێ ڕۆژێ هات دەمێ تەک ڕادوەستت و خودێ ب هەمی مەزنییا خۆ ڤە مەحکەمێ پێ دکەت، چاڤێن وی هند ڕۆندک باراندن حەتا دەستکێ گۆپالێ وی تەڕبووی، عومەری گۆتێ: هوین چەند کەسن؟ وی گۆت: ئەم پێنجین.. عومەری گۆتێ: حەقێ تە دەهـ دینارن، و ئەم پێنج سەدان دێ دەینە تە، دو سەدان ژ مالێ من و سێ سەدان ژ مالێ خودێ حەتا خودێ ڕێکەکێ بۆ تە دبینت.

عومەری ئەو باوەری هەبوو کو ل قیامەتێ پسیارا وی خەلکێ ل بن دەستی هەمییێ دێ ژ وی ئێتەکرن، حسێبەکا گرانە، لەو شەڤ و نیڤشەڤان خەو ژ چاڤان ڤەدرەڤی.. ئێک ژ خەلکێ مالا وی دبێژت: ڕۆژا ئەو بوویە خەلیفە و زڤرییە مال گەلەک یێ تێکچووی بوو، من گۆتێ: تە خێرە تو هندە یێ غەمگین؟ وی گۆت: بۆ وی حالێ ئەز تێدا دڤێت مرۆڤ غەمگین بت، ئەڤرۆ

مرۆڤەک د ناڤ ئوممەتا موحەممەدی دا -سلاڤ لێ بن- نینە چ ل ڕۆژهەلاتێ بت چ ل ڕۆژئاڤایێ، ئەگەر پسیارا وی ژ من نەئێتە کرن کانێ من حەقێ وی گەهاندییێ یان نە، چ وی داخوازا حەقێ خۆ کربت یان نە.

ب ڤی ڕەنگی مرۆڤێن خودێ د مەسەلێ دگەهن، مەزنی بارەکێ گرانە، شەرمزارییە بۆ وی یێ ژ دەر حەق دەرنەکەڤت.

نوکە بەرێ خۆ بدەنە ڤان دیمەنان ژ مالا عومەری:

- (عەونێ کوڕێ موعتەمری) دبێژت: ڕۆژەکێ عومەر زڤڕی مالا خۆ گۆتە ژنکا خۆ فاطمایێ: تە دەرهەمەک هەیە ئەم بۆ خۆ فڕێکەینە هندەک تری؟ وێ گۆت: نەخێر. وی گۆت: خۆ فلسەک ژی تە نینە؟ وێ گۆت: نە. ئینا عومەری خۆ بێ دەنگ کر، فاطمایێ گۆت: تو (أمیر المؤمنین)ی و تە نە دەرهەمەک نە فلسەک نینە بۆ خۆ هندەک تری پێ بکڕی! عومەری گۆت: مـن ب ڤێ خۆشترە ژ زنجیرێن ئاگری د جەهنەمێ دا.

- خزمێ عومەری (مەسەلەمەیێ کوڕێ عەبدلمەلکی) دبێژت: دەمێ عومەر نساخبووی ئەز چووم من سەرا دا، من دیت کراسەکێ قڕێژی دبەر بوو، ئینا من گۆتە ژنکا وی فاطمایێ -کو خویشکا مەسەلەمەی بوو- کراسێ (أمیر المؤمنین)ی بشوو شەرمە نوکە خەلک دئێن سەرا ددەن، وێ گۆت: بلا، گۆت: پاشی جارەکا دی ئەز چووم من دیت هەر ئەو کراس یێ دبەر، ئینا من گۆتە فاطمایێ: ما من نەگۆتبوو تە کراسێ (أمیر المؤمنین)ی بشوو یێ قڕێژییە، ئینا وێ گۆت: برا، ب خودێ وی ژ ڤی کراسێ دبەر پێڤەتر چو جلک نینن، ما دێ چاوا ژ بەر کەم شووم، و خەلک دئێن سەرا ددەن!

- شەڤەکێ عومەر زڤڕی مال، وی سێ چار کچەکێن فاما هەبوون، وەکی هەر جار وی سلاڤ کر، ئینا کچێن وی دەستێن خۆ ب دەڤێ خۆ ڤەنان و ب لایێ دەرگەهی ڤە چوون، عومەر پسیارکر: ئەڤە ڤان خێرە؟ هندەکان گۆتێ: ژ پیڤاز و نیسکێ پێڤەتر چو شیڤ د مالا تە دا نەمایە، و چونکی کچێن تە

پیڤاز یا خواری بێنا ژ دەڤێ وان دئێت، و وان شەرم کر بێنا دەڤێ وان بێتە تـە، لەو وان ئەڤە کر یا تو دبینی. عومەر ما.. ڕۆنـدک ژ چاڤـان هـاتن، نـە چونکی ژ پیڤازێ زێدەتر چو ب دەست کچێن وی ناکەڤت، نە! هاتە بەر چاڤێن عومـەری هەر وەکی قیامەت یا ڕابووی، و عومەری گرێدای پێ دئیننە مـەحکـەما مـەزن، فەقیر و ژارێن مللەتی دەعوەدارێن وینە: ئەی خودا! تە عومەر کربوو مەزنێ مـە، بچویکێن مە ب شەڤێ برسی دنڤستـن، و کچێن وی دتێر بوون، یا ڕەببی حەقـێ مە ژێ چێکە. ئەها ژ بەر هندێ گرییا عومەری هات. ئینا عومەری گـۆتە کچێن خۆ: ئەی کچێن من! خوارنێن خۆش بۆ هەوە بۆچنە ئەگەر هوین بـزانن بـابێ هـەوە سوباهی دێ بەنە ئاگری.

- ڕۆژەکا دی عومـەر د گەل هەڤالـەکێ خۆ هاتە مـال، گـازی کچـەکا خۆ یـا بچویک کر، وێ خۆ ڤەشارت و نەهات، عومەری گـۆت: ئەرێ بۆچی ئەو نائێـت؟ هنـدەکـان گـۆتێ: چـونکی کراسـێ وێ یـێ دڕیـای، و وێ چـو کراسـێن دی نیـنن بکەتە بەر خۆ، ڤێجا ژ شەرمان دا ئـەو نائێت.. و هـەر ئێـک ژ ڤـان کچـێن وی ڕۆژەکێ گـۆتێ: جۆتـەکێ گوهـارکێن وەکـی یـێن فـلان هـەڤالا مـن بـۆ مـن بکـڕە، عومەری گـۆتێ باشە، ڕابوو دو پەلێن ئاگری ئینان و گۆتە کچا خۆ: چی گاڤا تـە ئەڤە کرنە گوهێن خۆ دێ جۆتەکێ گوهارکان بۆ تە کڕم.

- کابانییا عومەری هندەک زێـڕ هـەبـوون، ڕۆژا ئـەو بوویـە بویـک بـابێ وێ عەبدلـمەلکی دابوونێ، دەمێ عومـەر بوویە خەلیفە گۆتێ: ئێـک ژ دویـان بـۆ خـۆ هلبژێرە: ئەز، یان ئەڤ زێڕە.. وێ عومـەر هلبژارت، ئینا عومـەری زێـڕێن وێ بـرن کرنە د خزینەیا دەولـەتێ دا. مەعنا عومەری بەری هەر تشتەکی ژ خۆ و مالا خـۆ و مرۆڤێن خۆ دەست پێ کر، لـەو شیا وێ بکەت یا وی کری.

### ئارمانجا پیرۆز:

ڕۆژا عومـەر بوویە خـەلیفـە گوهۆڕینـەکـا بـەرچاڤ د سـەروبـەرێ ژینـا وی دا پـەیـدابوو، چـونکی هـەر ژ ڕۆژا ئێکـێ وی ئارمانجـەکـا مـەزن و پیـرۆز دانـا بـەر

سنگێ خۆ و حەتا ڕۆژا دووماهییێ ژ ژییێ خۆ ئەو ژ کارکرنا بۆ ئارمانجێ سست نەبوو، و ئەگەر هەوە بڤێت بزانن ئەو ئارمانجا عومەری بۆ خۆ دانای چ بوو، گوهدارییا ڤێ سەرهاتییێ بکەن:

ڕۆژەکێ مەتەکا عومەری هاتە نک، ژنکەکا سەرە بوو، خەلیفێن ئومەوییان هەمییان قەدرەکێ مەزن بۆ دگرت، عومەری گۆتێ: ئەی مەتێ! پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- دەمێ ژ دنیایێ وەغەرکری خەلک هێلانە ل سەر ڕوبارەکێ بۆش، پشتی وی ڕوبیار کەفتە دەستێ زەلامەکی چو ئاڤ ژێ کێم نەکر، پشتی وی زەلامی زەلامەکێ دی هات جۆیەک بۆ خۆ ژ بەر وی ڕوبیاری بر، ئینا خەلکی دەست دایێ هەر ئێکی جۆیەک بۆ خۆ ژێ بر حەتا ڕوبیار هشک و زوهابووی، ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر خودێ من بهێلتە ساخ ئەز دێ وان جۆیان هەمییان گرم دا ڕوبیار وەکی بەرێ بزڤڕتەڤە.

ئەڤە ئارمانجا عومەری بوو، و دا کو عومەر خۆ بگەهینتە ڤێ ئارمانجێ ئەوی ڕێبازەکا موکم دانا و ئەو ل دویڤ چوو، و فەرمان ل بنەمالا خۆ کر کو ئەو ژی ل دویڤ بچن، گاڤا خەلکی ئەڤ چەندە دیتی ئەو ژی ل دویڤ چوون..

جارەکێ والییێ (خوراسانێ) کاغەزەک بۆ عومەری هنارت تێدا هندەک گازندە ژ خەلکێ جهێ خۆ کرن، و دەستویری ژێ خواست کو ئەو ڕێکێ بدەتێ دا ئەو دژوارییێ د گەل وان ب کاربینت و گۆت: تشتەک وەکی شیری و قامچییێ وان چێ ناکەت. عومەری د بەرسڤا وی دا نڤیسی: تو درەوان دکەی! حەقی و عەدالەت دێ وان چێ کەت، ڤێ چەندێ د گەل وان بکە، و بزانە خودێ کارێ خرابان باش ناکەت.

(حەقی) و (عەدالەت) دو پەیڤن هەردەم خەلک یێ بۆ تێنییە، و هەردەم مەزن پێ دئاخڤن، بەلێ کێمن وان ب جهـ دئینن.. د گۆتنەکا خۆ دا عومەر دبێژت: ب خودێ ئەگەر پەیداکرنا حەقییێ و نەهێلانا نەحەقییێ ب کەرکرنا لەشێ من ب جهـ بێت، ب دلەکێ خۆش ئەز دێ قەست کەمێ.

ئەڤ گۆتنا عومەری نە خاپاندن بوو بۆ مللەتی، و نە بەنجکرن ژی بوو بۆ وان، گۆتنەک بوو د واقعێ وان دا هاتبوو بەری، تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر د ژینا عومەری دا ئەو بوو ئەو وەسا د مەزنییێ دگەهشت کو بارەکێ گرانە، و شەرمزارییەکا مەزنە ئەگەر ژ دەر حەقی دەرنەکەڤت، و وی باش دزانی کو ئەگەر ئەو یێ دویر بت ژ مرۆڤێن باش ئەو ژ دەر حەقی دەرناکەڤت، لەو وی هەڤالێن باش ل خۆ زێدە دکرن، رۆژەکێ عومەر ب سەر مینبەرێ کەفت و گۆت: هەچییێ ژ هەوە بڤێت هەڤالینییا مە بکەت بلا پێنج تشتان ل نک خۆ پەیدا بکەت ئەگەر نە بلا نەئێتە نک مە: بلا گازندا وی کەسێ نەشێت بێتە نک مە بگەهینتە مە، و هندی بشێت بلا هاریکارییا مە ل سەر حەقییێ بکەت، و ئەگەر باشییەک هەبت و ئەم پێ نەحەسییێین بلا ئەو بەرێ مە بدەتێ، و بلا نەکامییا کەسێ ژی ل نک مە نەکەت، و تشتێ شۆلا وی نەبت بلا مایێ خۆ تێ نەکەت.

ژ بەر ڤێ چەندێ مرۆڤێن دورِوی، مەصلحەتچی، زەلامێن دنیایێ هەمی ژ دۆران ڤەرەڤین، ئەو و مرۆڤێن وەکی وی مانە د گەل ئێک.

### سلاڤ.. ئەی زەمانێ عومەری!

عومەر هات.. و د گەل دا عەدالەت، و گاڤا عەدالەت هات زۆرداری نامینت، هەژاری دبرِیێت.. والییێ (سوودانێ) -ئەو وەلاتێ حەتا ئەڤرۆ ژی ناڤێ وی وبرس هەڤالجیمک- کاغەزەک بۆ عومەری هنارتە شامێ، و تێدا نڤیسی: ((ئەی (أمير المؤمنين) کەس مالێ زەکاتێ ژ مە وەرناگرت، هەچییێ ئەم دبێژینێ: بۆ خۆ وەرە زەکاتێ، ئەو دبێژت: ئەز نە یێ پێتڤیمە.. ئەرێ ئەم چ ل مالێ زەکاتێ بکەین؟)). عومەری گۆتێ: عەبدان پێ بکرِن و ئازا کەن، و ئەگەر عەبد نەمان رێکان پێ ڤەکەن.

ل وەلاتێ مصرێ پیرەژنەکا بێ خودان هەبوو، دیوارێ مالا وێ یێ نزم بوو، شەڤەکێ هندەک دزیکەران خۆ د سەر سیاجی رِا هاڤێتە ژۆر و چوون

هندەک مریشکێن وێ ژ کۆلکی برن.. ئەڤە ڕویدانەکا نە یا مەزنە و هەر ب بەر ناکەڤت مەزنێ دەولەتێ خۆ پێڤە موژیل بکەت، ئەگەر مەزنێ دەولەتێ ژ تەرزێ عومەری نەبت! سوحبەتا پیرێ گەهشتە عومەری ل شامێ، عومەری کاغەزەک بۆ والییێ مصرێ هنارت و تێدا نڤیسی: من یێ زانی حال و مەسەلێن پیرەژنەکێ ئەڤەنە، دەمێ کاغەزا من دگەهتە تە تو ب خۆ هەڕە سیاجێ خانییێ وێ بۆ بلند بکە.

ل زەمانێ عومەری نە ب تنێ مرۆڤان خۆشی ب عەدالەتا وی دبر! حەیوانان ژی بارا خۆ تێ هەبوو.. عومەری ڕۆژەکێ کاغەزەک بۆ والییێ خۆ ل مصرێ هنارت تێدا گۆتێ: من یێ زانی (حەممالێن) هەوە بارێن گران ل دەوارێن خۆ دکەن، گاڤا کاغەزا من گەهشتە تە نەهێلە هەر حەممالەک ژ هندێ زێدەتر باری ل دەوارێ خۆ بکەت.

مرۆڤێن خودێ دەمێ مەزنی دکەفتە د دەستی دا مەزنییا وان بۆ حەیوان و دەواران ژی ڕەحمە!

ئیمامێ (ئەوزاعی) دبێژت: ڕۆژا عومەر مری ئەز د گەل جەنازێ وی دەرکەفتمە زیارەتی، پشتی ئەم زڤڕین ئەز چووم دا قەستا باژێرێ (قنسرینێ) بکەم، ئەز د بەر قەشەیەکی ڕا بۆریم جۆت دکر، گاڤا وی ئەز دیتیم گۆتە من: دیارە تو یێ ژ ڤەشارتنا ڤی زەلامی دزڤڕی؟ من گۆتێ: ئەرێ.. ئینا وی دەستێن خۆ ب چاڤێن خۆ ڤەنان و کرە گری، من گۆتێ: تو بۆچی دکەیە گری، مانێ تو نە ل سەر دینێ وی یی؟ وی گۆت: ئەز نە ل سەر وی دگریم، ئەز بۆ وێ ڕۆناهییێ دگریم ئەوا ب مرنا وی ل عەردی هاتییە ڤەمراندن.

عومەر ڕۆناهییەک بوو ل عەردی گاڤا مری ڕێک ل خەلکی هەمییێ تاری بوو..

(مالکێ کوڕێ دیناری) دبێژت: دەمێ عومەر بوویە خەلیفە هندەک شڤانان پسیارکر: ئەڤە کیژ زەلامێ چاکە بوویە مەزنێ خەلکی؟ هندەکان گۆتێ:

و هوین چ دزانن کو ئەو یێ چاکە؟ وان گۆت: چونکی ئەڤە رۆژا ئەو بوویە خەلیفە گورگی پەزەکا مە نەخوارییە!

و (مووسایێ کورێ ئەعیونی) ل بازێرێ (کەرمانێ) ل سەر زەمانێ عومەری شڤانی دکر، مووسا دبێژت: هندی عومەر یێ ساخ جارەکا ب تنێ ژی گورگی زیانا پەزێ مە نەدکر، شەڤەکێ گورگی پەزەکا مە خوار، مە گۆت: هەبت نەبت ئەڤ مرۆڤێ چاک نەمایە، من ئەو شەڤ نیشان کر دەرکەفت ئەو شەڤ بوو یا عومەر تێدا مری!

سلاڤ ل تە بن ئەی عومەر..

سلاڤ ل تە بن ئەی زەمانێ عومەری..

# مەیموونێ کوڕێ مەهرانی
# زەلامێ قورئانێ

ڤێ جارێ مە دڤێت ل دیوانا زەلامەکی ژ زەلامێن قورئانێ ئامادە ببین؛ دا بزانین کانێ چاوایە دەمێ قورئان مەزنان دورست دکەت، مەزنان نە ب وی رەنگێ مەزنییێ یێ خەلک تێ دگەهن..

ئەو زەلامێ ئەڤرۆ مە دڤێت ل خزمەتا وی ئامادە ببین، ئەوە یێ عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی د دەر حەقێ دا گۆتی: ((ئەگەر ئەڤە و یێن وەکی وی نەمان، ژ بلی لەغەران کەس د ناڤ مرۆڤان دا نامینت))!

- بۆچی؟

- چونکی ئەڤ زەلامە، و یێن وەکی وی، بۆ مرۆڤان وەکی خوێینە بۆ زادی، پێ ب تام دکەڤن، و بێی وان نشێن خۆ بگرن یان خۆ ڕاگرن.

ئەڤ زەلامێ مەزن هەیامەکێ ل سەر زەمانێ خەلیفەیێ عادل عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی بووبوو والییێ دەڤەرەکێ ل جەزیرا فوراتی، جارەکێ وی ئەو ڕۆژ ل بیرا خۆ ئینانەڤە و ب دلەکێ پڕ خەم ڤە گۆت: من حەز دکر چاڤەکێ من تاری ببا، و ئێک بۆ من مابا و من چو والییاتی نەکریان.. هندەکان گۆتێ: خۆ بۆ عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی ژی؟ گۆت: خۆ بۆ عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی ژی!

ئەو مەزنییا خەلکێ دنیایێ خەونان پێڤە دبینن، خوزییا وی یا مەزن ئەو بوو ئەو نەگەهشتبایێ ئەگەر خۆ بها چاڤەکێ وی ژی با.. ئەڤ زەلامە (مەیموونێ کوڕێ مەهرانی)یە.

## مەیموون کی بوو؟

مەیموون ئێک ز مەزنترین زانا و زاهد و عیبادەتکەرێن تابعییان بوو، علم و حەدیس ژ گەلەک صەحابییان وەرگرتبوو، ل شامێ ژیابوو، و پەیوەندییا وی د گەل خەلیفێ ئومەوی عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی یا موکم بوو، و ئەو ئێک ژ وان زانایان بوو یێن عومەری هەر ژ رۆژا ئێکێ ژ خیلافەتا خۆ ل دۆر خۆ کۆم کرین و پسیارا خۆ پێ دکر، وی ل سالا (١١٧) ل شامێ و پشتی عەمرەکێ ب بەرەکەت ئەمرێ خودێ کربوو.

پشتی پیربووی رۆژەکێ ل بازێرێ بەصرایێ بوو، داخواز ژ کورێ خۆ کر دەستێ وی بگرت و ببەتە مالا ئیمامێ مەزن (الحسن البصری) گاڤا ئەو گەهشتینە بەر دەری کچەکێ د مال دا پسیارکر: ئەو کییە ل بەر دەری؟ وی گۆت: ئەز مەیموونێ کورێ مەهرانیمە، ئەزێ هاتیم حەسەنی ببینم.. کچکێ گۆت: مەیموون! کاتبێ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی؟ گۆت: بەلێ.. کچکێ گۆتێ: بێ ئێغبالۆ! بۆچی تو مایە ساخ حەتا ڤی زەمانێ خراب؟! مەیموونی ژ بەر گۆتنا وێ هند کرە گری حەتا دەنگێ وی گەهشتییە حەسەنی د ژۆر ڤە، حەسەن هاتە بەراهییا وی، و پشتی هەردویان خۆ د ئێک و دو وەرکری، و چووینە ژۆر، مەیموونی گۆتێ: بابێ سەعیدێ ئەز پێ دحەسییێم هەر وەکی دلێ من یێ رەقبووی، تشتەکی بۆ من بێژە دلێ من پێ نەرم ببت..

بەلێ ئەو زەمان زەمانەکێ وەسا بوو د ناڤ زانایان دا هندەک هەبوون (ئختصاصێ) وان نەرمکرنا دلان بوو، و د ناڤ خەلکی دا هندەک هەبوون سەرەدانا ئێک و دو دکر بۆ هندێ دا ب باراندنا رۆندکان دلرەقییا وان نەمینت.. ئاڤا بن ئەو رۆژا هوین دزانن حەسەنی چ گۆتێ؟

حەسەنی ب تنێ ئەڤ ئایەتە بۆ وی خواند: ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَـٰهُمْ سِنِينَ ۝٢٠٥ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ۝٢٠٦ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ ۝٢٠٧ ﴾ (الشعراء: ٢٠٥-٢٠٧) یەعنی: ئەرێ تە زانییە کو ئەگەر ئەم چەند سالەکێن درێژ وان

بهێلینه د خۆشییان دا و مرنا وان پاش بێخین، پاشی ئەو عەزابا ژڤان پێ هاتییەدان ب سەر وان دا بێت؟ خۆشیبرنا وان ب ژییێ درێژ و ژیارا باش چو مفایی ناگەهینتە وان.

کورێ مەیموونی دبێژت: گاڤا حسەنی ئەڤ ئایەتە خواندی، من دیت بابێ من کەفتە عەردی دا بێژی دلێ وی بۆری.. و پشتی بێنەکێ دەمێ ئەو ڕابوویەڤە ئەم ژ مالا حسەنی دەرکەفتین ب ڕێڤە من گۆتە بابێ خۆ: ئەڤەیە حسەن؟ وی گۆت: ئەرێ، من گۆت: من د دلێ خۆ دا هزر دکر ئەو گەلەک ژ ڤێ مەزنترە! گۆت: بابێ من دەستێ خۆ ل سنگێ من دا و گۆت: کورێ من ئەوی ئایەتەک بۆ مە خواند، ئەگەر تو ب دلێ خۆ تێگەهشتبای گەلەک برینان تو دا د دلێ خۆ دا بینی!

ئەڤەیە جودایی د ناڤبەرا مە و ڤان ڕەنگە مرۆڤان دا، ئەم ب گوهی قورئانێ وەردگرین، و ئەو ب دلی وەردگرن، کورێ مەیموونی -ئەوێ ئەڤ سەرهاتییە بۆ مە ڤەگێڕای- وی ژی وەکی مە ئەڤ جیهانە ژ دویر ڤە ددیت لەو ژێ حێبەتی مابوو.. ئەڤە چیە؟ پیرەمێرەکێ ئەختیار، یێ بەرپێن خۆ باش نابینت، ڤێ ڕێکێ هەمییێ ددەتە بەر خۆ و دئێت؛ دا حسەن دلێ وی نەرم بکەت؟! و حسەن ژ ڤان هەر سێ ئایەتان زێدەتر تشتەکی بۆ وی نابێژت! ئەڤ ئایەتێن ئەو هەر ڕۆژ دخوینت، و تو دێ بێژی حسەنی وەعزێ دنیایێ هەمییێ لێ کر، لەو د گاڤێ دا ئەو دلگرتی بوو و کەفت! ئەڤە چ مرۆڤن!

هەر کەسەکێ ڤیانا دنیایێ دلێ وی پێچای، و پەردەیێ غەفلەتێ ب سەر دا بەردای یێ حەقە ژ ڤان ڕەنگە مرۆڤان عەجێبگرتی ببت؛ چونکی ئەو د ئەزمانێ وان ناگەهت، و ب دلێ وان ئحساسێ ناکەت.. مەیموون -وەکی حسەنی- ژ مرۆڤێن قورئانێ بوو، حسەنی ئەڤە دزانی، لەو ب وی ڕەنگی بەرسڤ دایێ یێ هەوە دیتی، و ئەو کەسێ وەکی وان مرۆڤێ قورئانێ نەبت یا غەریب نینە وان غەریب ببینت!

## زەلامێ قورئانێ:

مەیموون د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((هەچییێ ب دویڤ قورئانێ بکەڤت قورئان دێ سەرکێشییا وی کەت حەتا وی دبەتە بەحەشتێ، و هەچییێ قورئانێ بهێلت قورئان دێ ب دویڤ وی کەڤت حەتا وی دهاڤێتە د ئاگری دا)).

هزر نەکەن دویکەفتنا قورئانێ ئەوا مەیموون بەحس ژێ دکەت ئەوە مرۆڤ ب ئەزمانی ب تنێ قورئانێ بخوینت، و ب چاڤێ پیرۆزییێ بەرێ خۆ بدەتێ، و گاڤا ل ژیانا خۆ زڤڕی بێژت: ئەز قەبویل ناکەم قورئان ڕێبەرێ من بت! گەلەک کەس ییێن هەین قورئانێ دخوینن و قورئان لەعنەتێ ل وان دکەت.

مرۆڤاینییا مەیموونی بۆ قورئانێ ئێکا هند ژ وی چێکربوو ئەو هەردەم حسێبەکا دژوار د گەل خۆ بکەت.. ڕۆژا عومەری ئەو هلبژارتی دا ببتە والی ل جزیرێ مەیموونی هیڤی ژێ کرن ئەو وی ژ ڤی کاری عەفی کەت، و گۆتێ: ئەڤە بارەکێ گرانە تو ل ملێن من دکەی! عومەری گۆتێ: ((هەرە ببە والی و حوکمی د ناڤبەرا خەلکی دا بکە، و ئەگەر کیتابەکا من گەهشتە تە و نەحەقییەک تێدا بت وێ ل عەردی بدە، و ئەگەر تشتەک ل بەر تە ئاسێ بوو بهنێرە نک من، و مرۆڤان ئەگەر چی گاڤا کارەکێ ب زەحمەت بۆ وان کەفتە ڕێکا وان وان ئەو نەکر، نە دنیا ب ڕێڤە دچت نە دین)).

گاڤا وی ئەڤ گۆتنە ژ عومەری گوهـ لێ بووی، ئەو نەچاربوو فەرمانا وی ب جهـ بینت، ئەگەر چ بۆ وی یا نەخۆش ژی بوو، و خوزییا وی حەتا مری ژی ئەو بوو کو وی ئەڤ مەنصبە وەرنەگرتبا، چونکی وی دزانی مەزنییا دنیایێ شەرمزارییا ئاخرەتێیە، و مەیموون ژ وان کەسان نەبوو ییێن بەر ل مال و مەنصبان، یان مەزنی و دەولەمەندییێ، د گۆتنەکا خۆ دا ئەو دبێژت: ئەگەر ژ روهایێ حەتا حوڕانێ ب پێنج دەرهەمان بدەنە من، من نەڤێت.

هندی هند ئەو ژ شەرمزارییا مەزنییێ دڕەڤی وی شیرەت ل خەلکی ژی دکر ئەو ژێ بڕەڤن، نە بەس ژ مەزنییێ بڕەڤن بەلکی ژ مەزنان ژی، مەیموون

دبێژت: ((سێ فتنه یێن هەین هشیار بی پێ موبتەلا نەبی: نەچه نک چو سولطانان ئەگەر خۆ تو بێژی ئەز دێ فەرمانا ب باشییێ لێ کەم، و نەمینه ب تنێ د گەل چو ژنکان ئەگەر خۆ بێژی دێ قورئانێ نیشادەم، و گوهێ خۆ نەدە گۆتنا چو بیدعەچییان، چونکی تو نزانی کانێ دێ چ ژێ ب دلێ تە ڤە مینت)).

و ژ گۆتنێن وی یێن تێر عبرەت: ((ئەمیری نەنیاسە، و ئەوی ژی یێ ئەمیری دنیاست)).

و دبێژت: ((هەچییێ ب دزی ڤە گونەهەک کربت بلا ب دزی ڤە تۆبە بکەت، و هەچییێ ئاشکەرا گونەهەک کربت بلا ئاشکەرا تۆبە بکەت، چونکی خودێ گونەهان ژێ دبەت و شەرما خەلکی نابەت، و خەلک شەرما ئێک و دو دبەن و گونەهان ژێ نابەن)).

و ژ وان حەدیسان یێن وی ڤەگوهاستین: مەیموون دبێژت: عەبدللاهێ کورێ عومەری دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((قل ما يوجد في آخر الزمان درهم من حلال أو أخ يوثق به)) یەعنی: ل دووماهییا زەمانی گەلەک یا کێمە دەرهەمەکێ حەلال، یان برایەکێ باوەرێ هەبت.. وەکی (ئەبوو نوعەیم) ژێ ڤەدگوهێزت.

# ڕەجائێ کوڕێ حەیوەیی
# ئەوێ خودێ ب وی باران و سەرکەفتن ددا

هێشتا ئەم ژ زەمانێ عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی دویر نەکەفتین، ئەم دێ بەحسێ مرۆڤەکێ دی ژ مرۆڤێن خودێ کەین یێن کو ب ناسینییا عومەری دلشاد بووی، و عومەر ژی ب هەڤالینییا وی بەختەوەر بووی.. ئەو مرۆڤەکێ وەسا بوو -وەکی مەسلەمەیێ کوڕێ عەبدلمەلکی گۆتی- خودێ ب بەرەکەتا وی باران ددا، و موسلمان ب سەر نەیارێن وان دئێخستن!

بەری نوکە مە گۆت: ئەگەر خودێ خێرا مللەتەکی ڤیا، ئەو دێ مەزنییا وان ئێخستە دەستێ مرۆڤەکی ژ مرۆڤێن خۆ.. ژ خۆ ئەگەر وی ئەڤ نعمەتە د گەل وان نەکر، دبت ئەو نعمەتەکا دی د گەل وان بکەت گەلەک یا کێمتر نینە ژ ڤێ نعمەتا ژێگۆتی، ئەو ژی ئەوە ئەو مرۆڤەک ژ مرۆڤێن خۆ بکەتە شێوەرمەند و هەڤالێ نێزیکێ مەزنێ وان؛ دا ئەو بەرێ وی بدەتە باشییا دین و دنیایێ.

مرۆڤێ خودێ یێ کو ئەم دێ ڤێ جارێ بەحس ژێ کەین ئێک ژ مەزنترین زانایێن تابعییان بوو، ل سەر دەستێ کۆمەکا صەحابییان هاتبوو پەروەردەکرن، و علم بۆ خۆ ژ وان وەرگرتبوو، و ڕۆژەک ب سەر دا هاتبوو ئیمامەتییا د دینی دا کەفتبوو دەستێ وی، لەو دهاتە هژمارتن مەزنترین زانایێ تابعییان ل شامێ هەمییێ.. موصیبەتەک خودێ دابوویێ ئەو شیابوو ب دورستی و تمامی خۆ ل بەر بگرت حەتا ب سلامەتی و سەرفەرازی ژێ دەرباسبووی، موصەیبەت بوو

بۆ وی، بەلێ د عەینی دەمی دا ئەو نعمەتەکا مەزن بوو بۆ خەلکێ سەردەمێ وی، و ئەڤە یا غەریب نینە؛ چونکی زەمانی گەلەک جاران نیشا مە دایە کو موصیبەتا ئێکی دبتە فایدە بۆ ئێکێ دی، و موصیبەتا ڤی نە ب تنێ فایدە بوو بۆ ئێکێ دی، بەلکی ئەو فایدە بوو بۆ ئوممەتەکێ هەمییێ!

ئەز باوەر دکەم نوکە هوین هەمی پسیار دکەن: ئەرێ ئەڤ مرۆڤە کی بوو؟ و ئەو موصیبەتا هاتییە سەرێ وی و بۆ ئوممەتێ بوویە فایدە چ بوو؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژم: ئەڤ مرۆڤە (رەجائێ کورێ حەیوەیێ کندی) بوو، و موصیبەتا وی ئەو بوو ئەو ئێک ژ وان زانایێن تابعییان بوو یێن خودێ ب نێزیکی و هەڤالینییا چەند خەلیفەیان موبتەلاکری.. بەری نوکە مە گۆتبوو مرۆڤێن خودێ هندی ژێ دئێت خۆ ژ هەڤالینییا مەزنێن دنیایێ ددەنە پاش، و ب وان مەنصبان رازی نابن یێن ئەو پێشکێشی وان دکەن، بەلێ چونکی (ئبتلاء و جەرباندن) سوننەتەکە ژ سوننەتێ خودێ د عەردی دا، و مرۆڤێن خودێ پتر ژ هەمی کەسان دئێنە جەرباندن، هندەک جاران وەسا چێ دبت، ئەو ب کوتەکی و بەلکی هندەک جاران ب کەیف و هلبژارتنا خۆ ژی، بەر ب دەستەیا بلند ڤە دئێتە پالدان؛ دا بۆ وان ببنە شێوەرمەند و شیرەتکار، هنگی ئەو دکەڤنە د (خەطەرەکا) مەزن دا، و چونکی ژ بەر مرۆڤایینییا وان بۆ خودێ دنیا نەشێت وان هند ب نک خۆ ڤە بکێشت کو ئەو ئارمانجا خۆ یا سەرەکی ژ بیر بکەن، ئەو ب سەرفەرازی پێشڤە دچت، و چو جاران خۆ بۆ نەحەقییێ ناچەمینن، لەو (ئبتیلاء و موصیبەتا) وان بۆ خەلکی دبتە مفایەکێ مەزن.

کانێ وەرن دا پتر خۆ نێزیکی مەزنێ زانایان و موشیرێ مەزنان بکەین؛ دا بەرێ خۆ بدەینێ کانێ سەربۆرا وی د گەل گرێکا ئالۆز یا چاوا بوویە؟!

رەجاء کورێ حەیوەیێ کورێ جروەلێ کندی بوو، و هندەک دبێژن: باپیرێ وی ئێک ژ صەحابییێن پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، مرۆڤەکێ عەرەب بوو ژ ئویجاخا (کندییان)، و خەلکێ شامێ بوو، ل وی جهێ دبێژنێ: فلسطین،

ل دووماهييا زەمانێ ئيمام عوثمانى هاتبوو سەر دنيايێ، و علم و حەديس ژ هژمارەكا صەحابييان ريوايەت كربوون، وەكى: عەبدللاهێ كورێ عەمرى، و موعاذێ كورێ جەبەلى، و ئەبوو دەردائى، و عوبادەيێ كورێ صامتى، و موعاويەى، و گەلەكێن دى.

هێشتا ئەو نەبوويە دەهـ سالى حوكمێ ئومەمەتێ كەفتە دەستێ مالباتا ئومەوييان، و ب حوكمێ كو ئەو ل شامێ دژيا، ئەو يێ نێزيكبوو ژ سەرەكانييا حوكمدارييان خەليفەيێن ئومەوى، و پشتى ئەو بۆ وەرگرتنا علمى ل گەلەك جهـ و دەڤەران گەريای، و ئەو بوويە ئيمامەكێ ناڤدار، و فقهزانەكێ بەرچاڤ، وى قەستا باژێرێ ديمەشقێ كر، و ل وێرێ بنەجهـ و ئاكنجى بوو، حەتا دووماهييا ژيێ خۆ.

پشتى هەڤركى د ناڤبەرا عەبدللاهێ كورێ زوبەيرى و عەبدلمەلكێ كورێ مەروانى دا ب دووماهى هاتى، و عەبدلمەلك بوويە خەليفەيێ موسلمانان يێ ئێكانە، وى زانايێ مەزن رەجائێ كورێ حەيوەيى نێزيكى خۆ كر، و ئەو وەك وەزيرەك يان دورستتره بێژين: موشيرەک بۆ خۆ دانا، رەئيا وى د مەسەلەيێن دينى و دنيايێ ژى دا وەردگرت، و ب رەنگەكێ زێدە رێز لێ دگرت، و هەچييا خێرێ با رەجائى ئەو بۆ دگۆت.. و د مەسەلەيا خۆنێزيككرنا ژ خەليفەيان دا بۆچوونا رەجائى وەكى يا هندەک ئيمامێن دى يێن تابعييان نەبوو كو دڤێت ئەو ئێكجار خۆ ژ مير و خەليفەيان بدەنە پاش، و هەر ئێكى ئجتهاد و بۆچوونا خۆ هەيە.

د سەر ڤێ چەندێ را زانايێن تابعييان هەمى ل وێ باوەرێ بوو كو رەجاء زانايەكێ مەزن و تەقوادارەكێ بەركەفتى و كەسەكێ چاک و باوەرێ بوو، و قەت جارەكا ب تنێ ژى (تەنازول) ژ حەقييێ نەدكر سەر خاترا مەزنەكى، يان خەليفەيەكى، لەو نێزيكييا وى ژ خەليفەيێن ئومەوييان نوقطەيەكا رەشا ب تنێ ژى ل سەر ديرۆكا وى نەهێلايە، بەلكى بەرەڤاژى ڤێ چەندێ ئەو قەنجييێن وى

ب رێکا ڤێ هەڤالینییا خۆ بۆ خەلیفەیان گەهاندییە موسلمانان قەت نائێنە ژبیرکرن.

### مەزنترین قەنجییا وی:

مەزنترین قەنجییا وی پێشکێشی ئوممەتا ئیسلامێ کری دەورێ وی یێ بەرچاڤ بوو د بەربژێکرنا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی دا کو ببتە خەلیفە، و مەسەلە یا ب ڤی رەنگی بوو:

هەر چەندە رەجاء نە ژ وان مرۆڤان بوو یێن بەرێ وان ل دنیایێ و مەنصبان، بەلێ خودێ وەسا حەزکر دەمێ عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی بوویە خەلیفەیێ دەولەتا ئومەوییان، وی بەرێ خۆ دایێ هندەک زانایێن خودایی یێن بۆ وی ببنە هاریکار ل سەر کارێ ئاخرەتێ ل دۆر خۆ کۆمکرن، و هێژایی گۆتنێیە کو خەلیفەیین وی سەردەمی د گەل هەمی کێماسییێن وان هەین ژی، هێشتا ڤیانا خێرێ و ئاخرەتێ و خزمەتا دینێ خودێ د دلێن وان دا یا گەشبوو، و ئێک ژ وان زانایێن خودێناس یێن عەبدلمەلکی نێزیکی خۆ کرین: رەجائێ کورێ حەیوەیی بوو، پشتی عەبدلمەلکی وەغەرا دووماهییێ کری، وی کورێ خۆ وەلید دانا جهێ خۆ، و شیرەت کر کو پشتی وەلیدی کورێ وی یێ دی سولەیمان ببتە خەلیفە.. و وەسا چێبوو، ل سەر دەمێ وەلیدی و سولەیمانی وان ژی وەکی بابێ خۆ بهایەکێ زێدە ددا رەجائی و ئەو وەکی وەزیر و موستەشارەکی بۆ خۆ ددیت، عەلائێ کورێ روئبەیی ئاشکەرا دکەت کو دەمێ سولەیمانێ کورێ عەبدلمەلکی بوویە خەلیفە، وی -یەعنی: عەلائی- کارەک ب رەجائی هەبوو، گۆت: من پسیارا وی کر هندەکان گۆتە من: ئەو یێ ل نک سولەیمانی، ئەز مامە ل هیڤییێ گاڤا ئەو ژ دیوانا وی دەرکەفتی وی گۆتە من: ئەڤرۆ ئەمیرولموئمنینی ئەز کرمە قازی.. و ئەگەر گۆتبانە من: تە دڤێت ببیە قازی یان جەنازەیێ تە ببەینە ناڤ قەبران؟ ئەز دا چوونا د قەبری دا هلبژێرم! عەلائی گۆت: من گۆتێ: خەلک دبێژن: تە ئەڤ چەندە یا گۆتییێ. یەعنی: دەمێ وی

ڤیای کارەکی بێختە دەستێ تە، تە گۆتێ: ئەو تە بکەتە قازی. وی گۆت: خەلک ڕاست دبێژن، من بەرێ خۆ دا مەصلحەتا خەلکی نە یا وی.

ئەڤە ئەو تەرازی بوو یا ڤی مرۆڤێ خودێ مەسەلە پێ کێشای، دەمێ خەلیفەی ڤیای وی بکەتە تشتەک و مەنصبەکی بێختە دەستان، وی هزرێن خۆ کرن کانێ کیژ مەنصبێ ئەو وەرگرت خەلک دێ پتر فایدەی ژێ بینت، و وی گۆتە خۆ: ئەڤرۆ تشتێ خەلک ژ هەمییێ پتر هەوجە دبتێ، مەنصبێ قازییە؛ چونکی ئەوە حوکمی د ناڤبەرا خەلکی دا دکەت، و هەچییێ دیرۆکا ئیسلامێ بخوینت، ب تایبەتی د سەدسالێن پێشییێ، باش دزانت کو د دەولەتا ئیسلامێ دا قازی ژ خەلیفەیی مەزنتر بوو، و گۆتن و حوکمێ وی د سەر یێ خەلیفەیی ڕا بوو، ڕەجائی دیت یا باش بۆ خەلکی ئەوە ئەو ببتە قازی د گەل کو ئەڤ مەنصبە بارەکێ هندێ گران بوو ل بەر وی حەتا وی حەزدکر ئەو بمرت و جەنازەیێ وی ببنە قەبری نە کو ببتە قازی!

د گۆتنەکا دی دا ژ ڕەجائی دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: گاڤا ئەز ژ نک سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکی دەرکەفتیم، یەعنی: پشتی وی ئەو کرییە خەلیفە، من دیت زەلامەک ب نک من ڤە هات، نە بەری هنگی نە پشتی هنگی من ئەو زەلام نەدیتییە، وی دەستێ من گرت و گۆت: ((ئەی ڕەجاء! خودێ بۆ جەڕباندن، ئەڤە بۆ تە کرە بەلا و تو بۆ وی کرییە بەلا، ڤێجا تە ئێمانەت قەنجی و هاریکارییا مرۆڤێ لاواز، ئەی ڕەجاء! هەر کەسەکێ بهایێ خۆ ل نک سولطانەکی هەبت ڤێجا ئەو هەوجەییا وی مرۆڤێ لاواز بگەهینتێ یێ نەشێت هەوجەییا خۆ بگەهینتێ، دەمێ ئەو دچتە نک خودێ ئەو دێ چت پێیێن وی دموکم و شدیای)) پاشی ئەو زەلام چوو و غەوارە بوو.

ڕەجائی ب ڤێ شیرەتا وی کر، هندی ئەو یێ نێزیک ژ خەلیفەی ئەو ئەزمانێ خەلکی بوو ل نک وی، و گوهێ وی بوو د ناڤ خەلکی دا! هەر گازندەیەکا خەلکێ لاواز و هەژار هەبا وی ئەو دگەهاندە خەلیفەی، و خەلیفە

هان ددا کو وێ بکەت یا بۆ خەلکی باش، و ژ بەر ڕاستگۆیی و ئیخلاصا وی، خەلیفەی ب گۆتنا وی دکر، و ڕێ ل بەر وی ڤەدکر کو ئەو یا قەنج بۆ خەلکی بکەت؛ چونکی وی باش دزانی کو ئێکێ وەکی رەجائی تشتەکی ژ بلی رازیبوونا خودێ ناخوازت.

سولەیمانی ڤیانەکا زێدە بۆ رەجائی هەبوو، و ڕێز و بهایەکێ مەزن ددایێ، حەتا گەلەک جاران دەمێ ئەو دەردکەفتە سەفەرێ ژی وی ئەو د گەل خۆ دبر، جارەکێ ژ ڤان جاران ل سالا (٩٩) مشەختی دەمێ سولەیمانی ڤیای جیهادا رۆمێ بکەت، ئەو ب لەشکەرێ خۆ ڤە چوو گوندێ (دابق) ئەوێ دکەفتە نێزیکی حەلەبێ، و وی ژ وێرێ لەشکەرێ خۆ ب سەرۆکاتییا برایێ خۆ مەسلەمەیێ کوڕێ عەبدلمەلکی بۆ وەلاتێ رۆمێ هنارت، و کوڕێ خەلیفەی یێ مەزن داوود ژی د گەل ڤی لەشکەری بوو. خەلیفەی سویند خوار ئەو ژ دابقێ نەزڤڕتە دیمەشقێ حەتا ئێک ژ دویان چێ ببت: یان ئەو (قەسطەنطینییێ) پایتەختا رۆمێ یستینت، یان بمرت!

رەجاء د گۆتنەکا خۆ دا بەحسێ وی بۆ مە دکەت و دبێژت: ل سپێدەیا ئەینییێ خەلیفەی هندەک جلکێن نوی کرنە بەر خۆ و باش کارێ خۆ کر، گاڤا د قۆدیکێ دا بەرێ خۆ دایە خۆ و لاوینی و جحێلینییا خۆ، کەیفا وی گەلەک ب وی هات، پاشی دەرکەفتە مزگەفتێ خوتبە خواند، و نڤێژ ل بەر خەلکی کر، و هێشتا ئەو ژ مزگەفتێ دەرنەکەفتی، وی هەست ب گرانییا لەشێ خۆ کر، پشتی زڤڕییە مال گاڤ بۆ گاڤێ ئێش ل وی گرانبوو، و دەمێ ئەو یێ نساخ وی داخواز کر ئەز ژێ دویر نەکەڤم و هەر ل نک وی بم، ڕۆژەکێ دەمێ ئەز چوویمە نک من دیت ئەو یێ تشتەکی دنڤیست، من گۆتێ: ئەی ئەمیرولموئمنین، تو چ دنیڤسی؟ وی گۆت: ئەز دێ شیرەتا خۆ نڤیسم، و دێ کوڕێ خۆ ئەییووبی دانمە جهێ خۆ. من گۆتێ: ئەی ئەمیرولموئمنین! تشتێ خەلیفەی د قەبرێ وی دا دپارێزت ئەوە ئەو دەفتەرا خۆ ل نک خودایێ خۆ سپی بکەت کو مرۆڤەکێ

چاک پشتی خۆ بکەتە مەزنێ خەلکی، و کوڕێ تە ئەییووب یێ جحێلە، هێشتا باشی و خرابییا وی بۆ تە ئاشکەرا نەبوویە.. گۆت: گاڤا من وە گۆتییێ، وی کاغەز دڕاند و گۆت: ئەز دێ (ئستیخارێ) کەم.

پاشی پشتی دو سێ ڕۆژەکان وی هنارتە ب دویڤ من ڕا و گۆتە من: بابێ مقدامی! ڕەئیا تە د دەر حەقا کوڕێ من داوودی دا چییە؟ من گۆتێ: نوکە ئەو د گەل لەشکەرێ موسلمانان یێ چوویە شەڕێ ڕۆمێ، و ئەم نزانین کانێ ئەو یێ ساخە یان یێ مرییە؟

وی گۆت: پا تو چ دبێژی رەجاء، ئەز چ بکەم؟

من گۆتێ: رەئی رەئیا تەیە ئەی ئەمیرولمؤمنین.. و من خۆ گرت من گۆت: بەلکی ئەو پسیارا هندەک مرۆڤێن خۆ یێن دی ژ من بکەت، من هند دیت وی گۆت: تو چ دبێژی بۆ عەمەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی؟ و عومەر پسمامێ وی و زاڤایێ وی بوو، خویشکا وی فاطما ل نک عومەری بوو.

رەجاء دبێژت: من گۆتێ: یا ئەز دزانم ئەو مرۆڤەکێ کامل و قەنج و عەقلدار و دیندارە.. وی گۆت: تو ڕاس دبێژی، ئەو یێ وەسایە، بەلێ ئەگەر ئەز وی بدانمە جهێ خۆ کوڕێن عەبدلمەلکی دێ کەنە فتنە و ناهێلن ئەو ببتە خەلیفە، من گۆتێ: ئێک ژ وان د گەل بکە شریک، بلا پشتی عومەری ئەو ببتە خەلیفە.. خەلیفەی گۆت: تو ڕاست دبێژی، ب ڤێ چەندێ ئەو دێ رازی بن.

خەلیفەی وەصیەتا خۆ نڤیسی، کو پشتی من عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی دێ بتە خەلیفە، و پشتی وی یەزیدێ کوڕێ عەبدلمەلکی، و ختما خۆ لێ دا و کاغەز شەماکر، و هنارتە ب دویڤ مەزنێ شورطان ڕا و داخواز کر زەلامێن مالا وی هەمی کۆم ببن، و گۆتە وان: وەصیەتا خۆ من د ڤێ کاغەزێ دا یا نڤیسی، و ئەو دێ ل نک رەجائێ کوڕێ حەیوەی بت، و دڤێت هوین هەمی بەیعێ بدەنە وی یێ من ناڤێ وی د کاغەزا خۆ دا نڤیسی. و من ئەو کاغەز بر و ژ بلی من و خەلیفەی ئێکی نەدزانی کانێ چ د وەصییەتا خەلیفەی دا هەیە.

ب ڤی ڕەنگی ڤی مرۆڤێ خودێ کو ڕەجائێ کوڕێ حەیوەیی بوو مەزنترین قەنجی پێشکێشی سولەیمانی کر دەمێ ئەو پالدای دا مرۆڤەک ژ مرۆڤێن خودێ ل جهێ خۆ بکەتە خەلیفە، هەر وەسا وی مەزنترین قەنجی ل ئوممەتا ئیسلامێ ژی کر دەمێ ئەو بوویە سەبەب کو زێندیکەرێ دادییێ عومەرێ دویێ ببتە خەلیفە.

پشتی عومەر ژی بوویە خەلیفە، ڕەجاء ئێک ژ وان کسان بوو یێن عومەری ئەو زێدە نێزیکی خۆ کرین، و ڕەئیا وی د هەمی مسەلەیان دا وەردگرت، و دگۆتێ: ئەڤە ئەو بەلایە یا تە ئینایە سەرێ من، لەو دڤێت تو ژی د گەل من ملێ خۆ بدەیە بەر!

هەڤالینییا ڕەجائی د گەل عەبدلمەلکی و کوڕێن وی و برازایێ وی عومەری، خێرەکا مەزن بۆ ئوممەتێ تێدا بوو، و ب ڕێکا وی خودێ گەلەک قەنجی ب وان دانەکرن..

پشتی عومەری ژی وەغەرا خۆ یا دوومـاهییێ کری و یەزیدێ کوڕێ عەبدلمەلکی بوویە خەلیفە، ڕەجاء ژ وان دویرکەفت؛ دا خۆ بەرهەڤ بکەت بۆ دیدارا خودایێ خۆ.

ژ بلی وێ وەزیرییا ڤی زانایێ مەزن بۆ چەند خەلیفەیەکان کری، وی علمەکێ مەزن ژی د ناڤ ئوممەتێ دا بەلاڤکر، و جیلەکێ مرۆڤان پشتی خۆ پەروەردە کر، و ئەو ڕێبازا وی د ڤێ دەلیڤەیێ دا دایە بەر خۆ ئەڤە بوو: مرۆڤ کەسایەتییا خۆ ل سەر باوەری و ئیسلامێ ئاڤاکەت، و ب تەقوایێ و زانینێ ب خەمل بێخت، و ب عەمەلی و نەرم و حەلیمییێ تمام بکەت.

هەر دەلیڤەیەکا هەبا وی ئستغلال دکر دا خەلکی ل سەر تەقوایێ و ئیخلاصێ پەروەردە بکەت، جارەکێ پشتی نڤێژ سپێدێ وی دیت باوەشکێن زەلامەکی یێ دئێن، وی گۆتێ: هشیار بە، بلا خەلک هزر نەکەن، شڤێدی تو نەنڤستی!

یەعنی: هندی ژ تە بێت، باوەشکان نەئینە خۆ، نە کو خەلک بێژن: دیارە ئەڤە شڤێدی نەنڤستییە و عیبادەتێ کری، ڤێجا ئەڤە بۆ تە ببتە ئەگەر مەدحە و ریمەتی، و کارێ تە پویچ ببت!

هندە ئەو دحەریص بوون کو کارێ خۆ ڤەشێرن، و ئەڤرۆ ئەم دبینین هندەک ب هەمی دەنگێ د ناڤ خەلکی دا دبێژن: شڤێدی د نڤێژێن شەڤێ دا من فلان دوعا یا کری.. دا خەلکی بزانن کو ئەو نڤێژێن شەڤێ دکەن!

دوومـاهی شیرەتا ڤی مرۆڤێ خودێ یا من دڤێت بۆ هەوە ڤەگێرم، شیرەتەکە وی ل دو هەڤالێن خۆ کربوو (عەدییێ کورێ عەدی) و (مونذرێ کورێ مەعەنی) وی گۆتە وان: ((بەرێ خۆ بدەنێ ئەو کیژ کارە یێ هەوە دڤێت پێ بچنە نک خودێ، ڤی گاڤێ وی بکەن، و ئەو چ کارە یێ هەوە نەڤێت هوین پێ بچنە نک خودێ ڤێ گاڤێ خۆ ژێ بدەنە پاش)).

مەعنا ڤێ شیرەتێ چییە؟

مەعنا وێ ئەوە دڤێت هەمی گاڤان هوین ل وێ باوەرێ بن کو ئەڤها نوکە هوین دێ مرن و چنە نک خودێ، باشە ئەگەر ئەو کارێ هوین نوکە دکەن نە ئەو بت یێ هەوە دڤێت هوین پێ بچنە نک خودێ، و مرن هات، حالێ هەوە دێ چ بت؟

رەجائێ کورێ حەیوەی ل سالا ١١٢ مشەختی چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

# عەطائێ كوڕێ ئەبوو ڕەباحی
## علم عەبدی ب سەر مەلكی دئێخت

دەم: دووماهییا سالا (٩٧) مشەختییە.

جهـ: باژێڕێ مەكەها پیرۆزە.

وەفدێن حەجییان ژ هەمی لایان ڤە هاتبوون قەستا مالا خودێ كربوو دا سەر و بەرێ حەجێ -كو ئێك ژ ستوینێن ئیسلامێیە- ب جهـ بینن، هندەك دسویار و هندەك دپەیابوون، ژن و مێر، جحێل و پیر، یێن ڕەش و یێن سپی، ژ هەمی ڕەنگ و زمان و مللەتان بوون، ب ئێك جلك و ب ئێك ئەزمان ملكەچییا خۆ بۆ خودایێ كەعبێ بەرچاڤ دكر، و ل ژێر سیەرا ئیسلامێ دیتن و بەرێخۆدان و هیڤییێن هەمییان ئێك بوون..

تشتێ حەجا ئەڤ سالە ژ یا سالێن دی جودا دكر ئەو بوو د ناڤ خەلكی دا بووبوو دەنگ كو خەلیفەیێ موسلمانان مەزنترین مەلك ل سەر ڕوییێ عەردی (سولەیمانێ كوڕێ عەبدلمەلكێ ئومەوی) ب وەزیر و حاشیە ڤە یێ هاتییە حەجێ، بەلێ ئەگەر تو بیست خەبەرەكا ل وێ مەیدانا بەرفرەهـ ڕاوەستابای ئەوا ل دۆر كەعبێ، و تە بەرێ خۆ دابایێ دەمێ خەلیفە و (وەلی عەهدێ) وی د بەر تە ڕا دبۆرین، تە ئەو نەدنیاسین؛ چونكی خەلیفە ئەوێ سێ (قاررەت) و پتر ژ بیست و پێنج دەولەتێن مە یێن نوكە خۆ بۆ دچەماند، یێ سەركۆل و پێخواس بوو، وەكی كەسەكێ ژ هەمییان فەقیرتر كراسەكێ سپی یێ بێ بەریك ل بەر بوو، و وی ژی وەكی هەر ئێكی ژ ڕەعیەتا خۆ ب دلەكێ شكەستی ڤە گازی دكر: (لبیك اللهم لبیك).

پشتی خەلیفە ژ طەوافێ خلاصبووی، ل مرۆڤەکی زڤڕی و گۆتێ: کانێ هەڤالێ هەوە؟ وی دەستێ خۆ ب لایێ ڕۆژئاڤایا کەعبێ ڤە درێژکر و گۆت: یێ ل وێرا هە نڤێژێ دکەت.. خەلیفە ب وی لایی ڤە چوو، و دەمێ هندەکان ڤیای خەلکی بدەنە پاش دا ڕێکا خەلیفەیی ڤەببت، خەلیفەی گۆتێ: وە نەکەن! ل ڤێرێ مەلک و فەقیر وەکی ئێک لێ دئێن!

خەلیفەی ڕێکا خۆ د ناڤ قەرەبالغێ ڕا ڤەکر و ب نک وی ڤە چوو، هژمارەکا مەزن ژ خەلکی دڕوینشتی بوون، ل هیڤییێ بوون کانێ کەنگی ئەو دێ نڤێژا خۆ خلاص کەت و دەست ب دەرسێ کەت، خەلیفەی جهەکێ ڤالا ل بنێ دیوانێ دیت، ئەو و هەردو کوڕێن خۆ یێن جحێل لێ ڕوینشتن، ئەو ژی مانە ل هیڤییێ..

پشتی وی نڤێژا خۆ خلاصکری، ل سەر ملێ خۆ زڤڕی و بەرێ خۆ دا خەلکی، ناڤێ خودێ ئینا و دەست ب دەرسێ کر، و گاڤا ژ دەرسێ خلاصبووی، وی گۆت: هەچییێ ژ هەوە پسیارەک هەبت بلا بێژت، خەلکی دەست ب پسیاران کر، خەلیفەی ژی هندەک پسیار ل دۆر کرنا حەجێ ژێ کرن و وی بەرسڤا خەلیفی دا، بێی جوداهییەکێ د ناڤبەرا خەلیفەی و خەلکێ دی دا بکەت.. هەردو کوڕێن خەلیفەی عەجێبگرتی بوون: ئەرێ ئەڤ پیرەمێرێ حەبەشی یێ ڕەش، یێ سەر خەلەک و ڤژاڤژ، و دفن قوپ، و بەژن کورت، تو دێ بێژی قەلەڕەشکە، دێ کی بت بابێ وان (سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکێ کوڕێ مەروانێ ئومەوی) خەلیفێ کوڕێ خەلیفێ کوڕێ خەلیفەی، هندە خۆ بۆ دشکێنت و وەکی بچویکەکی ل بەر دەستان دڕوینت، و ب ئەدەب پسیاران ژێ دکەت، و ئەو وەسا بەرسڤێن وی ددەت هەر وەکی ئەو وی نانیاست و نزانت بهایێ وی چەندە؟!

بەلێ وان ئەدەب کر پسیارا ڤی مرۆڤی ژ بابێ خۆ بکەن، نە کو هندەک ب کێماسی بەرێ خۆ بدەنە وان کو ئەو ڤی مرۆڤی نانیاسن یێ ب عەلامەتان ڤە

کەسەکێ ناڤدارە، لەو وان خۆ بێ دەنگ کر.. پشتی خەلیفە ژ پسیارێن خۆ خلاصبووی، رابوو دا قەستا (صەفا و مەروایێ) بکەت بۆ سەعیا د ناڤبەرێ دا، بەری ئەو بگەهنە (صەفایێ) وان گوهـ ل کەسەکی بوو گازی دکر: گەلی موسلمانان! ب فەرمانا خەلیفەی نابت ژ بلی عەطائێ کورێ ئەبوو رەباحی کەسەک ل ڤی جهی فەتوایەکێ بدەت.. ئینا کورەکێ خەلیفەی ئەڤ چەندە بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت و گۆتە بابێ خۆ: ئەڤە چییە؟ تو فەرمانێ ددەی ژ بلی عەطائی کەس فەتوایێ نەدەت، و تو ب خۆ دچی داخوازا فەتوایێ ژ ڤی زەلامی دکەی یێ چو پویتە ب تە نەکری؟

خەلیفە ل کورێ خۆ زڤڕی و گۆتێ: کورێ من! ئەوێ تە دیتی من پسیار ژێ دکرن، ئەوە عەطاء خودانێ فەتوایێ، میراتگرێ علمێ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی.. پاشی وی گۆتن ئاراستەی هەردو کورێن خۆ کر و گۆتە وان: کورێن من! خۆ فێری علمی بکەن، ب علمی مرۆڤێ نزم بلند دبت، و علم عەبدان ب سەر ملکان دئێخت!!

## عەطاء کی بوو؟

بەلێ.. (عەطاء) ئەوێ خەلیفێ ئومەوی وەکی بچویکەکی ل بەر دەستان دڕوینشت، عەبدەکێ حەبەشی یێ ڕەش بوو، دەیک و بابێن وی ژی هەردو عەبد بوون، بابێ وی موسلمان بووبوو، و هاتبوو ل مەکەهێ ئاکنجی بووبوو، و عەطاء ب خۆ ل سەر دەمێ خیلافەتا عوثمانێ کورێ عەففانی هاتبوو سەر دنیایێ.

عەطائی زانین ژ هژمارەکا مەزن یا صەحابییان وەرگرتبوو وەکی: عائیشایێ و ئوم سەلەمەیێ و ئەبوو هورەیرەی و عەبدللاهێ کورێ عومەری و عەبدللاهێ کورێ عەبباسی، و ئەو ئێک ژ پشتەڤانێن عەبدللاهێ کورێ زوبەیری بوو، و ژێ دئێتە ڤەگوهاستن دبێژت: ئەز گەهشتبوومە دوسەد صەحابییان.. و عەطاء وەکی -مە گۆتی- مرۆڤەکێ ڕەش و سەقەت بوو، و دەستەکێ وی ژی

د گەل عەبدللاهێ کورێ زوبەیری بەطال بووبوو، و دووماهییا عەمرێ خۆ ئەو کۆرە بووبوو، فەتوا ل مەکەهێ یا وی بوو، زانایێ مەزن ئەبوو حەنیفە دبێژت: ((کەسەکێ چێتر ژ عەطائی من نەدیتییە)).

عەطاء کەسەکێ بێ مال و حال بوو، کەعبە پتر ژ بیست سالان مالا وی بوو، لێ ڕادبوو و دڕوینشت، و هەڤالەکێ وی دبێژت: چو جاران من نەدیت جلکەکێ وەسا د بەر وی بت پێنج دەرهەمان بینت! د گەل هندێ ژی ئەگەر جارەکێ چووبا دیوانا خەلیفەی، خەلیفە ژ جهێ خۆ ڕادبوو و ئەو ددانا جهێ خۆ، و خەلیفە د بن وی دا دڕوینشت.

ل رەمەزانا سالا (١١٥) مشەختی ل بازێڕێ مەکەهێ عەطاء چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ، پشتی ژییێ بوویە نێزیکی (٨٨) سالان یان پتر.

### علمێ عەطائی:

عەطاء د علمی دا گەهشتبوو دەرەجەیەکا وەسا حەتا دبێژن: جارەکێ عەبدللاهێ کورێ عومەری هاتە مەکەهێ دا عومرێ بکەت، خەلکێ مەکەهێ لێ کۆمبوون و پسیار بۆ خۆ ژێ کرن، ئینا عەبدللاهی گۆتە وان: ئەزێ عەجێبگرتیمە ژ هەوە گەلی خەلکێ مەکەهێ.. هوین پسیارێن خۆ بۆ من کۆم دکەن و عەطاء د ناڤ هەوە دا؟!

عەطاء نەگەهشتبوو ڤێ دەرەجێ حەتا وی دو تشت ل نک خۆ پەیداکرین:

یێ ئێکێ: وی نەفسا خۆ بندەستی خۆ کربوو، و رێ نەددایێ چی تشتێ بڤێت ئەو بکەت، ئەگەر فایدێ دینێ وی تێدا نەبت.

یێ دوییێ: ئەوی وەختێ خۆ ژی بندەستی خۆ کربوو، نەدهێلا گاڤەکا وی ژ قەستا بچت.

جارەکێ وی گۆتە شاگردەیەکێ خۆ: برازا! یێن بەری مە حەز ژ ئاخفتنا زێدە نەدکر، وی گۆت: ئاخفتنا زێدە ل نک وان چ بوو؟ عەطائی گۆت: هەر گۆتنەکا

هەبا ژ بلی کیتابا خودێ و حەدیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و فەرمانا ب باشییێ، و نەهییا ژ خرابییێ، و ئەو علمێ مرۆڤی نێزیکی خودێ بکەت، یان پێتڤییەکا ژیانا مرۆڤی، ژ بلی ڤان هەر گۆتنەکا دی یا هەبا ل نک وان ئاخفتنا زێدە بوو.. پاشی گۆت: ئەرێ ما شەرم نینە بۆ ئێک ژ مە دەمێ سجلا وی یا وی ل رۆژێ تژی کری بۆ وی ڤەدکەن، و ئەو بەرێ خۆ ددەتێ تشتەک نە ژ کارێ دینێ وی نە یێ دنیایا وی تێدا نینە؟!

مرۆڤی ئەگەر ئنیەتا وی یا دورست بت، و علمێ وی بۆ خودێ بت، خەلک هەمی نە ب تنێ طەلەبێن علمی مفایی ژ علمێ وی وەردگرن، و قەنجی و بەرەکەتا وی ژی دگەهتە یێن دویر و یێن نێزیک، و عەطاء ئێک ژ ڤان توخمە زانایان بوو.

ئیمامێ مەزن (ئەبوو حەنیفە) دبێژت: دەمێ ئەز چوویمە مەکەهێ بۆ کرنا حەجێ د پێنج تشتان دا ئەز خەلەت بووم، حەلاقەکی ئەو نیشا من دان، پشتی ئەز خلاصبوویم و من ڤیای سەرێ خۆ بتراشم دا ژ ئیحرامان دەرکەڤم، ئەز هاتمە نک حەلاقەکی و من گۆتێ: ب چەندێ دێ سەرێ من تراشی؟ وی گۆتە من: خودێ تە ب هیدایەت بینت! موعامەلە د (مەناسکان) دا چێ نابت، روینە و چەند ژ تە هات هندێ بدە من.. ئینا من شەرم ژ خۆ کر و ئەز روینشتم، و من بەرێ خۆ نەدا قیبلێ، حەلاقی ئیشارەت دا من کو بەرێ خۆ بدەمە قیبلێ، هێشتا من پتر شەرم ژ خۆ کر، و گاڤا وی ڤیای دەست ب تراشینێ بکەت، من لایێ چەپێ ژ سەرێ خۆ ب نک ڤە لێدا، وی گۆتە من: ژ لایێ راستێ دێ دەست پێ کەین، و وی دەست ب تراشینێ کر، و ئەز ژ شەرمێن خۆ و ژ عەجێبییێن وی دا مام کەفتمە هزران، وی گۆتە من: بۆچی تو یێ بێ دەنگی؟ تەکبیراتان بدە.. و پشتی ئەز خلاصبوویم و من ڤیای بچم، وی گۆتە من: دێ کیڤە چی؟ من گۆتێ: دێ زڤرمە جهێ خۆ، وی گۆت: دو رکاعەتان بکە پاشی هەرە. ئینا من گۆتە خۆ: ئەڤە نە کارێ حەلاقانە، ڤێ چەندێ علمەکێ زێدە پێ

دڤێت، لەو من پسیار ژێ کر: ئەڤ تشتێن تە نیشا من داین، تە ژ کیڤە زانینە؟ وی گۆت: ئەڤ تشتە من یێن بۆ خۆ ژ عەطائی وەرگرتین.

### د ناڤبەرا عەطائی و خەلیفەیان دا:

د گەل کو مرادا خەلیفە و والییان ئەو بوو عەطاء هەڤالینییا وان بکەت ژی، بەلێ عەطاء یێ دویر بوو ژ دیوانێن وان، بەلێ هەر جارەکا مەصلحەتەکا مللەتی کەفتبا بەرۆکا وی، و ڤیابا ئەو چووبا کۆچکا خەلیفەی وی خۆ ژ ڤێ چەندێ نەددا پاش.. و ئەگەر بەری نوکە سەرهاتییەکا وی د گەل (سولەیمانێ کورێ عەبدلمەلکێ ئومەوی) مە ڤەگوهاست بت، سەرهاتییەکا وی یا دی د گەل برایێ وی (هشامی) ژی هەبوو.

عوثمانێ خوراسانی دبێژت: جارەکێ ئەز و بابێ چووینە دیمەشقێ دا قەستا هشامێ کورێ عەبدلمەلکی بکەین، دەمێ ئەم نێزیکی دیمەشقێ بووین، مە دیت پرەمێرەکێ رەش ل سەر کەرەکی یێ سویار بوو، هندەک جلکێن کەڤن و زڤر د بەر وی بوون، من پێ کرە کەنی و گۆتە بابێ خۆ: ئەڤە کییە؟ وی گۆتە من: هش! ئەڤە سەییدێ فقهزانێن حیجازێیە، عەطائێ کورێ ئەبوو رەباحی..

پاشی بابێ من پەیابوو، و ب نک وی ڤە چوو، و وان خۆ د ئێک و دو وەرکر، و پسیارا حالێ ئێک و دو کر، پاشی ئەم ب رێ کەفتین، و گاڤا ئەم گەهشتینە بەر دەرێ قەسرا خەلیفەی، و جەواب گەهشتیە خەلیفەی کو عەطاء یێ ل بەر دەری، هەر زوی خەلیفەی گۆت: بلا بێنە ژۆر، و ئەم ژی ب خێرا وی زوی چووینە ژۆر، و گاڤا خەلیفەی ئەو دیتی ب نک ڤە هات گۆتێ: مەرحەبا مەرحەبا.. وەرە ڤێرێ وەرە ڤێرێ، و هنگی راوەستییا حەتا وی ئەو دانایە ب رەخ خۆ ڤە، و ئەو هەمی مرۆڤێن مەزن و ماقویل یێن کو ل دیوانێ دروینشتی بێ دەنگ بوون، و بەرێ وان ما ل خەلیفەی و ڤی مێڤانێ وی یێ غەریب! پشتی دەمەکی خەلیفەی گۆتێ: بابێ موحەممەدی، بێژە کانێ داخوازا تە چیە؟

وی گۆتی: ئەی ئەمیرلموئمنین، تە ئێمانەت خەلکێ مەکەهێ و مەدینێ، ئەو مرۆڤێن خودێنە و جیرانێن پێغەمبەرینە، چاڤێ خۆ بدێ..

خەلیفەی گۆتێ: باشە، چ ددی؟

وی گۆت: خەلکێ حیجازێ و نەجدێ ژی سەرکێشێن ئیسلامێنە، زەکاتا وان هەر بدە مرۆڤێن هەوجە ژ وان..

گۆتێ: بەلێ، چ ددی.

عەطائی گۆت: خەلکێ وان باژێرێن دکەڤنە سەر توخویبان، ئەون بەرانبەری دوژمنی ڕادوەستن، و شەڕێ نەیاران دکەن، وان موعویز نەکە، چونکی ئەگەر ئەو هاتنە ژ بیرکرن توخویب دێ ئێنە بەردان.

خەلیفەی گۆتێ: بەلێ، چ ددەی بابێ موحەممەدی.

وی گۆت: (أهل الذمة) ژ جوهی و فەلان، چاڤێ خۆ بدەنێ و بارەکێ زێدەی طاقەتا وان لێ نەکەن..

خەلیفەی گۆتە کاتبێ خۆ: ئەڤا بابێ موحەممەدی گۆتی هەمییێ بنڤیسە و بکە فەرمان..

پاشی گۆت: تشتەکێ دی هەیە؟

عەطائی گۆتێ: ئەی ئەمیرلموئمین، تەقوایا خودێ د نەفسا خۆ دا بکە، و باش بزانە دەمێ تو هاتییە دنیایێ تو یێ ب تنێ بووی، و گاڤا تو دمری ژی تو دێ یێ ب تنێ بی، و گاڤا تو ڕادبییە حەشرێ و حسێبێ ژی تو دێ یێ ب تنێ بی، و ئەوێن نوکە تو ل دۆر خۆ دبینی ئێک ژ وان د گەل تە نابت. ئینا هشامی سەرێ خۆ چەماند و چاڤێن وی تژی ڕۆندک بوون.. هنگی عەطاء ڕابوو و دەرکەفت.

خەلیفەی هندەک پارە د گەل کەسەکی بۆ وی هنارتن، وی ئەو پارە وەرنەگرتن و گۆت: ﴿ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾

(الشعراء: ١٢٧) هەڤالێ وی دبێژت: ب خودێ من نەدیت حەتا ئەو ژ نک خەلیفەی دەرکەفتی خۆ وی ئاڤ ژی ڤەخوار بت.

هۆسا بەرەکەتا وی ژ هەمی کسان دگرت، و بەرێ وی لێ نەبوو تشتەک بگەهتە وی.

عـەطـا ء حەفتێ سالان ل ڕۆژا عەرەفێ ل سەر چیایێ ڕاوەستا بوو دوعا ژ خودێ دکر ئەوی ب بارەکێ سڤک ڤە ژ گونەهان، یێ گران ژ خێران ژ ڤێ دنیایێ دەربێخت.

## عوروەیێ کوڕێ زوبەیری
## چەقەکێ ب بەرهەم ژ دارەکا ب خەمل

ڕەهێن دارا وی یا ب خەمل کویر د عەردێ تەقوایێ ڕا چووبوونە خوارێ..
بابێ وی کورمەتێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- زوبەیرێ کوڕێ صەفییایا کچا عەبدلموطەلبی، و دەیکا وی ئەسمائا کچا ئەبووبەکری بوو، ژ لایێ بابێ ڤە، ڕەهەکا وی دگەهشتە سەییدێ ئنس و جنان، پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن-، و ژ لایێ دەیکێ ڤە نەڤییێ زەلامێ ئێکێ بوو د ئوممەتێ، کو ئەبووبەکرە، و ژ لایێ خزمایینییێ ڤە، زاڤایا عەبدللاهێ کوڕێ عومەرێ کوڕێ خەططابی بوو.

دەمێ زەلامان شەڕ ل سەر (خیلافەتێ) دکر، و ئوممەت د ناڤبەرا برایێ وی (عەبدللاهی) و هەڤالێ وی (عەبدلمەلکی) دا بوویە دو پشک، وی خۆ ژ (حەلەقێن) علمی دویر نەدکر، کارێ وی ئەو بوو وی کیتابا خودێ و سوننەتا پێغەمبەری وەکی ژ خالەتا خۆ (عائیشایێ) وەرگرتی، نیشا خەلکی ددا، عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی -خودێ ژێ رازی بت- د دەر حەقا وی دا دگۆت: ((ئەز کەسەکێ نابینم زاناتر بت ژ عوروەیێ کوڕێ زوبەیری)).

**هیڤییەکا غەریب:**

دەمێ ئەو هێشتا یێ جحێل ل سەر زەمانێ خیلافەتا موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی -خودێ ژێ رازی بت- جارەکێ ئەو د گەل سێ چار هەڤالەکان ل (حیجرا ئیسماعیلی)، ل نێزکی کەعبەیا پیرۆز یێ ڕوینشتی بوو، مەزنییا

مـالا خـودێ، د گـەل جـوانییا دیـمـەنـێ طـەوافکـرنـا وێ کـەوکەبا مـایی ژ صەحابییان، د گەل ستێرە گەشێن تابعییـان ل دۆر کـەعبێ، پـتـر هەیبـەت ددا دیوانـا وان.. هاتـە سـەر هزرا ئێـک ژ وان کـو بێـژت: وەرن دا هـەر ئێـک ژ مـە هیڤییا خۆ بێژت، و ئەڤە عـەدەتێ صـەحابییان ژی بـوو گاڤـا سـوحبەت د ناڤبـەرا وان دا رحەت ببا، ئێـک ژ وان دا بێـژت: کـانێ دا هـەر ئێـک ژ مـە هیڤییـا خۆ بێژت، عەبدللاهێ کورێ زوبەیری گۆت: هیڤییا من ئـەوە حیجـاز هـەمی بکەفتـە دەستێ من، و ئەز ببمە خەلیفە. و برایێ وی موصعەبێ کورێ زوبەیری گۆت: پا ئەز حەز دکەم ببمە مەزنێ کووفە و بەصرە، و کەس شریکاتییا من تێدا نەکـەت. عەبدلمەلکێ کورێ مەوانی گۆت: هیڤییا من ژ یا هەوە هەردویان مـەزنترە، ئـەز هیڤی دکەم پشتی موعاویەی خیلافەت بگەهتە من، و ئـەز ببمـە مـەزنێ عـەردی هەمییێ..

دو کەس مـابوون هیڤییـێن خۆ نـەگۆتبوون: عـەبدللاهێ کـورێ عومـەری، و عوروەیێ کورێ زوبەیری، وان گۆتنێ: و هیڤییێن هەوە چنە؟

عوروەیی گۆت: خودێ بەرەکەتێ بۆ هەوە بێختـە دنیایـا هـەوە، هیڤییـا مـن ئەوە ئەز وە لێ بێم خەلک علم و زانینـێ ژ مـن وەربگـرن، و عـەبدللاهێ کـورێ عومەری گۆت: و هیڤییا من ئەوە خودێ گونەهێن من بغەفرینت..

چەرخا زەمانی زڤری، رۆژهـاتن و رۆژ چـوون.. موعاویـە چـوو، هـەر وەکـی رۆژەکـێ حـوکم ل بهوسـتـەکا عـەردی نـەکری، و کـورێ وی یـەزیـد ژی پشـتـی وی چوو، و خەلکێ حیجازێ (موبایەعا) عەبدللاهێ کورێ زوبـەیری کـر، و خـەلکی ب خیلافەتێ سلاڤ کرێ.. و دەمێ ئەو بوویـە خەلیفـە وی برایـێ خـۆ موصعـەب کرە والییێ عیراقێ، و بۆ دەمەکی هیڤییا وان هەردویان بۆ ب جهـ هات.

ل شامێ خەلکی موبایەعا عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی کر، پاشی ب رەخ کەعبێ ڤە ل نێزیکی وی جهی یێ عەبدللاهی هیڤی خواستی ئـەو ب دەستێن عاملێ عەبدلمەلکی حەجاجێ ثەقـەفی هاتـە کوشـتن، و ل عیراقـێ .. ل دویـر

موصـعەب ژی ب دویڤ عەبـدللاهی دا چـوو و د رێیـا ویلایـەتا خـۆ دا هاتـە کوشـتن.. و مەیـدان بـۆ عەبدلمـەلکی مـا ڤـالا، عەبدلمـەلک بـوو خـەلیفێ ئیسلامێ و مەزنێ نیڤەکا عەردێ وی زەمانی. هیڤییا وی ژی ب جهـ هات.

دو هیڤـی مـان.. یـا عەبـدللاهێ کـوڕێ عومـەری، ئەڤـە غەیبەکـە ل نـک خـودێ، و یـا عـوروەیی ل بـەر چاڤ ب جهـ هـات، بـۆری د گـەل مـە ئاخفتنـا عومــەرێ کــوڕێ عەبدلعــەزیزی د دەر حــەقا وی دا، و عەبــدررەحمانێ کــوڕێ حومەیدی دبێژت: جارەکێ ئەز د گەل بابێ خۆ چوومە مزگەفتێ، من دیت خەلک هـەمی یـێ ل مرۆڤـەکی کۆمبـووین و داخـوازا علمـی ژێ دکـەن، ئینـا ئـەز ژ وی عەجێبگرتی مام، و من گۆتە بابێ خۆ: ئەڤە کییـە؟ وی گۆتـە مـن: عـەجێبگرتی نەبـە، مـن ددیـت صـەحابیێن پێغەمبـەری -سـلاڤ لـێ بـن- پسـیارێن خـۆ ژ ڤـی دکرن، ئەڤە عوروەیێ کوڕێ زوبەیرییە!

ئەڤە دەسپێک.. و نوکە وەرن دا عوروەیی ب هەوە بدەینە ناسین.

## دانەنیاسینا عوروەیی:

عـوروە -وەکـی مـە گـۆتی- کـوڕێ زوبـەیرێ کـوڕێ عەوامییـە، و دەیکـا وی ئەسـمائا کچـا ئەبووبەکرییـە، ل سـالا دوومـاهییێ ژ خیلافـەتا (عومـەرێ کـوڕێ خـەططـابی)، یـان پشـتی (عوثمـان) بوویـە خەلیفـە ب دو سـێ سـالـەکان، ئـەو هاتبوو سەر دنیایێ، و هێشتا ژیێ وی ل دۆرێـن دەهـ سـالییێ بـابێ وی زوبـەیر هاتە شەهیدکرن، و دەیکا وی ئەسمائێ خەم ژ پەروەردەکرنا وی خوار، و چونکی مـرادا وی ئـەو بـوو ببتـە ئێـک ژ زانـایێن مـەزن یـێن کیتـاب و سـوننەتێ نیشـا خەلکی ددەن، هەر ژ زارۆکینییا خۆ وی قەستا صەحابییـێـن پێغەمبەری -سـلاڤ لـێ بـن- یـێن مـایی کـر، و علم ژێ وەرگرت، وەکـی: ئیمـام عـەلی، و ئـەبوو هـورەیـرە، و عــەبــدللاهــێ کوڕێ عەبباسی، و عەبدللاهێ کـوڕێ عومـەری، و ژ هەمییان پتر: خالەتا خۆ دەیکا موسلمانان عائیشایێ، ئەوا عوروە نێزیکی خۆ کـری، و ئـەو وەکـی کـوڕەکی بـۆ خـۆ حسـێبکری، لـەو دەمـێ عـوروە د گـەل وێ

دئاخفت دگۆتێ: دادێ! و عائیشایێ علمێ خۆ ب کیتابێ و سوننەتێ و شەریعەتی هەمی گەهاندێ. و ڕۆژەک ب سەر وی دا هات ئەو دهاتە هژمارتن ئێک ژ (حەفت فقهزانێن مەدینێ) یێن خەلک بۆ دینێ خۆ لێ دزڤرن..

ڕۆژا عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی بوویە والییێ مەدینێ، و ئەو گەهشتییە بارێ ئیمارەتا وی، ئێکەمین تشت وی کری ئەو بوو وی دەه زانا ژ خەلکێ مەدینێ داخوازکرنە دیوانا خۆ، و یێ ئێکێ عورروە بوو، و گۆتە وان: من هوین یێن داخواز کرین بۆ کارەکێ وەسا هوین دێ پێ خودان خێر بن، و دێ بنە پشتەڤان بۆ من ل سەر حەقییێ.. هوین دزانن ئەز یێ بوویمە مەزنێ هەوە و من نەڤێت کارەکی بکەم بێی کو ڕەئیا هەوە وەرگرم، ڤێجا ئەگەر هەوە دیت کەسەکی تەعدایی کر، یان هەوە گوهـ لێ بوو کو عاملەکێ من زۆرداری ل ئێکی کر، ئەز هەوە ب خودێ ددەمە سویندێ کو هوین بێژنە من. و هندی عومەر والی ل مەدینێ عورروە نێزیکترین کەس بوو بۆ وی، و ب هێزترین پشەڤان بوو بۆ وی ل سەر حەقییێ.. و ئەڤە کارێ وی د گەل خەلیفەی ب خۆ ژی بوو ل شامێ، چ د گەل عەبدلمەلکی بت یان د گەل کوڕێن وی بت، هەردەم وی ڕێکا باشییێ نیشا وان ددا، و چو جاران بەرێ وی ل هەڤرکییا وان و مال و مەنصبێن وان نەبوو، و هەر جارەکا زانایی حەقی گۆت، بێی بەرێ وی ل هندێ بت فایدەکێ دنیایێ ب وێ گۆتنێ بگەهتێ، ئەو ل نک مەزن و بچویکان دێ بتە جهێ قەدر و ئحترامێ.

عورروەیی علم و عەمەل پێکڤە کۆمکربوو، پتر ژ ڕۆژێن سالێ ئەو یێ ب ڕۆژی بوو، و ب شەڤێ بارا پتر وی عیبادەت دکر، ب ڕۆژ چارێکا قورئانێ دخواند، و ب شەڤێ وی ئەو د نڤێژێ دا ژ بەر دخواند، یەعنی: هەر چار ڕۆژان وی دو جاران قورئان ختم دکر.. و عەدەتێ وی بوو سالێ هەمییێ وی بیستانێ خۆ تەعان دکر دا حەیوان چو زیانێ نەگەهیننێ، و گاڤا بیستان دهاتە بەری، و دبوو دەمێ فێقی وی ل سێ چار جهان تەعان ڤەدکر، و دگۆت: ئەگەر ئێک

د بەر ڕا بۆری و دلێ وی چوو فێقی دا بشێت بێت ژێ بخۆت، و هندی بڤێت بۆ خۆ ژێ ببەت. ل ڕۆژەکا ئەوێ ب ڕۆژی ژ سالا (٩٣) مشەختی خودێ حەقیبیا رحا وی کربوو، و هندی کوڕێن وی مانە پێڤە دا ئەو ڕۆژیا خۆ بخۆت وی ب یا وان نەکر، و ب دەڤەکێ ب ڕۆژی ڤە وی قەستا خودایێ خۆ کر.

## صەبرا وی ل سەر بەلایێ:

بەرچاڤترین بەرپەڕ د دیرۆکا عوروەیێ کوڕێ زوبەیری دا مرۆڤ ل نک ڕاوەستت ژ بەر وێ دەرسا مەزنا صەبرێ یا کو تێدا هەی، ئەو بەرپەڕ بوو یێ ل سەر زەمانێ خیلافەتا وەلیدێ کوڕێ عەبدلمەلکی هاتییە ڤەکرن..

وەختەکی عوروەیی قەستا بازێڕێ دیمەشقێ کر، و دەمێ ئەو گەهشتییە وێرێ و خەلیفەی ب هاتنا وی زانی، خەلیفەی ئەو ل نک خۆ مێڤان کر، و قەدرەکێ زێدە دایێ، و ل دەمەکی کوڕێ وی ئەوێ د گەل هاتی، د گەل هندەک مرۆڤان دەرکەت و چو تەماشا هەسپێن خەلیفەی، و ل دەمەکێ ئەو یێ غافل هەسپەکی پێن خۆ ب جۆتکانی هاڤێتن و لیتکەک لێ دا، ئەجەلا وی تێدا بوو، جاب گەهاندە عوروەی.. وی حەمدا خودێ کر، و هێشتا ئەو ب دورستی ژ ڤەشارتنا کوڕێ خۆ خلاص نەبووی، پێ وی کەفتە بەر و وەڕمت، و ئەڤە ژ بەر وێ برینێ بوو یا ب ڕێڤە کەفتییە پێ وی و دایە بن، خەلیفەی هنارتە ب دویڤ دختۆر و حەکیمان ڕا؛ دا چارەیەکێ بۆ مێڤانێ وی ببینن، و پشتی وان زانینا خۆ هەمی لێ خەرجکری، وان ب خەم ڤە ئاگەهداریا خەلیفەی کر کو چو چارە نینن ژ بلی کو ئەو پییێ عوروەیی ببڕن، ئەگەر نە ئێش دێ لەشێ وی هەمییێ ڤەگرت، و گاڤا وان خەبەر گەهاندییە عوروەیی وی ب ڕوییەکێ گەش ڤە پێشوازی ل ئەمرێ خودێ کر. و گاڤا حەکیمی ئامیرەتێن نشتەرگەرییێ حازر کرین، و کارێ برینا پییێ نساخی کری، وی گۆتێ: ئەز دبێژم ئەگەر ئەم بەنجێ بدەینە تە باشترە دا تە های ژ ئێشێ نەمینت، وی گۆت: من نەڤێت ئەندامەکێ لەشێ من بێتە برین بێی ئەز هەست ب ئێشانا وی بکەم و بۆ خۆ ب خێر

حسێب بکەم، و گاڤا وی بەرێ خۆ دایە دەور و بەرێن خۆ وی کۆمەکا زەلامان دیتن، گۆت: ئەڤە کینە؟ حەکیمی گۆتێ: ئەڤە من یێن ئینایین دا تە بگرن دەمێ ئەم پێ تە دبڕین.. عورروەی ب گرنژین ڤە بەرسڤا وی دا: بلا بچن.. مە چو هەوجەیی ب وان نینە، ئەز هیڤیدارم زکر و تەسبیح جهێ وان بگرن!

حەتا دختۆری پیێ وی بڕی وی (لا إله إلا الله، والله أكبر) دگۆت، و ل دویڤ دەست و دارێ نۆژداریيا وی دەمی پشتی پێ بڕی، و دا کو نەزیف بۆ چێ نەبت، ئەو جهێ هاتییەبڕین کرە د ئامانەکێ تژی زەیتا کەلاندی دا، و گاڤا پیێ وی کرییە د زەیتا کەلاندی دا، دلێ وی بۆری و وی ڕۆژێ هەمییێ وی های ژ خۆ نەما، و ژ بەر وێ بێهشییێ وێ ڕۆژێ ب تنێ ئەو نەشیا (وردێ) خۆ -کو خواندنا چارێکەکا قورئانێ بوو- بخوینت، و پشتی ئەو هشیاربووی، وی گۆت: کانێ پیێ من نیشا من بدەن.. گاڤا وان ئەو طەست نیشا دای یا پیێ وی تێدا، وی بەرێ خۆ دا پیێ خۆ و گۆت: ئەز ب وی کەمە یێ ئەز ل شەڤ و نیڤشەڤان ب تە بریمە مزگەفتان، ئەو باش دزانت کو ئەز ب تە ب نک خرابییەکێ ڤە نەچوویمە.

و وەسا چێبوو کو ل وان ڕۆژان کۆمەکا زەلامان ژ ئویجاخا عەبسییان هاتنە نک خەلیفەی، خەلیفەی بەرێ خۆ دایێ زەلامەکێ کۆرە د ناڤ دا بوو، ئینا پسیار ژێ کر: چاوا چاڤێن تە هۆ لێ هاتینە؟

وی گۆت: ئەی ئەمیرلمونمنین! د ناڤ هەمی عەبسسیان دا زەلامەکێ وەکی من دەولەمەند و عەیال بۆش نەبوو، مالا من د نهالەکێ دا بوو، ڕۆژەکێ لەهییەکا وەسا ب سەر مە دا هات چو جاران لەهییێن وەکی وێ من نەدیتبوون، مال و حالێ من هەمی د گەل خۆ بر، تشتێ ئەز شیایم خلاصکەم بچویکەکێ سافا بوو، من ئەو دا بەر سنگێ خۆ، و حێشترەکا من ژی ژ لەهییێ ڤەڕست، گاڤا من حێشتر دیتی ئەز چوومێ دا بگرم، و من زارۆکێ خۆ دانا عەردی، و ئەز ب دویڤ حێشترێ ڤە چووم، دەمەکی ڤێژیيا زارۆکی هاتە من، ئەز لێ

زڤریم من دیت سەرێ وی یێ د دەڤێ گورکەکی دا، ئەز ب لەز چوومێ بەلێ یا ژ خۆ بوو، حەتا ئەز گەهشتیمێ گورک رەڤی و ئەو تمام بووبوو، من گۆت: کورێ هەر چوو دا ئەز بچمە حێشترێ، گاڤا ئەز نێزیک بوویم وێ لیتکەک ل ناڤ چاڤێن من دا، ئەنی ل من پەقاند و هەردو چاڤ کۆرەکرن.. و هۆسا د ئێک شەڤ دا من خۆ دیت نە عەیال و نە مال و نە چاڤ!

خەلیفە ل زەلامەکی زڤری و گۆتێ: هەرن ڤی ببەنە نک عوروەیی بلا چیرۆکا خۆ بۆ بێژت؛ دا ئەو بزانت کو د ناڤ خەلکی دا هندەکێن هەین موصیبەتا وان ژ یا وی مەزنترە.. بەلێ عوروەیی هەوجەیی ب هندێ نەبوو صەبرا خۆ ب موصیبەتێن خەلکێ دی بینت، گاڤا عوروە زڤرییە مەدینێ، کورێ د گەل نە و پێیەک پێڤە نە، و خەلکێ مالا وی هاتینە بەراهییێ، و تژی چاڤێن وان پسیارێن حێبەتی، یێن ل هیڤیا بەرسڤەکێ ژ وی، وی گۆتە مرۆڤێن خۆ: ئەو تشتێ هوین دبینن بلا ل بەر هەوە یێ مەزن نەبت، ئەگەر خودێ کورەکێ من بر بت وی سێیێن دی بۆ من یێن هێلاین، و ئەگەر وی پێیەکێ من بر بت وی دو دەست و پێیەک بۆ من یێن هێلاین.. حەمد بۆ وی بت، ژ چاران وی سێ بۆ من یێن هێلاین، و ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر وی پیچەک ژ من ستاند بت ژی، وی پتر بۆ من هێلایە.. و ئەگەر وی جارەکێ بەلا دابتە من وی گەلەک جاران سلامەتی یا دایە من.

### ژ شیرەتێن عوروەیی:

ژ شیرەتێن بەردەوام یێن عوروەیی ل عەیالێ خۆ دکر ئەڤە بوو وی دگۆتە وان: ((کورێن من! خۆ فێری علمی بکەن.. چونکی ئەگەر هوین د ناڤ خەلکی دا دبچویک ژی بن، بەلکی خودێ هەوە ب علمی بکەتە مەزنێن وان. ئەی کورێن من! ئەگەر هەوە باشییەک ژ مرۆڤەکی دیت هیڤییا خێرێ ژێ بکەن، ئەگەر خۆ ئەو ل بەر خەلکی مرۆڤەکێ خراب ژی بت، چونکی وێ باشییێ هندەک خویشک دێ هەبن، و ئەگەر هەوە خرابییەک ژ ئێکی دیت ژێ دهشیار

بن، ئەگەر خۆ ئەو ل نک خەلکی یێ باش ژی بت، چونکی ئەوێ خرابییێ هندەک خویشک دێ هەبن..)).

و گەلەک جاران وی بیرا وان ل گۆتنەکا خالەتا خۆ عائیشایێ دئینا ڤە، دگۆت: ((جارەکێ عائیشایێ گۆتە من: ب خودێ هندەک جاران چل شەڤ ب سەر مە دا ل مالا پێغەمبەری دهاتن مە ئاگر نە بۆ چرایی و نە بۆ زادلێنانێ هل نەدکر.. گۆت: من گۆتێ: دادێ! پا هەوە چ دخوار؟ وێ گۆت: ئاڤ و قەسپ!)).

# ئیبراهیمێ کوڕێ ئەدهەمی

ئیبراهیمێ کوڕێ ئەدهەمێ تەمیمی یێ خوراسانی د ناڤ زانا و زاهدێن ئوممەتێ دا وەکی ئالایەکێ بلند و ستێرەکا گەشە، کەسەک نەشێت بەحسێ دیرۆکا زوهدێ د ئیسلامێ دا بکەت ئەگەر ناڤێ وی نەئینت، و بەلکی گەلەک کەس هەبن یێن ناڤێ وی بهیستی باوەر نەکەن کو دەمەک د سەر ڤی زاهدێ مەزن دا هاتبوو ئەو یێ دویربوو ژ ڕێکا خودێ، پاشی دەمەکێ دی د سەر وی دا هات ئەو د ناڤ مەزن و خودێناسان دا هاتە ڕێزا ئێکێ..

سەرهاتییا ئیبراهیمێ کوڕێ ئەدهەمی ژی دەرسەکا مەزنە بۆ وان کەسێن دنیا دایە پشتا خۆ کو بێ هیڤی نەبن، ڤێجا ئیبراهیم کی بوو؟ و سەرهاتییا وی چ بوو؟

ئیبراهیم -وەکی مە گۆتی- ژ وەلاتێ خوراسانێ بوو، ژ باژێرێ بەلخ ئەوێ دکەفتە د ناڤبەرا ڕوبیارێ جیحوونێ و باژێرێ کابۆلێ دا، بابێ وی ئەدهەمێ کوڕێ مەنصووری ئێک ژ مەلک و شاهێن خوراسانێ بوو، ل باژێرێ بەلەخێ ل دۆرێن سالا (١٠٠) مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ، و ل قەسرا مەلکی هاتبوو ب خودانکرن، و دیارە ئەو نەخرییێ بابێ خۆ بوو لەو ئەو بوو جێگرییا بابێ خۆ دهاتە بەرهەڤکرن.

د جەووەکێ تژی خۆشی و رەفاهیەت دا، و ب نازدارییەکا زێدە هاتە پەروەردەکرن، چو تشتێ ژێ کێم نەبوو، چونکی هەچی داخوازا وی هەبا هەر زوی بۆ دهاتە ب جهئینان، ما نە کوڕێ مەلکی و جێگرێ وییە یێ کو مەزن و بچویکێن مەملەکەتێ دڤێت خولامینییا وی بکەن؟

وەکی هەر زارۆکەکێ د کۆچک و سەرایێن مەزنان دا دئێتە ب خودانکرن ئیبراهیم ب دنیایێ و خۆشییێن وێ ڤە موژیل بوو، و ڤیانا وی بۆ دنیایێ ئەو هند موژیلکر کو دەلیڤەیا وی بۆ هزرکرنا د کار و بارێ ئاخرەتێ دا نەمینت، و دەمێ ئەو بوویە نیڤزەلام کارێ وی یێ سەرەکی بوو نێچیرڤانی ل چۆلی، و نێچیرڤانی ل وی دەمی -وەکی دهاتە سالۆخدان- یارییا مەلکان بوو.. خۆ دەمێ بابێ وی مری و ئەو ل شوینا وی بوویە مەلک ژی ئارەزوویا وی یا مەزن نێچیرڤانی بوو.

دەربارەی ئەگەرا تۆبەدارییا ئیبراهیمێ کورێ ئەدهەمی دا دو گۆتن دئێنە ڤەگێران، و دویر نینە هەردو ب جهـ هاتبن.

یا ئێکێ ژ ئیبراهیمی ب خۆ دئێتە ڤەگوهاستن، دبێژت: جارەکێ دەمێ ئەز ل نێچیرێ ل چۆلی، من هسپێ خۆ ڕاکرە چارگاڤێ و دا ب دویڤ نێچیرا خۆ ڤە حەتا ئەز ژ هەڤالێن خۆ هەمییان ڤەدەربوویم، و ل وی دەمێ ئەزێ موژیل ب ڕاهێلانا ل دۆر نێچیرا خۆ ڤە دەنگەک هاتە من گۆت: ئەی ئیبراهیم بۆ ڤێ چەندێ تو نەهاتییە ئافراندن، و ب ڤێ چەندێ فەرمان ل تە نەهاتییەکرن ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ (المؤمنون: ١١٥) گۆت: هندی ئەز ل لایێ خۆ یێ ڕاستێ و چەپێ زڤڕیم، من کەس نەدیت، ئینا من گۆت: لەعنەتێن خودێ ل ئبلیسی بن! پاشی من ڤیا هسپێ خۆ بهاژۆم بەلێ بەری ئەز قەستا نێچیرا خۆ بکەم، جارەکا دی ئەو دەنگ هاتە من، بەلێ ڤێ جارێ نێزیکتر، ئەز لێ زڤڕیم دیسا من کەس نەدیت، و گاڤا من ڤیای بەردەوامییێ بدەمە کارێ خۆ بۆ جارا سێیێ هەر ئەو دەنگ هاتە من، و دەمێ من کەس نەدیتی من کرە هەوار: ئەڤە هشیارکرنەکە ژ خودێ بۆ من، ئەز هشیاربووم، ئەز هشیاربووم!

گۆتنا دویێ: دبێژن: جارەکێ ئیبراهیمێ کورێ ئەدهەمی یێ مەلک ڤیا بچتە نێچیرێ و زێرەڤان و ئێلچی تژی دۆر و ڕەخێن وی بوون، دا نەهێلن کەس

نێزیکی وی ببت، ژ لایەکێ دی ڤە دا ئەو وی خەلکی بەلاڤە بکەن ئەوێن هاتینە د رێکا مەلکی دا، دا ب دیتنا مەوکبێ وی شاد ببن.. ل لایێ رێکێ پیرەمێرەکێ بێچارە یێ روینشتیبوو، دەمێ دیتی نێزیکی هندەک پێ لێ بدانن گازی کر: هەوە خێرە؟ وان گۆت: مەلک هات مەلک!

پیرەمێری گۆت: مەلک.. یان مەملووک؟! (و مەملووک ئەو کەسە یێ عەبد بت).

دەنگێ وی گەهشتە مەلکی، و گاڤا مەلکی دیتی هندەک زەلامێن وی ب نک پیرەمێری ڤە چوون، دا وان بێشینن، وی گۆت: کەسێ نەئێشینن، پاشی مەلک ب خۆ ب نک وی ڤە چوو و گۆتێ: ئەی پیر! عەبد ب چ تشتی دێ گەهتە هەمییێ؟ پیرەمێری گۆتێ: ب هێلانا هەمییێ.

ئیبراهیم د ئاخفتنا وی گەهشت، سەرێ خۆ هژاند و چاڤێن وی تژی رۆندک بوون، پاشی ل هەڤالێن خۆ زڤڕی و گۆت: بزڤڕن ئەم ئەڤرۆ ناچینە نێچیرێ، و پشتی زڤڕینا وی ژ نێچیری ب سێ رۆژان وی بڕیارەکا مەزن دا.. بڕیار دا هەمییێ بهێلت دا بگەهتە هەمییێ!

ئیبراهیمێ کورێ ئەدهەمی بڕیار دا مەلکاتییێ بهێلت، و پشت بدەتە قەسر و قوصوور و مەملەکەتێ هەمییێ، خەلکێ وەلاتێ وی سپێدەیەکێ هشیاربوون بێی مەلکێ خۆ ببینن، و هندی لێ گەڕیان ب سەر چو سەر و شوینێن وی هل نەبوون، ب تنێ زەلامەکێ ژ رەعییەتا وی تێ نەبت، شڤانی ل لایەکێ دویر ژ باژێری دکر، وی خیڤەتا خۆ ڤەدابوو، شەڤەکێ مەلک ب تنێ د بەر خیڤەتا وی را بۆری و داخوازەکا غەریب ژێ کر، گۆتێ: وەرە دا ئەز و تو جلکێن خۆ پێک بگوهۆڕین! شڤان هەر زوی ب کەیف ڤە و بێی ئارمانجا مەلکی ژ ڤێ چەندێ بزانت ل بەر داخوازا وی هات.. و ئەو بوو رۆژا د دویڤ دا شڤانی ژی وەکی هەمی خەلکێ مەملەکەتێ گوهـ لێ بوو کو مەلک یێ بەرزەیە!

مـەلكى ئەوێ كراسێ شڤانى يێ درِياى كرييە بەر خۆ، هەسپێ خۆ ب لـەز هاژۆت و بەر ب رِۆژئاڤايێ ڤە دچوو و ب چوونا وى ديرۆكێ ئێك ژ غـەريبترين سەرهاتييان تۆماركر، ئەو مەلكێ ژ ترسێن خودێ دا دنيا بەرداى..

پشتى قويناغـەكا درێژ ئيبراهيم گەهشتە عيراقێ و ل وێرێ هەڤالينييا هندەك زانايێن مەزن كر وەكى: سوفيانێ ثەورى و فوضەيلێ كورِێ عياضى و هندەكێن دى.. و وى پسيارا سەيدايێن خۆ كر كانێ نانـەكێ حەلال ل كيڤە دێ دەست ب من كەڤت؟ وان گۆتێ: هەرِە قەستا شامێ بكە، و پشتى ئەو چوويە وێرێ وى ب دەستێ خۆ كـار دكـر، هنـدەك جـاران پالـەتى و هنـدەك جـاران ناطوورڤانييا چەم و بيسـانان، و هنـدەك جـاران ژى دچوو چيـاى دار دبـرِين و دئينان دفرۆتنە خەلكى، و ب حەقێ دەستێ خۆ وى خۆ ب خوان دكر.

ژ گۆتنێن وى يێن ناڤدار: ئەو دبێژت: هەچييێ تۆبە بڤێت بلا زۆردارييێ ل كەسێ نەكەت، و بلا تێكەلييا خەلكى ژى نەكەت، ئەگەر نە.. ئـەو نەشێت وێ ب دەست خۆ ڤە بينت يا وى دڤێت.

و ئەو دبێژت: ئەو مەلكێ عەدالەتێ نەكەت فەرقا وى و دزيكەرى نينە، و ئەو زانايێ ب تەقوا نەبت فەرقا وى و گورگى نينە، و هەچييێ خۆ بۆ ئێكێ دى ژ بلى خودێ بشكێنت فەرقا وى و صەى نينە.

جارەكێ هندەك هەڤالێن وى گۆتێ: ئەگەر تو ژنەكێ بۆ خۆ بينى، وى گۆت: ئەگەر ئەز شيابام دا نەفسا خۆ بەردەم.

ل سالا (١٦٢) مشەختى ل شامێ چوو بوو بەردلۆڤانييا خودێ.

# مرۆڤێن خودێ
# د گەل مەزنێن دنیایێ

(مرۆڤێن خودێ) و (مەزنێن دنیایێ) هەر وەکی تو بێژی: عەسمان و عەرد.. بلندی و نزمی.. ڕۆناهی و ئاخ!! سوحبەتەکا عنتیکەیە، و پەیوەندییەکا غەریبە، کەرەم کەن دا ژ نێزیک بەرێ خۆ بدەینێ..

دیتنا مرۆڤێن خودێ بۆ مەزنێن دنیایێ -بێ گومان- دێ یا گرێدایی دیتنا وان بت بۆ دنیایێ ب خۆ، لەو یا د جهێ خۆ دایە بیرا هەوە ل دیتنا وان بۆ دنیایێ بینینەڤە: بینە بەر چاڤێن خۆ.. شەڤەکێ، دەمێ تو یێ نڤستی، تە هند دیت تو یێ ل جهەکی دچی، چەند گاڤەگان تو چووی و خزینەیەکا مەزن کەفتە بەر سنگێ تە، و تو یێ ب تنێ یی، نەکەس هەیە ژ تە بستینت، و نە کەس هەیە شریکاتییا تە تێدا بکەت، هێشتا تە تێر کەیف ب خزینەیا خۆ نەهاتی تە هند دیت جرفەک ب تە کەفت و تو ژ خەو ڕابووی.. دلەکێ تژی کول، دو دەستێن ڤالا، و چو ددی نە!

بەرێ خۆ ژ ڤی دیمەنی وەرگێڕە، سەحکە دنیایێ.. (فلان کەس) تو دا بێژی قاروونە، ملیوونەک ل نک وی فلسەک بوو، دوهی مر، و مرۆڤێن وی ئەو بر د ئاخێ ڕا کر و زڤڕین، چو بالیفک نەدانانە بن سەری، خۆ ئەو فۆتا تێ ئالاندی ژی زڤڕاند و بۆ وی نەهێلا ل وێرێ، جرفەک ڤێ کەفت وی هند دیت هشیار بوو، حەتا ڤێ گاڤێ د خەونەکێ دا بوو نوکە ژێ ڕابووڤە، بەلێ پا چ؟ دلەکێ کۆڤاندار، و دو دەستێن ڤالا!

ئەڤەیە ئەو دنیایا خەلک دینێ خۆ بۆ دفرۆشن.. ئیمام (محەمەد ئەلباقر) دبێژت: ((دنیا وەکی وی مالییە یێ تو بۆ خۆ د خەونێ دا دبینی، گاڤا تو هشیاربووی تو چویێ د گەل خۆ نابینی)).

یان ژی گوهدارییا مرۆڤەکێ دی ژ مرۆڤێن خودێ بکە دێ چاوا دنیایێ نیشا مە دەت: رۆژەکێ (مەسرووقێ کورێ عەبدررەحمانی) دەستێ برازایەکێ خۆ گرت و برە هنداڤ لاتەکێ خەلکی گلێشێ خۆ دبر دهاڤێتێ، مەسرووقی دەستێ خۆ ب نک گلێشی ڤە درێژکر و گۆتە برازایێ خۆ: ((بەرێ خۆ بدە دنیایا وان.. ئەها ئەڤەیە ل بن پییێن مە، وان خوار و پویچ کر، کرە بەر خۆ و دراند، لێ سویاربوون و هێلا، و بۆ خاترا ڤێ ئەوان خوینا ئێک و دو رێت)).

چەند تشتەکێ غەریبە سەرا گلێشەکی مرۆڤ خۆ تێ ببەت! چەند هەڤرکییەکا بێ خێرە سەرا کنجرەکی مرۆڤ شەرێ هەڤالێ خۆ بکەت! دنیا بویکەکا ب خەملە، گەلەک یا جوانە، بەلێ بەرێ خۆ بدێ جهەکێ پاقژ لێ مایە کەسێ بەری تە دەست نەکریتێ؟ ڤێجا ئەڤە چ عشقەکا ڤاژییە؟!

کو مە زانی ئەڤەیە دیتنا مرۆڤێن خودێ بۆ دنیایێ، تو بێژی دیتنا وان بۆ مەزنێن دنیایێ دێ یا چاوا بت؟

مەزن -ب دیتنا وان- دو مەزنن: یان ئەوە یێ دلێ خۆ ل دویڤ گۆتنا خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دبەت، دینێ خودێ دپارێزت و شریعەتێ وی ب کار دئینت، و ئەو هنگی ژ کۆما مرۆڤێن خودێ دئێتە هژمارتن، یان ئەوە یێ دینێ خودێ -هەمی یان هندەک- لادای و رێکەکا دی بۆ خەلکی دانای دا ل دویڤ بچن، و ئەڤە ژی ئێک ژ دویانە: یان وی باوەری ب دینێ خودێ نینە، و هزر دکەت شریعەت ب کێر هندێ نائێت بۆ خەلکی ببتە مەنهەج.. و ئەڤە نە ژ حسێبا موسلمانانە، یان ژی وی باوەری ب شریعەتێ خودێ هەیە و د هندەک مەسەلان دا ب کار دئینت ژی بەلێ ب دورستی پێگیرییێ ب شریعەتی ناکەت

و زۆرداریيێ ل خەلكی دكەت.. و ئەڤەیە یێ مە ناڤێ وان كرییە: (مەزنێن دنیایێ)، و ئەم پسیار دكەین ئەرێ هەلویستێ مرۆڤێن خودێ ژ وان چییە؟

ل دەسپێكێ دێ بێژین: مرۆڤێن خودێ نەخاسمە یێن زانا ژ وان، هەردەم ژ حاكم و سولطان و میران دبێ منەتن، و هەلویستێ وان ژ وان ژ ڤێرێ دەست پێ دكەت.. ئەو كەسێن دویڤەلانكییێ بۆ مەزنێن دنیایێ دكەن ئێك ژ دو ئارمانجان دخوازن: یان (مەنصبێن بلند) ب دەست خۆ ڤە بینن، یان بەریكێن خۆ ژ قرێژا دنیایێ تژی بكەن.. و مرۆڤێن خودێ ژ ڤان هەردو ئارمانجان ددویرن. نە وان (مەنصب) دڤێن نە (مالێ دنیایێ)، و هەچییێ باوەر نەكەت بلا ڤێ سەرهاتییا كورت بخوینت:

رۆژەكێ خەلیفێ ئومەوی (سولەیمانێ كورێ عەبدلمەلكی) هاتە مەدینێ، و قەستا مزگەفتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- كر، ل كوژییەكێ مزگەفتێ بەرێ وی ب زەلامەكی كەفت نیشانێن تەقوایێ لێ ددیاربوون، خەلیفەی پسیاركر: ئەوێ هە كییە؟ هندەكان گۆتێ: (صەفوانێ كورێ سەلیمییە) ئێك ژ زانایێن مەدینێ یێن مەزنە.. ئینا خەلیفەی كیسكەكێ تژی پێنجسەد دینار كرە د دەستێ زەلامەكێ خۆ دا و گۆتێ: ڤان دیناران بۆ وێ هە ببە. وی كیسك ژێ وەرگرت و ب نك صەفوانی ڤە چوو، ل هنداڤ سەری ڕاوەستا و گۆتێ: (أمیر المؤمنین)ی ئەڤ دینارە یێن بۆ تە هنارتین، صەفوان ما و ژێلەل بەرێ خۆ دایێ، گۆتێ: كورێ من! دیارە تو یێ خەلەتبووی وی بەحسێ من نینە. زەلامی گۆت: نە نە، ما تو نە صەفوانی؟ صەفوانی گۆت: بەلێ.. بەس سەحكێ بەلكی تو یێ خەلەتبووی. زەلام دودل بوو، زڤری نك خەلیفەی دا مەسەلێ مسۆگەر بكەت، و دەمێ ئەو ب ڤێ چەندێ ڤە دموژیل صەفوانی هێدی خۆ ژ مزگەفتێ ڤەدزی و ل مەدینێ هەمییێ نەما، و حەتا خەلیفە ژ مەدینێ دەرنەكەفتی كەسێ صەفوان ل مەدینێ نەدیت.

ئەگەر مرادا هندەکان ئەو بت خەلیفە وان ب خولامینی د گەل خۆ قەبویل کەت؛ دا پارییەکێ زێدە بگەهتێ، یان بهوستەکێ ژ خەلکی بلندتر لێ بێت، صەفوان و یێن وەکی صەفوانی قەبویل ناکەن خەلیفە د بەر وان ڕا بچت!

ئەگەر باوەرییا ب خودێ و هیڤییا ڕەحما وی سەرمالێ مرۆڤی بت، نە دنیا و نە مەزنێن دنیایێ نەشێن مرۆڤی ل دویڤ خۆ ڕاخرینن، (سەلەمەیێ دیناری) ئەوێ دبێژنێ: (ئەبوو حازم) ئێک ژ زانایێن تابعییانە، د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((من هندەک زانا دیتبوون زانینا وان ئەو ژ خەلکێ دنیایێ هەمییێ بێ منەت کربوون، و خەلکێ دنیایێ نەشیابوون ب دنیایا خۆ، خۆ ژ وان بێ منەت بکەن، وان ب زانینا خۆ قەستا خەلکێ دنیایێ کر لەو خەلکێ دنیایێ نەشیان وان ب دنیایا خۆ د سەر دا ببەن)).. مەعنا ئەو زانایێ ب دورستی مرۆڤێ خودێ بت، زانینا وی دێ وی ژ مەزنێن دنیایێ و دەولەمەندان بێ منەت کەت.. ڕۆژەکێ دەولەمەندەکی هنارتە ب دویڤ (ئەبوو حازمی) ڕا و گۆتێ: هندەک پسیارێن دینی مە یێن هەین وەرە نک مە دا بۆ خۆ ژ تە بکەین، و دا بۆ خۆ باخڤین ژی، (ئەبوو حازمی) بەرسڤا وی دا و گۆتێ: ((ئەز گەهشتبوومە هندەک زانایان -و مەخسەدا وی زانایێن صەحابییان بوون- وان دینێ خۆ هل نەدگرت، و نەدبرە نک مرۆڤێن دنیایێ، و من نەڤێت ئەز ئێکەمین کەس بم ڤی تشتی بکەم، ئەگەر تە کارەک ب مە هەیە تو وەرە)).

و چونکی مرۆڤێن خودێ خۆ ژ مەزنێن دنیایێ بێ منەت دکەن سەرفەراز دژین.. ڕۆژەکێ دەمێ (سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکی) هاتییە مەدینێ چوو سەرا هژمارەکا زانایان دا، و وان ژی سەرا وی دا، و بەری ئەو بزڤڕتە شامێ پسیارکر: ئەرێ زانایەک مایە ل مەدینی هندەک صەحابی دیتبن و مە ئەو نەدیتبت؟ هندەکان گۆتێ: بەلێ، (ئەبوو حازم) یێ مای تە نەدیتییە، خەلیفەی گۆتە زەلامەکی: هەرە بێژێ بلا بێتە نک مە، مە دڤێت وی ببینین، گاڤا قاصد هاتییە نک ئەبوو حازمی و داخوازا خەلیفەی گەهاندییێ، ئەبوو حازمی گۆتێ:

من چو شۆل ب (أمير المؤمنين)ی نینن، ئەگەر وی شۆلەک ب من هەیە بلا ئەو بێت. خەلیفەی گۆت: ئەبوو حازم ڕاست دبێژت، ئەم دێ چینە نک وی، و خەلیفە هاتە نک ل مزگەفتێ، وەکی هەر فەقییەکێ وی، خەلیفە ل بەرانبەر وی ڕوینشت، و ب گازندەڤە گۆتە ئەبوو حازمی: ئەڤە چ زڤراتییە تو د گەل مە ب کار دئینی؟

ئەبوو حازمی گۆتێ: ما تە چ زڤراتی ژ مە دیتییە؟

خەلیفەی گۆتێ: خەلکێ مەدینێ هەمی هاتن سەرا مە بدەن و تو نەهاتی.

ئەبوو حازمی گۆتێ: حەتا ئەڤرۆ من و تە ئێک و دو نەناسییە.

خەلیفەی گۆتێ: تو ڕاست دبێژی.

پاشی خەلیفەی (سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکی) گۆتە ئەبوو حازمی: ئەرێ بۆچی ئەم حەز ژ مرنێ ناکەین؟

ئەبوو حازمی گۆتێ: چونکی هەوە دنیایا خۆ یا ئاڤاکری و ئاخرەتا خۆ یا خرابکری، و کەسێ نەڤێت ژ ئاڤاهی بچتە خرابەی.

خەلیفەی گۆت: خوزی من زانیبا کانێ حالێ مە سوباهی ل نک خودێ دێ چ بت؟

ئەبوو حازمی گۆتێ: بەرێ خۆ بدە قورئانێ دێ زانی، خودێ دبێژت: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ۝ وَإِنَّ ٱلْفُجَّارَ لَفِى جَحِيمٍ ۝ ﴾ (الانفطار: ١٣-١٤).

خەلیفەی گۆت: و ڕەحما خودێ ل کیڤەیە؟

ئەبوو حازمی گۆت: یا نێزیکی قەنجیکارانە.

خەلیفەی گۆتێ: باشە زڤڕینا مە بۆ نک خودێ دێ یا چاوا بت؟

ئەبوو حازمی گۆت: هندی مرۆڤێ باشە، وەکی وی کەسی دێ زڤڕت یێ ب وەغەرەکێ دەرکەفتی، و ژ مرۆڤێن خۆ خەریببووی، و یێ خراب وەکی وی عەبدی دێ زڤڕت یێ ژ خودانێ خۆ ڕەڤی ڤێجا هندەکان گرتی و ل خودانی

زڤڕاندی. گاڤا ئەبوو حازمی وە گۆتی، سولەیمانی هند کرە گری حەتا دەنگێ گرییا وی ب سەرکەفتی، و پشتی سوحبەتەکا درێژ خەلیفەی گۆت: ئەرێ تو بۆ مە چ دبێژی؟

ئەبوو حازمی گۆتێ: دێ من عەفی کەی ژ ڤێ پسیارێ؟

خەلیفەی گۆتێ: نە، شیرەتەکە ئەز حەز دکەم تو ل من بکەی.

ئەبوو حازمی بێ ترس و دودلی گۆتێ: باب و باپیرێن تە ب کوتەکی خۆ کربوو مەزنێن خەلکی، ب شیری هاتنە سەر حوکمی بێی ڕازیبوونا خەلکی، و وان کوشتنەکا مەزن ئێخستە ناڤ خەلکی پاشی چوون و بارکرن، ڤێجا ئەگەر تو بزانی وان چ گۆت، و چ بۆ وان هاتە گۆتن!

ل ڤێرێ ئێک ژ وان مرۆڤێن ب چنییێن خولامینییێ مەزنبووین و ل سەر سفرا (تەمەللوقێ) قەلەوبوین، ڤیا خۆ ل بەر خەلیفەی شرین کەت، لەو ل ئەبوو حازمی حەیتاند و گۆتێ: ئەڤە نە چو گۆتنە تە گۆتی.. ئەبوو حازمی گۆتێ: تو درەوان دکەی خودێ پەیمان ژ زانایان وەرگرتییە کو حەقییێ ئاشکەراکەن و نەڤەشێرن.

خەلیفەی گۆتە ئەبوو حازمی: دوعایەکێ بۆ من ژ خودێ بکە.. ئەبوو حازمی دەستێن خۆ سەر ئەڤرازکرن و گۆت: یا ڕەببی ئەگەر سولەیمان ئێک ژ چاکێن تە بت تو خێرا دین و دنیایێ بدێ، و ئەگەر ئەو ئێک ژ نەیارێن تە بت تو بەرێ وی بدە وێ ڕێکێ یا تە بڤێت.. و خۆ بێ دەنگکر، ئینا خەلیفەی گۆتێ: هەما هندە؟! ئەبوو حازمی گۆتێ: ئەگەر تو یێ ژ هەژی بی هندە ژی بسە.. و بەری دیوان ڤەرەڤت خەلیفەی گۆتێ: ئەگەر تە پێتڤییەک هەبت بێژە دا بۆ تە ب جه بینین، ئەبوو حازمی گۆتێ: بلا.. من ببە بەحەشتێ و من ژ جەهنەمێ دویر بێخە! خەلیفەی گۆت: ئەڤە ب من ڤە نائێت، وی گۆت: پا ژ ڤێ پێڤەتر من چو ددی نەڤێت..

خەلیفەی گۆتێ: باشە بۆچی تو نائێیی د گەل مە بی، ئەم ژی دێ مفاییی ژ تە بینین و تو ژی دێ مفاییی ژ مە بینی؟ ئەبوو حازمی گۆت: (أعوذ بالله!)، خەلیفەی گۆتێ: بۆچی؟ وی گۆت: ئەگەر ئەز هەڤالینییا هەوە بکەم نە کو خودێ ژ من بستینت و من عەزاب بدەت.. و دەمێ ئەبوو حازم ڕابووی دا بچت، خەلیفەی سەد دینار هاڤێتنە بەر و گۆتێ: ئەڤان دیناران ل حالێ خۆ خەرج بکە، و پاشی دێ هندەکێن دی ژی بۆ تە هنێرم، ئەبوو حازمی گۆتێ: ب خودێ من ئەو بۆ تە نەڤێن ڤێجا چاوا دێ من بۆ خۆ ڤێن، ئەڤ سەد دینارە ئەگەر پێش وان گۆتنان ڤە بن یێن من گۆتینە تە، ب خودێ مرار و خوین و گۆشتێ بەرازی ل دەمێ تەنگاڤییێ ژ وان حەلالترن، ژ خۆ ئەگەر ئەو ژ مالێ موسلمانان بت، من شریک دێ تێدا هەبن لەو بۆ من حەلال نینە ئەز وان وەرگرم، ئسرائیلی هند ل سەر ڕێکا ڕاست بوون هندی مەزنێن وان دهاتنە نک زانایێن وان، پشتی ئەو سەرنخوین بووین و د چاڤێ خودێ دا شکەستین و باوەری ب طاغووتی ئینای، زانایێن وان هاتنە دیوانێن مەزنان و پشکدارییا وان د دنیایا وان دا کر، ئینا هەڤالینییا وان د کوشتنێ ژی دا کر.

ڤێ پاقژییێ.. ڤێ بێ منەتییێ.. ڤێ سەربلندییێ، مرۆڤێن خودێ گەهاندنە وێ پێکا بلند یا کەسێ دی ژ بلی وان نەگەهشتییێ.

تەقوادارییا ڤان چاک و پارسان ئێکا هند ژ وان چێکر ئەو بەرێ خۆ ژ وی جهی ژی وەرگێڕن یێ زۆردار قەست دکەنێ.. خودێ ئەو بۆ جێگرییا پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- یێن داین، و ئەوێ ب جێگرییا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕازی ببت چاڤێن خۆ ب دیتنا مەزنێن دنیایێ تێر ناکەت! بلا نەخۆشی بێتە سەرێ وان، ترس و برسێ ببینن، گۆتنێن زڤر.. گرتن.. لێدان.. نەفیکرن، ئەڤە هەمی ل بەر وان چو نینە، تشتەکێ سڤکە بەرانبەر عەزابا خودێ یا ئەو ژێ دڕەڤن، یا کو دێ گەهتە وان ئەگەر وان هەڤالینییا زۆرداران کر. جارەکێ (عەبدلمەلکێ کوڕێ مەروانی) داخواز ژ عەلییێ کوڕێ حوسەینێ کوڕێ ئیمام

عەلی -ئەوێ ب ناسناڤێ زەینولعابدین دئێتە ناسین- کر کو ژ مەدینێ بێتە نک وی ل شامێ، و بمینتە ل وێرێ، زەینولعابدین ب ڤێ چەندێ یێ ڕازی نەبوو، ئینا خەلیفەی بڕیار دا ب کوتەکی وی بینن، لەشکەرێ خەلیفەی هاتنێ دەست و پییێن وی زنجیرکرن، و بەری وی ببەن زانایێ ناڤدار (ئبن شهابێ زوهری) دەستویری ژ لەشکەری خواست کو دەلیڤەیەکێ د گەل زەینولعابدینی بمینت، گوهدارییا زوهری بکەن دا ئەو ڤێ سەرهاتییێ بۆ مە ڤەگێڕت:

زوهری دبێژت: گاڤا ئەز چوویمە نک زەینولعابدینی و من دەست و پییێن وی زنجیرکری دیتین ئەز گریم، و من گۆتێ: خوزی ئەز نوکە ل شوینا تە بام و تو یێ بەردای بای، وی گۆتە من: ئەی زوهری ما تو هزر دکەی ئەڤ حالێ ئەز تێدا بۆ من یێ نەخۆشە؟ نێ ئەگەر من ڤیابا ئەز یێ گرتی نەدبووم.

بەلێ ڕاستە.. ئەگەر وی ڤیابا دا چت ل دیوانا خەلیفەی ڕوینت و تشتەک یێ ژێ کێم نەدبوو، دا یێ ب قەدر و خاتر بت، بەلێ سوباهی دەمێ ئەو ڕابەری خودێ ڕادوەستیا و پسیار ژێ دهاتەکرن: ئەو چ هەڤالینی بوو تو و خەلیفێ زۆردار گەهاندییە ئێک؟ بۆچی تو ل دیوانا وی دڕوینشتی؟ ئەو دێ چ بێژت؟ نە.. ئەی زوهری بلا نەخۆشییا ئەڤرۆ بت نە شەرمزارییا سوباهی!

(ئەبوو وائل شەقیقێ کوڕێ سەلەمەی) ئێک ژ زانایێن تابعییان بوو، بیست صەحابی دیتبوون، ڕۆژەکێ ئێکی گۆتێ: مزگینییا من ل تە بت کوڕێ تە (یەحیا) یێ بوویە قازی، وی گۆت: ئەگەر تە گۆتبا من کوڕێ تە یەحیا مر، من گەلەک پێ خۆشتر بوو ژ ڤێ گۆتنا تە گۆتی، پاشی وی گۆتە کچەکا خۆ: ژ ئەڤرۆ ویڤە چی تشتێ یەحیا بۆ من بینت ژێ وەرنەگری!

مەزنییا دنیایێ هندە د چاڤێن وان دا یا بێ بها بوو؛ چونکی دنیایێ ب خۆ چو بها ل نک وان نەبوو.. بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو مرۆڤێن خودێ ئەگەر هات و جارەکێ ئێک ژ وان ل دیوانا مەزنەکی ئامادە ببا، قەدرگرتنا وی مەزنی بۆ وی ئێکا هند ژ وی چێ نەدکر کو ئەو خۆ ژ گۆتنا حەقییێ بدەتە

پاش، (مالکێ کورێ دیناری) ڕۆژەکێ چوو دیوانا والیێ (بەصرا)، والی گۆتێ: دوعا بۆ مە بکە، وی گۆتێ: نوکە ل بەر دەرگەهێ کوچکا تە چەند مرۆڤ هەنە زۆرداری یا لێ هاتییەکرن.. ئەو هەمی یێ نفرینان ل تە دکەن!

مرۆڤێن خودێ ئەگەر چ ب پشکدارییا مەزنێن دنیایێ د مەزنییا وان دا ڕازی نابن ژی، بەلێ ئەو خۆ ژ هندێ ژی نادەنە پاش کو حەقییێ بگەهیننە وان؛ دا وان چو هێجەت نەمینن، ڕۆژەکێ (شیخ الإسلام ئبن تەیمیە) چوو دیوانا میرەکێ زالم؛ دا وی ژ خرابییێ پاشدا ببەت، بۆ طان وی میری گۆت: تو مرۆڤەکێ زاهدی یا باش ئەو بوو ئەز هاتبامە نک تە! (شیخ الإسلام)ی گۆتێ: مووسا ژ من چێتر بوو و فیرعەون ژ تە خرابتر بوو، د گەل هندێ ژی مووسا ڕۆژێ سێ جاران دچوو بەر دەرێ کۆچکا فیرعەونی؛ دا حەقییێ بۆ بێژت!!

# ئەو زانایێ ژ مەزنێن دنیایێ ڕەڤی سوفیانێ ثەوری!

ل وی دەمێ دنیا ب نک وی ڤە هاتی وی پشتا خۆ دایێ.. پتر ژ مەزنەکی ژ مەزنێن دنیایێ مراد بوو ڕۆژەکێ ئەو بێت هەڤالینییا وان بکەت و ل دیوانا وان ڕوینت، بەلێ ئەو ل سەر خۆڤەشارتنێ یێ مجد بوو.. ژ ڤی بارژێڕی دڕەڤی دچوو بارژێڕێ دی؛ دا کەس ب جهێ وی نەکەڤت و وی نیشا خەلیفەی نەدەت، جارەکێ پسیار ژێ هاتەکرن: ئەرێ بۆچی تو هندە ژ مەزنان دڕەڤی؟ وی گۆت: ئەز ژ هندێ ناترسم ئەو قەدرێ من نەگرن دەمێ ئەز دچمە نک وان، ترسا من ئەوە ئەو گەلەک قەدرێ من بگرن ڤێجا ئەز حەز ژ وان بکەم و مەیلدارییێ بۆ بکەم!

ڕۆژا ئەو مری خەلکی گۆت: ئەڤرۆ (أمير المؤمنين) د حەدیسێ دا مر، ئەڤ چیایێ (زانین) و (زوهد) و (تەقوایێ) بابێ عەبدللاهی سوفیانێ ثەورییە ڤێجا سوفیان کی بوو؟

**سوفیانێ ثەوری و پێناسەیەکا کورت:**

* ناڤێ وی وەکی ئاشکەرا سوفیانە، کوڕێ سەعیدێ کوڕێ مەسرووقێ ثەورییە، ژ ئویجاخا (بەنی ثەورە)، و خەلکێ بارژێڕێ کووفەیە.

* ل سالا (٩٧) ێ مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ، و چونکی نەگەهشتبوو زەمانێ صەحابییان دئێتە هژمارتن ژ (تابعێن تابعییان).

* زانایەکێ ب ناڤ و دەنگە نەخاسمە د زانینا حەدیسێ دا و ئەو دئێتە هژمارتن ئێک ژ شەش زانایێن مەزن یێن خودان مەزهەب، و (عەبدللاهێ

کوڕێ موبارەکی) دبێژت: من حەدیس ژ هزار و سەد سەیدایان وەرگرتبوو، کەس ژ وان ژ ثەوری باشتر نەبوو.

* ل سالا (١٦١) مشەختی ل باژێڕێ (بەصرایێ) چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

نوکە دا بەرپەڕێ گەشێ سوفیانی د گەل مەزنێن دنیایێ ڤەکەین دا بزانین کانێ ئەو چ بوو سوفیان کرییە سەروەرێ زانایێن وی سەردەمی، حەتا زانایەک وی وەختی بێژت: سوفیان منەتەک بوو خودێ د گەل مرۆڤێن ئیسلامێ کری.

## سوفیان و مەزنێن دنیایێ:

سوفیان ژی وەکی هەر مرۆڤەکێ دی ژ مرۆڤێن خودێ ل وێ باوەرێ بوو کو باشییا هەر مللەتەکی ژ باشییا دو توخمە کەسان دئێت: یا مەزنان، و یا زانایان.. و چاوا خوارن بۆ لەشی یا فەرە دا پێ بژیت، وەسا ئەڤ هەردو توخمە ژی بۆ جڤاتێ دفەرن دا پێ بمینت، و چاوا خوارن دەمێ خراب دبت بۆ لەشی دبتە ژەهر، وەسا مەزن و زانا ژی دەمێ خراب دبن بۆ جڤاتێ دبنە مرن.. و ب دیتنا مرۆڤێن خودێ سەرەکانییا خرابییا مەزنان ژ هندێ دەست پێ دکەت دەمێ ئەو شریعەتێ خودێ -هەمییێ یان هندەکێ- ژ ژینا خەلکی لاددەن و دینی ل دویڤ دلێ خەلکی دبەن، ڤێجا دەمێ وان ئەڤ چەندە کر عەجێبگرتی نەبن ئەگەر هەوە هەمی ڕەنگێن خرابییێ ژێ دیتن؛ چونکی ئەوێ شەرم ژ خودێ نەکەت چو هزرێ بۆ بەنییان ژی ناکەت.

مەزنی ئەگەر ڕێکا خودێ ناسی و لێ چوو و بەرێ مللەتی ژی دایێ، مرۆڤێن خودێ دێ ل دۆر کۆم بن، و بۆ وی بنە هاریکار و پشتەڤان، ئەگەر وی حەقییەک نەزانی ئەو دێ نیشا دەن، ئەگەر ژ بیرکر دێ ئیننە بیرێ، ئەگەر تەحسی دێ دەستێ وی گرن.. ژ خۆ ئەگەر مەزنی پشت دا ڕێکا خودێ مرۆڤێن دنیایێ دێ لێ داجرییێن و قیت کەنە سفرا وی، و مرۆڤێن خودێ دێ ژێ ڤەڕەڤن، هنگی زانا دێ بنە دو پشک: یان دێ خۆ دەنە د گەل مرۆڤێن دنیایێ،

یان دێ د گەل مرۆڤێن خودێ بن. ئەگەر چوونە د گەل مرۆڤێن دنیایێ، ئەو دێ بنە هەڤالێن مەزنان د خرابییێ دا، و هنگی خرابییا وان ل سەر جڤاتێ خۆ ژ خرابییا مەزنان ب خۆ ژی دێ خرابتر بت، بۆچی؟

بەرسڤ بلا بۆ سوفیانێ ثوری بت، سوفیان دبێژت: ((مرۆڤێ زانا دختۆرێ دینییە، و دەرهەم دەردێ دینییە، و هەر جارەکا دختۆری دەرد ئینا خۆ، کی دێ هەبت وی دەرمان کەت؟)) مەزن دەمێ خراب دبن دنیایا مرۆڤی خراب دکەن، بەلێ زانایێن دینی دەمێ خراب دبن دینێ مرۆڤی خراب دکەن، و خرابکارنا دنیایێ د گەل مانا دینی سڤکترە ژ خرابکرنا دینی د گەل مانا دنیایێ، لەو جارەکێ دەمێ پسیار ژ سوفیانی هاتییە کرن: چ تشت ژ هەمییێ خرابترە؟ وی گۆت: ((مرۆڤێ زانا ئەگەر خراب بوو)).

و بۆ وی یێ پسیار بکەت: ئەرێ کەنگی مرۆڤێ زانا خراب دبت؟ سوفیان بەرسڤێ ددەت: ((چی گاڤا تە مرۆڤێ زانا ل بەر دەرگەهێ سولطانی دیت تو بزانە ئەو دزیکەرە، و چی گاڤا تە ئەو ل بەر دەرگەهێ زەنگینان دیت تو بزانە کارێ وی ڕیمەتییە))، مەعنا: زانا ب ڤان هەردو ڕێکان خراب دبن، و ئەڤ زانایێن خراب ئەون دینێ خەلکی ددزن دا دنیا خۆ پێ خۆش بکەن، دینێ خۆ گۆری مەزنان دکەن دا بەریکێن خۆ ئاڤاکەن، و زانینا خۆ قوربانی زەنگینان دکەن دا ل سەرێ کۆچکان بێنە دانان.. و مرۆڤێن نەزان دەمێ وان ب ڤی ڕەنگی دبینن هەمی هزرا وان دبتە ئەو کو هەما دین هەر ئەڤەیە، لەو ئەو ژی دێ چاڤ ل وان کەن، یان دێ ژ دینی ڕەڤن.. ئەرێ ما خرابی ژ ڤێ مەزنتر هەیە؟

بەلێ خودێ رەحم یا ب مرۆڤان بری، ل هەمی دەم و هەمی جهان ئەو کتەکا بژارە ژ زانایێن دورست پەیدا دکەت دا بۆ خەلکی بینە نموونەیێن چاکییێ و ڕێنیشاندەرێن ڕاستییێ، و ژ لایەکێ دی ڤە دا بینە باشترین بەرسڤ بۆ وان زانایێن (دزی) و (ڕیمەتی) بۆ خۆ کرییە کار و کەسب.

پشتی ڤێ رێخۆشکرنێ کەرەم کەن دا دەفتەرا سوفیانێ ثەوری د گەل مەزنان ڤەکەین دا بزانین کانێ چاوایە دەمێ زانا مفایی ژ زانینا خۆ دبینت..

سوفیان مرۆڤەکێ فەقیر بوو، پتریا ژیێ خۆ یێ بەردەست تەنگ بوو، هندەک جاران دو سێ رۆژ ب سەر دا دچوون دانەکێ خوارنێ ب دەست نەدکەفت، هەڤالێ وی (ئەبوو شهابێ حەنناط) دبێژت: رۆژەکێ ئەز چوومە نک سوفیانی ل کەعبێ خۆ درێژ کربوو، من سلاڤ کرێ، وی ب سستی جابا سلاڤا من دا، من گۆتێ: خویشکا تە هندەک خوارن یا بۆ تە هنارتی، ئینا ئەو ئێکسەر رابووڤە، من گازندە ژێ کرن و گۆتێ: بۆچی تە ب سستی جابا سلاڤا من دا؟ وی گۆت: د ناڤبەرا من و تە دا بت، ئەڤە سێ رۆژە من تشتەک نەخوارییە، گاڤا تە بەحسێ خویشکا من کری، من زانی ئەو خوارنا وێ بۆ من هنارتی دێ ژ کارێ تەشییا وێ بت.

گاڤا خەلکی ئەو د ڤی حالی دا ددیت، هندەکان ئەو ژ فەقیرییێ دترساند، لەو وی دگۆتە وان: ((هوین من ژ فەقیرییێ دترسینن؟ ترسا من ئەوە دنیا بکەفتە دەستێن من)). ترسا سوفیانی ئەو بوو زەنگین ببت، و ڤیانا دنیایێ جهێ خۆ د دلی دا بکەت، و سوفیان ئەوە یێ د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((ئەو دلێ ڤیانا دنیایێ تێدا بت، ترسا ئاخرەتێ ژێ دەردکەڤت))، دبێژن: زوهد ئەوە مرۆڤ دلێ خۆ نەبەتە دنیایێ، بەلێ فەرقە مرۆڤەکی دنیا نەکەفتە لەپان ڤێجا دلێ خۆ نەبەتێ، و ئێکی دنیا ل بەر دەستی بت و ئەو دلێ خۆ نەبەتێ، و سوفیان ژ ڤی رەنگێ دویێ بوو، لەو زاهدێن سەردەمێ وی دگۆتن: یێ زاهد سوفیانە، دنیا ب نک ڤە وی هات، وی پشتا خۆ دایێ!

و دا هوین بزانن چاوا دنیا ب نک وی ڤە هات، و چاوا وی پشتا خۆ دایێ وەرن پتر خۆ نێزیکی جیهانا سوفیانی بکەین..

## سوفیان و ڕەڤینا بەردەوام:

ل نک گەلەک کسان ڕزگاری ئەوە مرۆڤ د دنیایێ دا د خۆشییان دا بژیت و یێ ب سلامەتی بت، بەلێ مرۆڤێن خودێ ب ڕەنگەکێ دی د ڕزگارییێ دگەهن: کو مرۆڤ دنیایا خۆ بپارێزت و دینێ خۆ ژ دەست بدەت هنگی مرن ژ مانێ چێترە، (سەلەمەیێ کوڕێ دیناری) گەلەک جاران دگۆتە خەلکی: ((ئەزێ ڕازیمە ئێک ژ هەوە هند چاڤێ خۆ بدەتە دینێ خۆ هندی چاڤێ خۆ ددەتە نەعالا خۆ))!

سوفیان ل وێ باوەرێ بوو کو پاراستنا دینێ مرۆڤێ زانا ب هندێ دبت کو ئەو خۆ ژ کۆچک و دیوانێن مەزنێن دنیاییێ بدەتە پاش، و دەستێ خۆ نەکەتە د ناڤ دەستێن وان دا؛ دا ل ڕۆژا ڕابوونا مەزن ژ دەستەکا وان نەئێتە هژمارتن. سوفیانی هەڤالەک هەبوو دگۆتنێ: (یووسف) ڕۆژەکێ خەلیفێ عەباسی (ئەبوو جەعفەری) ئەو بۆ والیاتییێ هلبژارت، خەلک چوونە نک دا کارێ وی یێ نوی لێ پیرۆز بکەن، سوفیان ژی چوو نک نە دا پیرۆزییان لێ بکەت، نە.. سوفیانی گۆتێ: ((تێچوون بۆ تە بت ئەی یووسف! وان بێ کێر تو سەر ژێ کری، ئەگەر ل ڕۆژا قیامەتێ هاتە گۆتن: کانێ ئەبوو جەعفەر و دویکەفتییێن وی بلا ڕابن و تو ژی د گەل بی، هنگی تو دێ چ کەی؟)).

ڕۆژەکێ هزر وەسا بۆ خەلیفەی چێبوو کو سوفیانی بکەتە قازییێ کووفە، ئینا وی هنارتە ب دویڤ ڕا، و پشتی ئەو ل دیوانا خەلیفەی هاتییە ئامادەکرن وی سلاڤ کرە خەلیفەی ب ناڤێ وی و نە گۆتێ (أمیر المؤمنین).. خەلیفەی ب ڕوییەکێ گەش ڤە گۆتێ: ئەی سوفیان تو خۆ ژ مە ڤەدشێری یا ژ تە ڤە ئەم نەشێینە تە، ئەڤە مە تو گرتی ڤێجا ما تو ناترسی ئەم حوکمەکێ ل دویڤ دلێ خۆ بدانینە سەر تە؟

سوفیانی گۆتێ: ئەگەر تو بشێیە من حاکمەکێ دی یێ خودان شیان هەیە دشێتە تە، و ئەو حەقییێ و نەحەقییێ ژێکجودا دکەت.

وەزیری گۆتە خەلیفەی: ئەی (أمیر المؤمنین) چاوا ئەڤ نەزانە ب ڤی رەنگی د گەل تە دئاخڤت؟ دەستویرییێ بدە من دا سەرێ وی ژ سەر قالبی بفرینم!

خەلیفەی لێ حەیتاند و گۆتێ: مرن بۆ تە بت، ما تو نزانی سوفیان و یێن وەکی وی حەز دکەن ئەم وان بکوژین؛ دا خۆشیا وان ببتە ئەگەرا شەرمزارییا مە؟ بنڤیسە: مە بڕیار دا سوفیان ببتە قازییێ کووفە ب وی شەرتی کەس مایێ خۆ د وی نەکەت.

پشتی فەرمانا خەلیفەی هاتییە نڤیسین و مۆرکرن وان ئەو کرە د دەستێ سوفیانی دا، سوفیان ژ دیوانا خەلیفەی دەرکەفت و ب نک ڕوویبارێ (دجلە) ڤە چوو، و فەرمانا خەلیفەی د ئاڤێ دا بەردا.. و ڕەڤی! تو دا بێژی عەردی ئەو داعویرا یان عسمانی هلکێشا، خەلیفەی جهەک نەهێلا و ڤێ نەکەفت.

بەری بۆ هەوە بێژین کانێ سوفیان کیڤە چوو، مە دڤێت سەرهاتییەکا وی یا دی د گەل بابێ ڤی خەلیفەی بۆ هەوە ڤەگێڕین: ئەڤ خەلیفێ مە نوکە بەحس ژێ کری (ئەبوو عەبدللاهێ مەهدی) یێ عەبباسی بوو، کوڕێ (ئەبوو جەعفەرێ مەنصوور)، جارەکێ ل مەکەهێ سوفیان و ئەبوو جەعفەر کەفتنە بەرانبەری ئێک، ئەبوو جەعفەری ملێ سوفیانی گرت و بەرێ وی دا کەعبێ و گۆتێ: ئەز تە ب خودانێ ڤێ بەیتێ ددەمە سویندێ تو من چاوا دبینی؟ سوفیانی گۆتێ: ئەز ب خودانێ ڤێ بەیتێ کەمە من تو دیتی پیسترین زەلام! و دەستێ وی بەردا و چوو..

سوفیانی کاغەزا خەلیفەی بۆ ماسییان بەردا د ئاڤێ دا، پاشی ژ بەغدا ڕەڤی.. ئەو نەچوو باژێڕێ خۆ کووفە؛ چونکی وی دزانی ئەو دێ ئێنە وێرێ لێ گەڕیێن، قەستا بەصرا کر، و نەچوو ناڤ باژێڕی دا کەس پێ نەحەسییێت، چوو ناڤ بیستانەکێ دارقەسپان و گۆتە خودانی: ئەز مرۆڤەکێ بێ ڕێمە ئەگەر تە بڤێت ئەز دێ بۆ تە ل بەر بیستانێ تە بم و تو هەر ڕۆژ خوارنێ بدە من، وی

گۆتى: بلا من قەبويلە. ڕۆژەكێ هندەك باجەستين د بەر بيستانى ڕا بۆرين، هاتنە ناڤ بيستانى، سوفيان ب تنێ يێ حازر بوو، گۆتنێ: تو يێ ژ كيبى؟ وى گۆت: ئەز خەلكێ كووفەمە، گۆتنێ: ئەرێ خورما بەصرا شرينترە يان يا كووفە؟ سوفيانى گۆت: خورما كووفە ئەز دزانم يا شرينە، بەلێ يا بەصرا من نەخوارييە ئەز نزانم. وان مرۆڤان گۆتێ: هەى پا تو مرۆڤەكێ درەوينى! ما صەيەك ژى مايە ل ڤێرێ خورما بەصرا نەخوارى، تو دبێژى هێشتا من نەخوارييە؟ پشتى ئەو باجەستين زڤرينە بەصرا وان سوحبەتا خۆ بۆ والى ڤەگێرا، والى گۆت: بگەهنێ هەبت نەبت ئەو دێ سوفيان بت.. مرۆڤەك ل بەصرا ل بەر بيستانەكێ دارقەسپان بت، و هێشتا تام نەكربتە خورما بەصرا، ئەگەر ئەو سوفيان نەبت ئەو كەسێ دى نابت.. و حەتا ئێلچييێن والى گەهشتينە ناڤ بيستانى وان ديت ئەو زەلامێ خەلكێ كووفە يێ چووى خاترا خۆ ژ خودانێ بيستانى يا خواستى و ل بەصرا هەمييێ نەمايە!

ڤێ جارێ كيڤە بچت؟

- بۆ يەمەنێ.. يەمەن جهەكێ دويرە و كەس ل وێرێ وى نانياست و ئەو دێ ژ خەلكى دويركەڤت.

سوفيان دبێژت: وەختێ ل سەر دەمێ (مەهدى) ل من دگەڕيان ئەز هاتمە يەمەنێ، ژ ڤى تاخى بۆ تاخێ دى ئەز دچووم، و چى جهێ ئەز گەهشتبامێ ئەز دچوومە مزگەفتێ، جارەكێ دەمێ ئەز ل مزگەفتێ دزييەك ل وى تاخى هاتەكرن يێ ئەز لێ، خەلكى ئەز گرتم و برمە نك والى (مەعەنێ كوڕێ زائدەى)، وى ناڤێ من گوهـ لێ بووبوو بەلێ ئەز نە دنياسيم، گۆتنێ: ڤى دزييا مە يا كرى، وى پسيارا من كر: بۆچى تە دزييا وان كرييە؟ من گۆت: من چو دزى نەكرينە، والى گۆتە خەلكى: كانێ دەركەڤن دا ئەز پسيارا وى بكەم.. دەمێ ئەم ماينە ب تنێ والى گۆتە من: ناڤێ تە چيە؟ من گۆتێ: ئەز عەبدللاهێ كوڕێ عەبدررەحمانيمە، وى گۆت: ئەز تە ب خودێ ددەمە سويندێ ناڤێ خۆ يێ

دورست بۆ من بێژە. من گۆت: ناڤێ من سوفیانێ کورێ سەعیدییە، وی گۆت: سوفیانێ ثەوری؟ من گۆت: ئەرێ! وی گـۆت: تـو ئەویـی یـێ (أمیـر المـؤمنین) ل تە دگرییێت و بۆ من نڤیسی کو هەر جارەکا ئـەز تـە ببینم تـە بگرم و بـۆ وی بهنێرم؟ من گۆت: بەلێ.. بیهنەکێ وی سەرێ خۆ چەماند، پاشی گـۆت: هنـدی تە بڤێت ل نک مە بمینە و چی گاڤا تە ڤیا هەرە، ب خودێ ئەگەر خۆ تـو ل بـن پێ من یێ ڤەشارتی بی ئەز پێ خۆ ڕاناکەم دا کەس تە نەبینت.

(مەهدی) ژی وەکی بابێ خۆ (مەنصووری) چوو، و سوفیان یێ ڤەشارتی، خیلافەت گەهشتە کورێ وی (هاروون ئەلرەشیدی)، هاروونی ڤیا هەڤالینییا خۆ یا کەڤن د گەل سوفیانی نوی کەتەڤە، چونکی هـاروون و سـوفیان هـەردو پێکڤـە شاگردەیێن ئیمام مالکی بوون، وان حەدیس ل نک خواندبوو، هاروون مرۆڤـەکێ زانا بوو و گەلەک حەز ژ زانایان ژی دکر، بەلێ چونکی ئەو د حوکمدارییا خۆ دا وەکی ئێک ژ هەردو عومەران نەبوو سوفیانی خۆ نێزیک نەکر، و هـەر ڤـەشارتی ما.. مـرادا هـاروونی ئەو بوو سوفیانی ببینت، بەلێ کـانێ سـوفیان کـی دزانـت ل کیڤەیە؟

ئـەبـوو ئـەحـمـەدێ زوبەیری دبێژت: ڕۆژەکـێ ئـەز و سـوفیان ل (منـایێ) د مزگـەفتـەکـێ ڤـە بـووین بانگهلـدێرەکـی گـازی کـر: (أمیـر المـؤمنین هـارون الرشید)ی فەرمان دایە هەچی کـەسـێ سوفیانێ ثـەوری نیشـا مـە بـدەت ئـەم دێ دەهـ هزاران دەینێ!

و جارەکێ دەمـێ (مـەهدی) ل سوفیانی دگەڕیا، هاتە حەجێ و وی زانـی کو سوفیان یێ ل مەکەهێ ئینا وی گۆتە زەلامێن خۆ: هەر چاوا بـت دڤێت وی بۆ من بینن، ئەو ڕابوون خۆ د ڕێکێ دا ل سوفیانی ڤەشارت، گاڤا سوفیان بۆری وان خۆ لێ دا و گرت و برە نک خەلیفەی، خەلیفەی گـۆتێ: بـابێ عـەبدللاهی! ئەڤە تو ل کیڤەیی جهەک مە نەهێلا هندی ئەم ل تە دگەڕیێین.. باش بوو خـودێ تو ئێخستییە دەستێن مە، کانێ بێژە تە چ دڤێت دا ئەم بۆ تە بکەین؟

سوفیانی گۆتێ: ما دێ من چ ڤێت؟ ب خێرا شیرێن (موهاجر) و (ئەنصاریيان) تو یێ گەهشتییە کورسیکێ و ئەڤرۆ بچویکێن وان ل بەر دەرگەهێ تە ژ برسان دا دمرن! عومەرێ کورێ خەططابی دەمێ هاتییە حەجێ هەژدە دینار خەرجکرن و د گەل هندێ ژی گۆتە هەڤالێ خۆ: مە گەلەک خەرج کر، تو ئەڤرۆ بێ هژمار یێ خەرج دکەی.. خەلیفەی گۆتێ: باشە ما ئەگەر ئەز نەشێم حەقێ هەر کسەکی بگەهینمێ؟ سوفیانی گۆتێ: ئەگەر تو نەشێی هەرە ل مالا خۆ روینە!

ب ڤی رەنگی سوفیانی ژیبێ خۆ بۆراند، هندی ژێ هاتی ژ دیوانا مەزنێن دنیایێ رەڤی، و ئەگەر جارەکێ هۆسا نەچار ببا ل دیوانا ئێک ژ وان ئامادە ببا ژی بێ ترس و دودلی وی حەقی دگۆت.

هەڤالێ وی (عەبدررەحمانێ کورێ مەهدی) دبێژت: سوفیانی خۆ ل نک مە ل بەصرا ڤەشارتبوو؛ دا خەلیفە ڤێ نەکەڤت، گاڤا کەفتییە بەر مرنێ و نساخبووی -و نساخییا وی ئێشا زکی بوو- وی دگۆت: ((خلاص، ئێدی خۆڤەشارتن نەما، خۆڤەشارتن نەما!)) و دەمێ ئەو مری شەڤ بوو، هەر وێ شەڤێ مە کارێ وی کر و بر ڤەشارت بەری سولطان پێ بحەسییێت.

هەڤالەکێ وی یێ دی دبێژت: گاڤا سوفیان مری من د خەونێ دا ددیت هەر وەکی ئەزێ ل بەحەشتێ چار زانایێن حەدیسێ ژ خەلکێ بەصرا دروینشتی بوون بۆ خۆ دئاخفتن، من پسیار ژ وان کر: پا کانێ سوفیان بۆچی ئەو د گەل هەوە نینە؟ وان سەرێن خۆ بلندکرن و گۆتن: وەسا ئەم وی دبینین وەکی مرۆڤ ستێران ل عەسمانی دبینت.

ئەڤە سوفیان بوو.. ئەوێ خودێ حەدیسا پێغەمبەرێ خۆ -سلاڤ لێ بن- ب وی و یێن وەکی وی پاراستی، (عەبدررەحمانێ کورێ مەهدی) دبێژت: کەس وەکی سوفیانی من نەدیتییە، گاڤا ئەز دچوومە دیوانا وی ژ هەیبەتێن وی دا من شەرم دکر بەرێ خۆ بدەمێ، ب شەڤێ من زێرەڤانی لێ دکر، دەمەکی دا

نڤت پاشی جرفەک ڤێ دکەفت و وی ب ترس ڤە دگۆت: ئاگر.. ئاگر، ترسا ئاگری خەو ژ چاڤێن من رەڤاند. و دا رابت دەست ب نڤێژان کەت حەتا لێ دبوو سپێدە، شەڤەکێ گوهێ من لێ بوو وی دگۆت: ((یا رەببی! تو دزانی من چ دڤێت، داخوازا من ئەوە تو من ژ ئاگری ئازا کەی، یا رەببی ترسا ژ ئاگری خەوا ژ چاڤێن من رەڤاندی، و ئەگەر بۆ من دورست با ئەز د ناڤ خەلکی دا نەدمام..)) پاشی هند دکرە گری ژ بەر دەنگێ گرییێ من نەدزانی کانێ ئەو چ دبێژت!

سلاڤ ل سوفیانی بن دەمێ وی پشتا خۆ دایە دنیایێ و بەرێ خۆ دایە ئاخرەتێ..

## حەسەنێ بەصری
## ئەوێ دیتنا وی خودێ ل بیرا مرۆڤی دئینا

ڤێ جارێ مە ل بەرە بەرپەڕێن ژینا مرۆڤەکێ ژ ڕەنگەکێ تایبەت ڤەکەین، لەو دڤێت باش کارێ خۆ بکەین.. مرۆڤەک بوو ئەوێن ئەو دیتی وەصفا وی هەمی د پەیڤەکێ دا کۆم دکر، دگۆتن: ((دەمێ مرۆڤی ئەو ددیت بیرا مرۆڤی ل خودێ دهاتەڤە)).

ئەگەر تە بەرێ خۆ دابایێ دەمێ ئەو ب ڕێڤە دچوو، تو دا بێژی ئەو ئێخسیرەکە یێ هاتییەگرتن، و یێ دبەن دا سەرێ وی ببڕن.. گاڤا بەحسێ جەهنەمێ ل نک وی هاتباکرن وە ل وی دهات تو دا بێژی جەهنەم بەس بۆ وی یا هاتییە چێکرن.. ئەو زەلامەک بوو هاتبوو د دنیایێ دا؛ دا دنیا ب ئەزمانێ وی باخڤت، ئەو پێغەمبەر نەبوو، و قەدەرا وی یا وەسا بوو ئەو ل زەمانێ چو پێغەمبەران ژی نەبت، بەلێ یێ تێکەلییا وی کربا هیچ گومان بۆ چێ نەدبوو کو ئەو ژ بەرماییێن پێغەمبەراتییێیە، گاڤا دئاخڤت دا بێژی دل و رح و دیمێ وی هەمی د گەل ئەزمانێ وی یێن دئاخڤن، لەو هێزەکا وەکی یا مەغناطیسی وی هەبوو، نەبوو کێشانا ئاسنی، بەلکی بۆ کێشانا دلێن مرۆڤان، حیکمەت ژ دەڤی دپەشی لەو دەمێ دئاخفت مرۆڤی ڤیابا نەڤیابا دا گوهێ خۆ دەتێ حەتا وی ئاخفتنا خۆ ب دووماهی ئینابا..

ڕۆژا ئەو مری زەلامەک د باژێری دا نەمابوو نڤێژا ئێڤاری ل مزگەفتێ بکەت، و ئەو جارا ئێکێ بوو پشتی (بەصرا) هاتییە ئاڤاکرن نڤێژا ب جماعەت لێ نەئێتەکرن، هوین دزانن بۆچی؟

- چونکی زەلام هەمی د گەل جەنازەیێ (حسەنێ بەصری) دەرکەفتبوونە سەر قەبران، دا بێژی کفنەکێ سپی یێ د بەصرا هەمیییێ ئالاندی! و ئەگەر مرنێ هەمیییێ ئێک مەعنا هەبت ژی، دەمێ (عەزیزێ) هندەکان دمرت کانێ ئەو چەندن هند مەعنا ژ مرنێ دچن، لەو مرنا حسەنی هندی هژمارا خەلکێ بەصرا مەعنا ژێ دچوون..!

بەلێ.. ڤێ جارێ ئەم دێ ل دیوانا ئیمامێ حسەن ئامادە بین، ئەوێ ب حسەنێ بەصری دئێتە نیاسین، بەلێ تشتێ مرۆڤی حێبەتی دکەت دەمێ دڤێت بەحسێ حسەنی بکەت ئەوە مرۆڤ نزانت ژ کیڤە دەست پێ بکەت، و بەحسێ چ بکەت و چ نەکەت..

### دەسپێکەکا پیرۆز:

ل باژێرێ (مەدینا مونەووەر) ل نێزیکی مالەکێ ژ مالێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دو سالان بەری ئیمامێ عومەر شەهید ببت، حسەن هاتبوو سەر دنیایێ، بابێ وی و دەیکا وی هەردو عەبد بوون هاتبوونە ئازاکرن، دەیکا وی جارییا (أم سلمە)یێ بوو، و گەلەک جاران دەمێ کارەک بۆ دەیکا وی چێ دبوو، وێ زارۆکێ خۆ یێ ساڤا دهێلا ل نک دەیکا موسلمانان (أم سلمە)یێ حەتا دزڤڕی، و هندەک جاران دەمێ وی دکرە گری، (أم سلمە)یێ پاخلا خۆ دکرە د دەڤی دا؛ دا وی تەنا بکەت، لەو دگۆتن: حسەنی پەیوەندییەک ب پێغەمبەرینییێ ڤە هەبوو، و دبێژن: دەمێ حسەن یێ ساڤا هندەک جاران (أم سلمە)یێ ئەو دهنارتە نک صەحابییان ل مزگەفتێ، و ئاشکەرایە کو مەزەلکا وێ ب رەخ مزگەفتێ ڤە بوو، و جارەکێ ژ وان جاران ئیمامێ عومەر ئەو هلگرت و دوعایەک بۆ کر و گۆت: یا رەببی تو وی زانا بکەی د دینی دا و وی ل بەر خەلکی شرین بکەی..

و هەر وەکی دوعایا عومەری د دەر حەقا وی دا ب جهـ هات!

حسەنی گەلەک صەحابییێن مەزن دیتبوون، وەکی عوثمانی و عەلی و طەلحەی و زوبەیری، و وی حەدیس ژ هژمارەکێ ژ وان ریوایەت دکر، بەلێ تشتێ بەر چاڤ ل نک وی ئەو بوو، دەمێ ئەو یێ جحێل وی دەمێ خۆ هند نەددا وەرگرتنا علمی هندی ددا کرنا جیهادێ، لەو ریوایەتێن وی یێن حەدیسێ ژ صەحابیان دکێم بوون..

حسەن مرۆڤەکێ زەلام باش بوو، هەیبەتەکا زێدە ل نک هەبوو، و جوانییەکا بەر چاڤ ژی وی هەبوو، (العوام بن حوشب)ی دگۆت: ئەز تەشبیها حسەنی ب پێغەمبەرەکی دکەم. و (ئەبوو بوریدە) دبێژت: من نەدیت مرۆڤەک هندی حسەنی وەکی صەحابییێن موحەممەدی بت. و هندەک جاران دەمێ مرۆڤەکی پسیارەک ژ صەحابییێ پێغەمبەری ئەنەسێ کورێ مالکی کربا دەمێ ئەو پیربووی، ئەو دا بێژت: پسیارا حسەنی بکەن، وی یا ژ بەرکری و مە یا ژبیرکری.

بۆ ڕەهوانبێژی و دەڤ و ئەزمانان دبێژن: ل وی زەمانی کەس ژ حسەنی و حەججاجێ ئەقەفی ب دەڤ و ئەزمانتر نەبوون. و دەمێ بەحسێ وی ل نک ئیمام (محمد الباقر)ی دهاتەکرن وی دگۆت: حسەن، ئەوێ ئاخفتنا وی وەکی ئاخفتنا پێغەمبەران؟! و گاڤا ئەو ل مزگەفتێ دڕوینشت و دەست ب وەعزی دکر ب سەدان شاشک ل دۆر وی کۆم دبوون، دا بێژی هەر ئێکی طەیرەکێ ل سەر سەری، وەسا ب گۆتنا وی ڤە دهاتنە گرێدان، و پتر جاران وەعز و گۆتنا وی ل دۆر زوهدێ و سلووکی و ترساندنا ژ مرنێ و ئاخرەتێ بوو.

ل دۆرێن چاردە سالییێ مالا وی ژ مەدینێ بۆ بەصرا هاتە ڤەگوهاستن، و ئەو د گەل دەیبابێن خۆ هات و قەستا ڤی بازێڕی کر، و بەصرا هنگی قەلعەیەک بوو ژ قەلعەیێن ئیسلامێ یێن مەزن، چونکی دکەفتە سەر توخوبێن دەولەتا ئیسلامێ، و هژمارەکا مەزن ژ صەحابی و تابعییێن مەزن ل ڤی بازێڕێ نوی

هاتییه ئاڤاکرن ئاکنجی بووبوون، حسەن ژی ل ڤی باژێری ئاکنجی بوو، لەو ئەو ب ناسناڤێ (حسەنێ بەصری) دهاتە نیاسین.

و ئەو هەر ل ڤی باژێری مربوو، ل دەسپێکا هەیڤا رەجەبێ ژ سالا (١١٠) مشەختی، ل سپێدەییا ئەینییێ، و ل مزگەفتا بەصرا پشتی نڤێژا ئەینییێ نڤێژ ل سەر وی هاتەکرن، و خەلک ل دویڤ جەنازێ وی دەرکەفت، و وێ رۆژێ وەکی مە گۆتی بۆ جارا ئێکێ د دیرۆکا بەصرا دا نڤێژا ئێڤاری ل مزگەفتێ نەهاتەکرن، چونکی کەس نەمابوو د باژێری دا هەمی چووبوونە سەر زیارەتان!

## تشتێ حسەن بلندکری:

نوکە دبت هندەک ژ هەوە د گەل خۆ پسیار بکەن: ئەرێ ئەو چ بوو حسەن گەهاندییە ڤێ دەرەجێ؟ و بۆچی ئەو هندە ل بەر خەلکی یێ ب بها بوو؟

جارێ گوهێ خۆ بدەنە جیرانێ وی و هەڤالێ وی (خالدێ کورێ صەفوانی) چاوا حسەنی ب مە ددەتە نیاسین، رۆژەکێ ئەمیرەکی پسیارا حسەنێ بەصری ژ وی کر، کانێ ئەو یێ چاوایە، وی گۆت: ((ئەز باش وی دنیاسم، ئەز جیرانێ وێ مالێ مە، و هەڤالێ وی یێ مزگەفتێمە.. کانێ ئەو ب سەرڤە یێ چاوایە ژ بن ڤە ژی ئەو یێ وەسایە، گۆتنا وی وەکی کریارا وییە، ئەگەر ئەو باشییەکێ نیشا خەلکی بدەت بەری هەمییان ئەو ب خۆ وێ دکەت، و ئەگەر ئەو وان ژ خرابییەکێ بدەتە پاش ئەو بەری هەمییان خۆ ژێ ددەتە پاش، من دیت ئەوی خۆ ژ خەلکی بێ منەت دکر، دلێ خۆ نەدبرە وی تشتێ د دەستێ وان دا هەی، و خەلک هەمی دهەوجەیی وی بوون، داخوازا وی تشتی دکر یێ ل نک وی هەی..)).

وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی هەر بەرپەرەکێ هەی د ژیانا حسەنێ بەصری دا، یێ ژ هەژی هندێیە مرۆڤ ل نک راوەستت و عیبرەتان ژێ وەربگرت، و هلبژارتنا هندەک ژ ڤان بەرپەران بۆ بەحس ژێ کرنێ د چەند دەقیقەیەکێن کێم دا

کارەکێ ب ساناهی نینە، بەلێ هەر چاوا بت ئەو نوکە بۆ مە کارەکێ پێتڤییە، دا بشێین گۆتنا خۆ ل دۆر مرۆڤێن خودێ تمام بکەین..

حسەن د دەمەکی دا ژیابوو، گەلەک گوهۆڕینێن مەزن ب سەر جیهانا ئیسلامی دا هاتبوون، دەمێ فتنەچی دژی خەلیفێ راشدی یێ سێیێ عوثمانێ کوڕێ عەففانی ڕابووین و مەسەلە گەهشتییە هندی ئەو ئیمامی بکوژن، حسەن یێ سێزدە چاردە سالی بوو، و پشتی خیلافەت گەهشتیە ئیمامێ چارێ عەلییێ کوڕێ ئەبوو طالبی، و وی خۆ ژ مەدینێ ڤەگوهاستییە باژێڕێ کووفە ل ژێرییا عیراقی، حسەنی ژی -د گەل مالا خۆ- قستا بەصرا کر و ل وێرێ ئاکنجی بوو، و ڤوینـاغا ڤەگوهاستنا خیلافەتێ ژ مەدینێ بۆ کووفە، پاشی بۆ شامێ وی ب چاڤ دیت، نیڤەک ژ زەمانێ خیلافەتا راشدی، و هەمی دەمێ عەدالەتا موعاویەی، پاشی پشتی خیلافەت کەفتییە دەستێ جحێلێن بنەمالا ئومەییەی، و وێ بەرفرەهییا دەولەتا ئیسلامێ ل سەر دەستێ وان دیتی، و د گەل وێ زولما هندەک جاران ژ هندەک ژ وان پەیدا دبوو، پاشی دەمێ عومەرێ دویێ جارەک دی بیرا خەلکی ل زەمانێ راشدییان ئینایەڤە، و پشتی عومەر ژ مەیدانێ دەرکەفتی، و جارەکا دی مەسەلە زڤڕییە مەلکاتییا ب کوتەکی.. ئەڤە هەمی حسەنی ب چاڤ دیتبوو.

ئەڤە ژ لایێ سیاسی ڤە، و ژ لایێ علمی ڤە ئەو دەمێ حسەن لێ ژیای دەمێ بەلاڤکرنا علمێ شەرعی بوو، صەحابییان ژ لایێ خۆ ڤە، و د گەل وان و پشتی وان ژی طەلەبێن وان ژ تابعییان هەمی هێزا خۆ بۆ بەلاڤکرنا کیتابێ و سوننەتێ، و (عەصرێ تەدوینێ) -وەکی دئێتە نیاسین- دەست پێ دکر..

ژ لایێ جڤاکی ڤە، دو دیاردە دبەرچاڤ بوون: دیاردا دەولەمەندی و تەرەفێ و خۆ مژویکرنا ب دنیایێ ڤە، و دیاردا زوهدێ و دەستبەردانا ژ دنیایێ، ئەوا پشتی هنگی ب ناڤێ (تەصەووفێ) هاتییە نیاسین..

حسەنێ بەصری د ڤان هەمی مەیدانان دا (جەولە) هەبوون، و وی د هەمی ڤان (مەجالاتان) دا هەلویست و گۆتن و بۆچوون هەبوون، حسەن چەند یێ دویر بوو ژ جڤاکا خۆ هند یێ نێزیک ژی بوو، دویر ژ سیاسەتێ وی سیاسەت دگوهارت، و بێی دلێ خۆ ببەتە وی تشتێ د دەستێن خەلکێ دنیایێ دا هەی وی بیر و بۆچوونێن خەلکێ دنیایێ دگوهارتن، هەڤالینییا خەلیفە و ئەمیران نەدکر و خۆ ژ کۆچک و دیوانێن وان ددا پاش، د گەل هندێ ژی مرادا هەمی خەلیفە و ئەمیران ئەو بوو هەڤالینییا حسەنی بکەن، ل وان جهێن خەلک پاشڤە دچوو حسەن پێشڤە دچوو، و ل وان جهێن خودان جەرگ دترسییان و مەصلحەتچی بێ دەنگ دبوون حسەنی بێ ترس دەنگێ خۆ بلند دکر، و دا هوین هزر نەکەن ئەڤ گۆتنا مە ب تنێ (ئینشائەکا بێ دەلیلە) وەرن دا پێکڤە ڤی بەرپەڕی ژ دیرۆکا وی ڤەکەین، د گەل کێ؟ د گەل حەججاجی، ئەوێ -ل وی دەمی- ناڤێ وی ترس و لەرز دئێخستە دلێ خەلکی، چونکی یێ حەججاج لێ ب غەزەب هاتبا حسێب بکە ئەو ژ دەیکا خۆ نەبوویە!

## د ناڤبەرا حسەنی و مەزنان دا:

جارەکێ حەججاجی قسرەکا مەزن و جوان بۆ خۆ ل باژێرێ (واسطێ) ئاڤاکر، و پشتی ئاڤاهی ب دوماهی هاتی، وی رێ دا خەلکی هەمییێ کو بێن بەرێ خۆ بدەنە ئاڤاهی و خۆشییێ ب دیتنا وی ببەن، و دوعایا بەرەکەتێ بۆ ئاڤاهی و خودانێ وی بکەن.. ئیمامێ حسەن خیلافێ عەدەتێ خۆ بریار دا، ئەو ژی د گەل خەلکی بچت تەماشەی قسرا ئەمیری بکەت، گاڤا حسەنی دیتی خەلک ب جوانییا قسرا حەججاجی و فرەهی و نەخش و نیگارێن وێ مەندەهووش بوون، ئەو د ناڤ وان دا رابووڤە و دەست ب خواندنا خوتبەیەکێ کر.. و د ڤێ خوتبەیێ دا گۆت: ((مە هەمییان پێکڤە ئەو ئاڤاهی دیت یێ پیسێ پیسان ئاڤاکری، و مە دیت کو ئەو ئاڤاهییێ فیرعەونی ئاڤاکری گەلەک ژ ئاڤاهییێ وی مەزنتر و بلندتر بوو، پاشی خودێ فیرعەون برە هیلاکێ و

ئاڤاهییێ وی ژی هەرفاند.. خوزی حەجاجی زانیبا کو خەلکێ عسمانی ئەو نەڤیایە، و خەلکی عەردی ئەو خاپاندییە حەتا غوروورێ ئەو گرتی..)).

ب ڤی ڕەنگی ئەو پێدا چوو، د ناڤ حێبەتی و دەهشەتا وی خەلکێ ئامادەبووی دا، حەتا هندەک ژ وان دل مایە پێڤە و ترسیاین حەجاج ل وی ب غەزەب بێت، لەو مرۆڤەکی گۆتێ: بابێ سەعیدی، هندە بسە! وی گۆت: خودێ پەیمان ژ زانایان وەرگرتییە کو ئەو حەقییێ نیشا خەلکی بدەن و چویێ ژێ نەڤەشێرن..

و کۆما خەلکی ڤەرەڤی.. بەلێ هندەک خودان خێران ئەوێن ل هەمی جهـ و هەمی دەمان دمشە، دا خۆ ل بەر حەجاجی شرین بکەن، چوونە نک و ئاخفتنا حسەنێ بەصری بۆ ڤەگوهاست، حەجاج ژ کەربێن خۆ دا هاربوو، و ل خەلکی زڤڕی و گۆت: تێچوون بۆ هەوە بت! عەبدەک ژ عەبدێن بەصرا د ناڤ خەلکی دا ڕادبتەڤە و چ یا وی دڤێت د دەر حەقا مە دا دبێژت، و کەس د ناڤ هەوە دا نابت لێ ڤەگێڕت؟ ترسینۆکێن ترسینۆک! ئەز ب خودێ کەمە دێ وە ل هەوە کەم هوین ژ خوینا وی ڤرکەن..

پاشی هنارتە ب دویڤ جەللادێ خۆ ڕا.. و گۆتە هندەک ئێلچییێن خۆ: هەرن حسەنی بۆ من بینن.

گاڤا وان حسەن ئینای، و حسەن گەهشتییە بەر دەری، و نیشانێن سەربڕینی د ڕویێ حەجاجی و جەللادی دا دیتین، ب دەنگەکێ نزم دوعایەک کر و ب ژۆرکەفت.. و خەلکێ دیوانێ کارێ خۆ کر دا دەهمەنێن خۆ هلدەن دا چپکێن خوینا حسەنی جلکێن وان پیس نەکەن، بەلێ هەر زوی صەدمە بۆ وان چێبوو، وان دیت حەجاج ب نک وی ڤە چوو، و ڕێ بۆ فرەهـ کر و ب هەیبەت ڤە گۆتێ: وەرە ڤێرێ بابێ سەعیدی، وەرە ڤێرێ بابێ سەعیدی!! و هنگی ڕاوەستیا حەتا ئەو بری دانایە ب ڕەخ خۆ ڤە، و گاڤا حسەن ڕوینشتی حەجاجی کەیفخۆشی د گەل کر، و هندەک پسیارێن دینی بۆ خۆ ژێ کرن.. و

پشتی دەمەکی ژ ئاخفتنێ حەججاجی گۆتێ: بابێ سەعیدی تو سەروەرێ هەمی زانایانی! گاڤا حسەن ژ دیوانێ دەرکەفتی، دەرگەهڤانێ حەججاجی دا ب دویڤ ڤە و گۆتێ: بابێ سەعیدی، حەججاجی تو بۆ ڤێ چەندێ داخواز نەکربووی. حەسەنی گۆت: ئەز دزانم، ژ جەللادێ وی یا دیاربوو. دەرگەهڤانی گۆتێ: من تو دیتی گاڤا تو هاتییە بەر دەری هەر وەکی تە دوعایەک کر، ئەو چ بوو تە گۆتی؟ حەسەنی گۆت: من گۆت: ئەی خودایێ نعمەت د گەل من کرین و ئەز ل تەنگاڤییێ هەوارێن خۆ دگەهینمێ، تو کەربا وی سار کە ل سەر من کانێ چاوا تە ئاگر ل سەر ئیبراهیمی سار کر و کرە تەناهی.

سەرهاتییەکا دی ژی حسەنی د گەل مەزنێن دنیایێ هەبوو، دەرسەکا مەزن بۆ زانایان بەری عامییان تێدا هەیە..

دەمێ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی بوویە خەلیفە، منافق و دوروی و (پاتەخور) ژ بەر دەرێ خۆ کرنە دەر، و شاعر و ئەزمان حلی و درەوین ژ دیوانا خۆ دەرێخستن، چونکی وی باش دزانی ئەڤ صنفێن مرۆڤان هاریکارێن چوونا مرۆڤینە بۆ جەهنەمێ، و ل شوینا وان وی مرۆڤێن زانا و زاهد ل خۆ کۆمکرن، و ئەگەر زانایەک هەبا یێ ژ وی دویر ژی با، وەکی حسەنی ئەوێ ل بەصرا دژیا، وی دەم بۆ دەمی کاغەز بۆ دهنارتن و داخوازا رەئی و بۆچوونا وی دکر د مەسەلێن گرنگ دا، و حسەنی ژ لایێ خۆ ڤە بەرسڤا وی ددا، و بێی (موجامەلە) ئەو حەقی بۆ دگۆت یا وی باوەری پێ هەی، و گاڤا حسەنی زانای عومەر یێ بوویە خەلیفە، ئێکەمین کاغەز بۆ هنارتی، دا پیرۆزیێ لێ بکەت، ئەڤ سێ چار رێزکە تێدا نڤیسیبوون پشتی حەمدا خودێ کری و صەلات داینە سەر پێغەمبەری: ((هندی دنیایە وارەکێ ب ترسە، رۆژا خودێ ئادەم کرییە تێدا بۆ عقووبە کربوو تێدا، ڤێجا ئەی ئەمیرلموئمنین تو بزانە کەفتنا ب دنیایێ نە وەکی هەر کەفتنەکێیە، یێ ئەو قەدرێ وێ بگرت ئەو دێ بێ قەدر بت، و هەر رۆژ ئەو گەلەکان دکوژت، ڤێجا تو ئەی ئەمیرلموئمنین د نیایێ دا وەکی وی

بریندارى بە یێ صەبرێ ل سەر نەخۆشییا دەرمانى دکێشت ژ ترسێن نەخۆشییا درێژ دا)). ئەڤە ئەو (کیتابا پیرۆزباهییێ) بوو یا حسەنێ بەصرى بۆ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزى هنارتى دەمێ ئەو بوویە خەلیفە!

پشتى عومەر چوویە بەر رەحما خودێ، و پسمامێ وى (یەزیدێ کورێ عەبدلمەلکى) بوویە خەلیفە، وى (عومەرێ کورێ هوبەیرەى) کرە والییێ عیراقێ و خوراسانێ، والى هنارتە ب دویڤ دو ژ مەزنترین زانایێن عیراقێ ڕا: حسەنێ بەصرى و عامرێ شەعبى، و پسیارا خۆ ب وان کر، و گۆت: هوین دزانن کو (ئەمیرلموئمنین)ى ئەزێ کریمە والى، و گوهدارییا وى ل سەر من واجبە، بەلێ هندەک جاران ئەو هندەک فەرمانان ل من دکەت ئەزێ ژێ رازى نینم چونکى عەدالەت تێدا نینە، هوین چ دبێژن ئەگەر ئەز ئەمرێن وى ب جهـ بینم گونەهەک بۆ من تێدا هەیە؟ عامرێ شەعبى جەوابەکا وەسا دایێ هندەک نەرمى تێدا بوو، دا نە دلێ خەلیفەى بمینت و نە والى تەنگاڤ ببت.. و حسەن یێ بێ دەنگ بوو، ئینا والى ل حسەنى زڤڕى و گۆتێ: و تو چ دبێژى بابێ سەعیدى؟

ئیمامێ حسەن گۆتێ: کورێ هوبەیرەى! ژ خودێ بترسە نە ژ یەزیدى، و تو باش بزانە خودێ دشێت تە ژ یەزیدى مەنعە کەت، بەلێ یەزید نەشێت تە ژ خودێ مەنعە کەت، کورێ هوبەیرەى نێزیکە تو بمرى و ملیاکەتەکێ زڤر و دژوار ب سەر تە دا بێت، ئەو بێ ئەمرییا خودێ ناکەت، دێ تە ژ سەر ڤێ کورسیکا تە ئینتە خوار، و ئەو دێ تە ژ قەسرا تە یا فرەهـ ڤەگوهێزتە قەبرەکێ تەنگ، ل وێرێ یەزید د گەل تە نابت، ئەو عەمەلێ تە دێ د گەل تە بت یێ تە ژ بەر یەزیدى بێ ئەمرییا خودێ پێ کرى.. کورێ هوبەیرەى! ئەگەر تو د گەل خودێ بى و طاعەتێ وى بکەى، ئەو ل دنیایێ و ئاخرەتێ بەلا یەزیدى دێ ژ تە ڤەکەت، و ئەگەر تو د گەل یەزیدى بى د بێ ئەمرییا خودێ دا، خودێ دێ

تـه هێلتـه ب هیڤییـا یەزیـدی ڤـه، و تـو بزانـه بـۆ چـو مرۆڤـان چـێ نابـت د بـێ ئەمرییا خودێ دا گوهدارییا کەسێ بکەن ئەگەر ئەو کەس کی بت.

گاڤا حەسەنی ئەڤ گۆتنە گۆتین رۆندک ژ چاڤێن والـی بـارین، و وی بـەرێ خۆ دا حەسەنی، و حەسەن د چاڤێن وی دا ژ شەعبی ب بهاتر لێ هات، و گـاڤا ئـەو زڤـرینە مـزگەفتێ و خـەلک لـێ کۆمبـووین، ئیمـامێ شـەعبی ب دەنگـەکێ بلـند گۆتـە خـەلکی: گـەلی مرۆڤـان! هـەچییێ ژ هـەوە بشـێت ل هـەمی جهـان رازیبوونا خودێ ب سەر رازیبوونا خەلکی بێخت بلا وە بکەت، ئەز ب وی کەمە یێ نەفسا من د دەستی دا ئەو تشتێ حەسەنی گۆتییە عومـەرێ کـورێ هوبـەیرەی من ژی دزانی بێژم، بەلێ من دڤییا کورێ هوبەیرەی ژ خۆ رازی کەم، و حەسەنی دڤییا خودێ ژ خودێ رازی کەت، ئینا خودێ ئـەو نێزیکـی کـورێ هوبـەیرەی کـر و ئەز ژێ دویرکرم!

ئەڤـە حەسـەن بـوو ئـەوێ هـەردەم د وەعـزێن خـۆ دا دگـۆت: کـورێ ئـادەمی! خـوزی تـە زانیبـا کـو تـو ئـەو رۆژی یـێن ب سـەر تـە دا دبـۆرن، چـی رۆژا ل تـە ئاڤابوو، ئەو پرتەک ژ تە ڤەبوو.

# محەمەدێ کوڕێ سیرینی
# ئەوێ حەسەنێ بەصری ئەو ل شوینا خۆ هلبژارتی

مەروانێ مەحمەلی مرۆڤەکێ زێدە عیبادەتکەر بوو، ژ وان بوو یێن خەلکی هزر دکر ژ بەر وی بەرەکەت ژ عەسمانی ل عەردی دبارت، ڕۆژا ئەو مری خەلک هەمی بۆ عێجزبوون، و تازی کەفتە هەمی مالان، جیرانەکا وی دبێژت: پشتی مرنا وی ب دەمەکی من ئەو د خەونێ دا دیت، من پسیار ژێ کر: بابێ عەبدللاهی، خودایێ تە چ ل تە کر؟ گۆت: وی گۆتە من: وی ئەز برمە بەحەشتێ، من گۆتێ: پاشی؟ گۆت: پاشی ئەز بلندکرمە د ناڤ خەلکێ ڕاستێ (أصحاب اليمين) دا، من گۆتێ: پاشی؟ گۆت: پاشی ئەز دامە د گەل یێن نێزیککری (المقربين). گۆت: من گۆتێ: تە کی ل وێرێ دیت؟ گۆت: حەسەنێ بەصری، و موحەممەدێ کوڕێ سیرینی!

حەسەن هەوە زانی کی بوو، ما ل وێرێ کوڕێ سیرینی.. و ئەز باوەر دکەم گەلەک ژ مە موحەممەدێ کوڕێ سیرینی ژێ دنیاسن، بەلێ ب تشتەکی ب تنێ، ب تەعبیرا خەونان، وەکی دی بەلکی ئەو نەزانن کو ئبن سیرین ئێک ژ وان زاهدان بوو یێن (زوهد) گەهشتییێ و ل نک وی ڕاوەستیای!

دەمەکی حەسەنێ بەصری ژ بەر حەججاجی ڕەڤیبوو و خۆ ژێ ڤەشارتبوو، هندەک هەڤالێن وی یێن نێزیک ب تنێ ب جهێ وی دکەفتن، ئێک ژ وان زاهدێ مەزن (ثابتێ بەنانی) بوو. هنگی کچەکا حەسەنی مر، ثابت دبێژت: ئەز چوومە نک ئیمامێ حەسەن، دا خەبەرێ مرنا کچا وی بگەهینمێ و هیڤییا من

ئەو بوو ئەو بێژتە من: پێش من ڤە نڤێژێ لێ بکە، گۆت: گاڤا من خەبەر گەهاندییێ ئەوی هند کرە گری حەتا دەنگێ وی بلندبووی، و گۆت: هەرە نک موحەممەدێ کورێ سیرینی و بێژێ بلا پێش من ڤە نڤێژێ ل سەر بکەت..
گۆت: هنگی مە زانی کو حەسەنی کەسێ ل ڕێزا ئبنی سیرینی نابینت.

## کورێ سیرینی کی بوو؟

دو سالان بەری شەهیدبوونا ئیمام عوثمانی موحەممەد هاتبوو سەر دنیایێ، بابێ وی سیرین عەبد بوو، ل نک صەحابییێ پێغەمبەری و خزمەتکارێ وی ئەنەسێ کورێ مالکی دژیا، و ئەو مرۆڤەکێ صنعەتکار بوو، دەمەک پێڤە نەچوو وی خۆ ژ ئەنەسی کڕی و ئازاد بوو، بوونا موحەممەدی ل باژێرێ مەدینێ بوو، و زارۆکینییا خۆ وی ژی وەکی حەسەنێ بەصری ل مەدینێ بۆراندبوو، و وی نێزیکی سیهـ صەحابییان دیتبوون.

پشتی دەمەکی وی ژی قەستا باژێرێ بەصرا کربوو و لێ ئاکنجی بووبوو، و هەڤالینییەکا موکم د ناڤبەرا وی و حەسەنێ بەصری دا هەبوو، و تشتێ ئەو هەردو ژێکجودا دکرن ئەو بوو حەسەن هەردەم یێ خەمگین بوو تو دا بێژی حوکمێ ئیعدامێ یێ ل سەر هاتییەدان، بەلێ موحەممەد مرۆڤەکێ کەیفخۆش و سوحبەتچی بوو، ئێک ژ طەلەبێن وان هەردویان دبێژت: موحەممەدی هند دکرە کەنی حەتا چاڤێن وی ڕۆندک دکرن، و حەسەنی حەدیس بۆ مە دگۆتن و دکرە گری. و مەهدییێ کورێ مەیموونی دبێژت: موحەممەدی سوحبەت دکرن و شعر دخواندن و دکرە کەنی، و گاڤا دەست ب گۆتنا حەدیسان کربا ناڤچاڤێن وی تێک دچوون و دهاتە گرتن. لەو ل وی دەمی دهاتە گۆتن: ب حلما ئبن سیرینی بکەن، نەکو ب غەزەبا حەسەنی!

ئێک ژ سالۆخەتێن ئبن سیرینی ئەو بوو ئەو گەلەک ژ بەرسڤدانا پسیاران دڕەڤی، ئەگەر هات و ئەو پسیار ب حەلالی و حەرامی ڤە یا گرێدای با، ئەشعەث دبێژت: دەمێ پسیارا حەلالی و حەرامی ژ موحەممەدێ کورێ سیرینی

هاتبا کرن، ڕەنگێ وی دهاتە گوهاڕتن تو دا بێژی نە ئەوە یێ بەرێ. و هەڤالەکێ وی یێ دی دبێژت: من کەس ژ وی ترسینۆکتر نەدیت بۆ فەتوایێ. یەعنی: دەمێ داخوازا فەتوایەکێ ژێ دهاتەکرن ئەوی ژ ترسان دا خۆ ددا پاش، و زوی ب زوی بەرسڤ نەددا، دترسییا ئەو خەلەت ببت ڤێجا بکەفتە گونەهێ.

و د گەل کو ئبن سیرین مرۆڤەکێ تاجر بوو، و گەلەک دەمێ خۆ ب کڕین و فرۆتنێ ڤە دبر ل سویکی، بەلێ ئەو زاهدەکێ مەزن ژی بوو، و ئەڤە تشتەکێ غەریبە.. کەسەک ب دنیایێ ڤە موژیل ببت و دنیا ڕیکا خۆ بۆ دلێ وی نەبینت.

عەدەتێ ئبنی سیرینی بوو ئەو ڕۆژەکێ یێ ب ڕۆژی بوو و ڕۆژەکێ دخوار، وەکی ڕۆژییا داوودی.. و ئەو ب خۆ مرۆڤەکێ بازرگان بوو، دەمێ خۆ ب تجارەتێ و بەلاڤکرنا علمی و دەرسدانێ ڤە دبۆراند، و تشتێ ژ هەمییێ پتر ئەو پێ ناڤداربووی زانینا وی یا بەرفرەهـ بوو ب علمێ تەعبیرا خەونان.

پشتی مرنا حسەنی ب سەد ڕۆژان، یەعنی: هەر ل شەووالا سالا ۱۱۰ مشەختی، دەمێ ژییێ وی حەفتێ و حەفت سال، ئبن سیرین چووبوو بەر دلۆڤانیا خودێ.

### سالۆخەتێن کوڕێ سیرینی:

دەم و جهێ ئبن سیرین لێ ژیای هەر ئەو دەم و جهـ بوون یێن حسەنێ بەصری لێ ژیای، و ئبن سیرین دەهـ سالەکان ژ حسەنی بچویکتر بوو، و تشتێ دی یێ ئبن سیرین ژ زانایێن دی یێن سەردەمێ خۆ جوداکری ئەو بوو، ل وی دەمی زانا دو ڕەنگ بوون: هندەکان تێکەلییا خەلیفە و والییان دکر، چ بۆ هندێ بت دا فایدەی ژێ بکەن، یان بۆ هندێ بت دا فایدەی بگەهیننێ، لەو وان گەلەک جاران خۆ ل سەر خەلەتییێن مەزنان بێ دەنگ دکرن، و هندەکێن دی بەرهنگارییا وان دکر، و د دەرس و دیوانێن خۆ دا ڕەخنەیێن دژوار ل وان دگرتن، و ئەگەر جارەکێ ئەو ل دیوانا خەلیفەی یان والی بەرهەڤ ببان، وان ئەڤ چەندە

بۆ خۆ ب دەلیڤە دزانی کو توند د گەل وان باخڤن، و ڕوی ب ڕوی خەلەتییێن وان بدەنە بەر چاڤێن وان، ئبن سیرین نە ژ وان بوو و نە ژ وان، هندی ژێ هاتبا وی خۆ نێزیکی مەزنان و دیوانێن وان نەدکر، و نەدهێلا کەس ل دیوانا وی ژی بەحسێ وان بکەت، جارەکێ مرۆڤەکی ل دیوانا وی گۆتنێن کرێت گۆتنە حەججاجی، پشتی مرنا حەججاجی، ئینا ئبن سیرینی گۆتێ: برازا، هش بە.. حەججاج یێ چوویە نک خودایێ خۆ، و ڕۆژا قیامەتێ دەمێ تو قستا خودایێ خۆ دکەی، تو دێ بینی کێمترین گونەها تە د دنیایێ دا کری ل سەر تە مەزنترە ژ مەزنترین گونەها حەججاجی کری، هەر ئێک وێ ڕۆژێ دێ یێ ب خۆ ڤە موژیل بت، و تو بزانە خودێ دێ تۆلا وان ژ حەججاجی ڤەکەت یێن وی زولم لێ کری، و دێ تۆلا حەججاجی ژی ژ وان ڤەکەت یێن زولم ل وی کری، ڤێجا ژ ئەڤرۆ وێڤە تو خۆ ب خەبەر گۆتنا کەسێ ڤە موژیل نەکە.

د سەر ڤێ چەندێ ژی ڕا ئەگەر جارەکێ ئەو گەهشتبا مەزنەکی، و وی پسیارەک ژێ کربا، ئەوی حەقی (بێ موجامەلە) دگۆت. والییێ عیراقێ ژ لایێ ئومەویان ڤە عومەرێ کوڕێ هویەیرەی جارەکێ ئەو ڤەخواندە دیوانا خۆ، ئبن سیرینی برازایەکێ خۆ د گەل خۆ بر، گاڤا ئەو ل دیوانا والی ئامادەبووی، والی هندەک پسیارێن دینی ژێ کرن، پاشی گۆتێ: بابێ بەکری، تە چاوا خەلکێ باژێرێ خۆ هێلاینە؟ وی گۆت: من ئەو هێلان زولم د ناڤ وان دا یا بەلاڤە، و تە های ژ وان نینە.. برازایێ وی هێدی دەستێ خۆ ل ئەنیشکا وی دا، ئینا ئەو ل برازایێ خۆ زڤڕی و گۆتێ: یێ پسیارێ ژ من دکەت نە ژ تە، و ئەڤە شاهدییەکە ژ من دئێتە خواستن، و یێ شاهدەییێ ڤەشێرت دلێ وی یێ پیسە.

و پشتی ئەو ژ دیوانا والی دەرکەفتی، والی سێ هزار دینار بۆ هنارتن، وی ئەو وەرنەگرتن و گۆت: بۆ والی بزڤڕینن، برازایێ وی گۆتێ: بۆچی تە دیارییا ئەمیری وەرنەگرت؟ وی گۆتێ: وی ئەڤ مالە یێ دایە من ژ بەر هزرەکا باش یا ئەو ژ من دکەت، ڤێجا ئەگەر ئەز یێ وەسا بم وەکی ئەو هزر دکەت چێ نابت

ئەز وی مالی وەرگرم، و ئەگەر ئەز یێ وەسا نەبم، بۆ من حەلال نینە ئەز وی وەرگرم.

**سەرهاتییەکا غەریب:**

جارەکێ وی بایێ چل هزاران زەیت ب دەین کڕی، پشتی زەیت وەرگرتی بەرێ خۆ دایێ مشکەکێ مرار یێ د جەرکەکی دا، وی گۆت: ئحتمالە ئەڤ مشکە هێشتا ل کارگەهێ کەفتبتە زەیتێ، مەعنا ئەڤ زەیتە هەمی دێ یا پیس بت، و ئەگەر ئەز زەیتێ بۆ خودانی بزڤڕینمەڤە -و ئەڤە حەقێ منە، چونکی زەیت یا ب عەیبە- ئەز دترسم ئەو وێ زەیتێ ببەت بفرۆشتە خەلکی.. هەما یا باش ئەوە ئەز زەیتێ هەمییێ بڕێژم، و بلا خوسارەتی یا من ب تنێ بت. و وی زەیت ڕێت.

وی دەمی ئەو د تەنگاڤییەکا مالی دا دبۆری، گاڤا بوویە دەمێ دانا دەینی، خودانێ زەیتێ هات داخوازا پارەیێن خۆ کرن، وی پارە نەبوون بدەتێ، خودانێ دەینی چوو نک قازی و گازندە ژێ کرن، قازی بڕیار دا ئبن سیرین بێتە گرتن حەتا دەینێ خۆ ددەت، و ب ڤی ڕەنگی ئبن سیرین هاتە گرتن، و دەمێ وی بەحسێ ڤێ گرتنا خۆ دکر، دگۆت: بەری سیه سالان من گونەهەک کربوو، ئەز دبێژم ژ بەر وێ خودێ ئەڤ گرفتارییە ب سەرێ من ئینا.. و ئەو گونەهـ چ بوو؟

جارەکێ وی طان ب فەقیرییێ ل مرۆڤەکی دابوو!

دەمێ ئەو یێ گرتی، دلێ حەرەسی ما پێڤە ژ بەر عەمرێ وی، و چونکی وی دیت ئەو چەند مرۆڤەکێ پیرۆز و عیبادەتکەرە، لەو جارەکێ گۆتێ: شێخ، دەمێ دبتە شەڤ و کەس نەمینتە ل ڤێرێ هەرە مال و بمینە د ناڤ عەیالێ خۆ دا، و سپێدێ زوی بزڤڕە ڤە، حەتا قازی بڕیارا دەرکەفتنا تە ددەت. ئبن سیرینی گۆتێ: نە ب خودێ ئەز وە ناکەم.. ئەز نابمە هاریکارێ تە ل سەر خیانەتا (ولی الأمر)ی.

هەر ل وان ڕۆژان صەحابییێ ناڤدار ئەنەسێ کوڕێ مالکی کەفتە بەر مرنێ، و وی وەصیەتکر گاڤا ئەو دمرت ئبن سیرین وی بشۆت و نڤێژێ لێ بکەت. و پشتی ئەو مری هندەک چوونە نک والی و وەصیەتا ئەنەسی بۆ ڤەگێڕا، والی دەستویری دا ئبن سیرین بێتە بەردان، و گاڤا چووینە نک وی و بڕیارا والی گەهاندییێ وی گۆت: ل سەر دەعوایا خودانێ دەینی هەوە ئەزێ گرتیم، و ئەز ژ ڤێرێ دەرناکەڤم حەتا ئەو دەستویرییێ نەدەت. لەو ئەو نەچار بوون چوونە نک خودانێ دەینی و دەستویری ژێ خواست، و هنگی ژ نوی ئبن سیرین دەرکەفت و چوو ئەنەس شویشت و کفنکر و نڤێژ ل سەر کر، پاشی زڤڕی سجنێ بێی بچت سەرا مالا خۆ بدەت!

# مالكێ كوڕێ دیناری

دەمێ مرۆڤ دبێژت: مالك.. یەعنی: پاشمایا پێغەمبەراتییێ، و ئەڤە یا غەریب نینە ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینینە ڤە كو مالك ل سەر دەستێ حەسەنێ بەصری یێ هاتییە پەروەردەكرن، حەسەن ئەوێ د كۆشا دەیكا موسلمانان (أم سلمە) یێ هاتییە ب خودانكرن.

دبت ل بەر گەلەك كەسان یێن ناڤێ ڤی چیایێ زانینێ و زوهدێ بهیستی تشتەكێ غەریب بت ئەگەر ئەم بێژین: مالك ل دەسپێكا ژییێ خۆ، گەلەك دویر ژ خودێ دژیا، و ئێك ژ مەزنترین عەرەقڤەخۆرێن باژێرێ بەصرا بوو!

بەلێ.. پاشی رۆژەك هات ئەڤ مالكە وەكی وێ رۆژا گەش لێ هات ئەوا تێنێ و رۆناهییێ ل عەردی بەلاڤ دكەت، بوو ئەو مرۆڤ یێ صەحابییێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەنەسێ كوڕێ مالكی گۆتییێ: تو گەلەك وەكی صەحابییێن موحەممەدی یی -سلاڤ لێ بن- ئەز پتر ژ گەلەك عەیالێ خۆ حەز ژ تە دكەم.

ڤێجا سەرهاتییا مالكی چ بوو؟ و چاوا بەرێ وی هاتە وەرگێڕان ژ رێكا شەیتانی بۆ رێكا خودێ؟

مالكێ كوڕێ دیناری.. هێڤێنێ وی ژ وەلاتێ سەجستانێیە ئەوێ دكەڤتە د ناڤبەرا ئیران و ئەفغانستانا نوكە دا، ل باژێرێ بەصرا ژییێ خۆ بۆراندبوو ل سەدا ئێكێ مشەختی و چارێكا ئێكێ ژ سەدا دویێ ژی، و گەهشتبوو دووماهییا دەمێ صەحابییان و علم و حەدیس ژ ئەنەسێ كوڕێ مالكی یێ

صەحابی، و مەزنێ تابعییان حەسەنێ بەصری، و سەعیدێ کوڕێ جوبەیری، و موحەممەدێ کوڕێ سیرینی وەرگرتبوو.

پشتی حەسەنێ بەصری ل سالا (١١٠) مشەختی چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ مالکی جهێ وی ل مزگەفتا بەصرا یا مەزن گرت، و دەمێ وی دەست ب وەعزی دکر مزگەفت ژ مرۆڤان تژی دبوو تو دا بێژی تەیران یا دادایە سەر سەرێن وان، ڕۆژەکێ مرۆڤەکی پسیارا دەسپێکا وی ژێ کر کانێ یا چەوا بوو؟

وی ب ئەزمانێ خۆ سەرهاتییا دەسپێکا خۆ ڤەگێڕا و گۆتنا وی ژ ئەزمانێ وی ئەم ب ئەزمانێ خۆ دێ ڤەگوهێزین:

ل دەسپێکا عەمرێ خۆ مالکێ زوگورد شورطە بوو، کارێ وی ئەو بوو سپێدێ حەتا ئێڤاری ب دەستەکێ دژوار و دلەکێ ڕەق ل باژێڕی دهات و دچوو زێرەڤانی ل خەلکی دکر، و ل دویڤ سەح و سویان دگەڕیا، و دەمێ کارێ وی ب دوماهی دهات ئەو دزڤڕی مالا خۆ و دما ب تنێ، و دەمێ خۆ یێ مایی ب ڤەخوارنێ دبۆراند، هەر وەکی وی ب ڤێ خۆ بێهشکرنێ دڤیا جیهانەکێ د خەیالا خۆ دا چێ بکەت یا جودا ژ وێ جیهانێ یا خەلک دنیاست..

دەمەکی وی ڤیا گوهۆڕینەکێ بێختە ڤی رووتینێ ژیانا وی ڤەگرتی، و ئێکەمین تشتێ وی هزر تێدا کری ئەو بوو ئەو ژیانا خۆ د مال دا بگوهۆڕت، ئێدی یێ ب تنێ نەبت، و چونکی وی دزانی هندی ئەو ژ پیسان بت کەس چو باشێن خۆ نادەتێ، ئەو ڕابوو (جارییەک) بۆ خۆ کڕی.. پشتی دەمەکی خودێ کچەک دایێ، و ڤێ کچێ تامەکا دی دا ژیانا وی، چونکی وی مرۆڤینییا مەزن د چاڤێن وێ یێن بچویک دا ددیت، کچا وی یا بچویک چەند ڕۆژەکێ مەزنتر لێ دهات و ب سەر پییان دکەت پتر ئەو ل هندێ ئاگەهدار دکر دڤێت ئەو ژینا خۆ پاقژ بکەت بەری کچا وی مەزن بیت و ب پیسییا ژینا وی بەقەم ببت، بەلێ هندی هاتی نەشیا هەڤالینییا پەرداغی بهێلت.. و هەڤڕکییەک

د ناڤبەرا ڤیانا کچا وی و ڤیانا پەرداغی دا د دلێ وی دا پەیدابوو، دەمێ هندەک جاران کچا وی -ئەوا ب سەر پییان کەفتی- ددیت ئەو یێ پەرداغان تێ دکەت و فڕ دکەت دا ب نک ڤە چت پەرداغێ وی ژ دەستی ئینتە دەر و ب کراسێ وی دا کەت، و کەتە کەنی.. ئەو عێجز نەدبوو چونکی وی ددیت کەیفا کچا وی یا بچویک یا ب ڤێ چەندێ دئێت.. و پیچ پیچە وی دیت هەر وەکی ئەو یێ ژ پەرداغی دویر دکەڤت، چونکی ڤیانا وی بۆ کچا وی هێدی هێدی جهێ ڤیانا وی بۆ پەرداغی دگرت، و هەمی ترسا وی ئەو بوو ڕۆژەک بێت کچا وی مەزن ببت و د مەعنا ڤی بەرداغی بگەهت، ڤێجا ئەو ببتە ئەگەرا پیسکرنا ژیانا کچا خۆ، ڤێجا ئەو گونەها خۆ و یا کچا خۆ ژی ل سەر ملێ خۆ هلگرت.

دەمێ ژیێ کچا وی گەهشتییە دو سالان.. مر!

و کانێ چاوا سەرهاتییا مرنێ هندەک کەسان ژ غەفلەتێ هشیار دکەت، وەسا ئەو هندەکێن دی پتر ب نک سەرداچوونێ ڤە دبەت، و چونکی مالکێ کوڕێ دیناری هند باوەری نەبوو موصیبەتا وی ل بەر وی سڤک بکەت، و چاڤێن وی ل ڕاستییێ ڤەکەت، مرنا کچا ئەو وەکی بەرێ یان پتر ب نک ژیانا پەرداغی و خۆ بێهشکرنێ ڤە بر، و خەما وی بوو جهێ شادییا شەیتانی!

مالک دبێژت: شەڤەکێ ژ شەڤێن ئەینییێ، ئەز ژ ڤەخوارنێ یێ مەست بووم، من نەزانی چ دەمێ شەڤێ بوو دەمێ ئەز کەفتیمە سەر تەنشتا خۆ و نڤستیم.. د خەوێ دا من دیت هەر وەکی ڕۆژا قیامەتێیە، خەلک یێ ژ زکێ عەردی دەردکەڤن و بۆ مەیدانەکا بەرفرەه یێ دئێنە کۆمکرن، و ئەز ئێک ژ وان بووم، د ڤێ تەنگاڤییا مەزن دا دەنگەکێ بلند هاتە من، ئەز ل خۆ زڤڕیم دا بەرێ خۆ بدەمێ کانێ ئەو چ دەنگە، دیتنا من دیتی مارەکێ ئەژدەها، یێ ڕەش و شین، دەڤێ خۆ یێ بەشکری و ب نک من ڤە یێ دئێت، من کرە هەوار و ئەز ژێ ڕەڤیم، بەلێ کیڤە بچم؟

پاشی من هند دیت پیرەمێرەکێ بێنخۆش و جلک پاقژ کەفتە رێکا من، من هەوارێن خۆ گەهاندنێ و گۆتێ: بەختێ خودێ من ژ ڤی ئەژدەهای خلاص بکە! ئینا پیرمێری بۆ حالێ من کرە گری و گۆت: ئەزێ لاوازم و ئەو تشتێ تو ژ من دخوازی ب من ڤە نائێت، بۆ خۆ بڕەڤە بەلکی خودێ رێکەکێ بۆ تە ببینت، ئەز ڕەڤیم، من جهەکێ بلند دیت، ئەز ب سەرکەفتم، لایێ دی نهالێن تژی ئاگر بوون، ئەز ل خۆ زڤڕیم ئەژدەها یێ ب دویڤ من ڤە، نێزیک بوو ژ ترسێن ئەژدەهایی دا ئەز بکەڤمە د ئاگری دا، ئینا دەنگەک هاتە من: بزڤڕە تو نە ژ خەلکێ وێ یی، پیچەکێ بێنا من هات، ئەز زڤڕیم و جارەکا دی ئەژدەهایی دا ب دویڤ من ڤە، دوبارە ئەز گەهشتمە نک پیرەمێری، من گۆتێ: من داخواز ژ تە کر تو من ژ ڤی ئەژدەهایی خلاص بکەی تە وە نەکر، پیرەمێری کرە گری و گۆت: ئەزێ لاوازم، هەڕە سەر ڤی چیایی هندەک ئێمانەت ل وێرێ هەنە، ئەگەر ئێمانەتەکێ تە د ناڤ دا هەبت ئەو دێ تە خلاص کەت.

گۆت: من بەرێ خۆ دایێ چیایەکێ گرۆڤر من دیت، ئەز ب نک ڤە چووم و ئەژدەهایی دا دویڤ من، گاڤا ئەز نێزیکبوویم، هندەک ملیاکەتان گازی کر: پەردەی ڕاکەن، و دەرگەهان ڤەکەن، بەلکی ڤی هەژاری ئێمانەتەک هەبت وی ژ دوژمنی بپارێزت.. پشتی پەردە هاتینە هلدان و دەرگەهـ ڤەبووین، من دیت هندەک زارۆکێن دێمێ وان وەکی هەیڤێ دجوان سەرێن خۆ دەرێخستن و بەرێ خۆ دانە من، و ئەژدەها نێزیکی من بوو، هندەک زارۆکان کرە هەوار: هوین هەمی دەرکەڤن سەحکەنێ نەیارێ وی نێزیک بوو، پاشی من هند دیت کچا من یا بچویک دەرکەفت و بەرێ خۆ دا من، گاڤا وێ ئەز دیتیم کرە گری و گۆت: بابێ منە بابێ منە! وێ گاڤێ من هند خۆ دیت ئەز هاتمە بلندکرن و هاڤێتن حەتا ئەز کەفتیمە نک وێ، وێ دەستێ من گرت و ئەز کێشام، ئینا ئەژدەها ڕەڤی و ئەز هێلام، پاشی کچا من هاتە دکۆشا من دا و گۆت: بابۆ! ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾ (الحدید: ١٦) پاشی وێ گۆتە من:

ئەو ئـەژدەهـایـێ ڕادهێلا تە کارێ تـە یـێ خرابـە، تـە هنـدێ مـەزن دکر حـەتا ئـەو ڕاهێلتە تە دا تە بهاڤێتـە د ئـاگرێ دا، و ئـەو پیرەمێـرێ تـە دیتـی کـارێ تـە یـێ باشە تە ئەو هندێ لاواز کری کو نەشێت بەرەڤانییێ ژ تە بکەت..

گۆت: و وێ گاڤێ من هند دیت ئەز ژ خەو ڕابووم.

پشتی مالک ژ خەو ڕابووی و دلـێ وی ژ غەفلەتێ هشیاربووی، ئێکەمین کـار وی کـری ئامـانێن شـەرابێ هـەمی شـکاندن، و کـرە دلـێ خـۆ ئـەو هنگـی ڕاوەستت حەتا (پیرەمێرێ لاواز) بزڤڕینتـە سـەر هێزا وی، دا بشـێت ئـەژدەهایی پاشپاشکی ببەت..

سپێدێ وی قەسـتا مزگـەفتێ کـر، خـۆ ب مـەزنترین زانـایێ تابعییـان ڕا گەهاند کو حەسەنێ بەصری بـوو، و ل سـەر دەسـتێ وی فێـری علمـی و عەمـەلی بوو، و هەر چەندە ئەو ل وی دەمـی یـێ بچویـک نـەبوو، بـەلکی گەلـەکێ جحێـل ژی نەبوو، بەلـێ د گەل هندێ ژی (هەمەتا) وی و (ئصرارا) وی ئێکـا هنـد ژێ چێکر نە ب تنێ ئـەو خـۆ ب زانـا و زاهدێن ئومـمـەتێ یـێن مـەزن ڕا بگـەهینت، بەلکی بەرا وان ژی ڕاکەت.

پشتی مالکێ کوڕێ دیناری بڕیـار دای ژینـا خـۆ بگوهـۆڕت و ڕێکـا خـودێ بگرت، وی دەسـت ب کارەکێ دی کـر، کارێ وی بوو ئەو وی قورئـان ب دەسـتێ خۆ دنڤیسی و دبرە بازارێ دفرۆت و ب وی پـارەی یـێ بـۆ وی ژێ دهـات خـۆ ب خـودان دکـر، و دبێـژن: هـەر چـار هـەیڤـان وی دانـەیـەکا قورئـانێ دنڤیسـی، و پشتی پارێ خۆ وەردگرت دا بەت دەتە بەقالی، و حەتا پـارێن وی خلاص دبوون وی تشت بەرانبەر بۆ خۆ ژ نک دئینان.

مالک ل سالا (١٢٧) مشەختی ل بەصرا چوو بوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

د گۆتنا خۆ دا ئەو دبێژت: زانایێ دورست ئەوە یێ ئەگەر تـو چوویـە نـک ل مـالا وی دا ئەو شیرەتەکێ ل تە بکەت و ئەو ل مال نەبت، مالا وی شیرەتێ

ل تـه بكـەت. يـەعنی: زوهـد و تـەقـوايـا وی بـۆ تـه ژ سـەر و بـەرێ مـالا وی ئاشكەرا ببت، ژ مالا وی تو بزانی ئەو نه مرۆڤێ دنياییيه، ڤێجا حالـێ مـالا وی بۆ ته ببته شيرەت.

رۆژەكێ خەلكێ بەصرا هاتنه نك و گازنده ژ نەهاتنا بارانێ كرن و گۆتنێ: بابێ يەحيای! ئەگەر تو هاتبای نڤێژا بارانێ ته ل بەرا مه كربا، بـەلكی خـودێ باران دابا مـه، وی سەرێ خۆ هژاند و گـۆت: هـوين د عەجێبگرتينـه كـو بـاران نائێت، و ئەزێ عەجێبگرتيمه كو بەر ژ عەسمـانی ب سەر هەوە دا نائێن!

عەدەتێ مالكی بوو دەرگەهێ مالا وی یێ بێ كليل بوو، و نه شـەڤ و نـه ب رۆژ چو جاران وی دەرگەهـ نەدگرت، شەڤەكێ دەمێ وی نڤێژ دكرن دزەك هاته مالا وی، هندی لـێ گەريا تشتەك نەديت بدزت، گاڤا ڤـيـای دەركـەڤـت مـالكی گۆتێ: چو تشتێ دنيايێ ته نەديت، ما ته نەڤێت تشـتەكێ ئاخرەتێ بدەمـه تـه؟ دزيكەری گۆتێ: بەلـێ.. گـۆت: وەره دەسنڤێژا خـۆ بگـره و دو ركاعـەتان د گـەل من بكه، و ڤان هەردو ركاعـەتـان ژيانا دزيكەری گوهارت، سپێدێ دەمـێ ئـەو و مـالـك پـێـكـڤه چووينه مزگەفتێ نڤێـژێ: هنـدەكان گـۆتێ: بـابێ يـەحيای! ئـەو كييه د گەل ته؟ مالكی ب گرنژين ڤه گۆت: هاتبوو دا دزييا مـه بكـەت، بەلـێ مه ئەو دزی!

# ئیمامێ ئەوزاعی
# ئەوێ چو جاران شیرەتا خۆ نەفرۆتی

ئەو مرۆڤێ خودێ یێ مە ل بەرە کو ڤێ جارێ ل دیوانا وی ئامادە ببین، و چەندەکێ ژ نێزیک بنیاسین مرۆڤەک بوو ب دورستی یێ هێژایی هندێ بوو ناسناڤێ (زانایێ دینی) ل سەر بێتەدانان، چونکی وی ب دورستی هەمی سالۆخەتێن زانایان ل نک خۆ پەیدا کربوون.. و سالۆخەتێ زانایێن دینی یێ ژ هەمییان بەرچاڤتر کو ل نک ڤی زانایی دهاتە دیتن ئەو بوو وی نصیحەتێ خێرێ ل مەزنی و بچویکی دکر، و جارەکا ب تنێ ژی ژێ نەهاتییە زانین کو وی مالێ دنیایێ سەرا شیرەتەکا خۆ وەرگرت بت، یان نصیحەتەکێ خۆ وی فرۆت بت، و ما دێ چاوا ئەو وە کەت و ئەو ب خۆ د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((یا من زانی ئەوە هەر زەلامەکێ وەعزەک ل هندەک مرۆڤان کربت و ئارمانجا وی کنارێ خودێ نەبت، دلێن خەلکی دێ ژێ دویرکەڤن کا چاوا ئاڤ ژ سەر کەڤرێ حلی دکەڤت)).

ڕۆژەکێ دەمێ وی وەعزەک ل مەزنەکی ژ مەزنێن دنیایێ کری ڤی مەزنی هندەک مال دایێ و گۆتێ: ((ئەڤە بۆ تە دا تو پێ بگەهییە وەلاتێ خۆ، وی مالێ وی لێ زڤڕاند و گۆتێ: من هەوجەیی پێ نینە.. و ئەز نە ئەوم یێ شیرەتا خۆ ب مالێ دنیایێ هەمییێ بفرۆشم!)).

### ئەوزاعی کی بوو؟

زانایێ مە یێ ڤێ جارێ ئیمامێ ئەوزاعییە.. و ئەوزاعی ناڤێ وی عەبدررەحمانێ کوڕێ عەمری بوو، و دگۆتنێ: (بابێ عەمری)، ل سالا (٨٨)

مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ، و هنگی هێشتا هندەک صەحابی دساخ بوون، و ل سەر دەمێ خلافەتا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی -خودێ ژێ رازی بت- عەمرێ وی ژ دەهێ بۆری بوو، عەسلێ وی خەلکێ وەلاتێ سندێ بوو، و ب ئێتیمی دەیکا وی ئەو ب خودان کربوو، و بەرێ وی دابوو رێکا خواندنێ و وەرگرتنا علمی حەتا رۆژەک ب سەر وی دا هاتی زانایەک د ناڤ ئوممەتێ دا نەمابوو ئەگەر هەوجەی علمێ وی نەبت!

ل سەر دەستێ هژمارەکا مەزن ژ زانایێن تابعییان علم و زانین وەرگرتبوو، وەکی (عطاء بن أبی رباح) و (محمد بن سیرین) و (نافع مولی ابن عمر) و گەلەکێن دی.

ئەوزاعی علم و عەمەل و گۆتنا حەقییێ بێ ترس ل نک خۆ کۆمکربوو، و هەر جارەکا ئەڤ هەر سێیە ل نک مرۆڤەکی کۆمبوون، دێ هێژاییی هندێ بت د ناڤ خەلکی دا ببتە ئیمامەکێ (قودوە)، و ئەڤ صفەتە بوون ئێکا هند ژ وی چێکری ئێکێ وەکی ئیمام (مالکی) د دەر حەقێ دا گۆتی: ئەوزاعی ئیمامەکە مرۆڤ دشێت بۆ خۆ بکەتە جهێ چاڤلێکرنێ .

ل سالا ١٥٧ مشەختی ل شامێ چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ .

## ئەوزاعی و شیرەتکرن:

وەکی مە گۆتی د دەرحەقا گۆتنا حەقییێ دا و شیرەتکرنا بێ بەرانبەر هەمی کەس ب دیتنا ئیمامێ ئەوزاعی وەکی ئێک بوون، و ئەو تەرازییا وی حەقی پێ دکێشا و زەلام پێ دنیاسین هەردەم ئێک بوو، و (تەمەللوقێ) چو جاران ئەو ب لایێ کەسێ دا شۆڕ نەدکر، و حەژێکرنا وی بۆ حەقییێ و بەلاڤکرنا دادییێ ئێکا هند ژ وی چێکربوو ئەو ژ کەسێ نەترست و ژ بەر کەسێ نەدانت.. دەمەک ب سەر وی دا هاتبوو ئەو کەسەکێ عەدەتی بوو د ناڤ کۆمەکا گەشە ستێرێن مەزن دا، لەو بەرێ خەلکی لێ نەبوو، هنگی ئەو یێ خۆ بوو.. پاشی رۆژەک ب سەر وی دا ئەو هاتە پێش و بوو یێ خەلکی، هنگی ئەو نەما

ئێدی یێ وەسا بت وەکی دلێ وی دچتێ، بەلکی مەجبوور بوو یێ وەسا بت وەکی ئیمامەت دخوازت، و ئەڤە بوو ئەو ب سەر ئیمامێ مەزن سوفیانێ ثەوری ئێخستی، سوفیانی پشت دا بوو دنیایا خەلکی و ژ بلندی ل دنیایێ دنێڕی، بەلێ ئەوزاعی د ناڤ خەلکی دا بوو و دنیایا وان دگوهارت، ژ بەر ڤێ چەندێ رۆژا ئەو هەردو پێکڤە چووینە دیوانا ئیمام مالکی، پشتی دەرکەفتین، مالکی گۆت: ئێک ژ وان ژ هەڤالێ خۆ زاناترە، بەلێ ب کێر ئیمامەتییێ نائێت، و یێ دی -یەعنی ئەوزاعی- ب کێر ئیمامەتییێ دئێت.

ئەوزاعی جارەکێ گۆتە هەڤالێ خۆ (موسی بن أعین)ی: بابێ سەعیدی بەرێ مە ترانە و یاری دکرن و مە دکرە کەنی، پشتی ئەم وە لێ هاتین خەلک چاڤ ل مە بکەت ئێدی خۆ ئەم نەشێین بگرنژین ژی!

ب راستی زانایێن ب ڤی رەنگی ئەوێن ئەڤ شعوورە هەی ئەون ئەو گەهـ یا خوینێ ڤەدگوهێزتە هەمی لایێن جڤاکێ، و ئەون ئەو تێلە یا رۆناهی تێرا دگەهتە هەمی لایێن ژینێ، لەو عەجێبگرتی نەبن ئەگەر هوین ببینن گەشاتی ژ هەمی ئاخفتنێن ڤان توخمە زانایان دپەشت.

رۆژەکێ زەلامەکێ فەلە هاتە نک وی و جەرکەکێ هنگڤینی بۆ ئینا، و گۆتێ: بابێ عەمری! من شۆلەک ل نک والییێ بەعلەبەکێ هەیە، و ئەز دزانم ئەو گەلەک قەدرێ تە دگرت ڤێجا ئەگەر تە کاغەزەک بۆ من نڤیسیبا دا بەمە نک. ئیمامێ ئەوزاعی گۆتێ: ئێک ژ دویان.. یان دێ هنگڤینی وەرگرم و کاغەزێ نانڤیسم، یان دێ کاغەزێ نڤیسم و هنگڤینی وەرناگرم!

هندە تەرازییا وی یا هویر بوو، ئەگەر من خزمەتەک بۆ تە کر و خێرەک د گەل تە کر پاشی من جەرکێ هنگڤینی ژ تە وەرگرت، مەعنا ئەو من ئەو خێرا خۆ فرۆت، و جهێ خۆ یان (وەجاهەتا) خۆ ئستغلالکر دا هندەک مالێ دنیایێ پێ بگەهتە من، یان مەصلحەتەکا من ب جهـ بێت.. و ئەوزاعی نە ژ وان کەسانە یێن ڤێ چەندێ دکەن.

و کانێ چاوا ئەو د گەل عامییان یێ ب ڤی ڕەنگی بوو، وەسا ئەو د گەل مەزنێن دەولەتێ ژی یێ وەسا بوو.. جارەکێ خەلیفێ عەبباسی (أبو جعفر المنصور)ی هنارتە ب دویڤ ڕا، گاڤا ئەو هاتی، خەلیفەی گۆتێ: من دڤێت علمی بۆ خۆ ژ تە وەرگرم!

وی گۆت: ئەی (أمیر المؤمنین) ئەز دێ بۆ تە بێژم بەلێ من دڤێت تو خۆ تێ بگەهینی.

خەلیفەی گۆت: من یێ هنارتییە ب دویڤ ڕا بۆ ڤێ چەندێ، ڤێجا چاوا ئەز خۆ تێ ناگەهینم؟!

وی گۆت: کو تو گوهێ خۆ بدەیە گۆتنا من و کاری پێ بکەی.

یەعنی: جامێرییا مەزنی ئەو نینە ئەو گوهێ خۆ بدەتە حەقییێ پاشی هەر وێ بکەت یا وی دڤێت، فیرعەونی ژی ل دیوانا خۆ ڕێ دا مووسایی ب دەنگەکێ بلند وێ بێژت یا وی دڤێت، نە بەس هندە.. گۆتێ: ئەم دێ مللەتی هەمییێ ل مەیدانەکێ کۆم کەین، ئەم دێ یا خۆ کەین، و تو یا خۆ بکە، و مللەت بلا وێ بۆ خۆ هلبژێرت یا وی دڤێت و ئەو دبینت حەقی!! ئەرێ ما (دیموقراطییەتەک) ژ ڤێ پێشکەفتیتر هەیە؟ بەلێ گاڤا ئەوا مووسایی گۆتی ب سەر وێ کەفتی یا وی گۆتی، و سێرەبەندێن وی ب خۆ ئعتراف ب ڤێ چەندێ کری (فیرعەونی) چ کر؟ گۆت: مادەم ئەز یێ نەحەقم دڤێت گوهدارییا مووسایی بکەم و کاری ب گۆتنا وی بکەم؟ نەخێر! وی گۆت: سلامەتییا وەلاتی و مەصلحەتا مللەتی هندێ دخوازت ئەم ڤان سێرەبەندێن خائین بهلاویسین..

مەعنا: عیبرەت ب هندێ نینە مەزن گوهدارییا گۆتنا (موخالف) بکەت، یان ڕێ بدەتە (موعارەضێ) ئاخفتنا خۆ بێژت، بەلکی عیبرەت ب هندێیە ئەو کاری ب گۆتنا حەقییێ بکەت گاڤا بۆ دئێتە گۆتن، ئیمامێ ئەوزاعی ل ڤێ باوەرێ بوو لەو وی گۆتە خەلیفەی: نەزانینا تە ب گۆتنا من ئەو نینە تو نەزانی کانێ ئەز چ دبێژم، نەزانینا تە ب گۆتنا من ئەوە تو کاری پێ نەکەی.

وەزیرێ خەلیفەی گاڤا ئەڤ بستەییە ژ ئەوزاعی دیتی بالا دەستکێ شیرێ خۆ کر، خەلیفەی لێ حەیتاند و گۆتێ: روینشتنا مە یا خەلاتییە نە یا جەلاتییە.. پاشی رێ دا ئیمامی باخڤت.

ئیمامێ ئەوزاعی گۆت: ئەی (أمير المؤمنين) ئەو کەسێ حەز ژ حەقییێ نەکەت ئەو حەز ژ خودێ ناکەت، چونکی خودێیە حەقییا ئاشکەرا، ئەی (أمير المؤمنين) تو ب خۆ ڤە یێ موژیلی، و تە ئەو خەلکێ ژ بیرکری یێ تو بوویە مەزنێ وان، سۆرێ وان و رەشێ وان، موسلمانێ وان و کافرێ وان، هەر ئێک ژ وان حەقێ ل سەر تە هەی تو دادییێ د گەل بکەی، ڤێجا دێ چاوا بت ئەگەر وەفدەک ل دویڤ وەفدەکێ ب دویڤ تە کەفت و هەر ئێک ژ وان گازندەیا بەلایەکێ بکەت یا تە ئینایە سەری یان زۆرداریەکا تە لێ کری؟

ئەی (أمير المؤمنين) ئەگەر ملک بۆ ئێکی بەری تە مابا ئەو نەدگەهشتە تە، و کا چاوا ئەو بۆ یێن بەری تە نەمایە وەسا ئەو بۆ تە ژی نامینت، ئەی (أمير المؤمنين) ئەرێ تو دزانی باپیرێ تە د شەرحا ڤێ ئایەتێ دا چ گۆتییە: ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ ﴾ (الكهف: ٤٩) ل رۆژا قیامەتێ دەمێ کیتاب دئێتە دانان ڤێجا تو دێ تاوانباران بینی ئەو ب ترسن ژ وێ یا ئەو تێدا، و ئەو دبێژن: تێچوون بۆ مە بت، ئەڤە چ کیتابە نە چ تشتێن بچویک دهێلت نە چ یێن مەزن، باپیرێ تە دگۆت: تشتێ بچویک گرنژینە، و یێ مەزن کەنییە.. ڤێجا تو چ دبێژی بۆ وی کاری یێ دەستان کری و ئەزمانان گۆتی؟

ئەی (أمير المؤمنين) یا بۆ من هاتییە ڤەگوهاستن ژ عومەرێ کورێ خەططابی وی دگۆت: ئەگەر هێسترەک ل سەر لێڤا فوراتی هلنگڤت ئەز دێ ترسم خودێ پسیارا وێ ژ من بکەت.. ڤێجا تو چ دبێژی بۆ وی یێ ل سەر بەرکا تە و هاتییە بێبارکرن ژ عەدالەتا تە؟

و ئیمامێ ئەوزاعی پێدا چوو و وەعزەکێ درێژ و دژوار ل خەلیفەی کر حەتا گەهشتییە وێ دەرەجێ خەلیفەی کەفیکا خۆ ئینایە دەرێ و ڕۆندک ژ چاڤێن خۆ ڤەمالین. و گاڤا ئیمامی ڤیای ژ دیوانا خەلیفەی دەرکەڤت و بزڤرتە جهێ خۆ، خەلیفەی هندەک مال دایێ گۆتێ: ئەڤە بۆ تە دا تو پێ بگەهییە جهێ خۆ.. ئیمامی گۆتێ: من چو هەوجەیی ب وی مالی نینە، و ئەز نە ئەوم یێ شیرەتا خۆ ب مالێ دنیایێ هەمییێ بفرۆشم.

ئەڤە ئەو ڕێباز بوو یێ ئیمامێ ئەوزاعی ژێنا خۆ ل سەر ب ڕێڤەدبر: ئەز نە ئەوم یێ شیرەتا خۆ ب مالێ دنیایێ هەمییێ بفرۆشم! و چونکی ئارمانجا وی ب گۆتنا حەقییێ کنارێ خودێ ب تنێ بوو، خودێ ڤیانا وی هاڤێتبوو دلێن مەزنان و دلێن بچویکان ژی.. نە وەکی وان زانایێن ل سەر سفرا (تەمەللوقێ) هاتینە پەروەردەکرن، ئەوێن ئەگەر جارەکێ حەقییەکێ بێژن ژی بەرێ وان یێ ل هندێ (عەمفەری) ب سەر دا بێن، ڤێجا دووماهییێ نە خودێ حەز ژ وان دکەت و نە ئەوێن ئەو ل هیڤییا عەمفەرییێن وان!!

# ئیمامێ تۆبەکەران
# فوضەیلێ کوڕێ عیاضی

فەضەیلێ کوڕێ عیاضی ناڤەکە د دیرۆکا تۆبەکەرێن ڤێ ئوممەتێ دا ل پێشییێ دئێت.. ل دەمەکی ژ ژییێ ئەو خۆ چەلەنگترین خلمەتکارێن ڕێکا شەیتانی بوو، پاشی خودێ وەسا بۆ وی حەزکر کو سەر و بەرێ ژینا وی بەرەڤاژی ببت، ژ مەزنترین دز و جەردێن وەلاتێ خوراسانێ ببتە سەیدایێ دەستەکا ئێکێ ژ ئیمام و زاهدێن ڤێ ئوممەتێ: سوفیانێ کوڕێ عویەینەی، عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی، بشر ئەلحافی، ئیمامێ شافعی. ئەڤە د دیرۆکا ئیسلامێ دا گەلەک ژ وێ ڕۆژێ ئەوا هوین ل عەسمانی دبینن دگەشترن، و بەسی فوضەیلییە بێژین: ئەڤە هەمی ئەو بوون یێن هندەک ژ گەشاتییا فوضەیلی بۆ خۆ وەرگرتی!

ڤێجا فوضەیل کییە؟ و چیرۆکا تۆبەکرنا وی چیە؟ و ئیمامەتییا وی د چ دا بوویە؟

ئەڤە دێ مژارا پەیڤا مە یا ڤێ جارێ بت، ئەگەر خودێ حەز بکەت.

**فوضەیل وپێناسەکا کورت:**

فوضەیلێ کوڕێ عیاضی، بابێ عەلییێ تەمیمی، ئێک ژ زاهدێن ئوممەتێ یێن مەزنە، ژ تەخەیا تابعێن تابعییانە، یەعنی: وی صەحابی نەدیتبوون بەلێ ئەو دیتبوون یێن صەحابی دیتین، عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی دگۆت: ((ب دیتنا من کەس ل سەر ڕوییێ عەردی نەمایە ژ فوضەیلێ کوڕێ عیاضی چێتر بت)).

ل سالا (١٥٠) مشەختی ل بـاژێرکێ (دەرهێ گـەزۆیـێ) ل دەڤـەرا سەمەرقەندێ هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر ل وێرێ پشکا ئێکێ ژ ژیێ خۆ بۆراند بوو.. ل دەسپێکێ فوضەیل مرۆڤـەکێ دویردین بوو، کار و کەسبێ وی ئـەو بـوو وی رێـک ل کـاروانی و رێڤنگـان دگـرتن و ئـەو دشـەلانـدن، د ناڤبـەرا بـاژێرێ (ئەبیووردێ) و (مەرۆیێ) دا جهەک هەبوو دگۆتنێ: (جهێ فوضەیلی)؛ چونکی ئەو جهـ ئەو بوو یێ فوضەیلی کاروانی لێ دشەلاندن. ترسا ژ ڤی جهی گـەلـەک جاران خەلک ژێ پاشڤەدبر، لەو وان بەرێ خۆ ژ ڤێ رێکێ وەردگێرا و قەستا رێکەکا دی دکر بلا چەند یا دویر ژی با! بەس دا نەکەڤنە وان بیسـەیان یێن فوضەیلی ل بەر وان ڤەددان.

فوضەیل زەلامەکێ ب هێز و ژێهاتی بوو، کەسێ نەدوێریا مایێ خۆ تێ بکەت، و هەمییان خۆ ژێ دکرِی، و ناڤێ وی بۆ خەلکی بووبوو جهێ ترس و سەهمێ.. و ئەگەر خودێ حەز کربت بۆ هەر دەردەکی دەرمانەک هەبت، دیسا وی حەزکرییە بۆ نەفسا شەنبۆز ژی لغاڤەک هەبت پێ بێتە هەڤسارکرن..

### چیرۆکا ئەڤینداریا فوضەیلی:

د نـاڤ گێلەشـۆک و پێلێن رێگـری و دز و جـەردەییـێ دا، یـێن کـو ژینـا فوضەیلی هەمی ڤەگرتی مێرگەکا تەنا و رحەت بۆ بێنڤـەدانـێ سـەرێ خۆ هلدا، رۆژەکێ بێ ژڤان و ب خافلەتی ڤە چاڤێن فوضەیلی ب کچەکا جوان کـەفـتن، و ڤێ کچێ ئێکسەر و بـێ دەسـتـویـری رێـکـا خـۆ بـۆ دلـێ وی دیت.. دلـێن وان ب سەر ئێک هلبوون، و ب ڤێ سەرکهلبوونێ ژینا فوضەیلی سەرک و بنک بوو، ئـەو فـوضـەیلـێ شـەڤ و نیڤشەڤان ل سەرێن رێکا رادوەستا و بەرێ وی دما ل نێچیرەکێ دا بشـەلینـت، ئێدی خەما وی هەمی بوو ئـەو دلبـەرا خـۆ -ئەگەر خۆ ژ دویر ڤە ژی بت- ببینت، و عەدەتێ دلییـە گاڤا هاتـە هژانـدن و ژ ئـەڤینێ تژیبوو ئەو دکەفتە سەر رێکەکا تایبەت یا دویر ژ دز و جەردەییێ، رێکـەکا تـژی جهێن بێنڤەدان و خۆشییێ، ڤێجا دێ بینین هندەک خودان دل خۆ ب ڤان جهێن

بێنڤەدانێ ڤە موژیل دکەن، و چوونا ل ڕێکا ئەڤینییێ دهێلن، و ئارمانجا مەزن ئەوا ل دووماهییا ڕێکێ ژ دەست ددەن، و هندەک ژی هند (زەخیرەی) بۆ خۆ ژ ڤان جهان وەردگرن کو ئەو پێ ب هێز بکەڤن و بشێن پێ بگەهنە ئارمانجا مەزن: (گەهشتنا مەحبووبێ حەقیقی).. و ڕەنگە ئەڤە ئەو (سلووک) بت یا خودانێ خۆ ژ (حوبا مەجازی) بەر ب (حوبا حەقیقی) ڤە دبەت وەکی صووفیاتی بەحس ژێ دکەت.

هەر چاوا بت ڤێ ئەڤینداریێ بەرێ فوضەیلی ژ ڕێکەکێ بۆ ئێکا دی ڤەگوهاست، خەما وی ئێدی بوو ئەو ل شوینا کاروانییان بێختە داڤێن خۆ، و دەستێ خۆ بدانتە سەر مالێ وان، دلبەرێ بێختە داڤێن خۆ و ژڤانەکی ژێ وەرگرت.. هێدی هێدی ئەو ژ ڕێگرییێ دویرکەفت، ب ڤیانا خۆ ڤە موژیل بوو، حەتا ئەو شەڤ ب سەر دا هاتی یا کو فوضەیلێ دز و تالانکەر تێدا بوویە ئیمامێ تۆبەکەرێن ئوممەتێ.. ڤێجا وەرن دا پێکڤە هەڤالینییا فوضەیلی بکەین ل وێ شەڤا ژێگۆتی.

## شەڤا تۆبەکرنا فوضەیلی:

هەر ڕۆژ گاڤا دبوو ئێڤار فوضەیلی هزرا خۆ دکر کانێ ئەڤ شەڤە بویسەیا خۆ ل کیڤە بدانت؛ دا نێچیرەکا باشتر بێختە داڤێن خۆ، بەلێ ڤێ جارێ هزرا وی ب تشتەکێ دی ڤە یا موژیل بوو: کانێ چاوا دێ شێت ئەڤ شەڤە دلبەرێ بینت؟ دووماهییێ بڕیار دا خۆ بگرت حەتا شەڤ ژ نیڤێ دقولپت، و چاڤ دکەڤنە خەوا گران، و زێرەڤان غافل دبن، پاشی درەکەڤتە ژڤانی، هنگی ئەو و ئەو و شەڤ ب تنێ دێ میننە د گەل ئێک..

دەمێ ژڤانی هات، فوضەیل نێزیکی جهێ ژڤانی بوو، ژ بلی دەنگێ پیێن وی شەڤێ گوهـ ل چو پێژنێن دی نەدبوو، گاڤا نێزیکی خانییێ دلبەرێ بووی، (ئتتفاق) یا وەسا بوو ئەو د دەرگەهی ڕا ب ژۆر نەکەڤت؛ دا کەس ل وان هشیار نەبت، ب ڕەخ سیاجێ خانی ڤە دارەکا بلند هەبوو، ب سەر دارێ

کەفت.. خانی -د ناڤ تارییێ ڕا- وەکی بویکەکا خەملاندی هاتە بەر چاڤێن وی، ژ سەر چەقەکێ دارێ خۆ هاڤێتە سەر سیاجی دا خۆ ژۆردا بەردەتە حەوشێ.. بەلێ بەری ئەو ڤێ پێگاڤا دووماهییێ بهاڤێت تشتەکێ وەسا چێ بوو چو جاران نەدهاتە سەر هزرا فوضەیلی.. ژ جهەکی -یێ وی ب خۆ ژی نەدزانی کیژ جهە- دەنگەک د گەل هەیبەتا شەڤێ ونازکییا (مەوقفی) هاتە گوهان، دەنگێ قورئان خوینەکی بوو ئەڤ ئایەتە ژ سوورەتا (الحدید) دخواند:
﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ (الحدید: ١٦) تو دا بێژی دەنگێ جبریلییە ژ نوی ئەڤ ئایەتە ئینایە خوارێ، هەر وەکی مەخسەد ب ڤێ ئایەتێ فوضەیلە و نە کەسێ دی: ئەرێ ما نە دەمە بۆ خودان باوەران کو دلێن وان بۆ زکرێ خودێ ڤەبن و ژ ترسان دا بلەرزن، و بێنە سەر وێ حەقییێ یا خودێ ئینایە خوارێ، و وەکی وان کیتابییان لێ نەئێن یێن دەم ل سەر وان درێژبووی و دلێن وان ڕەقبووین، و پترییا وان ئەون یێن د سەر دا چووین؟

فوضەیلی د دل دا بەرسڤ دا: بەلێ دەمە یا ڕەببی!

بۆچی دەم نەبت؟ و دەم یان دوهییە ئەوا ژ دەست تە دەرکەفتی و بۆری، یان سوباهییە ئەوا شەرت نینە تو بگەهییێ، یان ئەڤرۆیە ئەوا تە ئەو ب تنێ د دەست دا هەی؟

وەکی وی مرۆڤێ دلگرتی دبت فوضەیل ژ سەر دیواری کەفت، و وەکی وی مرۆڤێ ژ بەر تایا گران ژ بەر باخڤت ئاخفتنا فوضەیلی بۆ ئەو: بەلێ دەمە یا ڕەببی، بەلێ دەمە.. و فوضەیلی بەرێ خۆ وەرگێڕا، ژڤان هێلا ب ڕێڤە.. و ل ژڤانەکێ گەلەکێ مەزن چوو، گازییا دلبەرێ هێلا و د گازییا مەحبووبێ خۆ یێ مەزن چوو، و سۆز د گەل خۆ دا کو ئەو نەمینت فوضەیلێ بەرێ، و خودێ ل سەر سۆزا خۆ کرە شاهد..

فوضەیلی پشت دا خانییێ دلبەرا بۆری و بڕیار دا قەستا مالا مەحبووبێ خۆ یێ مەزن بکەت، و هندی یێ ساخ بت ل وێرێ بمینت.. بڕیارا فوضەیلی ئەو بوو پشتی تۆبەکرنێ قەستا مەکەهێ بکەت و ل مالا خودێ بمینت.. بەلێ نوکە، ل ڤێ نیڤا شەڤێ ئەو کیڤە بچت؟

فوضەیلی قەستا خانەکێ کر کو دکەفتە سەر ڕێکێ -وەکی ئۆتێلێن مە یێن نوکە- حەتا لێ دبتە سپێدە.. ل وێرێ فوضەیلی هندەک کاروانی دیتن وان دڤیا ڕابن بدەنە ڕێ؛ دا ل وەخت بگەهنە بنەجها خۆ، بەلێ هندەک ژ وان گۆتە هندەکان: دێ کیڤە چن ڤێ شەڤێ؟ پا ئەگەر فوضەیل هاتە د ڕێکا هەوە دا؟

چاڤێن فوضەیلی تژی ڕۆندک بوون، و وی گۆتە وان: نەترسن خودێ ڕێک ژ فوضەیلی پاقژکر، ئەوێ هوین ل نک خۆ دبینن فوضەیلە، و هیڤییا من ئەوە هوین ئێدی فوضەیلی ل ڤی وەلاتی هەمییێ نەبینن. پاشی فوضەیلی گۆتە خۆ: ئەز شەڤێن خۆ ب گونەهان ڤە دبۆرینم و خەلک ژ ترسێن من دا نەشێن دەرکەڤن، یا ڕەببی من تۆبەیە و تۆبا من ئەوە ئەز بچم قەستا بەیتا تە بکەم.

د گەل هەلاتنا سپێدەیا وێ ڕۆژێ، وەلاتێ خوراسانێ ژ فوضەیلێ دز و ڕێگر ڤالا و رحەت بوو، و وەلاتێ حجازێ ب هاتنا فوضەیلێ زانا و خودێناس شاد و کەیفخۆش بوو. د ڕێکا خۆ ڕا فوضەیلی قەستا وەلاتێ عراقێ کر، و ل وێرێ هەڤالینییا گەلەک زانایێن تابعییان کر، و زانین بۆ خۆ ژ وان وەرگرت، پاشی قەستا حجازێ کر و ل وێرێ ژی هەمی دەمێ خۆ ب علمی و عیبادەتی ڤە بۆراند، و ڕۆژەک ب سەر فوضەیلی دا هات د علمی و عیبادەتی و زوهدێ دا ئەو بوو زەلامێ ئێکێ د ناڤ خودێناسێن ئوممەتێ دا، و چەند جاران خەلیفێن وەکی هاروون ئەلرەشیدی و زانایێن وەکی ئیمامێ شافعی ڕیهێن خۆ ل بەر وەعزێن وی ژ ڕۆندکان تەڕ دکرن!

## د گەل هاروون ئەلرەشیدی:

دەمێ ناڤ و دەنگێن فوضەیلی ب زوهد و علم و بەرەڤانییا ژ سوننەتێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبووین، خەلیفێ عەبباسی هاروون ئەلرەشیدی حەزکر وی ببینت و گوهێ خۆ بدەتە دەرس و شیرەتێن وی، و عەدەتێ هاروونی بوو -خودێ ژێ رازی بت- مرۆڤێن زانا و تەقوادار ل دۆرێن خۆ کۆم دکرن و هەڤالینییا وان دکر.. رۆژەکێ هاروونی گۆتە سوفیانێ کورێ عویەینەی: ئەز حەز دکەم فوضەیلی ببینم و گوهێ خۆ بدەمە ئاخفتنێن وی، سوفیانی گۆتێ: ب تنێ رێکەک تە یا هەی تو وی پێ ببینی، کو تو رۆژەکێ جلکێن خۆ بگوهۆری و بێیە مزگەفتێ و ل دەرسا وی روینی بێی کو ئەو بزانت تو (أمیر المؤمنین)ی.. هاروونی ب یا وی کر، هات و قەستا دیوانا فوضەیلی کر، گاڤا فوضەیلی دەست ب وەعزی کری هاروون هندی گری حەتا ریهێن وی ژ رۆندکان تەر بووین، پشتی هاروون چووی، سوفیانی گۆتە فوضەیلی: ئەو (أمیر المؤمنین) بوو.

جارەکا دی هاروونی زانایێن باژێری هەمی ڤەخواندنە دیوانا خۆ، و فوضەیل ئێک ژ وان بوو، سوفیانێ کورێ عویەینەی دبێژت: گاڤا ئەم چووینە دیوانا خەلیفەی، فوضەیل پشتی مە هەمییان هات، و ب رەخ من ڤە روینشت، پاشی هێدی گۆتە من: کیژکە (أمیر المؤمنین)؟ گۆت: من ئیشارەت دا هاروونی و من گۆتێ: ئەڤەیە.. گۆت: فوضەیلی باش بەرێ خۆ دایێ، پاشی گۆتێ: ئەی خودانێ دیمێ گەش! تویی خودێ ئوممەت هەمی ئێخستییە بن دەستێ تە و گونەها وان کرییە ستویێ تە؟ ب راستی بارەکێ گران تە یێ ب ستویێ خۆ ڤە گرتی! ئینا هاروونی ژ بەر گۆتنا وی کرە گری.

پاشی بەری ئەو دەرکەڤن هاروونی هەر ئێکی دەه هزار دەرهەم دانێ، هەمییان وەرگرت فوضەیل تێ نەبت، هاروونی گۆتێ: ئەگەر دلێ تە نەچتە پارێن مە ببە بدە ئێکێ پێتڤی، فوضەیل ل بەر هندێ ژێ نەهات، ئینا هاروونی گۆتێ: تو چەند مرۆڤەکێ زاهدی! فوضەیلی گۆتێ: تو ژ من زاهدتری، وی

گـۆت: چـاوا؟ فوضـەیلی گۆتێ: چونکی ئەز د دنیایا فانی دا یێ زاهـدم، و تـو د ئاخرەتا بـاقـی دا.. پاشـی گـۆتـە هـاروونی: ئەی (أمیر المؤمنین) دلـێ خۆ ژ خەمێ و ترسێ تژی بکە، ئەو هەردو دێ بەرێ تـە ژ بێ ئـەمرییـا خـودێ دەنـە پاش، و ئەو دێ تە ژ ئاگری دویرکەن.

## دووندەها فوضەیلی:

فوضەیل یێ ب ڤی ڕەنگی بوو، گاڤا قویناغ کۆچک و دیوانێن خەلیفان با ئەو ل دووماهییان هەمییان بوو، و بۆ خێرێ و ترسا ژ خودێ کـەس ل بـەراهییـا وی نەبوو، چو جاران وی دلـێ خۆ نەدبرە وی تشـتـێ د دەسـتـێ مـەزنـان دا هـەی؛ لـەو ئـەو ژیـا یـێ مـەزن، و مـر یـێ مـەزن، و تشـتـێ غـەریـب ئـەو بـوو عـەیـالـێ فوضـەیلی، کـوڕ و کـچ، هێشـتـا ژ وی ژی دزاهـدتر بـوون.. بـۆ نموونـە بـەرێ خـۆ بدەنە ڤان هەردو سەرهاتییان:

١- فوضـەیلی کوڕەک هەبوو دگـۆتنێ: عـەلی، گەلـەک حەز ژ بابێ خۆ دکـر، فوضـەیل دبێژت: ڕۆژەکێ ئەز چوومە مال من دیت کوڕێ مـن عـەلی دکـرە گـری، ئینا من گـۆتێ: بـۆچی تـو دکـەیـە گـری؟ گـۆت: وی گۆتـە مـن: ئـەز دترسم ڕۆژا قیامەتێ ئەز و تو ژێکڤە ببین و ئەم ئێک و دو نەبینین، گۆت: پاشی وی گـۆتە من: بابۆ! دوعا ژ خودێ بکە کانێ چاوا وی د دنیایێ دا ئەز دامە تە وەسـا ئـەو ل ئاخرەتێ ژی من بدەتە تە. ژ ڤی کوڕێ خۆ فوضەیل فێری گرییا ژ ترسا خودێ بووبوو. دبێژن: جـارەکێ ڤـی عەلی گوهـ ل مرۆڤەکی بـوو ئـەڤ ئـایەتـە د خـوانـد: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ (الأنعام: ٢٧) ئینا ئەو ژ ترسێن خودێ دا دلگرتی بوو و کەفت و نەڕابوو، عەلی د ژیانا بابێ خۆ دا مربوو.

٢- فوضـەیلی کچـەک ژی هـەبـوو زوهـدا وێ ژ یـا بـابێ وێ و برایـێ وێ کێمتر نەبوو، بەلکی گەلەک جاران فوضەیلی دەرسێن زوهدێ و تەقـوایێ بـۆ خـۆ ژ ڤێ کچێ وەردگـرتن، ڕۆژەکێ دەسـتـێ وێ دئێشـا بـابێ وێ چـوو سـەرا بـدەت،

گۆتێ: کچا من! دەستێ تە یێ چاوایە؟ وێ گۆت: بابۆ! ئەو خێرا خودێ ب ڤی دەستی دایە من هندە ئەز نەشێم چو جاران شوکرا وی سەرا بکەم. د وێ گاڤێ دا کوڕکەکێ فوضەیلی یێ سێ سالی ب ژۆرکەفت، فوضەیلی ئەو دا بەر سنگێ خۆ و ماچی کر، ئینا کچا وی گۆتێ: بابۆ تو حەز ژ وی دکەی؟ وی گۆت: ئەرێ ب خودێ، کچکێ گۆتێ: وەی بۆ تە ژ خودێ بابۆ! من هزر دکر تە خودێ ب تنێ دڤێت، فوضەیلی گۆتێ: کچا من! ما هوین حەز ژ عەیالی ناکەن؟ وێ گۆت: ڤیان و حەژێکرن بۆ خودێیە، و رەحم و دلۆڤانی بۆ عەیالییە، گاڤا فوضەیلی گوهـ ل گۆتنا وێ بووی تەپەک ب سەرێ خۆ دادا و گۆت: ئەی خودا ئەز ب مەزنییا تەکەمە ژ ئەڤرۆ و حەتا ئەز دگەهمە تە ئەز ژ تە پێڤەتر حەز ژ کەسێ د گەل تە نەکەم.

ل باژێرێ مەکەهێ، و ل هەیڤا موحەررەما سالا (١٨٧) فوضەیل مربوو.

# زوهدا ژ ڕەنگەکێ تایبەت
# عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی

د دیرۆکا زاهدێن ڤێ ئوممەتێ دا گەلەک ڕەنگێن زوهدێ ب بەرچاف دکەڤن، بەلێ زوهدا عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی -ب هزرا من- ژ زوهدا هەر کەسەکێ دی یا جودایە؛ چونکی زوهدەکا تایبەتە ب وی ڤە.. ئەگەر د هزرا مە دا وەسا هاتبتە نەخشاندن کو زوهد ئەوە مرۆڤ پشت بدەتە دنیایێ، و خۆ ژ پەرتالێ وێ دەست ڤالا بکەت.. عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی ب زوهدا خۆ وەسا بنەجهـ کر کو زوهدا مەزنتر ئەوە دەستێ مرۆڤی ژ دنیایێ یێ تژی بت و مرۆڤ یێ ژێ زاهد بت، دبت هندەک کەسێن ئەڤ ڕەنگێ زوهدێ نەنیاسی پیسارەکێ بکەن: ئەرێ چاوا دەستێ مرۆڤی ژ دنیایێ یێ تژی بت و مرۆڤ یێ زاهد بت؟ ما چێ دبت مرۆڤێ زاهد یێ دەولەمەند بت؟

ژین و سەرهاتییا عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی بەرسڤە بۆ ڤێ پسیارێ.. ڤێجا کەرەم کەن ئەم و هوین و عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی، و سەرهاتییا زوهدا وی یا تایبەت.

**بەری دانەنیاسینێ:**

ئیمامێ نەوەوی -خودێ ژێ ڕازی بت- د دەر حەقا عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی دا دبێژت: ((ئەوە ئیمامێ (ئیجماع) ل سەر ئیمامەتی و مەزنییا وی د هەمی تشتان دا هاتییەکرن، یێ کو ب کرنا بەحسێ وی ڕەحم دئێتە خوارێ، و ب حەژێکرنا وی هیڤییا غەفراندنا گونەهان دئێتەکرن))، و پشتی بۆ مە

ئاشكەرا دبت كو نموونەيێ ئيسلامی يێ دلخواز ب جوانترین و پێكهاتیترین ڕەنگ د كەسينييا عەبدللاهێ كوڕێ موبارەكی دا كۆمبووبوو ئەم ژ ڤێ گۆتنێ عەجێبگرتی نامینین یا ئیمامێ نەوەوی د دەر حەقێ دا گۆتی..

بۆ عەقیدێ و بەرەڤانییا ژ (مەنهەجێ كیتاب و سوننەتێ) ئەو چیایەكێ موكمبوو، د كرنا هەمی ڕەنگێن عیبادەتی دا ل پێشییێ بوو، بۆ ئەخلاقێ خۆ یێ (ئینسانی) زەلامێ ئێكێ بوو، ڕویگەشی و مەردینی ئەو بوو یا وی نیشا خەلكی ددا، ل مەیدانا جیهادێ رحا وی ل سەر دەستی بوو و جهێ وی هەردەم ڕێزا ئێكێ بوو، د مەیدانا ئاڤاكرنا ئابۆرییێ جڤاكێ دا كەسێ دەستێ وی نەدگرت، ب كورتی دێ بێژین: ئەگەر تە بڤێت موسلمانەكێ كامل -ب كەمالا مرۆڤ دگەهتێ- ببینی بەرێ خۆ بدە عەبدللاهێ كوڕێ موبارەكی؛ چونكی ئەوە مرۆڤێ ئاڤاهییێ ئیسلامی یێ پێكهاتی د كەسینییا وی دا كۆمبووی، وەكی سەیدایێ ناڤدار (د. محمد سعيد رمضان البوطي) دبێژت.

**هێڤێنەكێ پاقژ:**

ئەم ب كوردی دبێژین: كوڕ كڤانێ بابێ دژەنت، یان گۆپالێ وی دكێشت، هەر چاوا بت ئەڤ گۆتنە هندێ دگەهینت كو باب گەلەك سالۆخەتێن خۆ بۆ كوڕێ خۆ ڤەدگوهێزت، لەو گەلەك جاران كوڕ ددەتە ب بابێ خۆ ڤە، و ئەگەر ئەڤ گۆتنە ل سەر كەسێ ب كار نەئێت ژی ئەو ل سەر عەبدللاهێ كوڕێ موبارەكی ب كار دئێت، و عەبدللاهی ئەگەر چو سالۆخەت ژ بابێ خۆ موبارەكی وەرنەگرت بن ژی بەسی وییە كو وی هندەك ژ تەقوایا وی وەرگرت بت..

ل دۆر تەقوایا موبارەكێ بابێ عەبدللاهی دیرۆك سەرهاتییەكا عەجێب ڤەدگوهێزت، كتێب دبێژن: موبارەك مرۆڤەكێ ترك بوو، قەدەرێ بۆ وی حەزكر بوو ئەو ببتە عەبدێ مرۆڤەكێ هەمەدانی یێ دەولەمەند، ئەڤی مرۆڤی بیستانەكێ تێر دار و بار و خودان بەرهەم هەبوو، لەو وی فەرمان ل عەبدێ خۆ موبارەكی كربوو كو ئەو حەرەسییێ ل ڤی بیستانی بگرت.. ڕۆژەكێ زەلامێ

هەمەدانی چوو ناڤ بیستانی و گۆتە عەبدێ خۆ: هنارەکا شرین بۆ من بینە.
ئەو چوو هنارەک بۆ کر و ئینا، گاڤا خودانی هنار شکاندی و تامکرییێ دیت ئەو یا ترشە، ئینا ب عێجزی ڤە گۆتێ:

- من گۆتبوو تە هنارەکا شرین بۆ من بینە نە یا ترش!

ئەو چوو هنارەک ژ بنەکا دی کر و بۆ سەییدێ خۆ ئینا، پشتی سەییدی تامکرییێ ئەو ژی ترش دەرکەفت، ئینا لێ حەیتاند و گۆتێ:

- دیارە تو ترشی و شرینی ژێکجودا ناکەی؟ ئەزێ دبێژمە تە هنارەکا شرین.. ئەو چوو هنارەکا دی ئینا ئەو ژی ترش دەرکەفت، عەقل د سەرێ خودانی نەما، گۆتێ:

- تو نابێژییە من مەسەلا تە چیە؟

موبارەکی ب ئەدەبەکێ زێدەڤە گۆتێ:

- ل من نەگرە، ب ڕاستی ئەز نزانم کیژ بن یا شرینە و کیژ یا ترشە!

زەلامی باوەر نەکر.. گۆتێ:

- ما تە تام نەکرییە هناران؟

وی گۆت:

- نەخێر.. تە ئەزێ دانایمە بەر بیستانی دا حەرەسییێ لێ بگرم و تە دەستویری نەدایە من کو ئەز ژێ بخۆم.

خودانێ بیستانی ژ گۆتنا وی حێبەتی ما، و چەند ڕۆژەکان زێرەڤانی لێ کر دا بزانت کانێ گۆتنا وی یا ڕاستە یان نە، و پشتی ڕاستییا گۆتنا وی بۆ خودانێ بیستانی ئاشکەرابووی ئەو د چاڤێن وی دا مەزن بوو، لەو وی ئنیەتەک کرە دلێ خۆ.. ڕۆژەکێ ئەو چوو ناڤ بیستانی و ل نک موبارەکی ڕوینشت و گۆتێ:

- من کچەکا هەی گەلەک کەسان یا خواستی، تو بێژی ئەز وێ بدەمە کێ؟

موبارەکی گۆتی: ل جاهلیەتێ بەرێ خەلکی ل مالبات و مالمەزنان بوو، و جوهییان بەرێ وان ل زەنگینییێ بوو، و فەلان بەرێ وان ل جوانییێ بوو، و بەرێ ڤێ ئوممەتێ یێ ل دینی.

زەلامێ هەمەدانی زڤڕی مال و سوحبەتا عەبدێ خۆ بۆ ژنکا خۆ ڤەگێڕا، و گۆتێ:

- ژ موبارەکی پێڤەتر کەس ب کێر کچا مە نائێت..

وی موبارەک ئازاکر و کچا خۆ دایێ، و چونکی کۆمبوونا وان بۆ خودێ بوو نەبوو چو تشتێن دی، خودێ بەرەکەت هاڤێتە ڤێ کۆمبوونێ و (عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی) بەرهەمێ ڤێ دارا پیرۆز بوو..

## شینبوونەکا ب بەرەکەت:

وەسا دیارە کو پشتی موبارەکی ئازادییا خۆ ب دەست خۆ ڤە ئینای، و ئەو و کابانییا خۆ کچا دەولەمەندێ هەمەدانی گەهشتینە ئێک، وان قەستا باژێرێ (مەرۆیێ) کر، و مالەکا بچویک بۆ خۆ دانا و دەست دا کارێ حەلال و بۆ خۆ بازرگانی کر، و ل ڤی باژێری (باژێرێ سوفیانێ ثەوری، و ئیسحاقێ کوڕێ راهوەیهی، و ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی) عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی ل سالا ١١٨ مشەختی (بەرانبەر ٧٢٣ زایینی) هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر ل ڤی باژێری هاتبوو ب خودانکرن و وی دەمەکێ درێژ ژ ژییێ خۆ بۆراندبوو، و ئەو ژ تەخەیا تابعێن تابعییان دئێتە هژمارتن.

ل باژێرێ مەرۆیێ دەمێ هێشتا ئەو یێ بچویک، وی قەستا خواندنێ کر و ل سەر دەستێ هژمارەکا زانایێن باژێری فێری خواندن و نڤیسینێ بوو، بەلێ وەسا دیارە کو دەمەکی ئەو ژ خواندنێ ڤەقەتیا بوو، و تێکەلییا هندەک هەڤالێن خراب کربوو، و ژ وان فێری هندەک کارێن خراب بووبوو وەکی لێدانا عوود و تەنبویرێ، و وی پترییا دەمێ خۆ ب موژیلاهییێن بێخێر ڤە دبۆراند، سەیدایێ

وی (ئەبو حەنیفە)ی ڕۆژەکێ پسیار ژێ کر: دەسپێکا تە د گەل زوهدێ چ بوو؟ وی گۆت: ((جارەکێ ئەز د گەل هندەک هەڤالان دەرکەفتمە ناڤ بیستانەکی، و مە خوار و ڤەخوار، و حەتا درەنگی شەڤ ئەم ماین، و حەتا بەری سپێدێ من عوود و تەنبویر لێ ددا، پاشی ئەز د خەو چووم، من د خەونێ دا دیت تەیرەک هاتە سەر دارێ ل هنداڤی سەرێ من و ئەڤ ئایەتە خواند: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ (الحديد: ١٦)، هنگی ئەز ژ خەو ڕابووم و من گۆت: بەلێ یا ڕەببی دەمە من تۆبەیە، و من عوودا خۆ ژ شکاند و زوهدا من دەست پێ کر)).

پشتی ڤێ سەرهاتییێ -ئەوا ل بیست سالییێ ب سەرێ وی هاتی- عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی بەرێ خۆ ژ ڕێکا موژیلاهییا بێ مفا وەرگێڕا و قەستا ڕێکا وەرگرتنا زانینێ کر حەتا وە لێ هاتی زانایەکێ وەکی (ئیسماعیلێ کوڕێ عیاشی) د دەر حەقێ دا گۆتی: ((کەسەک وەکی عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی ل سەر ڕوییێ عەردی نینە، و خودێ خسلەتەکێ خێرێ نەدایە ئەگەر ئەو ل نک عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی نەبت)).

عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی ل سەر دەستێ هژمارەکا مەزن ژ سەیدایێن بەرکەفتی فێری زانینێ بوو، وی دگۆت: من زانین ژ چار هزار سەیدایان وەرگرتییە.. و ژ وان سەیدایان یێن وی دەرس ل نک خواندین: سوفیانێ ثەوری، و مالکێ کوڕێ ئەنەسی، و ئەبو حەنیفە، و ئەوزاعی، و سوفیانێ کوڕێ عویەینەی، و ئەعمەش و گەلەکێن دی.. و وی پویتەکێ مەزن دا کۆمکرنا حەدیسێ حەتا پتر ژ بیست هزار حەدیسان ژبەرکرین، لەو د گۆتنێ: (أمير المؤمنين في الحديث)، و د مەسەلا ژێک ڤاڤارتنا حەدیسێن دورست و نەدورست دا ئەو بووبوو جهێ مەتەل پێ ئینانێ، دبێژن: جارەکێ (هاروون الرشيد)ی زەندیقەک گرت و پشتی ل سەر ئاشکەرابووی کو ئەو حەدیسێن درەو

چێ دکەت، هاروونی فەرمان دا بێتە کوشتن، وی گۆتێ: و تو دێ چ ل وان هزار حەدیسان کەی یێن من ژ نک خۆ چێکرین؟ هاروونی گۆتێ: ئەبوو ئیسحاقێ فەزاری و عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی حەرف حەرف دێ وان مۆخل و بێژنگ کەن!

ژ بلی زانینا وی یا بەرفرەهـ ب علمێ حەدیسێ عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی فقهزانەکێ مەزن ژی بوو، و ئەڤە یا غەریب نینە چونکی وی فقهێ خۆ ژ سێ فقهزانان وەرگرتبوو، ئوممەت هەمی ل سەر ئیمامەتییا وان یا (موتتەفقە) و مەخسەدا مە پێ: سوفیانێ ثەوری، و مالکێ کوڕێ ئەنەسی، و ئەبو حەنیفەیە.

حەژێکرنا وی بۆ زانینێ گەهشتبوو دەرەجەیەکا وەسا صەبرا وی ب کەسێ نەدهات هندی ب کتێبێن وی دهات، لەو هەڤالینییا وی د گەل کتێبێ یا پتر بوو ژ هەڤالینییا وی د گەل هەر کەسەکێ دی، ڕۆژەکێ هندەک مرۆڤان گۆتێ: گاڤا تە نڤێژ کر تو ڕادبی و دچی ل نک مە ناڕوینی بۆچی؟ وی گۆت: بڕوینم ل نک هەوە چ بکەم؟ و کارێ هەوە غەیبەتا خەلکییە؟ ئەز دچم ل نک صەحابی و تابعییان دڕوینم، وان گۆتێ: صەحابی و تابعییێن چ؟ وی گۆت: ئەز دچم بەرێ خۆ ددەمە علمێ خۆ ڤێجا ئەز ب حالێ وان زانا دبم و ئەز چاڤ ل وان دکەم.

(نەعیمێ کوڕێ حەممادی) دبێژت: عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی گەلەک دما ل مال ب تنێ، ئینا هندەکان گۆتێ: چاوا صەبرا تە دئێت تو هندە دمینییە ب تنێ ما تو خەریب نابی؟ وی گۆت: دێ چاوا خەریب بم و ئەزێ د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-؟

## زوهدەکا تایبەت:

گەلەک هەنە هزر دکەن زوهد ئەوە دەستێ مرۆڤی ژ مالێ دنیایێ یێ ڤالا بت، و مرۆڤ د مالا خۆ دا وەکی مێڤانان بژیت.. و ئێک ژ وان کەسێن ئەڤ

ڕەنگە هزرە دکر فوضەیلێ کوڕێ عیاضی بوو -سەیدایێ عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی و هەڤالێ وی- لەو دەمێ وی عەبدللاهـ دیتی ب کارێ بازرگانییێ ڕادبوو، و تجارەتا وی ژ وەلاتێ خوراسانێ حەتا مەکەهێ و شامێ ڤەدگرت، و سەرمالێ وی ب هزاران بوو، پسیار ژێ کر: تو یێ بەرێ مە ددەیە زوهدێ و تجارەتا تە ژ خوارسانێ یا دئێتە حەرەمێ ئەڤە دێ چاوا چێ بت؟ وی گۆت: ئەز ڤێ چەندێ دکەم دا ئاڤا ڕوییێ خۆ نەڕێژم، و ناموسا خۆ پێ بپارێزم، و ئەو بۆ من ببتە هاریکار ل سەر عیبادەتێ خودێ، و دا هەر جارەکا من حەقەکێ خودێ دیت ئەز ب لەز بچم ژ سەر خۆ ڕاکەم..

ئەڤە بەرێخۆدانا عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی بوو بۆ زوهدێ، زوهد ئەوە دلێ تە ژ دنیایێ یێ ڤالا بت، وەکی دی دەستێ تە یێ ژێ تژی بت یان نە ئەو چویێ ل زوهدا تە کێم و زێدە ناکەت، و دویر نینە ئەگەر عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی یێ زەنگین و دەولەمەند نەبا زوهدا وی هند بۆ مە یا بەرچاڤ نەبا؛ چونکی وی ب سەربۆڕ ئاشکەراکر کو ئەو ژ وان کەسان بوو یێن کەیفا وی ب زێدەبوونێ نەدهات، و کێمبوونێ ئەو ب خەم نەدئێخست، و هندەک زانایێن زانا دبێژن: گاڤا کەیفا تە ب هندێ نەهات دەمێ مالێ تە زێدە دبت، و تو ب خەم نەکەفتی گاڤا ئەو کێمبوو، ئەو تو مرۆڤەکێ زاهدی، ما خودێ نەگۆتییە:
﴿ لِّكَيْلَا تَأْسَوْاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ (الحديد: ٢٣) مەعنا: زوهد نە ئەوە تە مال نەبت و تو یێ فەقیر بی، بەلکێ زوهد ئەوە مالی هند بهایێ خۆ ل نک تە نەبت کو (حالەتێ تە یێ نەفسی) بگوهۆڕت.. وەکی دی عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی -د گۆتنا خۆ یا بۆری دا- بۆ مە ئاشکەرا دکەت کو (سررا) خۆزەنگینکرنا وی ئەوە وی دڤێت ب دانا مالی ژی عیبادەتێ خودێ بکەت، و دەستێ هاریکارییێ بۆ برایێن خۆ درێژ بکەت، و ما ئەگەر وی چو مال نەبت چاوا دێ شێت ڤی ڕەنگێ عیبادەتی کەت؟

عەلییێ کورێ مەدینی دبێژت: عەبدللاهێ کورێ موبارەکی دگوت: ئەگەر ژ بەر پێنج کەسان نەبا من بازرگانی نەدکر: سوفیانێ ثەوری، و سوفیانێ کورێ عویەینەی، و فوضەیلێ کورێ عیاضی، و موحەممەدێ کورێ سەمماکی، و کورێ عەلییەی. و ئەڤ هەر پێنجە ژ زانایێن حەدیسێ یێن مەزن بوون، حالێ وان یێ بەرتەنگ بوو، گاڤا تجارەتا عەبدللاهێ کورێ موبارەکی دهات هندەک مال بۆ عەیالێ خۆ ڕادکر، و مەصرەفێ حەجا خۆ هل دگرت، و مالێ دی دگرە پێنج پشک بۆ ڤان هەر پێنج زانایێن بەرکەفتی.

و هەر چەندە پشکا مەزن ژ هاریکارییێن عەبدللاهێ کورێ موبارەکی دگەهشتە زانایان و ب تایبەتی زانایێن حەدیسێ، بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن کو خەلکێ دی ژ خێرێن وی یێ بێبار بوو، و ئەگەر ئەم سەرهاتییێن مەردینییا وی ڤەگێڕین سوحبەتا مە گەلەک دێ درێژ بت لەو ل ڤێرێ ب تنێ سەرهاتییەکا وی دێ ڤەگێڕین، (ابن کثیر) دبێژت: ((دەمێ عەبدللاهێ کورێ موبارەکی ڤیابا بچتە حەجێ دا هنێرتە ب دویڤ خەلکێ باژێرێ خۆ ڕا و دگۆتە وان: کێ ژ هەوە دڤێت ئەڤ سالە بێتە حەجێ بلا پارێن خۆ بینت بدەتە ڤ من ئەم دێ پێکڤە چین، و دا ڕابت هەر ئێکی ناڤێ وی ل سەر جەرکەکی نڤیست و پارێن وی کەتە تێدا، پاشی وی جەرک هەمی دکرنە د سندۆقەکێ دا، و پێکڤە دەردکەفتن، و وی هەمی مەصرەف دکر، باشترین خوارن و ڤەخوارن ددانە وان، و نە دهێلا تشتەک ژ وان کێم ببت، و ل وێرێ دا بێژت: کێ ژ هەوە دڤێت تشتەکی بۆ مرۆڤێن خۆ بکرت بلا بکرت و وی پارە ددان، هندەک دا بێژنێ: پارێن مە دکێمن تێرا ڤێ هەمییێ ناکەن! ئەو دا بێژت: هەوە شۆلمژ هندێ نینە، و گاڤا دزڤڕینە مالێن خۆ ئەو دا ڕابت خوارنەکا بەرفرەه چێ کەت و هەڤالێن خۆ یێن حەجێ ڤەخوینتە مال، و پشتی وان خوارن دخوار ئەو دا ڕابت وێ سندۆقێ ڤەکەت و هەر ئێکی جەرکێ وی بۆ دزڤڕینت)).

و عەدەتێ وی بوو ئەو سالەکێ دچوو حەجێ و سالەکێ دچوو جیهادێ، جارەکێ دەمێ وی کارێ حەجێ کری، و د گەل هندەک هەڤالێن خۆ دەرکەفتییە حەجێ، ب رێڤە -دەمێ د بەر گوندەکی را بۆرین- وی تەیرەکێ مرار دیت، گۆتە هەڤالێن خۆ: وی ببەن بهاڤێنە سەر گیفکی، پشتی رابووین داینە رێ پیچەکێ وی خۆ ژ هەڤالێن خۆ ڤەهێلا، دیت کچکەک ژ مالەکێ دەرکەفت هات ئەو تەیرێ مرار ژ سەر گیفکی راکر و بۆ خۆ برە مال، ئەو ب دویڤ دا چوو؛ دا بزانت کانێ مسەلا وێ چیە، کچکێ گۆتێ: بابێ من مرۆڤەکێ مالدار بوو، هندەکان غەدرە لێ کر مالێ وی ژێ ستاند و ئەو کوشت، و ئەز و ئەڤ برایێ خۆ یێ بچویک ب تنێ یێ ل ڤێرێ و مە کەسێ خۆ نینە، خوارنا مە -وەکی تو دبینی- ئەو تشتە یێ خەلک دهاڤێتە سەر گیفکی.. گاڤا عەبدللاهێ کورێ موبارەکی سوحبەتا وێ زانی هنارتە ب دویڤ وەکیلێ خۆ را و گۆتێ: چەند مال د گەل تە هەیە؟ وی گۆت: هزار دینار، عەبدللاهی گۆتێ: بیست دیناران بۆ مە را کە دا پێ بزڤرینە مالا خۆ و یێ دی هەمییێ بدە ڤێ کچکێ، ئەڤ سالە ئەم ناچینە حەجێ.

**ل مەیدانا جیهادێ:**

ئەگەر مەزنترین جیهاد جیهادا نەفسێ بت، عەبدللاهێ کورێ موبارەکی یێ ژێ بێبار نەبوو؛ چونکی وی نەفسا خۆ ژ بەخیلییێ و حەژێکرنا دنیایێ و غروورێ پاراستبوو، و ئەگەر شەریفترین جیهاد جیهادا ب دەستی بت د رێکا خودێ دا دیسا دێ بێژین: عەبدللاهێ کورێ موبارەکی یێ ژێ بێبار نەبوو؛ چونکی دەمێ گازییا جیهادێ دهاتە راگەهاندن ئەو ل بەراهییا لەشکەری بوو، و کانێ چاوا خودێ دلەکێ فرەهـ بۆ مەردینییێ دابوویێ، وی دلەکێ موکمتر بۆ زیرەکییێ ژی دابوویێ..

هەڤالەکێ وی دبێژت: جارەکێ ئەم پێکڤە چووینە شەرێ رۆمێ، وەسا چێبوو مرۆڤەک ژ ناڤ لەشکەرێ رۆمێ دەرکەفت و قەبێ مە خواست، زەلامەک

ژ مە چوویێ یێ رۆمی ئەو کوشت، ئێکی دی چوویێ ئەو ژی هاتە کوشتن، ڤێجا زەلامێ رۆمی ب دفنبلندی ڤە ل مەیدانێ هات و چوو، و جارەکا دی قەبێ مە خواست، گۆت: زەلامەکێ دی ژ ناڤ مە دەرکەفت و چوویێ، پشتی شەرەکێ گەرم د ناڤبەرا هەر دویان دا چێبووی زەلامێ موسلمان ئەو کوشت، ئینا کەیفا خەلکی گەلەک هات، و هەمییان قەست کرێ دا بزانن کانێ ئەو فێرس کییە، گاڤا وی دیتی خەلک ب نک ڤە چوون وی سەر و چاڤێن خۆ پێچان و ب لەز چوو، و خۆ ڤەشارت؛ دا کەس وی نەنیاست، ئەز کەتمە دویڤ دا وی بنیاسم، من دیت ئەو عەبدللاهێ کورێ موبارەکییە، ئینا وی ئەز دامە سویندێ کو هندی ئەو یێ ساخ بت ئەز ڤێ سەرهاتییێ نەبێژمە کەسێ.

ژ ڤێ سەرهاتییێ زیرەکییا وی بۆ مە ئاشکەرا دبت کو وی خۆ ژ سنگێ مەیدانا جیهادێ نەددا پاش، و هەر جارەکا گازییا جیهادێ هاتبا بلندکرن وی ب نەفسا خۆ و مالێ خۆ قەستا جیهادێ دکر، و ئەگەر کەسەک هەبا دلێ وی چووبا کرنا جیهادێ و هند مال نەبا پێ دەرکەڤت عەبدللاهێ کورێ موبارەکی مەصرەفێ وی و یێ عەیالێ وی ژی ب ستویێ خۆ ڤە دگرت، حەتا ئەو دزڤری مالا خۆ.. و د گەل هندێ ژی غورور بۆ وی ب ڤی کارێ وی و ب ڤێ خێرخوازییا وی یا بێ توخویب چێ نەدبوو، و وی هزر نەدکر ئەو ژ خەلکێ دی یێ موسلمان باشترە، (ئەبو وەهەبێ مەروزی) دبێژت: من پسیار ژ عەبدللاهێ کورێ موبارەکی کو کانێ خۆ مەزنکرن چیە؟ وی گۆت: خۆمەزنکرن ئەوە تو خۆ ژ خەلکی چێتر ببینی و وان کێم کەی، گۆت من گۆتێ: و غورور و تەعەججوب چیە؟ وی گۆت: ئەوە تو هزر بکەی تشتەکێ ل نک تە هەی ل نک خەلکێ دی نینە.. ژ بەر ڤێ چەندێ وی هەردەم هەڤالێن خۆ ل ڤی ئەخلاقێ مەزن ئاگەهدار دکرن.

هەڤالەکێ وی دبێژت: شەڤەکێ ئەم د چەپەرێ جیهادێ دا بووین ل سەر توخویبێ رۆمێ، و مە بەحسێ هندەک مەسەلێن علمی دکر، ئینا من گۆتە

ئیمامی: تو بێژی خێرەکا ژ ڤێ مەزنتر هەبت یا ئەم تێدا؟ گۆت: وی گۆتە من: ئەری، ئەو مرۆڤێ بەرگەریانێ بۆ عەیالێ خۆ دکەت، و ل نیڤا شەڤێ رابیت بەرێ خۆ بدەتە عەیالێ خۆ و وان بنخێڤت، خێرا وی ژ یا مە پترە.

ئاشکەرایە ئیمامی ئەڤ گۆتنە ژ بەر هندێ گۆت دەمێ وی دیتی د ناڤ هەڤالێن وی دا هندەک هەنە ژ بەر ڤێ خێرا وان کری (کو جیهاد و بەلاڤکرنا علمییە) یێن بەر ب غورووێ ڤە دچن، وی بیرا وان ل هندێ ئیناڤە کو هندەک خێرێن بچویک یێن هەین ئەگەر مرۆڤ ب ئیخلاص بکەت، خێرا وان ل نک خودێ گەلەک ژ یا وان خێران مەزنترە ئەوێن مرۆڤ بێی ئیخلاصەکا دورست بکەت.

## تەقوادارییا وی:

چەند زانینا مرۆڤی ب خودێ و مەزنییا وی پتر لێ بێت، ترسا وی ژی ژ خودێ دێ زێدەتر لێ ئێت؛ چونکی پتر دێ بۆ وی ئاشکەرا بت کو وی ب دورستی حەقێ خودێ ژ سەر خۆ رانەکرییە، لەو ب دیتنا زانایێن وەکی عەبدللاهێ کورێ موبارەکی ترسا ژ خودێ سەرێ هەمی قەنجییانە، و رێکا هەمی باشییانە، رۆژەکێ پسیار ژێ هاتەکرن: دو مرۆڤ هەنە ئێک د رێکا خودێ دا یێ هاتییە کوشتن، و یێ دی پتر ژ خودێ دترست، کی ژ وان هەر دویان باشترە؟ وی گۆت: ئەوێ پتر ژ خودێ دترست.

ترسا عەبدللاهێ کورێ موبارەکی ژ خودێ گەهشتبوو دەرەجەیەکا وەسا ئەو بۆ وی بووبوو ناڤ و نیشان، و فوضەیلێ کورێ عیاضی دگۆت: ئەز حەز ژ وی دکەم چونکی ئەو ژ خودێ دترست. و ژ بەر ترسا وی یا مەزن ژ خودێ وی نە دهێلا دەلیڤەیەک ژ وەختێ وی ژ قەستا و بێی رەنگەکێ عیبادەتی بچت، دەمێ هێشا شاگردە و وی و هەڤالێن خۆ حەدیس بۆ خۆ دنڤیسین، حەتا پەرێ کتێبێن وان هشک دبوو هەڤالان بۆ خۆ سوحبەت دکرن، ئەو رادبوو سوننەتەک دکر..

هەڤالێ وی قاسمێ کوڕێ موحەممەدی دبێژت: ئەز گەلەک جاران د گەل عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی دچوومە سەفەران، و دەمێ من بەرێ خۆ ددایێ من د دلێ خۆ دا دگۆت: بۆچی هندە ناڤ و دەنگێن ڤی زەلامی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبووینە، و خەلک هندە حەز ژێ دکەن؟ نڤێژێن مە ژی هندی نڤێژێن وینە، و ڕۆژیێن مە هەر وەسا، و ئەم ژی وەکی وی جیهادێ و حەجێ دکەین، گۆت: شەڤەکێ ئەم پێکڤە دچووینە شامێ، و ئەم ڕوینشت بووین دا شیڤێ بخۆین، مە هند دیت چرایێ مە ڤەمری، پاشی ب خافلەتی ڤە ئێکی ژ مە چرا هلکرێ من بەرێ خۆ دایێ ڕیهێن عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی ب ڕۆندکێن وی یێن تەڕ بووین، هنگی من زانی ترسا ڤی زەلامی ژ خودێ ئەو یێ ب سەر سەرێ مە ئێخستی، گاڤا دنیا تاریبووی بیرا وی ل قەبری و قیامەتێ هاتەڤە لەو ڕۆندکێن وی ب ڤی ڕەنگی بارین.

و ترسا وی یا مەزن ژ خودێ ئێکا هند ژێ چێ دکر دەمێ وی ئەو حەدیس دخواندن یێن بەحسێ مرنێ و قیامەتێ دکەن، وی هند دکرە گری حەتا دەنگەکێ وەکی دەنگێ وی گایێ دئێتە سەرژێکرن ژێ دهات، و ل وان دەمان کەسێ بستە نەدکر خۆ نێزیکی وی بکەت یان پسیارەکێ ژێ بکەت.

## د گەل خەلیفە و مەزنێن دنیایێ:

ڕۆژەکێ مرۆڤەکی پسیار ژێ کر: کینە مرۆڤ؟ وی گۆت: زانا، گۆتێ: و کینە مەلک؟ گۆت: زاهد، گۆتێ: و کینە بێخێر؟ گۆت: ئەوێن دنیایێ ب دینی دخۆن. و د گۆتنەکا خۆ یا دی دا دبێژت: زانا میراتگرێن پێغەمبەرانە، ڤێجا ئەگەر وان دلێ خۆ برە دنیایێ خەلک کێ بدەنە بەرا خۆ؟ و مرۆڤێن زاهد مەلکێن عەردینە ڤێجا ئەگەر وان ڕیمەتی کر خەلک دویکەفتنا کێ بکەن؟ و مەزن شڤانێن خەلکینە ڤێجا ئەگەر شڤان ببتە گورگ کی دێ خەلکی پارێزت؟

ئەڤە دیتنا عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی بوو بۆ زانا و زاهد و مەزنان، ئەو ژی وەکی سەیدایێ خۆ یێ مەزن سوفیانێ ثەوری دویر ژ مەزنێن دنیایێ دژیا

لەوا ئەو مەزن ژیا، و مەزن مر، عەدەتێ وی بوو چو جاران وی مال ژ خەلیفە و مەزنان وەرنەدگرت، بەلێ ئەگەر مرۆڤەکێ دی دیارییەک دابایێ وی ئەو وەردگرت، و شوین دیارییەکا باشتر ددایێ، و گاڤا زانیبا هەڤالەکێ وی هندەک مال ژ خەلیفەیەکی یێ وەرگرتی شیرەت لێ دکر کو ئەو وی مالی د رێکێن خێرێ دا خەرج بکەت و چویێ ژێ بۆ خۆ نەهێلت، و چونکی ئەو بازرگانەکێ دەولەمەند بوو وی پشکەکا مەزن ژ مالێ خۆ ددا زانا و زاهدێن سەردەمێ خۆ؛ دا ئەو هەوجەی هندێ نەبن کو مالی ژ مەزنان وەرگرن.. رۆژەکێ مرۆڤەکی گۆتێ: ئەز مرۆڤەکێ خەیاطم و ئەز جلکان بۆ سولطانی ددوریم، تو بێژی ئەز ژ وان بم یێن هاریکار بۆ زالمان؟ گۆتێ: نە، تو ژ زالمان ب خۆیی، ئەوێ دەرزیکێ و دەزی دفرۆشتە تە ئەو هاریکارێ زۆردارانە!

و دەمێ ئەو کەفتییە بەر مرنێ دلێ وی چوو رەنگەکێ خوارنێ، هەڤالێن وی چوون بۆ لێگەریان ئەو خوارن ل نک کەسێ نەدیت ژ بلی والی، هاتن گۆتنێ: بەس والی ئەو رەنگێ خوارنێ یێ هەی، وی گۆت: نەئینن من نەڤێت.. و ئەو مر و ئەو خوارن نەخوار.

بەلێ مەعنا ڤێ ئەو نینە عەبدللاهێ کورێ موبارەکی هاریکارێ سولطانی ل سەر خێرێ نەبوو، نە! وی ژی وەکی سەیدایێ خۆ (فوضەیلێ کورێ عیاضی) دگۆت: ئەگەر من دوعایەک هەبت بێتە قەبویلکرن دێ بۆ سولطانی کەم، چونکی ئەگەر ئەو باش بوو خەلک هەمی دێ باش بن.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو د چاڤێن مەزنان دا بەری خەلکێ دی یێ مەزن بوو، و رۆژا ئەو مری، (هاروون ئەلرەشیدی) گۆت: ئەڤرۆ سەییدێ زانایان مر، و وی فەرمان دا خەلک بێنە نک وی بەهییێ! و دبێژن: رۆژەکێ هاروون چووبوو باژێرێ (رەققایێ) و وەسا چێبوو عەبدللاهێ کورێ موبارەکی ژی هاتە وی باژێری، گاڤا خەلکی ب هاتنا عەبدللاهی زانی هەمی دەرکەفتنە بەراهییێ حەتا وە لێ هاتی خەلکی ژ قەرەبالغێ ئێک و دو پالدان و تۆز ب سەر سەرێ

خەلكی كەفت، دەیكا هاروونی پسیار كر: ئەڤە چ قەومییە؟ هندەكان گۆتێ: ئەڤە زانایەكێ خەلكێ خوراسانییە هاتی.. وێ گۆت: ب خودێ ئەڤەیە مەزنی، نە مەزنییا هاروونی ئەوا ب شرطە و حەرەسان هندە خەلكی كۆم نەكەت.

## د گەل عەبدەكێ تەقوادار:

عەبدلاهێ كورێ موبارەكی دبێژت: سالەكێ ئەز هاتمە مەكەهێ، هشكاتی بوو، باران ژ خەلكی هاتبوونە برین، لەو خەلك بۆ نڤێژا بارانێ ل حەرەمێ كۆمبووبوون، من ژی خۆ د ناڤ كۆما خەلكی ڕا كر، من دیت عەبدەكێ ڕەش كراسەكێ بێ سەر و بەر دبەر بوو خۆ دابوو لایەكێ ڤەشارتی؛ دا كەس نەبینت و وی دوعا دكرن، ئینا من خۆ نێزیكی وی كر -بێی ئەو ب من بحەسیێت- دا بزانم كانێ ئەو چ دبێژت، پشتی من خۆ نێزیك كری من گوهـ لێ بوو وی دگۆت: ((ئیلاهی! گونەهێن مشە و عەیبێن كرێت ئەم یێن ڕویڕەش كرین، تە باران یا ژ مە بڕی دا خەلكی پێ ئەدەب بدەی، ئەز هەوارێن خۆ دگەهینمە تە تویی حەلیم، ژ جوانییێ پێڤەتر عەبدێن تە چو ژ تە نەدیتییە، یارەببی ڤێ گاڤێ تو بارانێ بدە وان ڤێ گاڤێ!)).

ئبن موبارەك دبێژت: و د گەل ڤێ گۆتنا وی: ((یا رەببی تو ڤێ گاڤێ بارانێ بدە وان))، من بەرێ خۆ دا عەسمانی عەوران خۆ لێكدا.. و بیست خەبەر پێڤە نەچوون بارانەكا وەسا هات تو دا بێژی گۆسكێ دەرنشیڤ كرییە، و ئەز ل وی عەبدی زڤڕیم من دیت یێ دبێژت: (سبحان الله، سبحان الله) چاڤێن من تژی ڕۆندك بوون، و بۆ من بوو مەرەق ئەز وی بنیاسم، گاڤا ئەو دەركەفتی ئەز ب دزی ڤە ب دویڤ دا چووم حەتا ئەز ب جهێ وی كەفتیم، پاشی ئەز زڤڕیم و هاتمە نك ( فوضەیلێ كورێ عیاضی)، گاڤا وی ئەز دیتیم وی گۆتە من: تە خێرە، ڕەنگێ تە هۆ یێ گوهاڕتی؟ گۆت: من گۆتێ: هندەكان بەری مە ڕاكر و گەهشتنێ!! وی گۆت: چاوا؟ گۆت: من گۆتێ: حال و مەسەلێن من و

عەبدەکێ رەش ئەڤەنە.. گاڤا وی سوحبەت گوهـ لێ بووی کەفتە عەردی و گۆتە من: زوی من ببە نک وی.

پشتی سەرهاتییەکا درێژ د ناڤبەرا ڤی جحێلێ تەقوادار و ڤان هەردو چیاییێن زانین و تەقوایێ دا، و پشتی ئەو ب سەر وی هلبووین و وان زانی کو ئەو عەبدەکە دئێتە کرین و فرۆتن، عەبدللاهی ئەو ب پارێن خۆ کری بۆ هندێ دا وی ئازا کەت، و دەمێ جحێلی زانی هندە ئێدی خەلک ب حالێ وی حەسیان وی قەستا حەرەمێ کر.. عەبدللاهـ کەفتە رێکا وی، جحێلی گۆتێ: تە شۆلەک ب من هەیە من دڤێت بچم؟ عەبدللاهی گۆتێ: بۆ کیڤە؟ وی گۆت: بۆ ئاخرەتێ! عەبدللاهی گۆتێ: بۆچی؟ وی گۆت: ژیان هنگی یا خۆش بوو هندی موعامەلە د ناڤبەرا من و خودێ دا، پشتی تو پێ حەسیای من هەوجەیی پێ نەما!!

ئبن موبارەک دبێژت: پاشی وی جحێلی قەستا حەرەمێ کر، بەرێ من ما لێ، وی دەست ب نڤێژێ کر، گاڤا چوویە سوجدێ بەرێ من لێ بوو وی هندەک دوعا کرن.. پاشی سەرێ خۆ رانەکر، پشتی دەمەکی من خۆ نێزیک کر من دیت ئەو یێ مری، ڤێجا ئەز ب خودێ کەمە چەند ئەو جحێل دئێتە بیرا من خەما من مەزن دبت، و دنیا د چاڤێن من دا بچویک دبت، و ئەز کارێ خۆ کێم دبینم!

هندە مرۆڤێن خودێ خۆ ژ (شوهرەتێ) دپاراست، دا ئەو نەکەڤنە داڤێن (گەلەک د خۆ گەهشتنێ) ئەوا بەرێ خودانێ خۆ ددەتە (خۆمەزنکرنێ) ئەوا سەری دکێشتە وێ (ریمەتییێ) یا ئەنجامێ وێ دبتە ئاگرێ جەهنەمێ.

د کتێبێن دیرۆکێ دا هاتییە کو جارەکێ زاهدێ مەزن شێخ عەدییێ کورێ موسافری -خودێ ژێ رازی بت- یێ ب رۆژی بوو، و عەدەتێ وی بوو بارا پتر رۆژان ئەو یێ ب رۆژی بوو، حەتا دەرەجەکێ د ناڤ موریدێن وی دا بەلاڤبووبوو کو شێخ عەدی مرۆڤەکە نە زادی دخۆت و نە ئاڤێ ڤەدخۆت! گاڤا ئەڤ گۆتنا وان

گەهشتییە شێخی، شێخ عەدی دەرکەفتە ناڤ موریدێن خۆ و ل دەوارەکێ سویار بوو، و گازی خزمەتکارەکێ خۆ کر و گۆتێ: ترارەکێ شیری بۆ من بینە، پاشی شێخی ل پێش چاڤێن وان هەمییان ئەو ترار دا سەر دەڤێ خۆ و ڤەخوار و رۆژیا خۆ یا سونەت شکاند.. بۆ هندێ دا ئەو وێ هزرا خەلەت ژ سەرێ خەلکی بینتەدەر یا ژ نەزانین کەفتییە سەرێ وان.

ئەها زاهدێن دورست ژ مرۆڤێن خودێ ب ڤی رەنگی بوون، بەرێ وان ل رازیبوونا خودێ بوو نە یا مرۆڤان.

## رۆژا وی یا دووماهییێ:

هەر چەندە عەبدللاهێ کورێ موبارەکی مرۆڤەکێ گەلەکێ زەنگین ژی بوو بەلێ هەردەم وی دوعا بۆ خۆ ژ خودێ دکر کو ئەو بمرت فەقیر، و خودێ دوعایا وی بۆ ب جهئینا، دەمێ ژیێ وی شێست و سێ سال، و ب دورستی ل سالا (١٨١) مشەختی (بەرانبەر ٧٩٧ زایینی) ئەو د گازییا جیهادێ دەرکەفت، و قەستا وەلاتێ شامێ کر، پشتی ژ جیهادێ خلاصبووی و ڤیای بزڤرتە وەلاتێ خۆ ل دەڤەرا (هیت) ل ژێرییا (عیراقێ) ئەو کەفتە بەر مرنێ، گۆتە مەولایێ خۆ (نەصری): سەرێ من بدانە سەر ئاخێ.. گاڤا نەصری ئەو د ڤی حالی دا دیتی کرە گری، ئیمامی گۆتێ: تو بۆچی دکەیە گری؟ وی گۆت: بیرا من ل زەنگینی و مالدارییا تە هاتەڤە، و ئەڤرۆ تو یێ دمری فەقیر و غەریب، ئیمامی گۆتێ: هشبە! گەلەک جاران من دوعا بۆ خۆ ژ خودێ دکر کو رۆییێ زەنگینان نیشا من نەدەت، و من فەقیر بمرینت.. پاشی گۆتێ: ل نک من شاهدە بدە، و ئەگەر من د دویڤ تە را گۆت، وێ دوبارە نەکەڤە وەسا نەبت ئەگەر تە دیت من ئاخفتنەکا دی گۆت.. و وەسا چێبوو، گاڤا کەفتییە بەر سەکەراتێ مەولایێ وی ل نک وی شاهدە دا و وی د دویڤ دا گۆت، و بەرێ رحا وی دەرکەڤت چاڤێن خۆ ڤەکرن و گرنژی و گۆت: ﴿ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴾ (الصافات: ٦١)، و رحا وی د گازییا خودایێ خۆ دەرکەفت

﴿ يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ۝٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً ۝٢٨ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ۝٢٩ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ۝٣٠ ﴾ (الفجر: ٢٧-٣٠). پشتی کارەکێ پیرۆز کو جیهاد بوو، و ل هەیڤەکا پیرۆز کو رەمەزان بوو، و ل دەمەکێ پیرۆز کو بەری سپێدێ بوو، ئیمامێ ئوممەتێ (أمیر المؤمنین) د علمێ حەدیسێ دا عەبدللاهێ کورێ موبارەکی چوو بەر رەحما خودێ.

# عەلییێ کورێ حوسەینی
## (زین العابدین)

(زین العابدین) باشێ عیبادتکەران، بەلکی باشترینێ عیبادەتکەران، و چێترینێ بنەمالا هاشمییان ل دەمێ خۆ، ئەوێ هندی هند ل سەر شەملکێ دما، خەلکی ناسناڤێ وی کربوو (سەججاد)، و هندی هند مرۆڤەکێ پاک و پاقژ بوو هەر وان ناسناڤێ وی کربوو (الزكي)، زانایێ مەزن (ابن شهاب الزهري) بەحسێ وی دکەت و دبێژت: قورەیشیەکێ ژ وی چێتر من نەدیتیە. ژیانا ڤی ئیمامێ مەزن ژی یا تژی بەرپەرێن گەشە، هەر ئێک هژمارەکا مەزن یا دەرس و عیبرەتان د ناڤ خۆ دا هەل دگرت، و دەمێ مرۆڤ دئێت دا هندەک ژ ڤان بەرپەران هلبژێرت و بەرچاڤ بکەت، دیسا دێ بێژم: مرۆڤ حێبەتی دمینت کیژ بەرپەری هلبژێرت و کیژکی بهێلت.. بەلێ بەری هەر تشتەکی مە دڤێت (زین العابدین)ی ب کورتی ب هەوە بدەینە ناسین.

### دانەنیاسینەکا کورت:

ناڤێ وی یێ دورست عەلییە، کورێ ئیمامێ شەهید حوسەینییە، کورێ ئیمامێ شەهید عەلییێ کورێ ئەبوو طالبێ قورەیشییە، ل مەدینێ، ل باژێرێ باپیرێ خۆ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- و ل دۆرێن سالا (٣٦) مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ، و د ناڤ پاقژترین و بلندترین بنەمالێ دا هاتە پەروەردەکرن و ل سەر دەستێ هەردو سەییدێن گەنجێن بەحەشتێ مامێ خۆ ئیمامێ حسەن و بابێ خۆ ئیمامێ حوسەین فێری تەقوایێ و علمی بوو، و ئەو دئێتە هژمارتن

ئێک ژ مەزنترین زاهد و تەقوادارێن تابعییان، وی هژمارەکا مەزن ژ صەحابییان دیتبوون، و حەدیس ژ گەلەک ژ وان ریوایەت کرینە، وەکی دەیکا موسلمانان عائیشایا کچا ئەبوو بەکری، و صەفییایا کچا حویەی، و (أم سلمە)، و ئەبوو هورەیرە، و عەبدللاهێ کورێ عەبباسی، و گەلەکێن دی، و علم ژ هژمارەکا مەزنێن تابعییان ژی وەرگرتییە وەکی: سەعیدێ کورێ موسەییبی، و زەیدێ کورێ ئەسلەمی، و ئەسلەمێ مەولایێ عومەری.. و گەلەکێن دی، و ژ بەر ڤیانا وی بۆ علمی دبێژن: گەلەک جاران ئەو ژ مەدینێ دهاتە مەکەهێ و دچوو ل بەر دەستێ ئەسلەمی دروینشت، و ئەو عەبدەک بوو عومەرێ کورێ خەططابی ئازا کربوو، و علم و حەدیس ژێ وەردگرتن، ئەڤ چەندە ب دلێ هندەک قورەیشییان نەبوو، لەو ئێک ژ وان گۆتێ: تو دیوانا مەزنێن قوەیشییان دهێلی و دئێی ل نک ڤی عەبدی دروینی! وی گۆت: مرۆڤ ل وی جهی دروینت یێ مفایی لێ وەردگرت.

دەمێ سەرهاتییا دل ئێشا کەربەلایێ رویدای، و بابێ وی ئیمامێ حوسەین شەهیدبووی، ئەو د گەل بابێ خۆ و بنەمالا وی ل کەربەلا یێ ئامادەبوو، و ژییێ وی هنگی ل دۆرێن بیست و سێ سالییێ بوو، بەلێ چونکی ئەو ل وی دەمی یێ نساخبوو و کەفتبوو ناڤ نڤینان، وی پشکداری د شەڕی دا نەکر، و ئەو ب سلامەتی ژ وێ کارەساتێ دەرباسبوو، و دەمێ بنەمالا حوسەینی پشتی شەڕی برینە شامێ، یەزیدی قەدرەکێ مەزن دایێ، و ب ئحترام ڤە ئەو هنارتە مەدینێ، و ئەو ما ل مەدینێ حەتا ل چاردەی رەبیعولئەووەلا سالا (٩٤)ێ مشەختی، چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ، و ل (بەقیعێ) هاتییە ڤەشارتن.

### ژ سالۆخەتێن وی:

ژ سالۆخەتێن ئیمامی ئەو یێ کێم ئاخفتن بوو، و خەمگینی ل سەر دێمێ وی یا ئاشکەرا بوو، و مرۆڤەکێ (موتەواضع) بوو، و د گەل وی قەدر و قیمەتێ خەلکی ددایێ ژ بەر کو ئەو نەڤییێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-

بەلێ وی چو جاران خۆ ژ خەلکی بلندتر نەددیت، ڕۆژەکێ تابعییێ مەزن (طاووسێ کوڕێ کەیسانی) ئەو ل نێزیکی کەعبێ دیت، وی نڤێژ دکر و دوعا بۆ خۆ ژ خودێ دکرن، و ڕۆندکێن وی دێمێ وی تەڕ کربوون، پشتی ئەو ژ دوعاکرنێ خلاصبووی، طاووس ب نک ڤە چوو و گۆتێ: ئەی کوڕێ پێغەمبەری، ئەز تە د ڤی حالی دا دبینم و تە سێ فەضل و سەراتی هەنە هیڤییا من ئەوە تو پێ ژ ترسێ خلاص ببی.. وی گۆتە طاووسی: ئەو چنە؟

طاووسی گۆتێ: یا ئێکێ: تو کوڕێ پێغەمبەری یی -سلاڤ لێ بن-، یا دویێ: شفاعەتا باپیرێ تەیە بۆ تە، و یا سێیێ: ڕەحما خودێ. وی گۆت: ئەی طاووس، مەسەلا ئەز ژ بنەمالا پێغەمبەریمە ئەڤ من پشتڕاست ناکەت پشتی من گوهـ ل ڤێ ئایەتێ بووی: ﴿ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ١٠١ ﴾ (المؤمنون: ١٠١) و مەسەلا شفاعەتا باپیرێ من، خودێ دبێژت: ﴿ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ ﴾ (الأنبياء: ٢٨) و ل دۆر ڕەحما خودێ، خودێ دبێژت: ﴿ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٦ ﴾ (الأعراف: ٥٦).

## دو بەربەڕ ژ ژیانا وی:

وەکی مە گۆتی: ژیانا (زين العابدين)ی یا تژی دەرس و عیبرەتە، بەلێ مە دڤێت ل ڤێرێ ب تنێ دو بەربەڕان ڤەکەین، یێ ئێکێ: بێنفرەهی و ئارامییا وی ئەوا مەتەل پێ دهاتنە گۆتن، و یا دویێ: خێرخوازییا وی ئەوا پشتی مرنا وی ژ نوی خەلک پێ حسیای..

ل دۆر مەسەلا بێنفرەهییا وی ب تنێ دو سەرهاتییێن کورت دێ ڤەگێڕین:

یا ئێکێ: پسمامێ وی حەسەنێ کوڕێ ئیمامێ حەسەن دبێژت: جارەکێ د ناڤبەرا من و(زين العابدين)ی دا نەخۆش بوو، و هندی کەریێن من ڤەبوون، ئەز چوومە نک وی ل مزگەفتێ، ئەو د ناڤ هەڤالێن خۆ دا یێ ڕوینشتیبوو، و هەچییا د دەڤێ من ڕا هاتی من گۆتێ، و ئەوی قەت دەنگ نەکر، و بەرسڤا من

نەدا.. و ئەز چوومە مالا خۆ. دەمێ بوویە شەڤ، من دیت ئێکی دەرگەهێ من قوتا، ئەز چووم و من دەرگەهـ ڤەکر، من دیت (زین العابدین) یێ ل بەر دەری، من د گەل خۆ گۆت: هەبت نەبت ئەو یێ هاتی تۆلا خۆ ل من ڤەکەت، بەلێ وی گۆتە من: برایێ من، ئەگەر تو یێ ڕاستگۆ بی د وی تشتێ دا یێ تە گۆتییە من، خودێ گونەها من بغەفرینت، و ئەگەر تو یێ ڕاستگۆ نەبی، خودێ گونەها تە بغەفرینت.. و سلاڤکر و چوو، من دا ب دویڤ ڤە، حەتا ئەز گەهشتیمێ و من گۆتێ: تۆبە ئەز جارەکا دی تشتەکی بکەم تە پێ نەخۆش بت، ئینا دلێ وی ما ب من ڤە و گۆت: گەردەنا تە ئازا!

یا دویێ: جارەکێ (زین العابدین) ژ مەزگەفتێ دەردکەفت، زەلامەکێ خەلکێ مەدینێ دا ب دویڤ وی ڤە، و گۆتنێن سەقەت و خەبەر گۆتنێ، کاڤا خەلکی ئەڤ چەندە ژێ دیتی چوونێ دا وی بێشینن، بەلێ ئیمامی گۆتێ: ژێ بگەڕن.. پشتی خەلک ژێ ڤەڕەڤین، ئیمام ب نک ڤە هات و گۆتێ: تە بەحسێ وان خرابییێن مە کر یێن تو دزانی، و ئەو خرابییێن مە یێن تو نەزانی پترن.. ئەرێ تە شۆلەک هەیە ئەم بۆ تە بکەین؟

وی زەلامی شەرم ژێ کر و نەئاخفت، هنگی ئیمامی ئەو کراسێ ل سەر ملێن خۆ ژ بەر خۆ کر و هاڤێتە سەر ملێن وی، و هزار دەرهەم ژی دانێ، و چوو.. ئەز زەلام دبێژت: ڤێجا پشتی هنگی چەند من ئەو ددیت من دگۆتێ: ئەز شاهدەییێ ددەم کو تو ژ دووندەها پێغەمبەری یی -سلاڤ لێ بن-.

بەرپەڕی دویێ ژ ژیانا (زین العابدین)ی ئەم دکەینە دیاری بۆ وان مالداران ئەوێن خێران دکەن، و حەز دکەن خەلک هەمی ب خێرێن وان بحەسییێن.

(زین العابدین) مرۆڤەکێ بازگان بوو، و ژ بلی بازرگانییێ وی جۆتیاری ژی دکر، و ژ تجارەت و زراعەتێ مالەکێ مەزن دگەهشتێ، بەلێ ڤی مالێ هە ئەو بەطران نەدکر، و چو ژ زوهدا وی ژێ کێم نەدکر، و کێماسی نەدگەهاندە

خێرخوازییا وی، بەلێ تشتێ بەرچاڤ د خێرخوازییا وی دا ئەو بوو وی چو جاران ل بەر چاڤێن خەلکی خێر نەدکرن، و ئێکا هند نەدکر کەس ب خێرێن وی بحەسییێت خۆ خەلکێ مالا وی ژی، لەو گەلەک کەسان دگۆت: ئیمام مرۆڤەکێ قەلسە، چو جاران چو خێران ناکەت. بەلێ گاڤا ئیمام مری و مریشۆیی ئەو شویشتی، وی دیت پشت و سەر ملێن وی درەش و شینن، وی پسیارا ڤێ چەندێ ژ مرۆڤێن وی کر، کەسێ نەزانی مەسەلە چیە، پشتی دەمەکی خەلکێ مەدینێ زانی کو سەد مالێن فەقیر یێن ماینە بێ خودان، پسیار ژ وان مالان هاتەکرن کانێ چاوا وان بەری نوکە دقەتاند، وان گۆت: هەر چەند شەڤەکان مە گوهـ لێ دبوو دەرگەهێ مە دهاتە قوتان، حەتا مە دەرگەهـ ڤەدکر، دا بەرێ خۆ دەینێ گینیکەکێ تژی ئەرزاق یێ ل بەر دەری و کەس ل وێرێ نینە.. و پشتی ئیمام (زین العابدین) مری، ئێدی کەس نەما ئەرزاقی بۆ وان دئینت.

ب ڤێ چەندێ وان زانی کو ئەوێ ئەرزاق بۆ وان دئینا و خۆ ڤەدشارت (زین العابدین) بوو، و ئەو رەش وشینییا ل سەر مل و پشتا وی هەی شوینوارێن هلگرتنا گینیکان بوون هەر شەڤ، و وی ب خۆ ئەڤ کارە دکر، دا کەس پێ نەحەسییێت.. لەو خەلکێ مەدینێ دگۆت: دانا خێران ب ڤەشارتی هنگی د ناڤ مە دا نەما رۆژا (زین العابدین) نەمای!

# سالم
# نەڤیيێ عومەرێ کوڕی خوططابی

## نەڤیيێ عومەری و حەججاجێ زالم:

سالم ل سالا ١٠٦ مشەختی ل بـاژێرێ مـەدينێ چووبـوو بـەر دلۆڤانییا خودێ، و ئـەوێن سالم و باپیرێ وی عومـەر دیتین دگۆتن: ئێـک ب ئێکی ڤـە نـەچوویـە وەکـی سـالـم ب عومەری ڤە چووی، نە ب شکل و بەژن و بالایێ ب تنێ، بەلکی ب تـەقوایێ و زانینـێ و نەترسییێ ژی، و ئـەڤ هەلویسـتێ وی یێ نوکە دێ ڤەگێڕین ڤێ چەندێ بۆ مە بەرچاڤ دکەن.

ل سەردەمێ حەججاجی جارەکێ وەسا چێبوو سالمی قەستا دیوانا حەجاجی کر، و ئارمانجا وی ژ ڤێ سەرەدانێ ئەو بوو حەججاج کارێ هندەک موسلمانان بۆ بقەتینت، دەمێ ئەو چوویە نک حەججاجی، حەججاجی گەلەک کەیفا خۆ پێ ئینا، و نێزیکی خۆ کر، و قـەدرەکێ زێدە بۆ گرت، و ل وی دەمێ ئـەو ل نـک حەججاجی یێ ڕوینشتی، وی هند دیت لەشکەرێ حەججاجی هندەک زەلامێن گرتـی ئینـان، ددێـم زەر و تـۆزەوی و وەسـتیای، و هـەمی دزنجیرکـری بـوون.. حەججاج ل سالمی زڤڕی و گۆتێ: ئەڤێن هە هندەک مرۆڤێن ژ ڕێ دەرکەفتی و خرابکارن، تشتێ خودێ حەرامکری ژ خوین ڕێتنێ ئەو حەلال دکەن، مە یێن دگرتین دا حوکمێ خودێ ل سەر وان ب جهـ بینین.

پاشی وی شیرێ خۆ ژ کاڤلانی ئینادەر و کرە د دەستێ سالمی دا، و دەستێ خۆ ب نک ئێک ژ وان زەلامان ڤە درێژکر و گۆتە سالمی: ئەڤە خەما تەیە ڕابە ڤی شیری ل ستویێ وی بدە.

سالمی شیر ژێ وەرگرت، و ب نک وی زەلامی ڤە چوو یێ حەججاجی ئیشارەت کریێ، و بەرێ خەلکێ دیوانێ هەمییێ ما ل زانایێ مەدینێ یێ مەزن، نەڤییێ عومەری، کانێ دێ چ کەت.. گاڤا ئەو گەهشتییە نک وی زەلامی، گۆتێ: تو مرۆڤەکێ موسلمانی؟

وی زەلامی گۆتێ: بەلێ.. بەس ما تە شۆلە ژ ڤێ چەندێیە؟ وێ بکە یا فەرمان پێ ل تە هاتییەکرن.

سالمی گۆتێ: ئەڤرۆ تە نڤێژا سپێدێ کرییە؟

ئەو زەلام حێبەتی ما ژ ڤێ پسیارێ، و ب عەجێبی ڤە گۆتێ: ئەزێ دبێژمە تە ئەز موسلمانم، و تو یێ دبێژییە من: تە نڤێژا سپێدێ کرییە؟ ما موسلمانەک هەیە نڤێژا سپێدێ نەکەت؟!

سالمی گۆتێ: ئەزێ پسیارێ ژ تە دکەم کانێ ئەڤرۆکە تە ڤێژا سپێدێ کرییە یان نە؟

وی زەلامی گۆت: خودێ تە ب هیدایەت بینت، من گۆتە تە: بەلێ! وێ بکە یا ڤی زالمی فەرمان پێ ل تە کری، ئەگەر ئەو دێ ل تە ژی ب غەزەب ئێت!

هنگی سالم هێدی زڤڕی ڤە، و شیرێ حەججاجی هاڤێتە بەر، حەججاج مەندەهووش بوو، چاڤ د سەری ڕا زیقبوون، و بەری حەججاج پسیارێ ژێ بکەت، وی بەرسڤ دا و گۆت: ئەڤ زەلامە یێ دبێژت: ئەز موسلمانم، و وی ئەڤرۆ نڤێژا سپێدێ یا کری، و ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یا گەهشتییە من، ئەو دبێژت: ((**من صلى الصبح فهو في ذمة الله**)) هەچییێ نڤێژا سپێدێ بکەت ئەو یێ ل سەر بەختێ خودێ، و ئەو کەسێ ل سەر بەختێ خودێ بت، ئەز وی ناکوژم! حەججاجی ب کەرب ڤە گۆتێ: ئەم وی ژ بەر نەکرنا نڤێژا سپێدێ وی ناکوژین..

سالمی گۆتێ: پا ژ بەر چ تو دێ وی کوژی؟

حەججاجی گۆت: چونکی ئەڤە ژ وان کسانە یێن هاریکاری ل سەر کوشتنا خەلیفەی عوثمانی کری.

سالمی گۆتێ: ئەگەر ژ بەر هندێ بت، د ناڤ مرۆڤان دا هندەکێن ژ من و تە فەرتر هەنە داخوازا خوینا عوثمانی بکەن..

گاڤا وی ئەڤ بەرسڤە دایە حەججاجی، حەججاج بێ دەنگ بوو و کەربا خۆ داکر، و هنگی سالم ژ دیوانا وی دەرکەفت.. و ئێک ژ وان کەسێن ل وێرێ دحازر چوو ئەڤ سوحبەتە بۆ بابێ سالمی، عەبدللاهێ کورێ عومەری ڤەگوهاست، و بەری ئەو سوحبەتێ تمام بکەت، عەبدللاهی ژ لەزان دا گۆت: ئێ! و سالمی گوهێ خۆ دا حەججاجی؟ پشتی وی سوحبەت تمامکری، بێنا عەبدللاهی هات، و کەیفخۆش بوو ب کارێ کورێ خۆ و گۆت: باش بوو باش بوو، ئەو مرۆڤەکێ عاقلە.

ئەڤە سەرهاتی بوو وەکی کتێبێن دیرۆکێ بۆ مە ڤەدگوهێزن، سالمی دەمێ زانی ئەڤ زەلامە، ئەوێ والی بڕیار ب کوشتنا وی دا ب هێجەتا هندێ کو ئەو ژ فتنەچییانە، دەمێ زانی ئەو مرۆڤەکێ موسلمانە، شاهدەییێ ددەت کو ئیسلام دینێ خودێیە، و نڤێژان دکەت، وی فەرمانا حەججاجی ب جهـ نەئینا، و خۆ ژ کوشتنا وی زەلامی دا پاش، هەر چەندە وی دزانی کو دبت ئەڤ کارێ وی حەججاجی عێجز بکەت، و فەرمانێ ب کوشتنا وی ژی بدەت! و وی زەلامی ب خۆ بێرا وی ل ڤێ چەندێ ئیناڤە، بەلێ سالم ئەوێ باش دزانت کانێ گونەها کوشتنا مرۆڤەکێ موسلمان و بێگونەهـ چەندە، فەرمانا والی ب جهـ نەئینا..

تەعلیقا مە ل سەر ڤی هەلویستی ئەڤەیە: سالمێ نەڤییێ ئیمامێ عومەر، ئەوێ باش د ئیسلامێ دگەهشت، و ئێک ژ فقهزانێن مەدینێ یێن مەزن بوو، و حەقی ژ هەر تشتەکێ دی مەزنتر ددیت، و نەدترسییا، دزانی کو ب ئجتهادەکا والییەک دکەت، یان ب شوبهەیەکا ئەو هل دئێخت، یان حەتا فەتوایەکا (ولي

الأمر) ژ نک خۆ و بێ دەلیل ددەت، خوینا کەسێ حەلال نابت، و بۆ مرۆڤی دورست نینە کوشتنا مرۆڤەکی رەوا ببینت ژ بەر هێجەتەکا ب ڤی رەنگی، لەو وی ئاخفتنا والی ل عەردی دا و گۆتێ: چاوا ئەز ڤی زەلامی بکوژم، و ئەو ب دەڤی یێ ئعترافێ دکەت کو ئەو موسلمانە و وی نڤێژا سپێدێ یا کری؟ ئەڤە ل وی دەمێ حەججاجی دەعوا هندێ دکر کو ئەڤ زەلامە ئێک ژ وان فتنەچییانە یێن خەلک دژی ئیمامێ شەهید عوثمانێ کوڕێ عەففانی ڕاکرین!

سالمی گۆتێ: ئەگەر خۆ ڕاست ژی بت، وی ئەڤ چەندە کربت، ئەز و تو نە ژ (ئەولیائێن) عوثمانینە، و مە حەق نینە ئەم طەلەبا ڤەکرنا خوینا وی بکەین و تۆلا وی بستینین، چونکی د شریعەتی دا ب تنێ وەلییێ مرۆڤێ کوشتی حەقێ هەی بێژت: قاتلی بکوژن، یان عەفی کەن، و ئەز و تو ژ وەلییێن عوثمانی نینین، ڤێجا چاوا ئەم ڤی حەقی بدەینە خۆ؟ ئەڤ کارێ ئەم دکەین پێلێدانا شریعەتییە، و تەعداکرنا ل سەر خوینا مرۆڤەکییە، و ئەگەر تو یێ ئامادە بی ڤی کاری بکەی، ئەز یێ ئامادە نینم وی بکەم.. ئەڤە تێگەهشتنا سالمی بوو بۆ ڤێ مەسەلێ، و گاڤا بابێ وی یێ صەحابی عەبدللاهێ کوڕێ عومەری ئەڤ هەلویستە ژێ دیتی، کەیف پێ هات و گۆت: ئەو مرۆڤەکێ عاقل و تێگەهشتییە.

پشتی ڤێ هوین چ دبێژن بۆ وان جحێل و نیڤ زەلامێن چو علمێ شەرعی ل نک نەهەی، نزانن دەسنڤێژا خۆ چاوا دێ ب دورستی گرن، فەتوایێ ب حەلالکرنا کوشتنا خەلکی ددەن ب هندەک شوبهەیێن گەلەک ژ ڤێ دکێمتر یا حەججاجی خوینا ڤی زەلامی پێ حەلالکری، و د سەر هندێ ڕا گەلەک کەسێن ژ وان نەزانتر ڤی کاری بۆ وان ب جیهاد حسێب دکەن؟ دێ بینی ئەو مرۆڤەکی یێ بێگونەهـ (یان حەتا ئەگەر یێ گونەهکار ژی بت) دێ ئینن وەکی مریشکێ ڤەکوژن و بەری ئەو ڤێ تاوانا خۆ بکەن دێ ژ وی مرۆڤی خوازن ئەو شاهدە

بدەت، دا پشتی هنگی ژ نوی ئەو وی بکوژن! ئەرێ ئەحمەقییەک ژ ڤێ مەزنتر هەیە؟

ئەگەر خۆ ئەو مرۆڤ کافر ژی بت، دەمێ ئەو شاهدە ددەت خوینا وی دئێتە پاراستن، چاوا تو مرۆڤەکێ موسلمان دکوژی؟ و ئەگەر ئەو کافرە و خوینا وی یا حەلالە و ئەڤە جیهادە تو د رێکا خودێ دا کەی، ئەو چ شاهدەدانە تو ژ وی دخوازی؟

# ئیمامێ زاهدێن ئوممەتێ
# ئیمامێ شافعی

پسیارا وی رۆژەکێ ژ ئیمام ئەحمەدی هاتەکرن: ئەرێ ئەو چ زەلام بوو تو هندە حەز ژێ دکەی، و هەر رۆژ پشتی نڤێژا سپێدێ تو دوعایان بۆ دکەی؟ ئیمامی گۆت: ((کورێ من! ئەو بۆ دنیایێ وەکی رۆژێ بوو، و بۆ مرۆڤان وەکی ساخی و سلامەتیییێ بوو، و ما ئێک هەیە ژ ڤان هەردو تشتان یێ بێ منەت بت؟)).

ئەوێن ئەو دیتی دبێژن: وی د ژیییێ خۆ هەمیییێ دا جارەکا ب تنێ ژێ درەو نەکریوو، و د گۆتنەکێ دا ئەو بەحسێ خۆ دکەت و دبێژت: ((بیرا من نائێت ئەڤە شازدە سالە ژ جارەکێ پێڤەتر من هند خوار بت کو ئەز تێر ببم، وێ جارێ ژی من هلاڤێت!)).

ئیمامەک بوو ئوممەتەک د شەخصێ وی دا کۆمبووبوو، و ئەڤە یا غەریب نینە؛ چونکی ئەو ژ (سوفیانێ کورێ عویەینە)ی فێری زانینێ بووبوو، و ژ (فوضەیلێ کورێ عیاضی) فێری زوهدێ بووبوو، و ژ (مالکێ کورێ ئەنسی) فێری تەقوایێ بووبوو.. ڤێجا ما چ دێ یێ ژێ کێم بت؟

ئیمامێ (ذەهەبی) دەمێ بەحسێ وی دکەت دبێژت: ((خودێ رەحمێ ب شافعی ببەت، ما یێن وەکی وی ل کیڤە هەنە؟)).

بەلێ ڤێ جارێ دێ چینە خزمەتا ئیمامێ خۆ یێ مەزن ئیمامێ شافعی؛ دا بزانین کانێ چاوایە دەمێ د ناڤ مرۆڤان دا هندەک وەکی وێ رۆژێ لێ دئێن ئەوا ل عەسمانی گەش دکەت؟

## شافعی کی بوو؟

ئیمامێ شافعی ناڤێ وی یێ دورست موحەممەدە کورێ ئدریسێ کورێ عەبباسێ کورێ عوسمانێ کورێ شافعێ کورێ سائبێ قورەیشییە.. و ئەو (شافعێ) کو ژ بەر وی دبێژنە ئیمامێ مە: (شافعی)، و دبتە باپیرێ باپیری ئیمامی، ئەو و بابێ خۆ هەردو ژ صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دئێنە هژمارتن.. و باپیرێ باپیرێ ڤی سائبی (موطەلبێ کورێ عەبدمەنافی)یە، و دئێتە زانین کو ئەڤ موطەلبە مامێ عەبدلموطەلبێ باپیرێ پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-، مەعنا ئیمامێ شافعی ژ بابکێ (موطەلبییانە)، و د ناڤ هەر چار ئیمامێن مەزن دا: ئەبوو حەنیفە، و مالک، و شافعی، و ئەحمەدی، ب تنێ شافعی ژ بنەمالا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- و ئەڤە ئێک ژ مەناقب و تایبەتییێن وییە.

ل رۆژا ئەینییێ سیهی هەیڤا رەجەبا سالا (١٥٠) مشەختی ئیمامێ شافعی ل باژێرێ غەززە ل دەڤەرا فلسطینێ هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر ل رۆژا ئەینییێ سیهی رەجەبا سالا (٢٠٤) مشەختی ل پایتەختا مصرێ ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ، پشتی پێنجی و چار سالێن تمام ژیای.

هێشتا نەبوویە دو سالی بابێ وی مر، لەو دەیکا وی ئەو ژ غەززایێ ڤەگوهاستە مەکەهێ دا ئەو ل نک مامێن خۆ بێتە ب خودانکرن.. ل مەکەهێ ئەو مەزنبوو، و دەمێ ژییێ وی بوویە حەفت سال وی قورئان هەمی ژبەرکر، و ل دەهـ سالییێ وی کتێبا (الموطأ) یا ئیمام مالکی هەمی ژبەرکر.

ل دەسپێکێ وی گەلەک حەز ژ ئەدەبی و شعرێ دکر، حەتا ناڤ و دەنگێن وی ب شعر گۆتنێ بەلاڤبووین، پاشی علمێ فقهی ل بەر وی هاتە شرینکرن، و وی دەست ب خواندنا فقهی کر و تێدا پێشکەفت حەتا بوویە ئێک ژ چار فقهزانێن ئوممەتێ یێن مەزن و خودان مەزهەب.

## ل مەیدانا زانینێ:

ل باژێرێ مەکەهێ ئیمامی قەستا هژمارەکا زانایێن ناڤدار کر؛ دا زانینێ بۆ خۆ ژێ وەرگرت، وەکی موفتییێ مەکەهێ (موسلم کورێ خالدێ زەنجی)، و زانایێ مەزن (سوفیانێ کورێ عویەینەی)، و ئیمامێ تۆبەداران (فوضەیلێ کورێ عیاضی) و گەلەکێن دی.. و هێشتا نەگەهشتییە بیست سالییێ ناڤ و دەنگێن وی ب زانین و تێگەهشتنێ بەلاڤبوون، و وی فەتوا دان و ئیمامەتی کر، و پشتی ئەو بوویە بیست سالی وی قەستا مەدینێ کر، و مەزنترین زانایێ ئیمامی دەرس ل نک خواندین ل مەدینێ، ئیمام مالکێ کورێ ئەنەسی بوو ئەوێ دبێژنێ: (إمام دار الهجرة).

## ئیمام ل باژێرێ بەغدایێ:

پشتی ئیمام مالک چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ ل سالا (١٧٩)ێ، ئیمامێ شافعی مەدینە هێلا و چوو قەستا یەمەنێ کر، ب ئنیەتا وەرگرتنا زانینێ ژ زانایێن وی وەلاتی، و دەمێ ئیمام ل یەمەنێ وەسا چێبوو هندەک (عەلەوی) ب شۆرەشەکێ دژی خەلیفێ عەبباسی (هاروون ئەلرەشیدی) ڕابوون، و چونکی ئیمامێ شافعی زەلامەکێ (موطەلبی) بوو، والییێ یەمەنێ ئەو ژی گرت و د گەل تاوانباران هنارتە بەغدایێ دا خەلیفە حوکمێ خۆ د دەر حەقا وان دا بدەت.. وان ئیمامێ شافعی گرت و ئینا بەغدا.. ل کۆچکا هاروونی هاتە ئامادەکرن، پشتی خەلیفەی دان و ستاندنەک د گەل کری، وی زانی ئەو مرۆڤەکێ زانا و تێگەهشتییە و وی چو د گەل (عەلەوییان) نینە لەو قەدرەکێ زێدە دایێ.. و هنگی ئیمامی بڕیار دا بمینتە ل بەغدایێ؛ دا مفای بۆ خۆ ژ زانایێن وێرێ ژی ببینت، و ل بەغدا شافعی مفایەکێ مەزن بۆ خۆ ژ ئیمام (موحەممەدێ کورێ حەسەنی) وەرگرت کو ئێک ژ شاگرەدێن ئیمامێ (أعظم) ئەبوو حەنیفەی بوو.. ب ڤێ چەندێ ئیمامێ شافعی (ئیجابییات) و باشییێن

(مەدرەسا حەدیسیێ) ل حیجازێ، و (مەدرەسا رەئییێ) ل بەغدایێ ل نک خۆ کۆمکرن، و ئەڤە ژی ئێک ژ (مەناقبێن) ئیمامی و مەزهەبێ وینە.

## مەزهەبێ شافعی:

دەمێ ئیمام ل بازێرێ بەغدا یێ ئاکنجی، وی بناخەیێن مەدرەسا خۆ یا فقهی ئەوا ب ناڤێ (مەزهەبێ شافعی) هاتییە ناسین دانان، و گەلەک زانایێن بەغدایێ قەستا دەرسێن وی کر و زانین -ب تایبەتی فقه- بۆ خۆ ژێ وەرگرت، و ئێک ژ مەزنترین زانایێن بەغدایێ یێن مفا بۆ خۆ ژ شافعی وەرگرتی ئیمام ئەحمەد بوو، ئەوێ ب ناسناڤێ (إمام أهل السنة والجماعة) دئێتە ناسین، و ئیمام ئەحمەدی مەدحێن زانایەکی نەدکرن، وەکی وی مەدحێن ئیمامێ شافعی دکرن، و گەلەک جاران وی شیرەت ل خەلکی دکر کو کتێبێن ئیمامێ شافعی بخوینن، و وی دگۆت: شافعی منەتەک بوو خودێ د گەل مە کری. ژ بلی فقهی ئیمامی دەستەکێ درێژ د زانینا (أصول الفقه) و (أصول الحدیث)ێ ژی دا هەبوو، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێکەمین زانایێ موسلمان کو کتێب ل دۆر ڤان علمان دانایین.

## ئیمام ل مصرێ:

دەمێ بزاڤا موعتەزلییێن بیدعەچی ل بەغدایێ خورتبووی، و ب رێکا وان فتنا (خلق القرآن) ژ حەلەقاتێن زانایان دەرکەفتی و کەفتییە ناڤ بازارێ! و دووماهییێ دەستەلاتدارییا عەبباسییان ب خۆ ژی پشتەڤانی بۆ کری، ئیمامی دیت یا باشتر بوو وی ئەوە ئەو جهێ فتنێ و فتنەچییان بهێلت، و بۆ خۆ برەڤت دا دینێ وی پاراستی بمینت، ئەو بوو وی ل دووماهییا سالا (١٩٩) بەغدا هێلا و قەستا وەلاتێ مصرێ کر.

ل مصرێ ئیمامێ شافعی قەستا پایتەختێ کر، ئەوا هنگی دگۆتنێ: (الفسطاط)، و ل وێرێ ئاکنجی بوو، و ل مصرێ وی هندەک بۆچوونێن خۆ

یێن فقهی گوهارتن، و ناڤێ: (مەزهەبێ نوی) ل سەر ڤان بۆچوونێن وی هاتە دانان.

چار پێنج سالەکان ئیمامێ شافعی ل مصرێ ما، حەتا ل رەجەبا سالا (٢٠٤)ێ مشەختی چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ.. هەڤالێ وی ئیمامێ موزەنی دبێژت: دەمێ شافعی کەفتییە بەر مرنێ ئەز چووم دا سەرا وی بدەم، من گۆتێ: حالێ تە چیە؟ وی گۆت: حالێ من.. بارکرنا ژ دنیایێ و هێلانا برایانە، ژ پەرداغێ مرنێ دێ ڤەخوم و دێ قەستا خودێ کەم، و ب خودێ ئەز نزانم کانێ رحا من دێ چتە بەحەشتێ یان دێ چتە جەهنەمێ..

پاشی وی کرە گری و گۆت:

ولما قسا قلبي وضاقت مذاهبي     جعلت الرجا مني لعفوك سلما
تعاظمني ذنبي فلما قرنته     بعفوك ربي كان عفوك أعظما

## ئیمامێ زاهدان:

تشتێ ژ هەمییێ بەرچاڤتر د ژینا ئیمامێ شافعی دا زوهد و خۆ بێ منەتکرنا وی بوو ژ مرۆڤێن دنیایێ، لەو هەڤالێن وی هەمی ل وێ باوەرێ بوون کو مرۆڤێن وەکی شافعی دمەرد -د گەل فەقیرییا وی- نەبوون، (عەمرێ کورێ سەوادی) دبێژت: شافعی گۆتە من: سێ جاران د عەمرێ خۆ دا ئەز یێ مفلس بوویم، تشتێ خۆ هەمی من یێ فرۆتی، خۆ چەکێن کچا خۆ و ژنکا خۆ ژی. و ئەڤ مفلسییا شافعی یا هندێ نەبوو چونکی وی زێدە مەصرەف ل خۆ دکر، نە! بەلکی یا هندێ بوو هندی وی هاریکارییا مرۆڤێن پێتڤی و هەژار دکر، وەکی هەڤالێن وی دبێژن. و ژ بەر کو ڤیانا دنیایێ جهێ خۆ د دلێ شافعی دا نەکربوو، دەستێ وی ب دانا خێران یێ ڤەکری بوو، و مەردینییا وی بووبوو جهێ مەتەل پێ ئینانێ.. د گۆتنەکا خۆ دا ئیمام دبێژت: ((ئەگەر دنیایێ هەمییێ ل سویکێ ب پرتەکا نانی بفرۆشن ئەز وێ ناکرم))!

رۆژا ئیمامێ شافعی ژ دیوانا هاروون ئەلرەشیدی دەرکەفتی، هاروونی پێنج هزار دینار د دویڤ ڕا بۆ هنارتن، زوبەیرێ قورەیشی دبێژت: حەتا ئیمام ژڤڕییە مال کێمتر ژ سەد دیناران مابوونە ڤێ یێن دی هەمی دانە مرۆڤێن پێتڤی.. و ئەڤ سەرهاتییە ل وی دەمێ دلفرەهییا ئیمامی بۆ مە ئاشکەرا دکەت، هندێ دگەهینت کو وەرگرتنا مالی ژ مەزنان ب ئنیەتا بەلاڤکرنا وی ل سەر هەژاران -ب دیتنا ئیمامی- کارەکێ دورست بوو. و د گەل هندێ ژی وە نەبت بێتە هزرکرن کو ئیمامی دەستێ خۆ ل بەر مەزنێن دنیایێ ڤەدگرت یان دویڤەلانکییا وان دکر دا تشتەک ژێ بگەهتێ، خەلیفێ عەبباسی مەئموون دبێژت: ب هەمی ڕەنگان ئەز هاتمە شافعی و ئەز نەشیامێ!

نەشیایێ چونکی شافعی ژ وان توخمە زانایان نەبوو یێن دنیا ب شاشکێ دخوار، و دین ددا ب دەرهەمی.

ئیمامێ شافعی دشیا تەحەممولا برسێ بکەت، بەلێ دلێ وی هاری وی نەدکر کو علمێ خۆ ل بەر دەرێ سولطانەکی یان دەولەمەندەکی بێ بها بکەت، و ژ بەر زوهدا ئیمامی ئەو شازدە سال بوو وی هند خوارن نەخواربوو کو ب دورستی تێر ببت، دگۆت: گەلەک خوارن لەشی گران دکەت و دلی ڕەق دکەت.. ژ بەر ڤێ چەندێ شافعی دلەکێ نازکتر ژ بایێ سحاران هەبوو، ڕۆژەکێ (سوفیانێ کوڕێ عویەینەی) وەعزەک دکر، د ناڤ وەعزێ خۆ دا هندەک حەدیس خواندن، گاڤا شافعی گوهـ ل وان حەدیسان بووی ژ ترسێن خودێ دا دلگرتی بوو و کەفت، هندەکان گۆتە سوفیانی: موحەممەدێ کوڕێ ئدریسی مر، وی گۆت: ئەگەر ئەو مر، مەعنا باشترینێ خەلکێ ڤی زەمانی مر!

د گەل ڤێ زوهد و زانینا خۆ یا مەزن ئیمامێ شافعی مرۆڤەکێ زێدە (موتەواضع) بوو، هەر جارەکا حەقی بۆ وی ئاشکەرا ببا دویچوونا حەقییێ دکر، و وی خۆ ژ هندێ مەزنتر نەددیت کو ژ بەر گۆتنا ئێکێ ژ خۆ کێمتر ل خەلەتییەکا خۆ لێڤەببت، ڕۆژەکێ دەمێ وی دەرس دگۆت، ل بەغدا، ئیمام

ئەحمەد -کو ئێک ژ شاگردێن وی بوو- ل دەرسێ یێ ڕوینشتی بوو، ئیمامی گۆتێ: د زانینا حەدیسێ دا تو ژ مە شارەزاتری، چی گاڤا حەدیسەکا دورست تە دیت بۆ مە بێژە؛ دا ل دویڤ بچین.

ئەڤە گۆتنا وی بوو بۆ ئێک ژ طەلەبێن وی، ڤێجا بزانن (تەواضعا) وی بۆ حەقییێ چەندا مەزن بوو.

## بەرەڤانییا وی ژ مەنهەجێ سوننەتێ:

د گەل کورتییا ژییێ ئیمامی -کو پێنجی و چار سال بوون- خودێ بەرەکەتەکا مەزن هاڤێتبوو علمێ وی، ئەو علمێ بەری هەر تشتەکی ڤیانا مەنهەجێ کیتابێ و سوننەتێ ل دویڤ تێگەهشتنا (سەلەفێن) ئوممەتێ د دلێ وی دا چاندی، و خزمەتکرنا د ڤێ ڕێکێ دا ل بەر وی شرینکری.. (تەعەصصوبا) وی بۆ حەقییێ ب تنێ بوو، و ژ بلی خودێ و پێغەمبەرێ وی، وی (عصمەت) نەددا بیر و بۆچوونێن چو کەسان، و وی ژی وەکی ئیمامێ مەزن ئەبوو حەنیفەی و مالکی هەردەم بەرێ هەڤالێن خۆ ددا سوننەتێ و ئەو ژ (تەعەصصوبا کۆرە) و مەزهەبییەتا بەرتەنگ ددانە پاش، و دگۆتێ: چی گاڤا هەوە تشتەک د کتێبێن من دا دیت وەکی سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەبت، هوین گۆتنا من بهێلن و ل دویڤ سوننەتێ هەڕن.

و ژ وان مەزنە گۆتنێن ئیمامی یێن د جەرگێ ڕۆژان دا هاتینە چاندن ئەوە دەمێ دبێژت: چی گۆتنا ئەز بێژم و ئەو وەکی گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- نەبت، یا دورست گۆتنا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن-، و هوین گۆتنا من ل دیواری بدەن!

ژ ئیمامی دئێتە ڤەگوهاستن، کو ڕۆژەکێ مرۆڤەکی گۆتێ: ئەرێ تو کاری ب فلان حەدیسێ دکەی؟ ئیمامی گۆتێ: چی گاڤا حەدیسەکا دورست من ژ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەگوهاست و من کار پێ نەکر هوین هەمی شاهد بن کو ئەو هنگی عەقلێ من نەمایە.

جارەکا دی مرۆڤەک هاتە نک وی و پسیارا مەسەلەکێ ژێ کر، ئیمامی حەدیسەک بۆ وی ڤەگێڕا و گۆتێ: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هۆ دبێژت.. وی مرۆڤی گۆت: باشە، و تو چ دبێژی؟ ئیمامێ شافعی ب عێجزی ڤە لێ حەیتاند و گۆتێ: ئەرێ تو چ هزر دکەی، یا ژ تە ڤە ئەزێ ل کەنیسێ و زنارەکا د پشتا من؟ ئەزێ دبێژمە تە پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هۆ دبێژت، تو یێ دبێژییە من: رەئیا تە چیە؟ مەعنا ئیمامێ شافعی ل وێ هزرێ بوویە کو ئەو کەسێ گۆتنا خۆ بینتە رێزا گۆتنا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- یان پشتی گۆتنا پێغەمبەری وی ژی رەئیەک هەبت ئەو وی چو پشک و بار د ئیسلامێ نینن، و فەرقا وی و زناریەرێسان نابت.

ئەڤە هندەکا کێم بوو ژ گەلەکییا شافعی، چپکەکا بچویک بوو ژ دەریایا وی یا بەرفرەه، و شافعی ئەڤە بوو لەو (ئەییووبێ کورێ سووەیدی) دگۆت: من باوەر نەدکر هێشتا ئەزێ ساخ ئەز دێ ئێکێ وەکی شافعی بینم!

# ئەو چیایێ ڕەشەبایی نەهژاندی
# ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی

**ل بەر دەستێ بابەتی:**

ئێک ژ مەزنترین گرفتارییێن دکەڤنە ڕێکا مرۆڤێن خودێ -ل درێژییا دیرۆکا وان- ئەوە دەمێ ئەو دبینن کسەک یان کۆمەک د ناڤ ڕێزێن ئوممەتێ دا دەردکەڤت تشتەکی ژ نک خۆ ل دینی زێدە بکەت و ب ناڤێ دینی د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت، ئەڤ تشتە یێ کو د شریعەتی دا دبێژنێ: (بیدعە) کوژەکترین ڤایرۆسە دکەڤتە دینێ خودانی و بێی وی های ژ خۆ هەبت ئەو دێ هند بینت چو دین ل نک نەمایە!

ئەگەر هندەک کەس هەبن هزر بکەن بیدعە تشتەکێ سڤکە، مرۆڤێن خودێ هزرەکا دی هەیە ب دیتنا وان ئەگەر مرۆڤەک گونەهەکێ بکەت، و بزانت ئەڤ کارێ ئەو دکەت گونەهە، سڤکترە ژ هندێ ئەو بیدعەیەکێ بکەت؛ چونکی مرۆڤێ گونەهکار دبت ل خۆ بزڤرت و تۆبە بکەت، بەلێ حەتا بیدعەچی ل بیدعەیا خۆ لێڤە ببت دەمەکێ درێژ پێ دڤێت؛ چونکی ئەو هزر دکەت کارێ ئەو پێ ڕادبت دینە. ژ لایەکێ دی ڤە ئەو کەسێ تشتەکی ژ نک خۆ ل دینی زێدە دکەت و دبێژت: ئەڤ تشتە یێ باشە ئەو هنگی ب ڕەنگەکێ نە ئێکسەر یێ دبێژت: دین تەمام نەبوویە! و ئەڤە درەوپێکرنە ب وێ ئایەتا دبێژت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ (المائدة: ٣).

ژ بەر ڤێ ئێکێ مرۆڤێن خودێ ژ هەمی تشتان پتر نەیارەتییا بیدعێ و بیدعەچییان دکەن، حەتا دەرەجەیەکێ (ئەبوو ئدریسێ خەولانی) دبێژت: ((ئەگەر

ل بەر چاڤێن من ئاگر بەربیتە مزگەفتێ و ئەز نەشێم ڤەمرینم ل نک من خۆشترە ژ هندێ ئەز بیدعەیەکێ ل مزگەفتێ ببینم و ئەز نەشێم بگوهۆڕم)).

نەیارەتییا مرۆڤێن خودێ بۆ بیدعەچییان گەهشتبوو وێ دەرەجێ ئێکی ژ وان -گاڤا بێ هیڤی ببا کو ئەڤ بیدعەچییە ل کارێ خۆ لێڤە نابت- تێکەلییا وی نەدکر، و نە دهێلا هەڤالێن وی ژی تێکەلییا وی بکەن: ڕۆژەکێ ئێکی گۆتە ئیمام ئەحمەدی: زەلامەکێ ل وێرا هە دبێژت: عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی ژ موعاویەیێ کوڕێ ئەبوو سوفیانی چێترە، ئیمامی گۆتێ: چو جاران نەچە دیوانا وی، و خوارن و ڤەخوارنا تە بلا د گەل وی نەبت، خۆ ئەگەر ئەو نساخ ژی بوو سەرا نەدە!

هندە ئەو د (حەریص) بوون ل سەر خۆدویرکرنا ژ بیدعەچییان.

و گەشترین نموونە ل سەر بیدعێ و بەلاڤبوونا وێ د ناڤ ئوممەتێ دا بیدعەیا (موعتەزلییان) بوو، ئەوا ل سەر دەمێ عەبباسییان پەیدابووی، و ب ناڤێ: (بدعة خلق القرآن) هاتییە ناسین، و هند مەزنبووی کو بارا پتر ژ زانایان باوەری پێ ئینای و گەهشتییە وێ دەرەجێ کو خەلیفە ژی بگەهتێ.. ل ڤی دەمێ بیدعێ سەرێ خۆ هلدای و چەنگێ خۆ یێ ڕەش ب سەر ئوممەتێ دا گرتی ناڤێ ئیمام ئەحمەدی و بەحسێ بەرەڤانییا وی ژ عەقیدا (سەلەفی) بلند بوو حەتا ئەو ب ناسناڤێ: (إمام أهل السنة والجماعة) هاتییە ناسین.

## ئیمام ئەحمەد کییە؟

* ناڤێ وی ئەحمەدە کوڕێ موحەممەدێ کوڕێ حەنبەلێ شەیبانییە، و دگۆتنێ: بابێ عەبدللاهی.

* د مەها ڕەبیعەلئەووەلا سالا ١٦٤ مشەختی دا، ل باژێڕێ بەغدایێ هاتبوو سەردنیایێ، و هەر ژ زارۆکینییا خۆ وی حەز ژ زانینێ و زانایان دکر، ب تایبەتی زانینا حەدیسێ، ل سەری دەست ب خواندنا فقهی کر ل نک گەلەک

زانایان وەکی ئیمامێ شافعی، پاشی دەست ب وەرگرتن و ڤەگوهاستنا حەدیسان کر.

* هژمارەکا زانایێن مەزن وەکی: بوخاری و موسلمی حەدیس ژێ وەرگرتن، و هندەک سەیدایێن وی ب خۆ پشتی هنگی د حەدیسێ دا بوونە طەلەبێن وی وەکی: شافعی و عەبدررەزاقی و وەکیعی، و دەمێ ئیمامێ شافعی ژ بەغدایێ دەرکەفتی و چوویە مصرێ دگۆت: ((ئەز ژ عیراقێ دەرکەفتم و من کەسەکێ وەکی ئەحمەدی چێتر و زاناتر و ب تەقواتر لێ نەهێلایە))، و ئسحاقێ کورێ راهوەیهی دبێژت: ((ئەحمەد دەلیل بوو د ناڤبەرا خودێ و بەنییان دا ل سەر عەردی)).

* کتێبا وی (المسند) باشترین نیشانە ل سەر زیرەکییا وی، ژ ناڤبەرا حەفت سەد و پێنجی هزار حەدیسێن کو وی ڤەگوهاستین، چل هزار حەدیس ب تنێ وی هلبژارتن و د ڤێ کتێبا خۆ دا ئینان و د (سەنەدا) سێسەد حەدیسان ژ ڤان حەدیسان دا ب تنێ سێ (راوی) د ناڤبەرا وی و پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- هەنە.

* د زانینا فقهی ژی دا خودان مەزهەبەکێ تایبەتە، و ئەو دئێتە هژمارتن ئێک ژ زانایێن (موجتەهد)، و زانا دبێژن: د ناڤبەرا هەمی مەزهەبان دا مەزهەبێ وی ژ هەمییان پتر یێ نێزیکی سوننەتییە.

* ل سەر دەمێ خەلیفێ عەبباسی (مەئموونی) گرفتاری و فەتەراتەکا مەزن هاتە سەری؛ چونکی وی بەرهنگارییا وێ بیدعەیا موعتەزلییان کر ئەوا دبێژت: قورئان تشتەکێ مەخلووقە، و ئەڤ فتنە بەردەوام ما حەتا دەمێ موعتەصم و واثقی ژی، و ژ بەر ڕاوەستانا وی یا ب هێز بەرانبەر ڕەشە پێلا موعتەزلییان، ئەو هاتە گرتن و ئێشاندن -وەکی پشتی دەلیڤەیەکا دی دێ بەحس ژێ کەین- و خۆڕاگرییا وی د ڤێ فتنێ دا بوو ئەگەرا هندێ دیرۆکنڤیس ناسناڤێ (إمام أهل السنة والجماعة) ل سەر بدانن.

* ل رۆژا ئەینییێ (١٢)ی هەیڤا رەبیعولئەووەلا سالا (٢٤١) مشەختی ل باژێرێ بەغدایێ چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و دبێژن: نە بەری وی و نە پشتی وی چو جەنازە ل بەغدایێ وەکی جەنازێ وی نەهاتینە ڤەشارتن، ب دەهان هزار مرۆڤ ئامادەبوون، و مالەک نەما خەم نەکەفتییێ.

## موعتەزلی و بیدعەیا (خلق القرآن):

ئێکەمین کەس ئەڤ بیدعە د ناڤ ئوممەتێ دا پەیداکری (جەعدێ کورێ درهەمی) بوو، ئەوێ سەرا ڤی کارێ خراب ل سەر دەمێ ئومەوییان هاتییە کوشتن، و هەر چەندە ئەو هاتە کوشتن ژی بەلێ فتنە ب مرنا وی ب دوماهی نەهات؛ چونکی پشتی وی شاگردەیێ وی (جەهمێ کورێ صەفوانی) ب دەورێ وی یێ خراب ڕابوو حەتا ئەو ژی ل سالا (١٢٨) هاتییە کوشتن، و پشتی وی (بشرێ مەریسی) ئەوێ قنیات جوهی ئالایێ ڤێ بیدعێ هلگرت، و نێزیکی چل سالان خەبات بۆ کر.

دەمێ هاروون ئەلرەشید بوویە خەلیفە بڕیارا کوشتنا بشری دا، و ڕێ نەدا وی و هەڤالێن وی کو ڤێ بیدعێ بەلاڤ بکەن، و هندی هاروون یێ ساخ ئالایێ سوننەتێ یێ بلندبوو و موعتەزلییان د خۆ ڕا نەددیت بێنە مەیدانێ، و سەرێ وان بشرێ مەریسی خۆ ڤەشارتبوو، و ژ ڤی جهی درەڤی جهێ هە حەتا هاروون مری، پشتی مەئموون بوویە خەلیفە بڕیار دا فەلسەفا یۆنانی بێتە وەرگێڕان، و دەمێ موعتەزلییان دیتی مەئموون گەلەک حەز ژ فەلسەفە و جەدەلێ دکەت، وان خۆ گەهاندێ و ئەو ژی وەکی خۆ د سەردا بر و کرە ئێک ژ هلگرێن ئالایێ بیدعەیا (خلق القرآن).

دەمێ دەولەت بوویە پشتەڤانا موعتەزلییان وان سەربەست بیدعەیا خۆ بەلاڤکر، و زۆری ل خەلکی کر کو بێنە سەر بیر و باوەرێن وان.. مەئموون مر، و ئەو بەری بمرت شیرەت ل برایێ خۆ موعتەصمی کر کو ئەو ژی ل سەر ڕێبازا وی بچت، وی ب یا مەئموونی کر و بڕیار دا هەر زانایەکێ پشتەڤانییا ڤێ

بیدعێ نەکەت بێتە گرتن و ئێشاندن.. و فتنە یا بەردەوام بوو حەتا موعتەصم ژی مری، و کوڕێ وی واثق بوویە خەلیفە، خەلیفێ نوی ژ بابێ خۆ و مامێ خۆ یێ جودا نەبوو وی ژی ڕێکا وان گرت و پشتەڤانییا موعتەزلییان کر حەتا مری، پشتی وی موتەوەککل بوو خەلیفە، و موتەوەککلی بریار دا ئەڤ بیدعە بێتە ڕاکرن و جارەکا دی مەزهەبێ حەدیسێ بێتە گۆتن و بەلاڤکرن، ژ بەر ڤێ چەندێ هاتە گۆتن: ((خەلیفە سێنە: ئەبووبەکر ل دەمێ (رددێ)، و عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی بۆ ڤەگەڕاندنا حەقێ هەژاران، و موتەوەککل بۆ بلندکرنا سوننەتێ)). هەر ژ سالا (٢١٨) و حەتا سالا (٢٣٤) بازارا ڤێ بیدعەیێ د ناڤ ئوممەتێ دا یا گەرم بوو، و گرفتاری ل سەر زانایان یا دژوار بوو؛ چونکی دەستهەلاتدارییێ خۆ دابوو د گەل گازیکەرێن ڤێ بیدعەیێ.

### هێڤێنێ بیدعەیا (خلق القرآن)ێ:

بەلکی گەلەک ژ خواندەڤانان نوکە ڤێ پسیارێ د گەل خۆ دکەن: ئەرێ مەسەلا (خلق القرآن)ێ چیە؟ و هێڤێنێ ڤێ بیدعەیێ ژ چ هاتییە؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژین: د عەقیدەیا ئیسلامی یا دورست دا، ئەوا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- و صەحابییێن وی ل سەر چووین، هندی ئاخفتنە، ئەوا ب عەرەبی دبێژنێ: (کلام)، ئێک ژ سالۆخەتێن خودێیە، و ئەڤ سالۆخەتێ خودێ ژی -وەکی هەر سالۆخەتەکێ وی یێ دی- سالۆخەتەکێ (ئەزەلی) و (ئەبەدی)یە، یەعنی: هەر هەبوویە و هەر دێ هەبت چو بەراهی و دوماهی بۆ نینن، و قورئانا پیرۆز ئەوا ب ڕێکا جبریلی بۆ موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- هاتی ب ڕاستی و دورستی گۆتنا خودێیە، ژ وی دەست پێ کرییە و بۆ وی دزڤڕت.. ئەڤە ئەو عەقیدە بوو یا موسلمانان باوەری پێ دئینا، دەمێ (جەعدێ کوڕێ درهەمی) هاتی و پشتی گۆتنەکا فەلسەفی یا دویر و درێژ گەهشتە وێ باوەرێ کو هندی ئاخفتنە نە ژ سالۆخەتێن خودێیە، و گۆت: پاککرن و (تەنزیها) خودێ هندێ دخوازت ئەم بێژین: خودێ نائاخڤت!

و دەمێ پسیار ژێ هاتییەکرن: پا ئەڤ قورئانا ئەم دخوینین چیە؟

وی گۆت: ئەڤە گۆتنەکا چێکرییە (یا مەخلووقە) خودێ ئەو یا کرییە د لەشێ چێکرییەکی دا -کو جبریلە- و بۆ پێغەمبەرێ خۆ یا هنارتی، و ئەو نە ژ سالۆخەتێن خودێ یێن ئەزەلییە.

ئەڤە -و گەلەک ب کورتی!- گۆتنا جەعدی و دویکەفتییێن وی بوو ژ دەستەکا موعتەزلییان.. و گاڤا وان ئەڤ گۆتنا خۆ ئاشکەراکری زانایێن ئوممەتێ یێن ژێهاتی گۆتنا وان هژمارتن ئێک ژ بیدعەیێن (عەقائدی) و ب رەنگەکێ جوان و رێک و پێک خەلەتییا بۆچوونا وان ئاشکەراکر، و راگەهاند کو هەر کەسەکێ باوەرییێ ب ڤێ بۆچوونێ بینت دێ ژ بیدعەچییان ئێتە هژمارتن.

هندی ئەڤ بیدعە د چارچووڤەیێ ڤەکۆلین و دان و ستاندنێن زانایان دا ئەو مەسەلەکا (علمی) بوو، و چو کارێ خۆ د (شارعی) دا -وەکی دبێژن- نەدکر، هەر لایەکی دەلیلێن خۆ دئینان و بەرەڤانی ژ بۆچوونا خۆ دکر، و ئوممەتێ هەمییێ وەسا بەرێ خۆ ددا موعتەزلییان کو دەستەکەکا بیدعەچی و سەرداچووینە، بەلێ هنگی گرفتاری دژوار بوو و فتنە کەفتە (شارعی) دەمێ موعتەزلی شیاین خۆ بگەهیننە سەرێ حوکمی و دەسهەلاتدارییێ کو خەلیفە بوو، و وی وەسا تێ بگەهینن کو ئەو ب ڤێ بیدعەیا خۆ یێ بەرەڤانییێ ژ عەقیدەیا ئیسلامی دکەن، خەلیفە ب گۆتنێن وان هاتە خاپاندن و پشتەڤانییا بۆچوونا وان کر، وەکی بەری نوکە ژی مە گۆتی: هندی (هاروون ئەلرەشید) یێ ساخ موعتەزلییان د خۆ را نەددیت گۆتنا خۆ ئاشکەرا بەلاڤ کەن؛ چونکی هاروون -ئەوێ دەرس ل نک زانایێن مەزن وەکی ئیمام مالکی خواندین- ل سەر عەقیدەیەکا دورست بوو، و پشتی وی کورێ وی مەئموونی، پاشی موعتەصەمی، پاشی واثقی ژی پشتەڤانییا بیدعەیا موعتەزلییان کر، هنگی گرفتارییێ دەست پێ کر، و فتنە ل سەر زانایێن سوننی دژوار بوو.. و هەر چەندە دووماهی هەر

یا حەقییێ بوو بەلێ ڤێ حەقییێ -حەتا شیای خۆ ڕاگرت- قوربانییێن خۆ هەبوون، و قوربانییێن وێ د بچویک نەبوون.

## ئیمام ئەحمەد بەرانبەری پێلێ:

گرفتاری (محنە) هات.. و وەکی هەر جارەکا ئەو دئێت ئاگرەکێ بۆش د گەل خۆ ئینا، ڕاستە ئاگر سۆتنێ د گەل خۆ دئینت، تەڕ و هشکی پێکڤە دسوژیت، بەلێ ژ بیر نەکەن ژی کو زێڕێ عەسلی پشتی ب ئاگری دئێتە جەرباندن ژ نوی دئێتە ناسین، ل بەرفرەهییێ هەر کەسەک دشێت یا وی بڤێت بێژت، بەلێ ل تەنگاڤییێ خۆڕاگر دکێمن، ب تنێ مرۆڤێن خودێنە ملێن خۆ ددەنە بەر بارێن گران و بەرانبەریا پێلێن دژوار دکەن؛ چونکی ئەون ب دورستی هەست ب بەرپسیارییێ دکەن..

دەمێ تەنگاڤی زێدە شدیای، و کێر گەهشتییە هەستی -وەکی دبێژن- ئیسحاقێ مامێ ئیمام ئەحمەدی هاتە نک وی ل گرتیخانەیێ، هەر وەکی وی دڤیا پیچەکێ ئیمامی سست بکەت دا ئەو رەحمێ پێ ببەن، داخواز ژێ کر کو ئەو ژی وەکی گەلەک زانایێن دی خۆ بێ دەنگ بکەت حەتا پێل دبۆرت، ما بۆچی ئەو ب تنێ دێ ل مەیدانێ بت، ئیمامی گۆتێ: ((ئەی مامێ من! ئەگەر مرۆڤێ زانا ڕاستییێ نەبێژت و یێ نەزان ژی نزانت، باشە ڕاستی کەنگی دێ دیار بت)).

خەما وی ئەو نەبوو بێتە گرتن، یان حەتا کوشتن ژی؛ چونکی هەر دێ رۆژەکێ مرت، خەما وی ئەوە ئوممەت وە لێ بێت کەسەکێ زانا د ناڤ دا نەمینت ڕاستییێ بێژت، و نەزان ب خۆ نزانت، ڤێجا هنگی ڕاستی د بەر پییان بچت.. بێژنە من: ئەگەر مرۆڤێن خودێ نەبن کی هندە خەمێ ژ ڕاستییێ دخۆت؟

گاڤا هاتین ئیمام گرتی و بری، ئەبوو جەعفەرێ ئەنباری ب ڕێڤە خۆ گەهاندێ و گۆتێ: ((ئەڤرۆکە تو بۆ خەلکی سەری، بەرێ هەمییان یێ ل تە، ئەز

ب خودێ کەمە ئەگەر تە ژی وەکی وان گۆت خەلک هەمی دێ وەکی وان بێژن، بلا تە باوەری ب خودێ هەبت، گوهێ خۆ نەدە وان و بزانە ئەگەر تو ب دەستێن مەئموونی نەئێیە کوشتن ژی هەر رۆژەکێ دێ مری..)) چاڤێن ئیمامی تژی رۆندک بوون، و گۆت: ((یا خودێ حەز بکەت ئەو دێ چێ بت)).. ئەها ب ڤی رەنگی مرۆڤێن خودێ خاترا خۆ ژێک دخوازن دەمێ بۆ کۆچکێن زۆرداران دئێنە برن: نە وە بت لێڤە ببی، ئەگەر ئەو تە نەکوژن ژی تو هەر دێ مری! نە عەدەتێ وانە ئەو ل ڤان دەمان بێژنە ئێک و دو: تە ئێمانەت خۆ چو ل تە نەئێت.. نە، ئەو دبێژنە ئێک و دو: تە ئێمانەت حەقی، ژ ترسێن کوشتنێ دا وێ د بەر پییان ڤە نەدەی. ئەی ئەحمەد! بزانە تو ب تنێ بەرانبەر پێلێ یێ راوەستای، ئەڤە تو هاتییەبرن، دویر نینە ئەو گەڤێن کوشتنێ ل تە بکەن، دویر نینە تە بکوژن ژی، بەلێ قەیدی ناکەت، لێڤە نەبە، ئەگەر ئەو سەرا حەقییێ تە بهلاویسن ژی، لەشێ تە پارچە پارچە بکەن دێ مری، و ئەگەر تو ل مالا خۆ یێ روینشتی ژی بی هەر دێ مری، ئەنجام ئێکە.. ڤێجا ما بۆچی تو ئێکا هند ناکەی سوباهی دەمێ تە بۆ دیوانا خودێ گازی دکەن بێژن: کانێ ئەو ئەحمەدێ د دنیایێ دا رحا خۆ گۆری دینی کری؟

ئیمام هاتە گرتن و بەرێ وی بۆ کۆچکا مەئموونی هاتەدان..

## ئیمام ئەحمەد و مەئموونێ عەبباسی:

نوکە سال سالا ٢١٨ مشەختییە، خەلیفێ دەولەتا عەبباسییان -ئەوا حوکمی ل جیهانا موسلمانان دکەت- مەئموونێ کورێ هاروونییە، ئەوێ موعتەزلی شیاین وی ب لایێ بیدعەیا خۆ ڤە بکێشن.. مەئموون ژ پایتەختێ یێ دەرکەفتی و ب لایێ شامێ ڤە یێ چووی..

مەئموونی پشتی باوەری ب بۆچوونا موعتەزلییان ئینای کو قورئان تشتەکێ مەخلووقە و ئاخفتن نە صفەتەکێ خودێ یێ ئەزەلییە، وی بریار دا ئەڤ

هزره د ناڤ ئوممەتێ دا بێتە بنەجهکرن، و چونکی زانایێن سوننی مەزنترین ئاستەنگ بوون د رێکا ڤێ مرادا وی دا، وی دو پێگاڤ هاڤێتن:

یا **ئێکێ**: وی ژ والی و زەلامێن دەولەتا خۆ خواست ئەو وان زانایان دەسنیشان بکەن یێن باوەری ب بیدعەیا موعتەزلییان نەئینای، و ئێک ئێکە بۆ نک والی بێنە داخوازکرن و ژێ بێتە خواستن کو ئەو تاگیرییا حزبا موعتەزلییان بکەن، ئەگەر نە.. دڤێت چو کارێن رەسمی و حوکوومی د دەولەتێ دا نەمیننە د دەستان دا، خۆ شاهدەییا وان ژی دڤێت قازی قەبویل نەکەت، و هەچییێ هات و ب دەڤێ خۆ گۆت: قورئان یا مەخلووقە هەمی حەق و حقووقێن وی دێ بۆ ئێنە زڤڕاندن.

یا **دویێ**: هەر زانایەکێ پێگیرییێ ب فەرمانا خەلیفەی نەکەت راتب دێ ژێ ئێتە برین و چێ نابت ئەو دەرسان بێژت یان فەتوایەکێ بدەت.

ڤان هەردو پێگاڤان دەمەکی ڤەکێشا.. هژمارەکا نە یا کێم ژ زانایان -چ ژ ترسان دا چ ژ تەمەعییا دنیایێ- تاگیرییا بۆچوونا خەلیفەی کر، یان هەر چ نەبت خۆ بێ دەنگ کر؛ دا عامی هزر بکەن ئەو ژی تاگیرێن خەلیفەینە، و هندەک ژی ئاشکەرا دژی بۆچوونا خەلیفەی مان، و د ناڤ خەلکی دا بۆچوونا بیدعەچییێن موعتەزلییان رسوا دکر، لەو موعتەزلییان خەلیفێ خۆ پالدا کو پێگاڤەکا دی بهاڤێژت.. بڕیار هاتەدان: هەچییێ گوهدارییا خەلیفەی نەکەت دێ ئێتە گرتن.

ڤێ پێگاڤێ ژی هندەک لێڤەکرن، و کتەکا کێمتر ما.. ئەبوو یەعقووبێ بوەیطی -شاگردەیێ ئیمامێ شافعی- ئێک ژ وان زانایێن کێم بوو یێن خۆ ڕاگرتین و گەفێن خەلیفەی کار لێ نەکری، لەو بڕیار هاتەدان ئەو بێتە گرتن، دبێژن: دەمێ دبوو نیڤرۆیا ئەینییێ و بانگ دهاتەدان ئەو دا ڕابت کارێ خۆ کەت و ئێتە بەر دەرێ زیندانێ، دەرگەهڤان دا بێژتێ: دێ چ کەی؟ ئەو دا بێژت: دێ د گازییا خودێ چم.. ئەو دا بێژتێ: بزڤڕە جهێ خۆ، ئینا ئەو دا دەستێن خۆ

سەرئەڤراز کەت و بێژت: ((یا ڕەببی تو دزانی ئەز د گازییا تە هاتم و وان نەهێلا)).. ئەبوو یەعقووب ما د زیندانێ دا حەتا ل سالا ۲۳۱ مری.

دەمێ خەلیفەی دیتی هندەک کەس هەنە گرتن ژی کاری لێ ناکەت بڕیار دا هەچییێ باوەرییێ ب بۆچوونا موعتەزلییان نەئینت بێتە کوشتن.. وەکی مە گۆتی: ل سالا ۲۱۸ مەئموون ل شامێ بوو، لەو وی کاغەزەک بۆ والییێ خۆ ل بەغدایێ هنارت تێدا دەستویری دایێ کو هەر کەسەکێ وەکی موعتەزلییان نەبێژت سەرێ وی بێتە لێدان!

کاغەزا خەلیفەی گەهشتە والییێ بەغدا ئیسحاقێ کوڕێ ئیبراهیمی ئەو ڕابوو زانایێن باژێری هەمی کۆمکرن و ئێک ئێکە پسیار ژێ کر کانێ قورئان یا مەخلووقە یان نە؟ پشتی کو کاغەزا خەلیفەی بۆ وان خواندی کو هەچییێ نەبێژت قورئان یا مەخلووقە دڤێت بێتە کوشتن.

د ناڤ زانایێن بەغدایێ دا ب تنێ چار کەسان ب ئاشکەرایی نەڕازیبوونا خۆ دیارکر و گۆت: ئەڤ گۆتنە دەرکەفتنە ژ عەقیدا ئیسلامی و بیدعەیەکا خەلەتە و مە باوەری پێ نینە، و ئەو هەر چار زانا ئەڤە بوون: ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی، موحەممەدێ کوڕێ نووحی، عوبەیدوللاهێ قەواریری، و حەسەن ئەلسەججادە، ئینا والی بڕیار دا ئەو بێنە زنجیرکرن و بەرێ وان بۆ زیندانێ بێتە دان.

سێ ڕۆژان هەر ڕۆژ والی جارەکێ ئەو داخواز دکرنە دیوانا خۆ و دەلیڤە ددایێ دا ئەو ل گۆتنا خۆ لێڤە ببن، ئەگەر نە، ئەو دێ وان فرێکەتە شامێ ل نک خەلیفەی و ژ کوشتنێ پێڤەتر چوددی نینە.. ل ڕۆژا ئێکێ حەسەن ئەلسەججادە لێڤەبوو، یان وەسا د خۆ ئینادەر کو ئەو لێڤەبوو، ڕۆژا دویێ عوبەیدوللاهێ قەواریری ژی چاڤ ل حەسەنی کر و دەلیلێ هەر دویان ئەڤ ئایەتە بوو: ﴿ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ ﴾ (النحل: ۱۰٦) ئەو هەردو هاتنە بەردان، و دو مان: موحەممەدێ کوڕێ نووحی، و ئەحمەدێ کوڕێ

حەنبەلی، والی ئەو هەردو زنجیرکرن و هنارتنە شامێ ل نک خەلیفەی. ب رێڤە ئەبوو جەعفەرێ ئەنباری خۆ گەهاندە ئیمام ئەحمەدی و ئەو گۆتێ یا مە بەری نوکە ڤەگێرای.

بەری ئیمام ئەحمەد و هەڤالێ وی بگەهنە باژێرێ طەرسووسێ ل شامێ جهێ مەئموون لێ، جابا مرنا مەئموونی گەهشتە وان، لەو قاصدان ئەو هەردو زڤڕاندنە بەغدا و ب رێڤە موحەممەدێ کورێ نووحی ژی مر و ئیمام ئەحمەدی نڤێژ ل سەر کر.. پشتی ئیمام هاتییە زڤڕاندن بۆ بەغدا خەلکی هزرکر ب مرنا مەئموونی مەسەلە ب دووماهی هات و سوحبەتا (خلق القرآن) ئێدی نائێتەکرن، بەلێ وەسا چێ نەبوو؛ چونکی خەلیفێ نوی ژی کو موعتەصم بوو باوەری ب وێ هزرێ هەبوو یا برایێ وی مەئموون ل سەر چووی..

## ئیمام ئەحمەد و موعتەصمێ عەبباسی:

موعتەصمی گوه ل سوحبەتا ئیمام ئەحمەدی د گەل مەئموونی بووبوو، و مەئموونی بەری بمرت شیرەت ل موعتەصمی کربوو کو دەڤ ژ سوحبەتا (خلق القرآن)ێ بەر نەدەت، لەو پشتی ئەو بوویە خەلیفە ئێکسەر وی بڕیار دا ئیمام ئەحمەد بێتە گرتن..

ڤێ جارێ هەیڤا رەمەزانێ بوو.. ئیمام یێ ب رۆژی بوو، ئێلچییێن خەلیفەی هاتن دەست و پییێن وی زنجیرکرن و د گەل خۆ بر، ئەحمەدێ کورێ فەرەجی دبێژت: رۆژەکێ ئەز ل بازارێ یێ روینشتی بووم، من هند دیت خەلکی هەمییێ دەرگەهێن دکانێن خۆ گرتن و شیرێن خۆ هلگرتن و چوون، من پسیار کر: خێر بت ئەڤە چ قەومییە؟ هندەکان گۆتە من: ئیمام ئەحمەد هاتە گرتن، بر دا پسیارا قورئانێ ژێ بکەن.

ئیمام بر.. و بەری ل دیوانا موعتەصمی ئامادە بکەن، چەند رۆژەکان هێلا د ئاخوریا دەواران ڤە، بەلێ د ئاخوریا دەواران ڤە! گۆتن: بەلکی ئەو لێڤە ببت.. ل هەیڤا رەمەزانێ، ل پایتەختا دەولەتا ئیسلامێ، و ب ناڤێ بەرەڤانییا

ژ ئیسلامێ، ئیمام ئەحمەد ئەوێ پتر ژ حەفت سەد و پێنجی هزار حەدیسان ژبەر، د ئاخویرا دەواران ڤە، ب دەستێن بیدعەچییان هاتە گرتن.. و ئەو لێڤە نەبوو!

پشتی چەند ڕۆژەکان ئەو بۆ گرتیخانەیا بازێڕی هاتە ڤەگوهاستن، هنگی مامێ وی ئیسحاق چوو نک، و وی ئەو گۆتێ یا مە بەری نوکە ڤەگوهاستی: ((ئەی مامێ من! ئەگەر مرۆڤێ زانا ڕاستییێ نەبێژت و یێ نەزان ب خۆ نزانت، باشە چاوا ڕاستی دێ بۆ خەلکی دیار بت.. گرتن بۆ من نەخەمە، ل بەر من وەکی ئێکە ئەز ل مالا خۆ بمرم یان ل ڤێرێ، ئەگەر ئەو من ب شیری بکوژن چو نینە، بەلێ ئەز دترسم ئەو هند من عەزاب بدەن ئەز خۆ ل بەر نەگرم و لێڤە ببم))، دبێژن: دزیکەرەکی دەمێ گوهـ ل ڤێ گۆتنا ئیمامی بووی گۆتێ: ئەی ئیمام تە خەم پێ نەبت، عەزابدان ژی چو نینە، خۆ ل بەر هەردو قامچییێن ئێکێ بگرە یا سییێ تە های ژێ نابت!

ل هەڤدەی ڕەمەزانێ ئیمام ژ گرتیخانەیێ بۆ مالا والی هاتە ڤەگوهاستن، سێ ڕۆژان ئەو زنجیرکری ل دیوانا والی هاتە ئامادەکرن و والی گۆتێ: بەس جارەکێ بێژە قورئان یا مەخلووقە ئەم دێ تە بەردەین، وی ب یا وان نەکر، ل ڕۆژا چارێ خەلیفەی ژ والی خواست ئەو ئیمامی فرێکەتە نک وی، والی گۆتە ئیمامی: ئەز ب خودێ کەمە ڤێ جارێ ڕحا تەیە و چو ددی نە، خەلیفەی سویندا خواری تە ب شیری نەکوژت، و ئەگەر تو لێڤە نەبی ئەو ب قامچییان دێ تە ئاخێڤت، و دێ تە هاڤێتە د عەردەکی ڤە تو ڕۆژێ لێ نەبینی.. ڤان گەفان ژی ئیمام نەترساند ئینا ئەو بۆ کۆچکا موعتەصمی هاتە هنارتن.

## ل کۆچکا موعتەصمی:

سپێدێ دیوانا خەلیفەی یا تژیبوو، ئیمام ئەحمەد ئینا زۆر هێشتا یێ زنجیرکری بوو، پشتی سلاڤ کری، خەلیفەی گۆتێ: خۆ نێزیکی من بکە، پشتی چەند گۆتنەک د ناڤبەرا هەر دویان دا هاتینەکرن، خەلیفەی گۆتێ: تو

چ دبێژی بۆ قورئانێ؟ ئیمامی گۆت: ئەز وێ دبێژم یا خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتی، قورئان گۆتنا خودێیە و نە یا مەخلووقە.. خەلیفەی د خۆ ڕا نەدیت د گەل وی درێژ بکەت، ئینا گۆتە هەڤالێن خۆ ژ سەر و گرگرێن موعتەزلییان: د گەل باخڤن. حەتا نێزیکی ڕۆژئاڤایێ دان و ستاندنا وان ڤەکێشا و ئەو هەمی پێکڤە نەشیان ب ڕێکا علمی بەرانبەر ئیمام ئەحمەدی ڕاوەستن.

بەری دیوان ڤەرەڤت موعتەصمی ئیمام و زەلامەکێ دی ڤەدەرکرن و د گوهێ ئیمامی دا گۆت: فلان کەسی تو دنیاسی؟ ئەو سەیدایێ من بوو، چونکی وی گوهێ خۆ نەدا من، من بڕیار دا ئەو ل عەردی بێتە ڕاخشاندن و پییان ڤە بچنە سەر پشتێ! زەلامێ دی گۆت: ئەی (أمير المؤمنين) ئەز ئەحمەدی دنیاسم ڕۆژەکا ب تنێ ژی وی دوژمناتی و بێ ئەمرییا تە نەکرییە، و ئەو یێ ل مالا خۆ کەسێ چو نەخۆشی ژێ نەدیتینە.. موعتەصمی گۆت: ئەز دزانم ئەو مرۆڤەکێ زانا و تێگەهشتییە، و من گەلەک پێ خۆشە ئێکێ وەکی وی د گەل من بت، بەس د ڤی تشتی دا ئەو گوهدارییا من بکەت ئەز ب خۆ ب دەستێ خۆ دێ وی ڤەکەم، و ئەز ب خۆ ب هەڤالێن خۆ ڤە دێ چمە نک وی.. و خەلیفەی ب ڤێ چەندێ دڤیا ئیمامی (طەماع) کەت.. پشتی ڤێ چەندێ خەلیفە ل ئیمامی زڤڕی و گۆتێ: ئەی ئەحمەد تو چ دبێژی؟ ئیمامی گۆت: تشتەکی ژ کیتابا خودێ یان سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ل سەر بۆچوونا خۆ بینن ئەز دێ گوهێ خۆ دەمە هەوە.

ل ڕۆژئاڤایێ بێهنا موعتەصمی تەنگبوو ئینا بڕیار دا ئیمام ئەحمەد بۆ گرتیخانەیێ بێتە زڤڕاندن، ل ڕۆژا دویێ جارەکا دی هەر ب ڤی ڕەنگی وان خۆ د گەل ئیمامی جەرباند، دیسا چو پێڤە نەهات، ل ڕۆژا سییێ موعتەصمی بڕیار دا دووماهییەکێ بۆ مەسەلێ بدانت: ڕۆژ چارشەنب بوو، بیست و چاری هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا ۲۲۰ مشەختی، ئەو سێ ڕۆژ بوو ئیمام ئەحمەدی چو

نەخواری، ب رۆژێ یێ ب ڕۆژی بوو، و ب شەڤێ ل مالا والییێ بەغدایێ یێ گرتی بوو، ئیمامی زادێ وی نەدخوار چونکی دترسییا یێ حەلال نەبت! ل رۆژا سییێ دیوانا موعتەصمی یا گرێدای بوو، خەلیفەی هنارتە ب دویڤ ئیمامی ڕا، بەرێ خەلکی هەمییێ لێ بوو کانێ سوحبەت دێ ل سەر چ ڕاوەستت.. ئیمام ئەحمەد دبێژت: ((گاڤا وان ئەز بریمە نک موعتەصمی، وان ئەز د جهەکی ڕا برمە جهەکێ دی، و هەچی جهێ وان ئەز تێڕا دبرم من ددیت یێ تژی لەشکەر بوو و شیرێن وان د دەستان دا بوون، ئەز ب زۆرکەفتم، موعتەصمی گۆتە هەڤالێن خۆ: د گەل وی باخڤن، پشتی ئاخفتنا مە درێژ بووی و ئەو نەشیاین من لێڤەکەن، جارەکا دی موعتەصمی ئەز ڤەدەرکرم و گۆتە من: کانێ چاوا دلێ من ب کوڕێ من ڤەیە، وەسا دلێ من یێ ب تە ژی ڤە گوهێ خۆ بدە من، من گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین) تشتەکی ژ کیتابا خودێ یان سوننەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بۆ من بینین ئەز دێ گوهێ خۆ دەمە هەوە..)).

ل ڤێرێ عەقل د سەرێ موعتەصمی نەما، لەو ل جەلادان خوڕی: وەرنێ ب دەستان ڤە بهلاویسن.. ئەو هاتن دەستێن وی کنفکرن و هند شداندن حەتا نێزیک بوو دەستێن وی ژ گەهـ بچن، پاشی وان ئەو ب دەستان هلاویست حەتا پتر ژ بهوستەکێ ئەو ژ عەردی بلندکری. کوڕێ وی صالح دبێژت: حەتا بابێ من مری ژی -یەعنی حەتا بیست و ئێک سالان پشتی هنگی- ئەوی هەر نەخۆشییا خۆ ژ دەستێن خۆ ددیت ژ بەر هنگی دەمێ وان ئەو ب دەستان هلاویستی.

پاشی موعتەصمی بریار دا هەر زەبانییەکێ وی بێت و دو قامچییان بدانتە ئیمامی، حەتا ئەو ل گۆتنا خۆ لێڤە ببت، یان ژی ب قوتانێ بمرت.. ئەو ل دویڤ ئێک هاتن و ب کارێ خۆ ڕابوون، قامچییا ئێکێ ئیمامی گۆت: (بسم الله)، یا دویێ گۆت: (لا حول ولا قوه إلا بالله)، یا سییێ گۆت: (قورئان ئاخفتنا خودێیە و نە یا مەخلووقە) و یا چارێ گۆت: (لن یصیبنا إلا

ما كتب الله لنا).. و ب ڤی رەنگی ئیمام ما، و هەر جار موعتەصم پتر دقەهری و ل جەللادی دخوری: دەستێن وی باش بشدینن.

پشتی دەلیڤەیەکێ موعتەصم ژ سەر کورسیکا خۆ رابوو و ب نک ئیمامی ڤە چوو و گۆتێ: تێچوون بۆ تە بت، ما دێ خۆ کوژی؟! لێڤە ببە ئەز ب خۆ دێ تە ڤەکەم و بەردەم، ئیمامی گوهدارییا وی نەکر، هندەکان گازی کر: ئەی (أمير المؤمنين) وی بکوژە و خوینا د ستویێ من دا! موعتەصم زڤری سەر جهێ خۆ و فەرمان ل جەللادان کر کو دەست ب کارێ خۆ بکەنەڤە، دو سێ جاران موعتەصمی ژێ خواست ئەو لێڤە ببت، بەلێ ئەو لێڤە نەبوو، لەو موعتەصمی گۆتە جەللادێن خۆ: کی ژ هەوە دێ ئەحمەدی بۆ من کوژت؟ ئێکی گۆت: ئەز، وی گۆتێ: ب چەند قامچییان؟ وی گۆت: ب پازدە بیستەکان! موعتەصمی گۆتێ: دەست پێ بکە خودێ دەستێن تە بشکێنت!

ئەڤ جەللادێ دل ئاسن ب نک ئیمامی ڤە چوو و چەند قامچییەک دانانێ، دەمێ وان ئیمام ددا بەر قامچییان هەر بێن بێنە ئیمامی سەرێ خۆ بلند دکر و هێدی دوعا دکرن.. پشتی هنگی هندەکان پسیار ژێ کر: ئەو هنگی تە چ دوعا دکرن؟ وی گۆت: ترسا من ئەو بوو جلکێن من د بەر من دا بقەتیێن و ئەز بێ ستارە ببم، ڤێجا من دوعا ژ خودێ دکرن کو ئەگەر ئەز ل سەر حەقییێ بم ئەو من بێ ستارە نەکەت.

دەمێ جەللادی دەست ب لێدانا ئیمامی کری سێ چار قامچییەک دانانێ ئیمام دلگرتی بوو، دەستێن وی ڤەکرن و بر ئاڤ لێ کر دا هشیار ببت، پشتی ئەو هشیاربووی دەرمانەک بۆ وی ئینا و گۆتێ: ڤەخۆ و دلێ خۆ راکە دا هشێن تە بێنە سەرێ تە، وی گۆت: ئەز رۆژییا خۆ ناخۆم. بوو دەمێ نڤێژا نیڤرۆ ئیمام ب لەشێ خۆ یێ بریندار ڤە رابوو و نڤێژ کر، قازییێ موعتەصمی یاری بۆ خۆ پێ کرن و گۆتێ: خوین یا ب لەشێ تە ڤە چاوا تو نڤێژێ دکەی؟ ئیمامی گۆتێ: ما چاوا عومەری نڤێژ دکر و خوین ژ برینێن وی دزا؟

ل ڤی دەمی خەلک تێک هاتن و تێک چوون، هەمییان شیرێن خۆ ڕاکرن و هاتنە بەر دەرگەهێ موعتەصمی و گۆتن: یان دێ ئیمامی بەردەن یان دێ فتنەکا مەزن هلکەین.. هەڤالەکێ موعتەصمی ب زۆرکەفت و گۆت: ئەی (أمیر المؤمنین) ئێک ژ دویان هلبژێرە بەردانا ئەحمەدی یان فتنەکا مەزن. موعتەصم ژ گۆتنا وی ترسیا لەو هنارتە ب دویڤ ئیسحاقێ مامێ ئیمام ئەحمەدی ڕا و گۆتێ: بەرێ خۆ بدێ ما نە یێ ساخە ئەڤە من ئەو تەسلیمی تە کر، هەرە بێژە خەلکی دا ژ بەر دەرگەهی ڤەرەڤن، دەمێ خەلکی ئیمام دیتی یێ ساخە ژ نوی تەنابوون، ل بەر دەرگەهی خەلکی گۆتە ئیمامی: ئەی ئیمام تو چ دبێژی؟ ب سەرەکێ بلند و دلەکێ موکم ڤە وی گۆت: قورئان ئاخفتنا خودێیە و نە یا مەخلووقە.. ئینا خەلک ڤەرەڤین و ئەڤ ئاخفتنە ژ وی ڤەگوهاست..

وەزیرێ موعتەصمی یێ موعتەزلی گۆتە خەلیفێ خۆ: ئەڤ مرۆڤە فتنەیە، ئەگەر تو ب من بکەی دێ وی هاڤێیە د زیندانێ دا، بەلێ موعتەصمی ژ ترسێن خەلکی دا گۆت: نە نە.. وەسا نینە!

بەلێ.. مللەت ئەگەر مللەت بت مەزن دێ هزرەکێ بۆ کەن!

پشتی بیست و هەشت هەیڤان ژ گرتن و لێدانێ ئیمام زڤری مالا خۆ، بێی ژ گۆتنا خۆ لێڤە ببت، هەر چەندە وان ژ ترسێن خەلکی دا ئیمام بەردا بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن کو وان بەلایا خۆ ژ وی ڤەکر؛ چونکی هندی ژ وان هاتی وان نەخۆشی بۆ چێ دکر..

## ل سەر دەمێ واثقی:

ل سالا ٢٢٧ موعتەصم مر و کوڕێ وی واثق هاتە شوینێ، خەلکی هزرکر فتنە خلاص، بەلێ وەسا نەبوو چونکی واثق ژی مرۆڤەکێ موعتەزلی بوو، واثقی بڕیار دا: هندی ئەزێ ساخ بم چێ نابت ئەحمەد ل مزگەفتێ دەرسان بدەت یان دەرکەفتە ناڤ خەلکی، و ب ڤێ چەندێ ئیمام کەفتە ژێر مانا ب کوتەکی د مال دا (إقامە جبریە)، و وان نەدهێلا خۆ ئیمام بۆ نڤێژێ ژی

بچته مزگەفتێ، دگۆتن: دا ئەو کەسێ دی وەکی خۆ لێ نەکەت. بەلێ حەقی ملکێ ئەحمەدی ب تنێ نینە، هندەکێن دی هەبوون ب بیدعەیا موعتەزلییان نەدڕازی، و ئێک ژ وان (ئەحمەدێ کوڕێ نەصری) بوو، ئەوێ گەلەک جاران د دەرسێن خۆ دا دهاڤێته موعتەزلییان و خەلەتییا وان بۆ خەلکی ئاشکەرا دکر، لەو واثقی بڕیار دا سەرێ وی بێته ژێڤەکرن، و ل مەیدانەکا بەغدایێ بێته هلاویستن، و لەشێ وی ل سامرا هاتە هلاویستن! ئیمام ئەحمەدی د دەر حەقا وی دا دگۆت: ((خودێ رەحمێ ب ئەحمەدێ کوڕێ نەصری ببەت، چەند مرۆڤەکێ مەرد بوو، رحا خۆ پێشکێش کر!)).

نەعیمێ کوڕێ حەممادی ژی ئێک ژ وان زانایان بوو یێن کو سەرا عەقیدا دورست ل سەر دەمێ واثقی هاتینەگرتن و د گرتیخانەیێ دا مرین، هەر وەسا ئەبوو یەعقووبێ بوەیطی ئەوێ بەری نوکە ژی مە بەحسێ وی کری هاتبوو گرتن و د سجنێ ڤە وی زنجیرێن خۆ دهژاندن و دگۆت: دڤێت ئەز ب ڤان زنجیران ڤە بمرم؛ دا خودێ بزانت کو هندەک کەس هەبوون سەرا ڤێ عەقیدێ یێن مرین.

## د گەل موتەووەکلی:

پشتی واثق ژی مری و موتەووەککل ل شوینا وی بوویە خەلیفە، وی بڕیار دا ئەڤ بیدعەیە نەمینت، و ئاخفتن ل سەر نەئێتەکرن، و جارەکا دی مەزهەبێ سوننەتێ بێتە بەلاڤکرن، لەو وی ئیمام ئەحمەد بەردا و دەستویری دایێ جارەکا دی ل دەرسێن خۆ بزڤڕت و مەزهەبێ سوننەتێ یێ دورست بۆ خەلکی بێژت.. و ڤی خەلیفەی قەدرەکێ زێدە دا ئیمام ئەحمەدی و هنارتە د دویڤ ڕا؛ دا ئەو بێتە نک وی و فەرمان ل قاصدی کر کو دەه هزار دەرهەمان ژی د گەل خۆ بۆ ئیمامی ببەت، ئیمامی ئەو پارە ژێ وەرگرتن و گۆتە کوڕێ خۆ: هەڕە گازی فلانی و فلانی بکە ژ نەڤییێن موهاجری و ئەنصارییان، پشتی ئەو هاتین ئیمامی ئەو پارە هەمی دانە ڤێ و گۆتێ: ڤان دەرهەمان ببەن ل سەر فەقیرێن خۆ بەلاڤ بکەن.. کوڕێ وی صالح دبێژت: ژ وان دەه هزار دەرهەمان بابێ من

دەرهەمەکێ ب تنێ دا من! و بۆ زانین گۆرەک د پییێن ئیمامی بوو کورێ وی دبێژت: ئەو پازدە سال بوو ئەو گۆرە د پییان، و بارا پتر ژێ یا پنیکری بوو، گۆت: ئەز چوومە نک بابێ خۆ من دیت ئەو یێ دکەتە گری، من گۆتێ: تە خێرە؟ وی گۆت: ئەڤە شێست سالە من خۆ ژ ڤان پاراستی، نوکە پشتی عەمرێ من گەهشتییە دووماهییێ ئەو بۆ من بوونە بەلا!

کورێ وی دبێژت: دەمێ بابێ من چوویە نک موتەوەککلی من گۆتێ: ئەز دێ بێژمە خەلیفەی بلا خانییەکی بدەتە مە، بابێ من گۆت: هەما تو وە بێژییێ یا من و تە ژێک خلاص! و دەمێ نەخۆشی ژ سەر رابووی و دنیا ل بەر فرەهبووی گەلەک جاران وی دگۆت: ئەگەر رحا من د دەستێ من دا با ئەز دا وێ بەردەم.. و یا غەریب ئەو بوو دەمێ ئەو یێ گرتی و دهاتە جەلدەدان وی وە نەدگۆت.

ئەو ب نەخۆشییێ هاتە جەرباندن وی خۆ راگرت، و ئەو ب خۆشییێ ژێ هاتە جەرباندن دیسا وی خۆ راگرت: ﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ (ص: ٤٤).

سلاڤ ل ئەحمەدی بن رۆژا ئەو هاتییە هاڤێتن د ناڤ ئاگری دا، و رۆژا ئەو وەکی زێرەکێ زەر و صافی ژ ناڤ دەرکەفتی.. و خودێ پێش ئیسلامێ ڤە باشترین جزایێ خێرێ بدەتێ.

## بەقییێ کورێ موخەللدی
## ئەوێ علم ب کراسێ خازۆکییێ خواستی!

ل باژێرێ بەغدا، پشتی شتلا فتنێ ب دەستێن موعتەزلییان هاتییە چاندن، پاشی ب پشتەڤانیا هندەک خەلیفێن عەبباسییان ئەو شینبووی، و ڕۆژ بۆ ڕۆژ بستیکا وێ ڕابووی، و نێزیکبووی بەری ژ خۆ بدەت، زانایەکێ خودایی سۆز دا بەر سنگێ ڤێ فتنێ بگرت، و تەحەممولا هەر نەخۆشییەکێ بکەت یا کو د ڤێ ڕێکێ بگەهتێ.. ئەو زانا -وەکی بەری نوکە مە گۆتی- ئیمامێ مەزن ئەحمەدێ کورێ حەنبەلی بوو، ئەوێ پشتی هنگی ناسناڤێ (إمـام أهـل السنة) ل سەر هاتییە دانان.

ئیمامی گەلەک نەخۆشی دیتن، هاتە جەلدەدان، پاشی بۆ دەمەکێ درێژ هاتە گرتن، و پشتی ئەو ژ گرتیخانەیێ هاتییە بەردان ژی، بڕیارا دەولەتێ ئەو بوو: چێ نابت بۆ وی ئەو ل مزگەفتێ ڕوینت و دەرسێن حەدیسێ بێژت، و چێ نابت ئەو چو فەتوایان ژی بدەت، و هەر کەسەکێ بچت ل نک وی بخوینت، یان پسیارەکێ ژێ بکەت، ئەو ب توندی دێ ئێتە جزادان.. بەرانبەر ڤێ چەندێ ڕێ بۆ (موفتی و زانایێن بیدعەچی) هاتە ڤەکرن کو ئەو (حەلەقێن بەرفرەهـ) ل مزگەفتان گرێدەن، و ل سەرێن دیوانان ڕوینن، و ب رحەتی باطلێ خۆ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ کەن، یا ژ وان ڤە ئەو دێ شێن ب ڤێ چەندێ ڕۆناهییا سوننەتێ د ناڤ خەلکی دا ڤەمرینن، بەلێ یا وان ڤیای قەت و قەت ب جهـ نەهات، د ڤێ دەربارێ دا گۆتنەکا بنەجهـ ژ زانایێ مەزن ئەبووبەکرێ کورێ عیاشی دئێتە ڤەگوهاستن، جارەکێ ل سەر زەمانێ وی دیسا بیدعەچییان سەرێ

خۆ ڕاکربوو، و ئەزمانێ خۆ درێژ کربوو، هندەک کەسێن خەما سوننەتێ دلـێن وان تژیکری هاتنە نک ڤی زانایی و گازندەیەکا خۆ گەهاندێ، گۆتنێ: ل مزگەفتێ هندەک کەس یێن ڕوینشتین و خەلک یێ ل دۆر وان کۆمبووین.. مەخسەدا وان هندەک ژ (ئەهلێ بیدعێ) بوو، وی گۆت: هەچییێ بۆ خەلکی ڕوینت خەلک دێ لێ کۆم بن، بەلێ ئەهلێ سوننەتییە پشتی مرنا وان ژی شوینوارێ وان دمینت؛ چونکی ئەهلێ سوننەتێ تشتێ پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- پێ هاتی زێندی دکەن، لەو وان بارەک د ڤێ ئایەتێ دا هەیە: ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤ ﴾ (الشرح: ٤) یەعنی: ئەی پێغەمبەر ما مە ناڤ و دەنگێ تە د ناڤ خەلکی دا بلند نەکرییە؟ و ئەهلێ بیدعێ کەرب ژ وی تشتی ڤەدبت یێ پێغەمبەر سلاڤ لێ بن- پێ هاتی، لەو وان بارەک د ڤێ ئایەتێ دا هەیە: ﴿ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣ ﴾ (الکوثر: ٣) یەعنی: ئەوێ کەرب ژ تە ڤەدبن ئەی پێغەمبەر ئەو یێ بڕییە، ژ خێرێ و ژ گەهشتنا وی تشتێ وی دڤێت.

موعتەزلییێن بیدعەچی و پەشتەڤانێن وان نەیارەتییا سوننەتێ د شەخصێ ئیمام ئەحمەدی دا کر، حەتا گەهشتییە وێ دەرەجەیێ وان نەهێلا ئیمام دەرس و وەعظان ل مزگەفتێ بێژتە خەلکی، بۆ هندێ دا سوننەت بەرزە ببت، بەلێ ل وان ڕۆژێن ئەڤ بڕیارە دهاتە ب جهئینان، جحێلەکێ حەز ژ علمێ کیتابێ و سوننەتێ دکەت، ژ وەلاتەکێ گەلەکێ دویر ژ بەغدا، ل ڕۆژئاڤایا جیهانا ئیسلامی، ل وەلاتێ ئەندەلوسێ، ب لایێ ڕۆژهەلاتێ ڤە هات، ئنیەتا وی ئەو بوو حەدیسان و علمێ سوننەتێ ئێکسەر ژ دەڤێ ئیمام ئەحمەدی وەرگرت، ناڤێ وی جحێلی (بەقییێ کوڕێ موخەللەدی) بوو، پشتی قویناغەکا دویر و درێژ، ووەستیانەکا مەزن، ئەو گەهشتە بەغدا.. و پشتی ئەو گەهشتی ئێکسەر وی پسیارا بابێ عەبدللاهی ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی کر، کانێ ئەو ل کیڤەیە؟ و کەنگی ئەو ل مزگەفتێ دڕوینتە خوارێ بۆ گۆتنا دەرسێ؟

هەر ئێکێ وی پسیارا ئیمامی ژێ دکر، نیشانێن حێبەتییێ ل سەر دێمی ئاشکەرا دبوون، و هندەک جاران ئەو دا مینن دئێک و دو فوکرن، و هندەک پسیارێن غەریب ل سەر دێمێن وان ئاشکەرا دبوون، هەر وەکی وان ب بێ دەنگیا خۆ دگۆتە ئێک و دو: ئەڤە چ پسیارە ئەڤە دکەت؟ پاشی ئەو دا ژێ ڤەرەڤن هەر وەکی وی پسیارەکا حەرام کری، یان ناڤەکێ خەطەر گۆتی، حەتا جارەکێ مرۆڤەکی ب بستەیی ڤە گۆتییێ: دیارە تو نە خەلکێ بەغدایی؟ وی گۆت: نەخێر! ئەز مرۆڤەکێ غەریبم، ژ وەلاتەکێ دویر ئەزێ هاتیم، من دڤێت علمی بۆ خۆ ژ بابێ عەبدللاهی وەرگرم.. وی مرۆڤی گۆتێ: باشە، مادەم وەسایە ئەز دێ سوحبەتا ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی بۆ تە کەم، و دێ مالا وی ژی نیشا تە دەم، بەلێ هشیار بی کەس نەزانت کو من ئەو یێ نیشا تە دای!! وی گۆت: سۆز بت کەس نەزانت.. پاشی وی مرۆڤی سوحبەتا ئیمامی بۆ ڤەگێڕا، و مالا وی نیشا دا..

هەر چەندە ڤی حجێلێ ئەندەلوسی دزانی کو چوونا مالا ئیمامی ل دەمەکێ هۆسا، وەکی یاریکرنا ب ئاگرییە، بەلێ حەژێکرنا وی بۆ علمی و ڤیانا وی بۆ وەرگرتنا حەدیسێ ژ ئیمامی ئەو پالدا کو ڤێ (موخاطەرێ) بکەت، و بچتە بەر دەرێ مالا ئیمامی، گاڤا دەرگەهـ قوتای، ئیمامی ب خۆ دەرگەهـ بۆ ڤەکر..

- کەرەم کە، تە خێرە؟

وی بەرسڤا ئیمامی دا:

- ئەز کەسەکم ژ وەلاتەکێ دویر یێ هاتیم، دا داخوازا علمی بۆ خۆ ژ تە بکەم..

ئیمامی گۆتێ: بەلکی تە یێ گوهـ لێ بووی، وان چ بڕیارا دای، و ئەز دترسم ئەو نەخۆشیەکێ بگەهیننە تە..

وی گۆت: ئەز د خەما نەخۆشییا وان نینم، چ دکەن بلا بکەن؟

ئیمام ئەحمەدی گۆتێ: کورێ من! بەلکی ئەو مەنعا تە ژ ڤێ چەندێ بکەن؟

(بەقی) گۆت: ئەگەر ژ لایێ تە ڤە دەستویری هەبت، ئەز دێ ب رێکەکا وەسا ئێمە نک تە ئەو نەشێن مەنعا من بکەن!

ئیمامی گۆتێ: وێ بکە یا تو حەز بکەی..

رۆژا د دویڤ، خەلکی جحێلەکێ ب هندەک کراسێن دڕیای دیت، وەسا یا دیار بوو ژ سەر و بەرێ وی کو ئەو مرۆڤەکێ بێ خودانە، ل سەر خێر و خێراتێن خەلکی دژیت، هەر جار ل دەمەکێ رۆژێ دیار دبوو، و ب نک وی تاخی ڤە دچوو یێ مالا ئیمامی لێ، گازی دکر: خێرەکێ د گەل من بکەن، خودێ رەحمێ ب هەوە ببەت، پاشی دچوو بەر دەرگەهێ مالا ئیمام ئەحمەدی، ئیمامی دەرگەهـ بۆ ڤەدکر، بێنەکێ هەردو ل بەر دەری دمان، پاشی ئەو خازۆک دزڤڕی ڤە و دچوو غەوارە دبوو دا بێژی عەردی یێ داعویرای..

پشتی دەمەکی تەنگاڤی ژ سەر ئیمام ئەحمەدی ڕابوو، خەلیفێ عەبباسی هاتە گوهۆڕین، و خەلیفێ نوی کو موتەووەکل بوو حەز ژ سوننەتێ دکر، لەو وی بڕیار دا دووماهییەکێ بۆ وێ فتنێ بدانت یا موعتەزلییان هلکری، و ئێکەمین فەرمان وی دای ئەو بوو (ئعتبار) بۆ ئیمام ئەحمەدی بێتەدان ڤە، و حەلەقا وی یا علمی دوبارە ل مزگەفتا بەغدا بێتە گرێدان، و قەدرەکێ زێدە بۆ وی بێتە گرتن، و ب ڤی ڕەنگی (محنە) ژ سەر ئیمامی ڕابوو، و بیدعەچی ئەوێن ل بەر سیبەرا شیرێ خەلیفەی ئەزمانێ خۆ و ستویێ خۆ درێژکری، جارەکا دی ل بەرانبەر ڕۆناهییا علمێ ئیمام ئەحمەدی ڕەڤین و زڤڕینە د کونجێن خۆ یێن تاری ڤە.. و ڕۆژەکێ دەمێ ئیمام ل حەلەقا علمی ل مزگەفتێ یێ ڕوینشتی، خەبەرەک گەهشتێ، پشتی ئەو ژ دەرسێ خلاصبووی، وی گۆتە طەلەبێن خۆ: سەرەدانا نساخەکی مە یا هەی هەچییێ ژ هەوە دڤێت بلا د گەل من بێت.

ل لایەکێ بەغدا خانەک هەبوو، وەکی ئۆتێلێن مە یێن ئەڤرۆ، مرۆڤێن بیانی و ڕێڤنگ لێ دمان، د مەزەلکەکێ ڤە ژ ڤێ خانێ، جحێلەکێ لاواز و نساخ هەبوو، خودانێ خانێ د سوحبەتا وی دا حێبەتی بووبوو، ئەڤە کییە؟ و هاتییە چ؟ هندەک جاران ب جلکێن درپای وەکی وان کەسێن خواستنێ دکەن، دەردکەڤت، و هندەک جاران مەزەلکا وی یا تژی کاغەز و کتێبە! و ئەڤە چەند ڕۆژەکە ئەو هەر نەدەرکەفتییە دێ بێژی یێ نەخۆشە، و پیچ پیچە وی نەخۆشییا خۆ ژ ڤی نەفەرێ غەریب دیت.. ئێڤارییەکێ دەمێ ئەو ل خانێ یێ ڕوینشتی، وی حەرەکەکا غەریب ل بەر دەرێ خانێ دیت، مرۆڤ تێک هاتن و تێک چوون، هەر وەکی تشتەکێ نە یێ عەدەتی ل جادێ چێبوو، مرۆڤەک ب لەز هاتە ژۆر، و بەری خودانێ خانێ پسیارێ ژێ بکەت: ئەو چ قەومییە؟ وی گۆتێ: ئەڤە هات.. خودانێ خانێ هزرکر ئەو دێ بێژت: ئەڤە خەلیفەیە هات، ژ بەر وێ ئزدحاما ل سەر جادێ چێبووی، وی ب حێبەتی ڤە پسیارکر: ئەو کییە هات؟ وی گۆت: بابێ عەبدللاهی یێ بەر ب خانا تە ڤە دئێت، دێ سەرا نەخۆشەکی دەت..

ئیمام د گەل مەوکبێ خۆ گەهشتە وێ مەزەلکێ یا ئەو جحێل تێڤە ڕازای، و گاڤا ئەو گەهشتییە نک نەخۆشی، ئیمامی گۆتێ: مزگینییا خێرێ ل تە بت، بابێ عەبدررەحمانی، دوعایا من ژ خودێ ئەوە شفایێ ب رزقێ تە بکەت.. و تو دا بێژی قەدەر ل هیڤییا ڤێ دوعایێ بوو ژ بابێ عەبدللاهی، پشتی هنگی ب دەمەکێ کێم بابێ عەبدررەحمانی (بەقییێ کوڕێ موخللدی) ڕابوو سەر پییان، پشتی خودێ ب بەرەکەتا دوعایا ئیمامی شفا بۆ وی هنارتی، و دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو ئەو ل سەر دەستێ ئیمام ئەحمەدی و زانایێن دی ل بەغدا بوو ئێک ژ مەزنترین موجتەهد و زانایێن ئەندەلوسێ، و سەرهاتییا وەرگرتنا وی بۆ علمی ژ ئیمام ئەحمەدی ب کراسێ خازۆکان بوو ئێک ژ مەزنترین دەرسان بۆ هەر کەسەکێ بڤێت ببتە خودان عەزیمە و هیممەتەکا بلند د وەرگرتنا علمی دا.

یا مای بێژین: بەقی خودانێ تەفسیرەکێیە، ئیمامێ مەزن ئبن حەزم د دەر حەقێ دا دبێژت: د ئیسلامێ دا تەفسیرەکا وەکی یا بەقی نەهاتییە نڤیسین. و ئەو ئێکەمین زانا بوو فقهێ حەدیسێ ل ئەندەلوسێ بەلاڤکری، لەو فەقیهێن مەزهەبێ مالکی نەیارەتییا وی دکر، بەلێ وی دگۆتە وان: دارەکا وەسا من یا چاندی حەتا دەجال بێت کەس نەشێت وێ بینتە دەر، مەخسەدا وی فقهێ حەدیسێ بوو.

دبێژن: وی پشکداری د پتر ژ حەفتێ غەزوەیان دا کربوو، و ل سالا ٢٧٦ ل وەلاتێ ئەندەلوسێ ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

# بشرێ کوڕێ حارثی
# سەروەرێ خودێناسێن دەمێ خۆ

(بشـر الحـافی) د دیرۆکـا مـرۆڤێن خـودێ دا ناڤەکـە گەلـەک ژ وێ ڕۆژێ گەشـترە یـا هـوین ل عسـمانی دبیـنن، خودێناسـی و زوهـد ل سـەردەمێ وی گەهشتبوو نک وی، و ژ وی دەرباس نەبووبوو، و ڕۆژا ئەو مری ئیمامێ (ئەهلێ سوننەت و جەماعەتێ) ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی گـۆت: ((وی کسـێ وەکـی خۆ ل پشـت خۆ نەهێلایە..))!

پشتی نڤێژا سپێدێ وان جـەنـازێ وی ژ مزگـەفتا بەغدا دەرێخست و بـەر ب زیارەتـان ڤـە بـر، و دبێـژن: پشـتی نڤێـژا عەیشـا ژ نـوی ئـەو ژ ڤەشـارتنا وی خلاصبوون، هندی هند ئزدحام و قـەرەبالغا مرۆڤـان چێبووبـوو، زانـایێ حەدیسـێ یێ مەزن (عەلییێ مەدائنی) ئەوێ هنگی ل وێـرێ حـازر، ب هـەمی دەنگـێ خۆ گازی کـر: ((ئـەز ب خودێ کەمـە، ئەڤـە شـەرەفا دنیایێیـە گەهشـتییە وی، بـەری شەرەفا ئاخرەتێ)).

ئەڤ مرۆڤێ هە، یێ ل سەر دەستێ سەییدێ زاهدێن زەمانێ خۆ فوضـەیلێ کوڕێ عیاضی فـێری زوهدێ بووی، و ب سەر سـەرێ جونەیدێ بەغـدادی و یـێن ل مەرتەبەیا وی کەفتی، و بوویە ئێک ژ وان خودێناسان یێن هندی دنیـا هـەبت، ئوممەتا مە د ناڤ ئوممەتێن دی دا دێ شانازییێ پێ بـەت و خۆ پێ سـەربلند بینت..

ئەو زەلامەک بوو باش عەرەبی نەدزانی، و ل دەسپێکا خۆ مرۆڤـەکێ وەکـی هەر ئێکێ دی بوو، بەلکی ژ گەلەکان خرابتر ژی بوو، پاشی کەرەما خودێ ڤێـرا گەهشت، و ئەو ژ وێ نزمییێ یا ئـەو تێدا بـەر ب بلندییـەکا وەسا ڤـە بـر، کێم

کـەس دشێـن بیننه سـەر هزرا خۆ.. و کەرەم یا وەسایە د گەل وان مرۆڤـان یـێن ژ هەژی بن! ڤێجا (بشریَ حافی) یەعنی: یێ پێخواس! کی بوو، و سەرهاتیا وی د گەل زوهدێ و خودێناسیییێ چ بوو؟

کەرەم کەن دا بەر ب جیهانا وی ڤە بچین، حەتا ڤێ چەندێ بزانین..

## بشر کی بوو؟

بابێ نەصری، بشرێ کورێ حارثی، ئەوێ زانایێ مـەزن ئیمامێ ذەهەبی دبێژتـێ: (العـالم المحـدث، الزاهـد الربـاني، القـدوة، شـيخ الاسـلام) خـەلکێ گونـدەکی ژ گونـدێن (مـەرۆیێ) بـوو، دگـۆتنێ: (مابەرسـام)، و بـابێ وی یـێ شەشێ ل سەر دەستێ ئیمام عەلی هاتبوو د ئیسلامێ دا، و وی نـاڤێ خۆ کربـوو عەبدوللاهـ. بشر ل سالا (١٥٠) مشـەختی، ل گوندێ خۆ ئـەوێ دکەفتـە دەڤـەرا مەرۆیێ ل وەلاتێ خەراسانێ، یان ل باژێرێ بەغدایێ ل دویڤ گۆتنـەکێ، هـاتبوو سەر دنیایێ.

ل دەسپێکا ژیێ خۆ، و چەندەکێ ژ جحێلینیا خۆ ژی، ئـەو ژ دینـداریێ و مرۆڤێن دیندار یـێ دویـربـوو، نـەدهـاتـە سەر هزرا وی ژی کـو ئـەو ڕۆژەکـێ بـەر ب خـودێ ڤـە بـچـت، و ببـتـە ژ زەلامـێـن شـەڤێ یـێن کـو شـەڤ و نیڤشـەڤان ب موناجاتا خودێ و رکووع و سجوودان ڤە دبەنە سەری.. بـەلێ ئـەو ژ زەلامـێن شـەڤێ بـوو، و گەلـەک جـاران وی شـەڤ و ڕۆژ دکرنـە ئێـک، و خـەو ب چاڤـان نـەدکـەفت، بەلێ.. نە ژ بەر عیبادەتی و تەهەجودان، نـە.. بـەلکی بـۆ هنـدێ دا ئەو ب سەر مالـەکێ یان کاروانەکی دا بگرت، و وان بشـەلینت!!

بەلێ، کی ژ هەوە ئەوێن هەوە نـاڤێ زاهدێ مـەزن بشـرێ حـافی گوهـ لـێ بووی، باوەر دکەت کو ئەو ڕۆژەکێ ئێک ژ مـەزنترین دزێـن دەڤـەرا خۆ بـوو، یـێ نـاڤێ وی تـرس د دلـێن خـەلکی دا پەیدا دکـر؟! بشـر.. ئـەوێ شـەڤەکێ هـاتییە مال، و حەتا سپێدێ ل بەر دەری مایە ژ پێیان ڤە و هزرێن خۆ کرین، و دەمـێ سپێدێ هندەکان ژ خەلکێ مالا وی گۆتییێ: ئەو تـە خێـر بـوو شـڤێدی هـەمییێ

تو ل بەر دەری یێ ڕاوەستیای بووی و تە هـزرێن خۆ دکرن؟ وی گۆت: من هزرا خۆ د خۆ دا دکر، ئـەرێ ئـەز چمە حەتا خودێ ئـەڤ نعمەتـە د گـەل مـن کری، و بەرێ من دایە هیدایەتێ.. ئەگەر ئەز ژی وەکی فلان و فلانـی (و نـاڤێن وان ژی بشر بوون) مرۆڤەکێ کافر بامە، ئەز دا چ کەم.

ئـەڤ بشـرە، دزیکـەرەکێ ناڤـدار بـوو، پاشـی ڕۆژەک ب سـەر دا هـات (فەضلێ خودێ) ژێ گرت، و وی ڕێکا خۆ گوهاڕت ﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَـن يَشَآءُۚ ﴾ (المائدة: ٥٤) و ئـەو بـوو سـەروەرێ زاهدێن سەردەمێ خۆ، یێن هـەر جارەکا بەحسێ زوهدێ بێتەکرن، ناڤێ وی ژی دئێتە گۆتن.. دا گوهێ خۆ بدەینـە بشری چاوا بـۆ مـە بەحسـێ دەسپێکا خـۆ د گـەل زوهدێ دکـەت، و وی سـەبەبی دبێژت یێ بەرێ وی ژ ڕێکەکێ بۆ ئێکا دی وەرگێڕای..

## دەسپێکا زوهدا وی:

هەڤالێ وی ئەییوبێ عەطـار دبێژت: جارەکێ ئـەز و بشـرێ حـافی پێکڤـە ل جهەکی دچووین، دو زەلام د بەر مە ڕا بۆرین، ئێکی گۆتە یێ دی:

- بەرێ خۆ بدێ، وێ هە بشرە، هەر شەڤ هزار رکاعەتێن سوننەت دکـەت، و سێ ڕۆژان پێکڤە ڕۆژیێ دگرت، و تشتـەکی ناخوت.

گۆت: بشر ل من زڤڕی و گۆت:

- بەرێ خۆ بدێ.. چاوا ئەو تشتێ جوان بەلاڤ دکەت، و قبحەتێن مرۆڤـی ڤەدشێرت! ئەییووب، ئەز ب خودێ کەمە شەڤەکا ب تنێ ژی مـن هزار رکاعـەت نەکرینە، و جارەکا ب تنێ ژی من سێ ڕۆژی پێکڤە نەگرتینـە، بـەلێ ئـەز دێ بـۆ تە بەحسێ دەسپێکا خۆ کەم..

پاشی وی بۆ من بەحسێ جحێلینییا خۆ کر، و کانێ چاوا بەرێ وی کەفتـە زوهدێ.. کارێ وی ئەو بـوو گەلـەک جـاران ئـەو ژ بـاژێری دەردکـەفت، ل سـەرێن ڕێکـا بویسـە ددانـا، بـۆ هنـدێ دا بـێ تالعـەک بکـەفتێ، و ئـەو وی بشـەلینت،

جارەکێ ژ ڤان جاران، هەڤالەکێ وی ژ ڤان دایێ کو ئەو هەردو پێکڤە دەرکەڤن، ب رێڤە، و ل نک حەمامەکێ، وی کاغزەک ل عەردی دیت خەلکی پێ لێ ددانا، و پیس بووبوو، وی ئەو کاغەز ژ عەردی ڕاکر و بەرێ خۆ دایێ دیت ناڤێ خودێ یێ ل سەر، ئینا وی بەرێ خۆ سەرئەڤراز دا و گۆت:

- ئەی سەییدێ من! ناڤێ تە ل ڤێرێ یێ هاڤێتییە، و خەلک یێ پێ لێ ددانت!

پاشی وی ئەو کاغەز داقوتا، و پاقژکر، بشر دبێژت:

- من ل سەر دارێ دنیایێ دەرهەمەکێ ب تنێ هەبوو، ئینا ئەز ب نک دکانا عەتارەکی ڤە چووم، و من ب هندەک بێنا خۆش ب وی دەرهەمی کڕی و ب وی جهی دا کر یێ ناڤێ خودێ ل سەر، پاشی من ئەو کاغەز بر دانا جهەکێ پاقژ.. پاشی ئەز چوومە نک هەڤالێ خۆ.

و ڕۆژا د دویڤ دا، دەمێ لێ بوویە سپێدە، ئەو چوو نک هەڤالەکێ خۆ یێ شۆلێ شیشێ دکر، گاڤا هەڤالێ وی ئەو دیتی، گۆتێ:

- برا، ب خودێ شڤێدی من خەونەکا وەسا خۆش یا ب تەڤە دیتی، چو خەونێن ژ وێ خۆشتر من نەدیتینە.. و ئەز نابێژمە تە ئەو خەون چیە حەتا تو نەبێژیە من کانێ تە چ کارێ باش ڤان ڕۆژان کرییە.

بشری گۆتێ:

- مانێ تو من دنیاسی، ب خودێ تشتەکێ باش من نەکرییە.. کارەک تێ نەبت، حال و مەسەلێن من و کاغزەکێ ئەڤەنە..

و وی سەرهاتییا خۆ یا وێ ئێڤارا چووی بۆ ڤەگێڕا، ئینا ڤەهالێ وی سەرێ خۆ هژاند و گۆت:

- هەما ئەوە و چو ددی نە! شڤێدی من د خەونێ دا دیت، هەر وەکی دەنگەک دهاتە من، و دگۆتە من: بێژە بشری، ئەو ناڤێ مە ژ عەردی ڕادکەت

دا کەس پێ لێ نەدانت، ئەم ل دنیایێ و ئاخرەتێ ناڤێ وی دێ بلندکەین، و دلێ وی وەسا دێ پاقژ کەین کانێ چاوا وی ناڤێ مە پاقژ کر.

ئەڤ خەونە یا هەڤالێ وی ب وی ڤە دیتی، و د هندەک گۆتنان دا هاتییە کو وی ب خۆ ئەڤ خەونە ل وێ شەڤێ ب خۆ ڤە دیت، بوو ئەگەرا هندێ رێکا بشری بێتە ڤەگوهاستن، و بەرێ وی بێتە ڤەگێران.. و ژ وێ رۆژێ پێڤەتر، خەلکی بشرێ دزیکەر ژ بیرکر، و وان بشرەکێ دی نیاسی، ئەو بشرێ بوویە سەروەرێ زاهدێن بەغدا ل سەر دەمێ خۆ.

**بشرێ زاهد:**

پشتی بشری رێکا خۆ وەرگێرای، ئێکەمین تشت وی کری ئەو بوو وی بارێ خۆ ژ زانینا علمێ شەرعی زێدەکر، وی قەستا حەلەقێن علمی ل مزگەفتان کر، و ل سەر دەستێ زانا و زاهدێن مەزنێن سەردەمێ خۆ، خۆ فێری علمی و عەمەلی کر، و ژ وان زانا و زاهدێن مەزن یێن وی خۆ ڤێرا گەهاندی: فوضەیلێ کورێ عیاضی، و عەبدللاهێ کورێ موبارەکی، و گەلەکێن دی.

تشتێ بشر ژ ڤان جوداکری ئەو بوو بشری خۆ ب بەلاڤکرنا علمی، و دانا دەرسان، و ریوایەتێ ڤە موژیل نەدکر؛ چونکی وی ژ بەر زوهدێ و ترسا وی یا زێدە ژ خودێ خۆ ل وی مستەوایی نەددیت (سەیدا) بت، و هزر دکر (سەیدابوونا مرۆڤی) ئەگەر مرۆڤ ئەو نەبت یێ خودێ خێرا وی ڤیای، دێ ئێکا هند ژێ چێ کەت ئەو زێدە د خۆ بگەهەت، و رەنگەکێ خۆمەزنکرنێ د دلی دا پەیدا کەت، مرۆڤەکی جارەکێ پسیارا حەدیسەکێ ژێ کر، ئینا وی گۆت:

- ئەگەر پسیارکرنا تە بۆ دنیایێ بت، پسیار نەکە، و ئەگەر بۆ ئاخرەتێ بت، مە ریوایەت کرییە کو ((ملیاکەت عەمەلێ وی مرۆڤی یێ ب کارێ خۆ موعجب بت، بلند دکەت، حەتا ئەو وی دبەتە نک خودێ، و خودێ دبێژت: وی بهاڤێنە د (سججینێ) دا، چونکی ئەو کارەکە وی نە بۆ من کرییە)).

ل سەر ڤی بناخەیی وی خۆ ژ حەدیسێ و ریوایەتێ ددا پاش، و نەخاسم ل وی دەمی هندەک (طەلەبێن علمی) پەیدا بووبوون، مەدحە بۆ خۆ ب زێدەکرنا ریوایەتان دکر، ئەگەر نە.. بشری گەلەک جاران دگۆت: ئەز تشتەکی باشتر نابینم ژ داخوازکرنا علمی، ئەگەر ئەو بۆ خودێ بت.

ئەو رێبازا بشری د زوهدێ دا بۆ خۆ دانای، یا ئاڤاکری بوو ل سەر چەند بناخەیەکان، **ئێک** ژ وان ئەو بوو تشتێ دلێ وی چووبایێ، و ئەو پێ حەسیابا کو نەفسا وی پێ کەیفخۆش دبت، وی خۆ ژێ ددا باش.. دگۆت: نەفس گاڤا تێربوو و خۆشیێن خۆ هەمی دیتن، بەطران دبت، و هەر گاڤەکا نەفس بەطران بوو، بەرێ خودانێ خۆ دێ دەتە هیلاکێ. ئەو چەند سال بوو وی هند خوارن نەخوار بوو کو تێر ببت، و پاریەکێ زێدەتر ژ هندێ کو ئەو خۆ پێ بگرت، نەچوو بوو دەڤێ وی، رۆژەکێ هندەک مرۆڤان گۆتە ئیمامێ مەزن ئەحمەدێ کورێ حەنبەلی:

- بۆ مە بەحسێ تەقوایێ بکە..

ئیمامی گۆت:

- (أستغفر الله) ئێکێ وەکی من یێ هندێ نینە بەحسێ تەقوایێ بکەت، ئەز ژ فێقییێ بیستانێن بەغدایێ دخوم، ئەگەر بشر با ئەو دا ب کێر ئێت بۆ هەوە بەحسێ تەقوایێ بکەت؛ چونکی وی ئەو نەدخوارن..

هەڤالێ وی حەمزەیێ بەزاز دگۆت: چی زاهدێ من دیتی دهاڤێتە دنیایێ و ژێ دخوار، بشرێ کورێ حارثی تێ نەبت، وی دهاڤێتێ و ژێ درەڤی.

خۆ د مەسەلا علمی ژی دا، جارەکێ هندەکان گۆتێ: تو حەدیسان ریوایەت ناکەی؟ وی گۆت: دلێ من دچتێ هندەک جاران ئەز وان ریوایەت کەم، بەلێ گاڤا دلێ من چوویێ، ئەز خۆ بێ دەنگ دکەم.

**بناخەیێ دوییێ** یێ بشری رێبازا خۆ یا زوهدێ ل سەر ئاڤاکری ئەو بوو چو جاران وی دلێ خۆ نەدبرە تشتەکی یێ د دەستێ خەلکی دا هەی، لەو هەر گاڤ ئەو ژ وان یێ بێ منەت بوو، خەلک یێ موحتاجی دینێ وی بوو، و ئەو یێ موحتاجی دنیایا وان نەبوو، لەو ئەو ب سەر سەرێن وان کەفتبوو، رۆژەکێ زەلامەکی گۆتێ:

- بابێ نەصری، خەلک چەند حەز ژ تە دکەن!

هەر وەکی وی ب ڤێ چەندێ خۆش نەبوو، لەو گۆتێ:

- حەز ژ تە ژی دکەن، ئەگەر تە بڤێت..

گۆت: چاوا؟

وی گۆتێ:

- ئەو تشتێ د دەستێن وان دا هەی بۆ وان بهێلە، ئەو دێ حەز ژ تە کەن..

مرۆڤەک ل وێرێ یێ روینشتیبوو، گۆت: من گوهـ ل ئسماعیلێ کورێ عەبدللاهی بوویە، دگۆت: من گوهـ ل نافعی بوویە، وی ژ عەبدللاهێ کورێ عومەری گوهـ لێ بوویە، دبێژت: زەلامەکی گۆتە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- کارەکی نیشا من بدە، ئەگەر ئەز وی بکەم، خودێ ل عەسمانی حەز ژ من بکەت و خەلک ل عەردی.. گۆت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ((دلێ خۆ نەبە دنیایێ خودێ دێ حەز ژ تە کەت، ودلێ خۆ نەبە وی تشتێ د دەستێ خەلکی دا خەلک دێ حەز ژ تە کەن)). گۆت: گاڤا من ئەڤ حەدیسە بۆ وی گۆتی، کەیفا وی گەلەک هات، کو گۆتنا وی وەکی گۆتنا پێغەمبەری دەرکەفتی.

**بناخەیێ سێیێ** د زوهدا بشری دا ئەو بوو تشتەک وی ژ بەر خەلکی نەدکر، و کانێ ئەو ل نک خەلکی یێ چاوا بوو، دەمێ ئەو یێ ب تنێ ژی، ئەو هەر یێ وەسا بوو، هەڤالەکێ وی دبێژت: جارەکێ ئەز چوومە د مزگەفتێ ڤە،

من دیت ئەو ب تنێ ل وێرێ بوو، نڤێژ دکر و سەرێ وی د سوجدێ دا بوو، من خۆ نێزیکی وی کر دا بزانم کانێ ئەو چ دبێژت، من گوهـ لێ بوو وی دوعایەک دکر و دگۆت: ((یا رەببی تو دزانی و تو یێ ل سەر عەرشێ خۆ کو فەقیری ژ زەنگینییێ خۆشتڤیترە ل نک من، و تو دزانی و تو یێ ل سەر عەرشێ خۆ کو بێ ناڤی ژ ناڤدارییێ خۆشتڤیترە ل نک من، و تو دزانی و تو یێ ل سەر عەرشێ خۆ کو ئەز حەژێکرنا ئێکێ دی ب سەر حەژێکرنا تە نائێخم)) گۆت: هنگی ئەز گریم.. و گاڤا دەنگێ من چوویێ و ئەو ب من حەسیای، وی گۆت: ((و تو دزانی و تو یێ ل سەر عەرشێ خۆ کو ئەگەر من زانیبا ئەڤە یێ ل ڤێرێ من وە نەدگۆت)).

هەڤالەکێ وی دبێژت: جارەکێ نیڤرۆ ئەو هاتە نک من ل دکانێ، فێقیییەکێ خۆش و رطاب ل بەر سنگێ من بوون، وی بەرێ خۆ دایێ، من زانی کو دلێ وی یێ دچتێ، من گۆتێ: ئەگەر تو حەز بکەی هندەکێ ژێ بخۆ.. وی گۆت: ب خودێ تشتەکێ خەلکی ژ من زانی کو ئەز ناکەم، ئەز وی د پشت وان ڕا ناکەم!

**بناخەیێ چارێ** ئەو بوو بشر چو جاران ژ (مەکرا) خودێ یێ پشتڕاست نەبوو، و ژ نەفسا خۆ یێ ئەمین نەبوو، و غورروور بۆ وی ب وان ناڤ و دەنگان چێ نەدبوو یێن وی د ناڤ خەلکی دا هەین، ڕۆژەکێ بشر ل کۆلانەکێ دچوو، مرۆڤەکێ سەکران ئەو دیت، یێ سەکران ب نک وی ڤە چوو و کەیفا خۆ پێ ئینا و خۆ تێ وەرکر و ماچی کر، و گۆت: سەییدێ من، بابێ نەصری، بشر! و بشری ئەو ژ خۆ نەدا پاش، حەتا ئەو ب خۆ چووی، بشر لێ زڤڕی و چاڤێن وی تژی ڕۆندک بوون، و گۆت: زەلامەک حەز ژ ئێکی دکەت، ژ بەر خێرەکێ یا ئەو هزر دکەت کو ل نک وی هەیە، بەلکی ئەو خلاص ببت و یێ ئەو حەز ژێ دکەت خلاص نەبت، چونکی ئەو نزانت کانێ حالێ وی چییە.

و ئێک ژ دوعاییێن گەلەک جاران وی دکر ئەڤە بوو: ((یا رەببی، ئەگەر تە د دنیایێ ناڤ و دەنگێن من بەلاڤ کرین، دا ل ئاخرەتێ شەرما من ببەی، تو وان ناڤ و دەنگان ژ من بستینە)).

**هندەک گۆتنێن وی:**

- ئەگەر رۆژ هەمی بێن حەتا بگەهنە بەر دەرێ بەغدا، و زەلام ب شیرێ خۆ بەر سنگێ وان بگرت، و ئەو ب تنێ وان بزڤرینتە وی جهی یێ ئەو ژێ هاتین، فایدێ وی ناکەت ئەگەر ئەو هندی سەرێ دەرزیکێ صەحابییەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- بێ بها بکەت. مەعنا: بشر ل وێ باوەرێ بوو کو کارێ چاک، خۆ ئەگەر جیهادا د رێکا خودێ ژی دا بت، چو مفایی ناگەهینتە خودانێ خۆ، ئەگەر هات و عەقیدەیەکا پیس وی هەبت.. و صەحابی ئەون یێن دین د رێکا وان را گەهشتییە مە، و هەر کەسەکێ د باوەری و عەدالەتا وان دا بکەفتە شکێ، یان بهایێ وان کێم بکەت، مەعنا ئەو یێ شکێ بۆ مە د دینی دا چێ دکەت، و ئەڤە مەزنترین تاوانە ئەو دکەت.

- موحەممەدێ کورێ نوعەیمی دبێژت: جارەکێ ئەز چوومە نک بشری دەمێ ئەو یێ نساخ و من گۆتێ: شیرەتەکێ ل من بکە، وی گۆت: ل ڤی خانی مێریەکا هەی دندکان ل هاڤینێ کۆم دکەت؛ دا ل زڤستانێ بخوت، رۆژەکێ دەمێ دندکەک د دەڤی دا، چیچکەک هات خۆ لێ دا و ئەو ب دندک ڤە بر، ڤێجا ئەو نەگەهشت نە وان دندکان بخوت یێن وێ کۆمکرین، و نە ئەو هیڤی ب دەست خۆ ڤە ئینا یا وێ رادهێلا.. من گۆتێ: هێشتا، وی گۆت: تو چ دبێژی بۆ وی یێ مالا وی قەبر بت، و رێکا وی پرا صیراطێ بت، و لێ زڤرینا وی قیامەت بت، و پسیارکەرێ وی خودێ بت، ڤێجا ئەو نەزانت دووماهییا وی دێ بەحەشت بت دا کەیفا وی بێت، یان دێ جەهنەم بت دا ئەو ب خەم بکەڤت، ڤێجا خەما وی چەند دێ یا درێژ بت، و موصیبەتا وی چەند دێ یا مەزن بت.

- و جارەکێ وی دەستێ خۆ ب نک خەلیفەی ڤە درێژ کر و گۆت: چی گاڤا ئەڤە فتنە نەبت، خەلک چو فتنان نابینن.

- و ئەو د گۆتنەکا خۆ دا بەحسێ زانا و قورئانخوینان دکەت، و دبێژت: ئەو ب دو سالۆخەتان یێن چووینە هیلاکێ: ب غەیبەتێ، و ب خۆ موعجبییێ.

- د شعرەکا خۆ دا ئەو بەحسێ خەلکێ زەمانێ خۆ دکەت، ئەوێن حەز ژ تێکەلییا خەلکی دکەن، و دبێژت:

يا من يسر برؤية الإخوان
مهلا أمنت مكائد الشيطان
خلت القلوب من المعاد وذكره
وتشاغلوا بالحرص والخسران
صارت مجالس من ترى وحديثهم
في هتك مستور وخلق قران

- د گۆتنەکا دی دا ئەو دبێژت: هندەک مرۆڤ هەنە پشتی مرنا خۆ ژی حەز ژ ریمەتییێ دکەن، دەمێ حەز دکەن گەلەک مرۆڤ ل سەر جەنازەیێ وان حازر بین.

ل سالا (٢٢٧) ل باژێرێ بەغدا زاهدێ مەزن بشرێ حافی مربوو. و گاڤا خەبەرێ مرنا وی گەهشتیبە ئیمام ئەحمەدی، وی گۆت: ئەو ژ وان بوو یێن صەبرا مرۆڤی پێ دهات.. و د گەل جەنازێ وی چوو سەر زیارەتان.

یا مای بێژین: دبێژنە بشری (الحافی)؛ چونکی ل جحێلینیا خۆ دەمێ ئەو د چوو علم وەردگرت، ژ بەر زوهدا خۆ ئەو یێ پێخواس بوو.. و دبێژن: جارەکێ ئیمام ئەحمەدی گۆت: ئەگەر وی پێلاڤەک کربایێ، و حالێ خۆ ل بەر خەلکی ڤەشارتبا بۆ وی چێتر بوو!

# یەحیایێ کوڕێ موعاذی
# سەییدێ واعظێن زەمانێ خۆ

(واعظ) ئەو کەسە یێ ب کارێ (وەعظی) ڕابت، و (وەعظ) پەیڤەکا عەرەبییە بۆ کارێ بیرئینانا ل خێر و باشییێ دئێتە گۆتن، ئەگەر هات و ئەو د کراسێ شیرەتێ دا هاتە پێشکێشکرن. و ئاشکەرایە کو هندی ئەو کراسێ (وەعظ) پێ دئێتە بەرچاڤکرن یێ تازەتر و خوشکۆکتر بت کار و تەئیسرا وی ل سەر گوهداران دێ باشتر و پتر بت، و ئەو بەرهەمێ پێڤە دئێت ژی دێ یێ ب تامتر بت، و پتر بەرەکەت دێ تێدا بت.

سەرهاتییا مرۆڤێن خودێ د گەل (وەعظی) ژی سەرهاتییەکا تایبەت و خودان تامەکا خۆش و بێ هەڤتایە؛ ژ بەر کو مانا وان د گەل خۆشتڤی د خەلوەیێن شەڤ و نیڤشەڤان دا، و موناجاتا وان یا درێژ ب وی ڕا شرینییەکا وەسا یا دایە ئاخفتنێن وان مرۆڤ شرینییەکا وەکی وێ د گۆتنا چو کەسێن دی دا نابینت، تو دێ بێژی ئەو ب ئیلهام بۆ وان یا هاتییەدان، کانێ چاوا گۆتنێن پێغەمبەران -سلاڤ لێ بن- ب وەحی هاتینەدان.

مرۆڤێن خودێ گۆتنێن خۆ بێ (چێکرن) و (خۆوەستاندن) دبێژن، ئەو ل پەیڤێن بریسقەدار ناگەڕێن، و ئاخفتنان وەک ئەدیب و شاعران نائێخنە بەرێک، و بەرێ وان ل هندێ نینە ئەو ڕستەیێن خودان ئاواز و لێکئینان دورست بکەن، د گەل هندێ ژی ئەو گۆتن و حیکمەتێن وەکی دوڕ و گەوهەران ژ دەڤێن وان دەردکەڤن چو گەوهەرییێن بسپۆڕ ژی نەشێن چێکەن، و ئەڤە ئەو قەنجییە یا خودێ ددەتە وی یێ وی دڤێت: ﴿ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ ﴾ (المائدة: ٥٤).

ڤێ جارێ ژڤانێ مە د گەل ناڤەکێ گەشە د جیهانا وەعظی دا، ئەو ل سەر دەمێ خۆ ئیمامێ واعظێن ئوممەتێ بوو، دبێژن: ئەو د ناڤ واعظان دا وەکی ئیمامێ شافعییە د ناڤ فقهزانان دا، یان ئبن تەیمیەی د ناڤ زانایان دا، یان موتەنەببی د ناڤ شاعران دا.. بەلێ تشتێ غەریب ئەوە کتێبێن (توراثێ ئیسلامی) ئەوێن بەحسێ ژین و سەرهاتییا زانا و ناڤدارێن مە دکەن، د گەل گەلەکییا وان، و پویتەپێکرنا وان ب هویر و ماران ژی، وان ژین و سەرهاتییا ڤی ئیمامێ مەزن ب فرەهی بۆ مە نەگۆتییە، هندەک تشتێن کێم تێ نەبن یێن تێنکاتییا مرۆڤی پێ نەشکێت، هەر وەکی دیرۆکێ دڤێت هەما ڤی ئیمامی ب تنێ ب رێکا وان گەوهەران ب مە بدەتە نیاسین یێن ژ دەڤێ وی ڤەپەشین دەمێ وی وەعظ ل خەلکی دکر!

هەر ئێکێ بەحسێ وی کر بت بەری هەر تشتەکی یێ گۆتی: ئەو واعظێ زەمانێ خۆ بوو، و خودانێ هندەک گۆتنێن (بێ نەظیر) بوو.. دیرۆکنڤیس د دەر حەقا وی دا دبێژن: ل زەمانێ وی کەسێ وەکی وی نەبوو، وی ئەزمانەکێ شرین د هیڤی و رجایێ دا هەبوو، و گۆتنەکا تایبەت د عیرفانێ دا.. ناڤێ وی یێ دورست یەحیایێ کورێ موعاذێ رازی بوو، د بنیاتێ خۆ دا ئەو مرۆڤەکێ فارسی بوو، و خەلکێ باژێرێ (رەی) بوو، لەو دبێژنێ: رازی.

ئەو سێ برا بوون هەر و سێ زاهد بوون: یێ مەزن ئیسماعیل بوو و یێ ناڤێ ئەوێ ژ هەمییان پتر ناڤداربووی یەحیا بوو، و یێ بچویک ئیبراهیم بوو.. تشتێ کتێبێن دیرۆکێ و ژیاننامەیێن ناڤداران د دەر حەقێ ژیانا وی دا دبێژن ب تنێ ئەوە: ئەو ژ باژێرێ رەی چووبوو نیسابۆرێ و ل وێرێ ئاکنجی بووبوو، حەتا ل وێرێ مری.

و دبێژن: دەمەکی وی هەڤالینییا زاهدێ ناڤدار ئەبوو یەزیدێ بەسطامی کربوو، و ژ وی فێری زوهد و تەقوایێ بووبوو، هەر وەسا ئەو دەمەکی هاتبوو باژێرێ بەغدا، و زاهد و عارفێن بەغدا یێن وی دەمی وەکی: جونەیدی و

خەلکێ طەبەقەیا وی هەمی لێ کۆمبوون، و وەکی شاگردەیان ل بەر دەستی روینشتن، وان کورسییەک بۆ وی دانا دا ئەو ل سەر روینت و وەعظی ل وان بکەت.

دەمەکی ئەو ژ نیسابۆرێ چووبوو بەلخێ ، و زەمانەکی ل وێرێ ژی ئاکنجیبوو، بەلێ ئەو پشتی هنگی دوبارە زڤری نیسابۆرێ و ل وێرێ ما حەتا مری ل ژییێ چل و ئێک سالییێ، ل سالا ٢٥٨ مشەختی.

ژ ڤان زانینێن کێم پێڤەتر، کتێبێن دیرۆکێ چویێ د دەر حەقا ژیانا وی دا بۆ مە ناڤەگێرن، بەلێ ئەو هژمارەکا نە یا کێم ژ گۆتنێن وی یێن تژی حیکمەت ڤەدگێرن، یێن وی د وەعظێن خۆ دا پێشکێشی خەلکی دکرن، کو ب راستی هەر ئێک ژ وان د گەل کورتییا کۆمەکا مەعنایێن مەزن د ناڤ خۆ دا هل دگرن، هەر وەسا هندەک کتێب ژی ل سەر ناڤێ وی چاپبووینە، د تژینە ژ گۆتنێن وی یێن تێ (حیکمەت)، وەکی کتێبا (جواهر التصوف).

ل ڤێرێ مە دڤێت دەمەکی خۆ بدەینە بەر سیبەرا هندەک گۆتنێن وی یێن دیتنا مرۆڤێن خودێ بۆ کۆمەکا مەسەلەیێن گرنگ بۆ مە بەرچاڤ دکەن..

ل بەراهییێ مە دڤێت بێژین: یەحیایێ رازی ل وێ باوەرێ بوو کو هەر مرۆڤەکێ دلێ وی تووشی ئێک ژ سێ دەردان بت، ل هیڤییێ نەبە جارەکێ (حیکمەت) ل سەر ئەزمانێ وی بگەرێت، ئەو هەر سێ دەرد ژی ئەڤەنە: (خەما رزقی، حەسویدییا مرۆڤان، و ڤیانا ناڤ و دەنگان)، پشتی هنگی نە هەر کەسەکێ د ناڤ خەلکی دا رابوو و وەعظەک کر دێ یێ هەژی هندێ بت مرۆڤ ناڤێ (واعظ) ل سەر بدانت، بلا ئاخفتنا وی یا لێکدای ژی بت؛ چونکی مرۆڤ خودێ ب دیتنا یەحیایێ کورێ موعاذی وەکی مرۆڤێن دنیایێ هند بەرێ خۆ نادەنە پەیڤێ هندی بەرێ خۆ ددەنە مەعنایێ، و حەتا مەعنایا پەیڤێ جهێ خۆ د دلێن خەلکی دا بکەت، و کاری ل ژیانا وان بکەت، دڤێت ئەو ب گۆتنەکا دورست یا ژ دەڤەکێ فەصیح و رەهوان دەردکەڤت، بێتە

پێشکێشکرن، دورستییا بێ فەصاحەت وەکی فەصاحەت بێ دورستی تشتەکێ سەقەتە، لەو بەرهەمەکێ باش پێڤە نائێت، یەحیایێ کورێ موعاذی ئەوێ شارەزا و خودان خیبرەت د کرنا وەعظی دا دبێژت: ئاخفتنا نازک، ئەوا ژ بەحرەکا کویر دەرکەڤت، کو دلە، و ب ئەزمانەکێ دلۆڤان دەربڕین ژێ دئێتەکرن، ئەوە یا خۆ ل دلێ خەلکی ددەت.. ئەو گۆتنا زڤر بت، یا ب ئەزمانەکێ نەرم نەئێتە گۆتن، و دەربڕینێ ژ کویراتییا دلی نەکەت، نابتە وەعظەکێ سەرکەفتی، ڤێجا بلا مەلا و واعظێن مە ڤێ دەرسێ ژ یەحیایێ واعظ وەرگرن!

پشتی هنگی ڕاستە وەعظ بیرئینانە بۆ مرۆڤێ غافل، و هشیارکرنە بۆ کەسێ نڤستی، بەلێ دڤێت واعظ کارێ خۆ یێ سەرەکی نەکەتە ئەو بێژتە خەلکی دڤێت هوین دنیایێ ب ئێکجاری ژ دلێن خۆ بهاڤێژن، و لێڤێن هەوە ب تمامی ژ کرنژینێ سل ببن، و ناڤچاڤێن هەوە ب شەڤ و ڕۆژ دگری بن.. ئەڤە نە ئەو ڕێکە یا ئیسلام پێ هاتی.. ڕۆژەکێ زەلامەکی گۆتە یەحیایێ کورێ موعاذی: ئەز دبینم تو حەز ژ دنیایێ دکەی؟ هەر وەکی وی ب ڤێ ڕەخنەیا خۆ دڤیا بێژتە ئیمامی: ئەگەر تو ژ زەلامێن ئاخرەتێ بی، دڤێت تو حەز ژ دنیایێ نەکەی.. پشتی بێنەکێ ئیمامی گۆت: کانێ ئەوێ پسیارا ئاخرەتێ دکر؟ وی زەلامی گۆتێ: ئەڤە ئەزم. وی گۆتێ: بێژە من: ئەرێ مرۆڤ ب طاعەتی یان گونەهێ ئاخرەتێ ب دەست خۆ ڤە دئینت؟ وی گۆت: ب طاعەتی. ئیمامی گۆتێ: ئەرێ ب ژیانێ یان مرنێ مرۆڤ دگەهتە طاعەتی؟ وی گۆت: ب ژیانێ. ئیمامی گۆتێ: ئەرێ ژیان ب قویتی بەردەوام دبت یان ب تشتەکێ دی؟ وی گۆت: نەخێر! ئەو ب قویتی و خوارنێ بەردەوام دبت. ئیمامی گۆتێ: باشە بێژە من: قویت ژ دنیاییێیە یان ئاخرەتێ؟ وی گۆت: نە، ئەو ژ دنیاییێیە. ئیمامی گۆتێ: باشە چاوا ئەز حەز ژ وێ دنیایێ نەکەم یا ئەز قویتێ خۆ ژێ وەردگرم، ئەو قویتێ ژیانێ ددەتە من، ئەو ژیانا ئەز طاعەتی پێ ب دەست خۆ ڤە دئینم، ئەو طاعەتێ ئاخرەتێ دگەهینتە من؟!

ب ڤی ڕەنگی ئیمامێ واعظان یەحیایێ کوڕێ موعاذی ئەو مرۆڤ بێ دەنگ کر.. بەلێ مرۆڤێن خودێ دەمێ ژ خەلکی دخوازن ئەو دنیایێ نەکەنە د دلێ خۆ دا، ئارمانجا وان ئەوە ئەو ڕێکێ نەدەنە دنیایێ کو ئەو هەڤرکییا ئاخرەتێ د دلێن وان دا بکەت، یان حەژێکرنا وان بۆ دنیایێ ب سەر هەر حەژێکرنەکا دی بکەڤت، یەحیا د گۆتنەکا خۆ دا شیرەتێ ل گوهدارێ خۆ دکەت و دبێژتێ: ((دنیایێ بهایێ خۆ ل نک خودایێ خۆ نینە و ئەو یا وییە، ڤێجا بلا وێ بهایێ خۆ ل نک تە ژی نەبت و ئەو نەیا تەیە)) و دەمێ ئەو دبێژت: بلا دنیایێ بهایێ خۆ ل نک تە نەبت، مەعنایا وێ ئەوە بلا ڤیانا وێ دلێ تە کۆرە نەکەت، چونکی ((دینێ تە دێ مینت دڕیای و پرتپرت هندی ڤیانا دنیایێ دلێ تە د ناڤ خۆ دا بگرت)).

د گۆتنەکا دی دا ئیمام دبێژت: ((ئەز فەرمانێ ل هەوە ناکەم هوین پشت بدەنە دنیایێ، بەلێ ئەز فەرمانێ ل هەوە دکەم کو هوین پشت بدەنە گونەهان؛ چونکی پشتدانا دنیایێ کارەکێ قەنجە، و پشدانا گونەهان کارەکێ فەرە، و هەوە پتر هەوجەیی ب کرنا کارێ فەرە هەیە ژ کرنا کارێ قەنج)).

تشتێ ژ هەمییێ پتر یەحیایێ کوڕێ موعاذی ژێ دترسیا، و پێتڤییە هەمی زانا و واعظ گەلەک ژێ بترسن، ئەوە گۆتنا وان بۆ خەلکی و د ناڤ وان دا یا باش بت، و کارێ وان دەمی دمیننە ب تنێ یێ خراب بت، ما نە موصیبەتەکا مەزنە مرۆڤ خۆ ب وی ئاگری بسۆژت یێ خەلک ل بەر ڕۆناهییا وی ڕێکا خۆ دبینن!

جارەکێ یەحیایێ کوڕێ موعاذی هاتە باژێرێ شیرازێ، قەستا مزگەفتێ کر، گاڤا خەلکی ئەو دیتی لێ کۆمبوون و کورسییەک بۆ وی دانا و گۆتنێ: وەعظەکی ل مە بکە.. دەمێ وی ئەو قەدەر مرۆڤ ل دۆر خۆ دیتین، بەرێ هەمییان ل دەڤێ وی کانێ دێ چ بێژت، وی سێ بەیتێن شعرێ ب عەرەبی بۆ وان گۆتن:

مـواعـظ الـواعـظ لن تقبلا حـتـى يـعـيـهـا لـبه أولا
يا قوم من أظلم مـن واعـظ خالف ما قد قاله فى الملا
أظـهـر بـيـن الـناس إحسانـه وبـارز الـرحـمـن لـمـا خلا

پاشى دلێ وى هاتەگرتن، و كورسيكێ دا كەت..

و مەعنايا ڤان مالكان ئەڤەيە: وەعظێ واعظى ژ لايێ خەلكى ڤە نائێتە قەبويلكرن، حەتا ئەو ب خۆ ب دلێ خۆ تێ بگەهت و بزانت كانێ وى چ گۆت، گەلى مرۆڤان! كى ژ وى واعظى زالمترە يێ ب كارێ خۆ موخالەفا وێ گۆتنێ بكەت يا ئەو د ناڤ خەلكى دا دبێژت؟ دەمێ ئەو د ناڤ مرۆڤان دا ئەو تشتێ باش ژ خۆ ئاشكەرا بكەت، و گاڤا ما ب تنێ ئەو وى كارى بكەت يێ هەڤڕكييا خودايێ وى تێدا؟

ئەرێ ما ئەو واعظێ ب ڤى ڕەنگى بت، ژ وان منافقان نابت يێن ڕۆژا قيامەتێ ئێكەمين جار ئاگرێ جەهنەمێ ب وان دئێتە هلكرن؟ ئەى يەحيا تو دێ چ بێژييە خودايێ خۆ ئەگەر تو ئێک ژ ڤى ڕەنگێ مرۆڤان بى، بلا خەلک ب تە نەحەسيينن ما خودێ ژى ب تە ناحەسييێت؟ گاڤا ئەڤ هزرە هاتييە سەر دلێ وى، هاتە بەر چاڤێن وى ڕۆژا قيامەتێيە و زەبانى يێن هاتين دا وى ببەن بهاڤێنە د جەهنەمێ دا، هنگى دلێ وى بۆرى، و ئەو د كورسيكێ دا كەت!

دەردێ دى يێ كارێ مرۆڤێ واعظ پويچ دكەت، ئەوە ئەو ب كارێ خۆ مەزنى و ناڤدارييێ بخوازت، و حەز بكەت خەلک وى ب پێش خۆ بێخن، و جهێن بلند بدەنێ، ژ بەر ڤێ چەندێ يەحيايێ كوڕێ موعاذى دگۆت: ((ئەو كەس ئيفلەحێ نابينت يێ بێنا مەزنييێ ژێ بێتە سەحكرن)) و مەخسەدا وى ب ڤێ گۆتنێ ئەوە ئەو كەسێ تە ديت حەز ژ مەزنييێ دكەت خێر د سەرێ وى نابت، بۆچى؟ چونكى مادەم ئەو حەز دكەت د ناڤ خەلكى دا مەزن و مەشهوور بت و خەلک ب دويڤ وى بكەڤن، ئەو دێ حەقييێ گۆرى وان كەت؛ دا ئەو ژ وى

عێجز نەبن، و وی ب پێش خۆ بێخن، و ئەو کەسێ ب ڤی ڕەنگی بت، ئەرێ ما دێ چ خێر و ئیفلەح د سەرێ وی بت؟!

یەحیایێ کوڕێ موعاذی د ژیانا خۆ یا ڕۆژانە دا هەر دەلیڤەیەکا هەبا، یان ڕویدانەکا دیتبا بۆ هندێ ئستغلال دکر کو دەرسەکێ ژێ وەرگرت، و ڤێ دەرسێ د کراسێ وەعظەکێ ب حیکمەت دا پێشکێشی خەلکی بکەت، و ئەڤە ئەو مەنهەجە یێ پێغەمبەری ب خۆ -سلاڤ لێ بن- دانای.. جارەکێ وی گوهـ ل کەسەکی بوو قورئان دخواند، گاڤا گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ۝ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ۝ ﴾ (طـه: ٤٣-٤٤) یەعنی: ئەی مووسا و هاروون، هوین هەردو هەڕنە نک فیرعەونی ئەو یێ د سەر پێیێ خۆ دا چووی، هوین گۆتنەکا نەرم بێژنە وی بەلکی ئەو بیرا خۆ ل حەقییێ بینتە ڤە یان بترست. گاڤا یەحیای گوهـ ل ڤێ ئایەتێ بووی وی کرە گری، و گۆت: یارەبی ئەڤە نەرمییا تەیە د گەل وی یێ دگۆت: ئەزم خودا، پا نەرمییا تە د گەل وی دێ یا چەوا بت ئەوێ دبێژت: تویی خودا؟!

گەلەک جاران ئەم دبینین ئەو کەسێ گازییا حەق دگەهیننە خەلکی خۆ ژ ڤی ئەدەب و تۆرەیێ گرنگ بێ ئاگەهـ دکەن، دەمێ بەرێ خەلکی ددەنە حەقییێ ئەو شێوەیەکێ ڕەق و زڤر بەلکی حەتا یێ کرێت ژێ ب کاردئینن، یا ژ وان ڤە ئەو ب ڤێ چەندێ دێ خەلکی ب نک خۆ ڤە کێشن، خودێ دەمێ دو پێغەمبەرێن خۆ یێن خودان قەدر هنارتینە نک فیرعەونی گۆتێ: دەمێ هوین د گەل وی دئاخڤن هوین شێوەیەکێ نەرم ب کاربینن.. و ئەو فیرعەون بوو!

بەری ئەڤ ئیمامێ زاهد ڤێ هزرێ ژ ڤێ ئایەتێ بینتەدەر، د سەرهاتییەکا دی دا دئێتە ڤەگێڕان کو جارەکێ مرۆڤەک چوو دیوانا خەلیفەیێ عەبباسی یێ ناڤدار هاروون ئەلرەشیدی؛ دا هندەک نصیحەتان لێ بکەت، ڤی مرۆڤی ئەوێ ژ زانایان دهاتە هژمارتن شێوەیەکێ زڤر د ئاخفتنێ دا ب کارئینای، خەلیفەی بەرێ خۆ دا، و چونکی خەلیفە ب خۆ ژی کو هاروونە زانایەکێ ژێهاتی بوو،

گـۆتیێ: تـو چێتـری یـان مووسـا و هـاروون؟ وی گـۆت: مووسـا و هـاروون.. خەلیفەی گۆتیێ: ئەز خرابترم یان فیرعەون؟ وی گۆت: فیرعەون.. ئینا خەلیفـەی گـۆتیێ: دەمـێ خودێ مووسا و هـاروون هنارتینـە نـک فیرعـەونی گـۆتیێ: هـوین گۆتنەکا نەرم بێژنێ!

جارەکا دی یەحیایێ کورێ موعاذی د بەر مرۆڤەکی ڕا چوو، بەر دشکاندن، د خوهێ ڕا مابوو، د گەل هندێ ژی یێ ب کەیف بوو و ستران د بەر ڕا دگـۆتن، ئینا ئیمامی ب دلپێڤەبوون بەرێ خۆ دایێ و گۆت: ((مرۆڤ چەند یێ مسـکینە! شـکاندنا بـەران ل بـەر وی ژ هێلانـا گونـەهان ب سـاناهیترە)) یـەعنـی: مـرۆڤ مەخلووقەکێ عەجێبە، شکاندنا بەران چەند کارەکێ ب زەحمەت و نەخۆشـە، ئـەو ب کـەیـف و خـۆشـی دکـەت، بەلێ خۆدویرکرنا ژ گونـەهان کـو کـارەکێ گەلـەکێ ب ساناهیترە ل بەر وی یێ ب زەحمەتە، و ئەو نەشێت خۆ ژێ بدەتـە پـاش، مـا ئەڤە نە تشتەکێ عەجێبە؟

ل دووماهییێ چەند گەوهەرەکێن دی ژ (حیکەمێن) ڤی ئیمامی ب کورتی دێ بۆ هەوە ڤەگێرم:

ئەو دبێژت: ((پیسـترین بـرا ئـەو برایـێ یـێ تـە هەوجـەیی ب هندێ هـەبت بێژییێ: دوعا بۆ من بکە)) بۆچی؟ چونکی ئەگەر ئەو برایەکێ باش بـت بێـی تـو داخوازێ ژێ بکەی ئەو ب خۆ دێ بۆ تە دوعا کەت.

د گۆتنەکا خۆ یا دی دا ئەو دبێژت: ((دەمێ مـرۆڤ دمـرت دو موصیبەتێن وەسا د مالێ وی دا بـۆ وی هـەنـە کەسێ ژ یێن پێشییێ و یێن پاشییێ گوهـ ل تشـتەکێ وەکـی وان نەبوویـە، ئـەو ژی ئەڤەنـە: مـالێ وی هـەمی ژێ دئێتـە سـتـانـدن، و پسیارا هەمییێ ژێ دئێتەکرن)) ما نە موصیبەتەکا مەزنە تشـتەک ژ مرۆڤی بێتە ستاندن، و حسێبا وی د گەل مرۆڤـی بێتـەکرن؟ د گـەل هنـدێ ژی تبیعەتێ مـرۆڤـی یـێ وەسـایە دەمێ مالێ وی کێم دبت، یـەعنی: ئـەو حسـێبا د گەل وی دێ ئێتەکرن سڤک دبت، ئەو ب خەم دکەڤت!

د گۆتنەکا دی یا عەجێب دا یەحیایێ کورێ موعاذی دبێژت: ((ئـەو گونـەها مـن هەوجـەیی وی بکـەت ل نـک مـن چێتـرە ژ وێ خێـرا مـن ژ وی بـێ منـەت دکەت))

بەلکی کەسەک بێژت ئەڤە چاوایە؟

هندەک مرۆڤێن هەین دەمێ گونەهەکێ د دەر حەقا خودایێ خۆ دا دکەن، خـۆ گەلـەک هەوجـەیی وی دکـەن، و ڕۆنـدکێن پەشـێمانییێ ل بـەر دەسـتێ وی دبـارینن، و شـەڤ و نیڤشـەڤان هـەوارێن خـۆ دگـەهیننێ دا ئـەو ل وان ببـۆرت، بەرانبەر وان هندەک کەس هەنە خێران دکەن، و هزر دکەن ئـەڤ خێـرە وان دکەنـە خودان حەق ل سەر خودێ، یـەعنی: لازم سـەرا ڤـان خێـرێن وان کرین خودێ وان خەلات کەت، لەو تو دبینی ئەو خۆ بێ منەت دکەن، و ژ غـەزەبا وی ناترسـن، و خۆ هەوجەیی وی ناکەن، و ل بەر دەرێ وی نـادانن.. ئـەرێ حالێ کێ باشـترە: ئەوێ گونەه کری یان خێر؟ یەحیا دبێژت: ئەوێ گونەه کری.

بـەری ئـەم بەربـەرێ دوومـاهییێ یێ ڤـی خودێناسی قەلـدەین، ڤێ شیرەتا گرنگ ژ وی وەرگرە، ئەو دبێژتە تە: ((خۆ ژ هەڤالینییا سێ ڕەنگێن مرۆڤان بدە پاش: زانایێن غافل، و شارەزا و خواندەڤانێن قورئانێ ئەوێن حولیسـکاتییێ بـۆ خەلکی دکەن، و صووفییێن جاهل)).

مـەعنا: چـو خێـر د هـەڤالینییا وی زانـایی نینـە یـێ مرۆڤـی ژ غەفلـەتێ هشیار نەکەت، و دینی ل دویڤ دلێ خەلکی ببـەت، و وی عیبادەتکـەرێ جاهـل ژی ئەوێ چو ژ دینی نەزانت و خۆ ب زوهدێ بینتـەدەر.

## جونەیدێ بەغدادی
## شێخێ زاهدان

هێشتا ئەو یێ بچویک دەمێ یاری د گەل زارۆکان دکرن (حیکمەت) وەکی شرکا ئاڤێ ژ دەڤی دەرکەفت، رۆژەکێ خالێ وی زاهدێ مەزن (السری السقطی) د گەل کۆمەکا هەڤالێن خۆ ژ خودێناسان د بەر وی را بۆرین وی یاری د گەل هەڤالێن خۆ یێن زارۆک دکرن، خالێ وی گۆتێ: کۆرۆ! شوکور چییە؟ وی گۆت: ((شوکور ئەوە مرۆڤ بێ ئەمرییا خودێ ب وێ نعمەتێ نەکەت یا وی د گەل مرۆڤی کری)) ئینا خالێ وی ژ حێبەتییێن خۆ دا گۆتێ: ئەز دترسم بارا تە ژ خودێ ئەو ئەزمان بت یێ تە هەی.. وی دگۆت: حەتا ڤێ گاڤێ ژی ئەو گۆتنا وی من دگرینت!

بۆچی؟

چونکی ئەو دترسیا هەما بارا وی ژ وێ باشییا خودێ دایێ ئەزمان ب تنێ بت، یەعنی: هەما خودێ ئەزمانەکێ خۆش و گۆتنەکا شرین دابتێ و بەس! وەکی دی ئەو نە ل ئاستێ گۆتنا خۆ بت، یان کارێ وی نە ل دویڤ وێ گۆتنێ بت یا ئەو بۆ خەلکی دبێژت، و ئەڤە فتنەیەکا مەزنە دگەهتە خودانی، دڤێت مرۆڤ گەلەک ژێ بترست.

گاڤا یەحیایێ کورێ موعاذی هاتییە بەغدا، زاهدێن بەغدا ل دۆر وی کۆمبوون، و هندەک ژ وان ئاخفتن.. و چونکی گۆتنا وی ژ یا هەر ئێکی رەهوانتر بوو، ئەو ئاخفتن، و هنگی عەمرێ وی یێ بچویک بوو، گاڤا یەحیایێ کورێ موعاذی دیتی د ناڤ هەمییان دا ئەو یێ دئاخڤت، ئەو ترسیا غورور بۆ چێ ببت، ئینا وی ڤیا دەرسەکێ د (تەزکییێ) دا بدەتێ، (تەزکییا) ل سەر

مەزهەبێ وان يێ تايبەت! لەو گۆتی: بەرخۆ! تو چ یی حەتا ل دیوانا مرۆڤان باخڤی؟!

و مەخسەدا وی ب مرۆڤان، مرۆڤێن خودێنە، ژ وەلی و عارف و زاهدان.. گاڤا تو دچییە دیوانا وان، نەئاخڤە، ب تنێ بلا گوهێ تە ل وان بت؛ چونکی ئەو دەلیڤەیەکا زێڕینە بۆ تە کو تو بارێ خۆ ژ دوڕ و مرارییێن وان کۆم بکەی!

ڤێ جارێ سوحبەتا مە دێ ل دۆر (سەییدێ طائیفەیا خودێناسان) بت، وەکی عارفان ئەو دایە نیاسین، یان ژی (تاجا سەرێ عارفان)، ڤێ جارێ گۆتنا مە دێ ل دۆر (جونەیدێ بەغدادی) بت.

### جونەیدێ بەغدادی کی بوو:

ئیمام جونەیدێ بەغدادی د دیرۆکا مرۆڤێن خودێ دا و ل عسمانێ زوهد و تەقوایێ ناڤەکە گەلەک ژ ڕۆژا هاڤینێ گشترە، د ناڤ کۆما واعظان یێن بیرا خەلکی ل خودێ دئیناڤە ئەو چیایەکێ سەربلند و بەرچاڤە.. خودێ گەلەک نعمەتێن مەزن د گەل وی کربوو، بەلێ نعمەتا ژ هەمییێ بەرچاڤتر ئەو بوو وی ئەزمانەکێ هندێ شرین بۆ کرنا وەعظی هەبوو گەلەک جاران وی ب خۆ دوعا بۆ خۆ ژ خودێ دکرن کو ئەو سەرا وێ ئاخفتنێ وی عەزاب نەدەت، بەلکی هوین بێژن: بۆچی؟ د بەرسڤێ دا دێ بێژم: چونکی ئەو دترسیا ژ بەر شرینییا ئاخفتنا وی، و تەئسیرا مەزنا وێ ئاخفتنێ ل سەر خەلکی، غوروور بۆ وی چێ ببت، و ئەو زێدە د خۆ بگەهت و بێژت: ئەڤە ئەزم هندە ئاخفتنا من کاری ل خەلکی کەت؟!

پشتی مری ژی ب دەمەکی، هەڤالەکێ وی ئەو د خەوێ دا دیت، و گۆتێ: خودێ چ ل تە کر؟ وی گۆت: ((**طاحت تلک الإشارات، وغابت تلک العبارات، وفنيت تلک العلوم، ونفدت تلک الرسوم، وما نفعنا إلا رکعات کنا نرکعها في الأسحار**)) یەعنی: ئەو ئیشارەت هەمی کەڤتن، و ئەو عیبارەت هەمی

پاشکەفتن، ئەو زانین هەمی فەنابوون، و ئەو نیشان هەمی نەمان و چوون، و تشتەکی مفایێ مە نەدا ئەو رکاعەت تێ نەبن ییێن مە ل سەحەرێ دکرن!

زانایێن دیرۆکێ و ئەهلێ سلووکی ل وێ باوەرێنە کو ئەگەر د ناڤ ئوممەتێن بەری مە دا لوقمانەکێ حەکیم هەبت، ناڤ و دەنگێن وی ب گۆتنێن بنجە و حەکیم بەلاڤ ببت، د ناڤ ئوممەتا مە دا ب سەدان لوقمان هەنە، ییێن حکمەت ژ گۆتنێن وان ڤەدپەشی، و دور و مراری ل سەر ئەزمانێ وان دگەریان، و جونەیدێ بەغدادی ئێک ژ وان بوو. ئەگەر ئەم نەبێژین: ئەو ئیمام و پێشەوایێ وان بوو.

جونەید د بنیاتێ خۆ دا خەلکێ نەهاوەندێ بوو، بەلێ چونکی سالا ٢٢٠ مشەختی ل با ژێرێ بەغدا هاتبوو سەر دنیایێ، و د ژیانا خۆ دا ئەو هەر ل وێرێ ئاکنجی بووبوو، ئەو ب ناڤێ: (جونەیدێ بەغدادی) هاتبوو نیاسین.

ل زارۆکینییا خۆ وی قەستا مەدرەسە و زانایێن سەر دەمێ خۆ کربوو، و ئەو ل سەر دەستێ کۆمەکا زانایێن فقهێ و حەدیسێ هاتبوو پەروەردەکرن، وەکی شاگردەیێ ئیمامێ شافعی ئیمام ئەبوو ثەورێ کەلبی، و حەسەنێ کورێ عەرەفەی و گەلەکێن دی، هەر وەسا وی هەڤالینییا هژمارەکا زاهد و عارف و خودێناسان ژی کربوو، و ل سەر دەستێ وان بەر ب جیهانا زوهدێ ڤە چوو، و سەیدایێ وی یێ ژ هەمییان ناڤدارتر د ڤێ دەلیڤەیێ دا خالێ وی (ئەلسەری ئەلسەقطی) بوو، و چونکی وی ل دەسپێکێ زانینێن شەرعی ژ قورئان و حەدیس و فقهـ و زمانی وەرگرتبوون، پاشی وی قەستا جیهانا زوهدێ و وەعظی کربوو، ئەو مرۆڤەکێ کامل بوو ژ هەر لایەکی ڤە، ئەو کەمالا مرۆڤ دگەهنێ، و ژ بەر هەڤالینییا وی یا بەردەوام د گەل مرۆڤێن حەکیم و خودێناس، حکمەت ل سەر ئەزمانێ وی دگەریا، و گۆتنا وی ل بەر خەلکی یا شرین بوو.

هێشتا ژیێ وی بیست سال دەمێ ئەو ل نک سەیدایێ خۆ یێ فقهزان ئەبوو ثەوری ئەو هند د علمێ شەرعی دا پێشکەفتبوو وی فەتوا ددانە خەلکی..

بەلێ پشتی دەمەکی وی بەرێ خۆ ب نک عالەما زوهدێ ڤە دا حەتا ڕۆژەک ب سەر دا هاتی ئەو بوویە مەزنترین کەس د ڤێ دەلیڤەیێ دا، لەو خاص و عامان ئەو ب ناسناڤێ (سید الطائفة) دا ناسینێ.

ژیانا خۆ وی ل بەغدا بۆراندبوو، و هەر ل وێرێ ئەو ل ڕۆژەکا ئەینییێ ژ سالا ٢٩٨ مشەختی ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.. و دبێژن: نێزیکی شێست هزار کەسان نڤێژ ل سەر وی کربوو، و دەمێ ئەو مری وی قورئان دخواند و ئەو گەهشتبوو ئایەتا حەفتێیێ ژ سوورەتا (البقرة).

پشتی ئەو مری ژی -وەکی بەری نوکە مە گۆتی- وی د خەونێ دا گۆتنەکا شرین و حکمەتەکا مەزن گۆتە هەڤالەکێ خۆ، دەمێ گۆتییێ: ((**طاحت تلك الإشارات، وغابت تلك العبارات، وفنيت تلك العلوم، ونفدت تلك الرسوم، وما نفعنا إلا ركعات كنا نركعها في الأسحار**)) بەلێ.. بەرێ خۆ بدەنێ، ڤان عیبارەت و ئیشارەتێن شرین هند فایدە نەگەهاندێ هندی وان ڕکاعەتان فایدە گەهاندییێ پێن وی ل نیڤا شەڤێ و بەری سپێدی دکرن؛ چونکی ئەو ئیشارەت و عیبارەت د ناڤ خەلکی دا بوون، و بۆ وان، خەلکی مەدحێن وی پێ کرن و ئەو ل دنیایێ گەهشتە حەقێ خۆ!! بەلێ ئەو ڕکاعەتێن وی ل سەحەرێ دکرن، د ناڤ تارییا شەڤێ دا بوون، و کەس پێ نەدحەسییا ئەو تێ نەبت یێ وی ئەو بۆ دکرن، و نوکە دەم هات ئەو وی خەلات بکەت، پشتی (عەمەل) هاتییەبڕین و (ئەمەل) مای.

شێخی هژمارەکا کتێبێن بچویک ل پاش خۆ هێلابوون، وەکی:

- القصد إلى الله.
- السر في أنفاس الصوفية.
- الفرق بين الإخلاص والصدق.

و چەندەکێن دی ژی کو هەمی نوکە د کتێبەکێ دا پێن هاتینە چاپکرن.

زانایێن ئیسلامێ ژ هەمی مەزهەب و ئێتیجاهان ل سەر هندێ کۆمبووینە کو ئیمامێ جونەید زاهد و زانایەکێ خودان قەدر و بها بوو، و کسەکێ مەقبوول بوو ژ لایێ خەلکی ڤە ئەگەر مەزهەب و بیر و بۆچوونێن وان چ بن. ئەبوو نوعەیم دبێژت: ((جونەید خودێ رەحمێ پێ ببەت ژ وان کسان بوو یێن علمێ شریعەتی موکومکری)) و (شیخ الإسلام) ئبن تیمیە دبێژت: ((ئەو ئێک ژ ئمامێ عارف بوو)) و ئیمامێ ذەهەبی دبێژت: ((ئەو شێخێ عارفان بوو، و جهێ چاڤلێکرنا سالکان بوو، و ئەو سەیدایێ وەلییێن زەمانێ خۆ بوو)).

## ڕێبازا جونەیدی:

جونەید خودێناسەکێ زاهد و زانا بوو، و ئەو ئێک ژ وان زاهدان بوو یێن (طەریقەت) ب (شەریعەتی) ڤە گرێددا، و ئەو وەکی دو ڕوییان بۆ ئێک دراڤی ددیت، نە کو ئێک ژ وان دکرە پێگوهۆڕ بۆ یێ دی، وەکی هندەک نەزانێن پشتی هنگی دەرکەفتین و ب ناڤێ سلووک و تەصەووفێ ئاخفتین، و ڤیاین خەلکی وە تێ بگەهینن کو (شەریعەت) ڕێبازا عامیانە و (طەریقەت) ڕێبازا خاصانە، و ئەو دو تشتێن ژێکجودانە! جونەیدێ بەغدادی وەکی شێخ ئیسلامێ هەکاری و شێخ عەبدلقادرێ گەیلانی و شێخ عەدییێ کوڕێ موسافری و گەلەکێن دی ژ وان زانا و زاهدان بوون یێن (تەصەووف) یان (علمێ سلووکێ) ل سەر بناخەیێ کیتاب و سوننەتێ ل دویڤ مەنهەجێ (سەلەفێن ئوممەتێ) ئاڤادکر، و ل وێ باوەرێ بوون کو ئەو کسێ (طەریقەتا سلووک و پەروەردەکرنا نەفسێ) دویر ژ ئەحکامێن شریعەتی بدانت ئەو کسەکێ نەزانە و یێ دویرە ژ حەقییێ، خۆ ئەگەر خەلک وی وەک وەلی ژی بنیاسین..

د ڤێ دەلیڤەیێ دا چەند گۆتنەک ژ ئیمامێ جونەید دئێنە ڤەگێڕان، ل ڤێرێ ئەم دێ ئیشارەتێ دەینە هندەک ژ وان:

شێخ دبێژت: ((ڕێ ل بەر هەمی خەلکی دگرتینە، ئەو تێ نەبن یێن ل سەر ڕێکا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دچن، و دویکەفتنا سوننەتا وی دکەن، و

پێگیرییێ ب طەریقەتا وی دکەن، ئەوان ڕێکێن خێرێ هەمی ل بەر دڤەکرینە))
و دبێژت: ((هەچییێ قورئانێ نەزانت و حەدیسان نەنڤیست، د ڤی کاری دا -یەعنی: د سلووک و تەصەووفێ دا- چاڤ ل وی نائێتەکرن؛ چونکی ئەڤ علمێ مە ب کیتاب و سوننەتێ ڤە یێ گرێدایە)).

ژ ڤان هەردو گۆتنێن وی و گەلەک گۆتنێن دی ژی یێن ب ڤی ڕەنگی دئێتە زانین کو زانایێن دەسپێکێ یێن (ئەهلێ سلووکی) ب چاڤەکێ مەزن بەرێ خۆ ددا شریعەتی، و بهایەکێ زێدە ددا علمێ کیتاب و سوننەتێ، و چو بها نەددا وی کەسی یێ هزر دکر کو ڕێکەکا دی ژ بلی یا کیتاب و سوننەت پێ هاتی بەرێ مرۆڤی دێ دەتە خودێ.

عەبدلواحدێ کوڕێ عەلوانی دبێژت: جونەیدی وەعظەک ل من کر و گۆت: ئەی حجێل! خۆ ب علم و زانینێ ڤە بگرە، ئەگەر خۆ هندەک ئەحوال ب سەر تە دا بێن ژی، و ئەگەر علم هەڤالێ تە بت ئەحوال دێ ل نک تە پەیدا بن، چونکی خودایێ مەزن دبێژت: ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ﴾ (آل عمران: ٧).

مەعنا: ئیمامێ جونەید هەردەم شیرەت ب علمی ل خەلکی دکر؛ چونکی علمە بەرێ خودانی ددەتە ڕاستییێ، و ئەوێ علمەکێ دورست یێ وەرگرتی ژ کیتاب و سوننەتێ نەبت، مرۆڤی باوەری ب حال و ئەحوالێن وی ژی نابت.
بەلێ دڤێت ژ بیر نەکەین کو (علمێ دورست) و (طەمەع) د دلەکی دا کۆم نابن، ئیمامێ جونەید دبێژت: ((تشتەک وەکی طەمەعێ مرۆڤێ زانا د چاڤێن خودێ دا ناشکێنت، دەمێ طەمەع د گەل علمی د دلێن وان دا کۆم دبت)) و طەمەعا زانایی ئەوە ئەو دینێ خۆ بکەتە ڕێک بۆ کۆمکرنا دنیایێ.

و ئیمامێ جونەید (حیکمەتێن خۆ) د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ نەدکرن، و ئەوی وەعظ ل وان نەدکرن ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا وی دڤیا (توراثەکێ) وەسا ل پاش خۆ بهێلت خەلکێ دووماهییا زەمانی ژی مفایی بۆ خۆ ژێ ببینن، ل

وی دەمی یێ مرۆڤێن بێخێر دبنە مەزنێن خەلکی یێن دینی و دنیایێ ژی، ئیمام د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا کو د ریوایەتان دا هاتییە: دووماهییا زەمانی پیسترینێ مرۆڤان دێ بتە مەزنێ وان، ئەز د دەر حەقا هەوە دا نەدئاخفتم)).

جارەکێ پسیار ژ جونەیدی هاتەکرن کانێ (زکرێ خەفی) چییە؟ و ئەو چ تشتە یێ ملیاکەتێن نڤیسەر ژ مرۆڤی نزانن؟ و بۆچی عەمەلێ ڤەشارتی حەفتێ جاران ژ یێ ئاشکەرا ب خێرترە؟ وی گۆت:

ئەو زکرێ خودێ ب تنێ پێ دحەسییێت ژ مرۆڤی ئەوە یێ ئەزمان و لەش پێ نەگەڕییێت، وەکی کو هەیبەتا خودێ د دلێ تە دا هەبت، و ئەو د چاڤێن تە دا یێ مەزن بت، و دلێ تە ژ وی یێ ب ترس بت، و ئەڤە ئەو غەیبە یا د ناڤبەرا عەبدی و خودایێ وی دا یا کو کەس پێ ناحەسییێت، و دەلیل ل سەر ڤێ چەندێ گۆتنا خودێیە: ﴿ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ (القصص: ٦٩) مەعنا: ئەو تشتێ د دلی دا ڤەشارتی ژ خودێ پێڤەتر کەس پێ ناحەسییێت خۆ ئەو ملیاکەت ژی پێ ناحەسیێن یێن خودێ نڤیسینا کریارێن عەبدان هێلایە ب هیڤییا وان ڤە. و ئەو گۆتنا دئێتە ڤەگێڕان کو ئەو عەمەلێ مرۆڤ ڤەشارتی بۆ خودێ بکەت حەفتێ جاران ب خێرترە ژ عەمەلێ ئاشکەرا، ئەڤە ژ بەر هندێیە -و خودێ چێتر دزانت- چونکی ئەڤ مرۆڤە خۆ دهێلتە ب هیڤییا علمێ خودێ ب تنێ ڤە، و وی منەت پێ نینە ئێکێ دی ژ بلی وی ب ڤی کارێ وی بحەسییێت، و ئەگەر دلێ مرۆڤی وە لێ هات ژ علمێ خودێ پێڤەتر منەت ب علمێ کەسێ دی نەبت، ئەو دل دێ کارەکێ ب ئیخلاص کەت، و دەمێ خودێ دزانت کو عەبدێ وی د قەصدا خۆ دا یێ ڕاستگۆیە و بەرێ وی ل کەسێ دی نینە ژ بلی، ئەو خێرێ حەفتێ جاران پتر دێ دەتێ.

و د دەر حەقا مەعنایا گۆتنا ئیبراهیم پێغەمبەری دا -سلاڤ لێ بن- دەمێ وی گۆتی: ﴿ لَآ أُحِبُّ ٱلْآفِلِينَ ﴾ (الأنعام: ٧٦) جونەیدێ بەغدادی دبێژت:

((مەعنایا وێ ئەوە: من ئەو نەڤێت یێ ژ بەر چاڤ و دلێ من ئامادە نەبت، و ئەڤە دەلیلە کو من ئەو دڤێت یێ بەرێ من هەردەم لێ بت، و ئەز ب وی یێ زانابم حەتا ئەو هەردەم یێ ئامادە بت، ژ بەر ڤێ چەندێ مە دیت کو تشتێ ژ هەمییێ دژوارتر ل سەر دلێ ئەڤینداران ئەوە دەمێ خۆشتڤییێن وان ژ بەر چاڤێن وان بەرزە دبت، و ئەو وان نەبینن)).

و د گۆتنەکا خۆ یا دی یا تێر مەعنا، ئەو دبێژت: ((هەچییێ هزر بکەت کو ب خۆوەستاندن ئەو دێ گەهت ئەو یێ رێ ل خۆ دگرت، و هەچییێ هزر بکەت کو ئەو بێ خۆوەستاندن دێ گەهت ئەو یێ خوزییان رادهێلت، و ئەوێ خۆ فێری حەقیقەتێ بکەت ئەوە یێ خودێ وی دگەهینتە هیدایەتێ)).

و دگۆت: ((گاڤا تە ئێک دیت صەبرێ ل سەر حەقییێ دکەت، وی بگرە و بەرنەدە)) پاشی وی گۆت: ((و ما تو دێ ئێکێ وەسا ژ کیڤە بینی؟ کانێ ئێکی نیشا من بدە دەمێ حەقی بۆ دئێتە گۆت خۆ ل سەر نەرازی نەکەت)) و مەخسەدا ئیمامێ جونەید ئەو حەقی بت یا نە ب دلێ مرۆڤی بت یان ژی نە د مەصلحەتا وی دا بت، ب دەڤی ئەم هەمی حەز ژ حەقییێ دکەین، بەلێ ئەو کییە یێ گوهـ ل حەقییەکێ دبت و ئەو حەقی نە د کەصلحەتا وی دا بت، د گەل هندێ ژی ئەو ب دلەکێ خۆش و رازی وێ حەقییێ قەبویل بکەت و قەت (ئعتراضێ) ل سەر نەکەت؟ گاڤا تە مرۆڤەکێ ب ڤی رەنگی دیت وی باش بگرە و قەت دەستان ژێ بەرنەدە؛ چونکی ب راستی خۆ ژ زەمانێ ئیمام جونەیدی وەرە و حەتا ئەڤرۆ ژی ئەو مرۆڤێن ب وی رەنگی بن ب دەست ناکەڤن!!

# مرۆڤێن خودێ
# و گرییا ژ ترسێن خودێ دا

سەرهاتییا مرۆڤێن خودێ د گەل گرییێ سەرهاتییەکا عنتیکەیە، و ژ ڤێ چەندێ عەجێبگرتی نەبن، هەڤالینییا مرۆڤێن خودێ د گەل وێ رۆندکا ژ ترسێن خودێ دا ژ چاڤێن وان دباری ژ هەڤالینییا وان بۆ هەر تشتەکێ دی پتر و موکمتر بوو، ئێک ژ وان ب دەڤێ خۆ هند نەدئاخفت هندی ب چاڤێن خۆ رۆندک دباراندن، و د کەڤن دا خودان دل دزانن کو ئەو گۆتنا چاڤ دشێت ب رۆندکێ بگەهینت، چو جاران دەڤ ب ئەزمانی نشێت بێژت! ئەگەر نە.. پا بۆچی عاشق و ئەڤینداران هندە بەحسێ چاڤان کرییە؟

هنگی ئوممەت یا ب خێر بوو دەمێ زانایان ب رۆندکێن خۆ بەری گۆتنا دەڤی شیرەت ل خەلکی دکرن، هنگی ئوممەت یا ب خێر بوو دەمێ ل مزگەفت و مال و بازارێ دیوان بۆ گرییێ دهاتنە گرێدان، گرییا ل سەر دنیایێ، نە وەکی مە ئەڤرۆ، ئەگەر ئێک ژ مە جارەکێ بگریت ژی بەرێ خۆ بدێ دێ بینی گرییا وان بۆ دنیاییێیە.

مخابن ئەم یێن گەهشتینە زەمانەکی خەلکێ وی رۆندکا ژ ترسا خودێ دا نەنیاسییە، نە بەس هندە، بەلکی گەلەک ژ وان هەر خودێ ب خۆ نەناسییە حەتا ڤێجا ژ ترسێن وی دا بکەنە گری، ئێک ژ وان هەر سپێدێ دەمێ رادبت و حەتا لێ دبتە شەڤ ئەگەر بۆ سویندێ نەبت دویر نینە ناڤێ خودێ نەئێتە سەر ئەزمانێ وی!

ئیمامێ (شەعبی) ئەوێ ل سالا (١٠٤) ێ مشەختی مری، د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((دەمەکێ درێژ مرۆڤ ب دینی دژیان، حەتا دین ژ دلێن وان هاتییە دەر، پاشی ئەو ب مروەتێ ژیان، حەتا ئەو ژی چووی، پاشی ئەو ب شەرمێ ژیان، حەتا شەرم نەمای، و نوکە ئەو ب طەمەعکرن و ترساندنێ دژین.. و پشتی ڤی زەمانی زەمانەکێ دی دێ ئێت هێشتا دێ یێ خرابتر بت)).

نوکە ئەو زەمانە یێ ئیمامێ شەعبی بەحس ژێ کری! و ڕەشبینی نەبت بەلێ ئەڤرۆ ئێک زێدە زەحمەت و وەستیانێ دبینت حەتا ب سەر ئێکێ وەسا هل ببت ب دورستی بێنا دینی ژێ بێت، ڕۆژەکێ (ئەبوو موسلمێ خەولانی) د بەر مزگەفتەکێ ڕا بۆری دیت هندەک مرۆڤ ل مزگەفتێ یێن کۆمبووین، کەیفا وی گەلەک ب وان هات، وی هزرکر ئەو یێ بەحسێ خودێ دکەن و یێ علمی نیشا ئێک و دو ددەن، ئەو ب نک وان ڤە چوو دیت لەغوا وانە و بەحس بەحسێ دنیاییێیە، ئینا وی گۆتە وان: ((سبحان الله! مەتەلا من و هەوە وەکی مەتەلا وی زەلامییە یێ بارانەکا بۆش لێ باری، ڤێجا ئەو ل دۆر خۆ زڤڕی دەرگەهەکێ ڤەکری دیتی، و گۆتی: باشە، ئەز دێ چمە د ڤی خانی ڤە دا ژ بارانێ بێمە پاراستن، ڤێجا پشتی ئەو چوویە د وی خانی ڤە وی دیت ئەو خانییەکێ بێ بانە! ئەز هاتمە دیوانا هەوە من هزرکر دیوانا زکری و زانینێیە دێ مفایی بۆ خۆ ژێ بینم، پاشی دەرکەفت ئەو دیوانا دنیاییێیە د مالا خودێ ڤە)).

بەرێ خۆ بدەنە مزگەفتێن مە دێ زانن ئەم چ زەلامین! مەتەلا مە مەتەلا مێرگەکا ب خەمل بوو، چو ستری د ناڤ دا نەبوون، پاشی هند ستری کەفتنێ حەتا ڕۆژەک ب سەر دا هاتی چو گول د ناڤ دا نەماین!

زڤڕین ل مژارا خۆ یا سەرەکی دێ بێژین: ئەو ڕۆندکا ژ ترسێن خودێ دا ژ چاڤی دئێتە خوارێ هنگی ڕادوەستت حەتا خودانێ خۆ دبەتە بەحەشتێ، و ژ سالۆخەتێن وان خودان باوەرانە یێن کو خودێ ژێ ڕازیبووی و ئەو ب بەحەشتا خۆ ڕازی کرین: هەر جارەکا ئایەتێن خودێ بۆ وان هاتنە خواندن ئەو سەرێن خۆ

ل بەر مەزنییا خودێ دچەمینن و هند ڕۆندكان ژ ترسێن وی دا دبارینن حەتا ئەو بەرسنگێن خۆ تەر دكەن.. د ئایەتەكێ دا خودایێ مەزن مەدحێن وان بەنییێن خۆ دكەت یێن وی قەنجی د گەل كری و دبێژت: ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴾ (مریم: ٥٨).

و ل جهەكێ دی دبێژت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ۝ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ۝ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴾ (الإسراء: ١٠٧-١٠٩) ئەوێن خودێ زانین دایێ گاڤا ئایەتێن قورئانێ بۆ وان دئێنە خواندن ئەو نەشێنە چاڤێن خۆ، ڕۆندكان دبارینن و سەرێ خۆ ب ترس ڤە بۆ خودێ دچەمینن. (ئەبوو ئەعلایێ تەیمی) دبێژت: ((هەچی زانایێ زانینا وی وی نەگرینت ئەوی چو زانین نەبوویە)).

ئەوێ ئەڤرۆ ژ ترسێن خودێ دا بگریت، سوباهی دەمێ ئەو ژ قەبری ڕادبت و خەلک ل دۆرێن وی دگرین ئەو دێ یێ ب كەنی بت، و ئەوێ ئەڤرۆ دكەنیت و خودێ ژ بیر دكەت، سوباهی دەمێ ئەو ژ قەبری ڕادبت دێ گریت.. ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضْحَكُونَ ۝ ﴾ (المطففین: ٢٩) ئەڤە د دنیایێ دا، ئەوێن تاوانبار گاڤا خودان باوەر ددیتن، بۆ خۆ پێ دكرە كەنی ﴿ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ۝ ﴾ (المطففین: ٣٤) ڤێجا ئەڤرۆ، ل ڕۆژا قیامەتێ، ئەوێن د دنیایێ دا باوەری ئینای ب وان ئەوێن كافربووین دكەنە كەنی.. ئێك ب ئێكێیە، و شەرت ڤێرێیە!

د حەدیسەكا دورست دا پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- وان هەر حەفت مرۆڤان بۆ مە دهژمێرت یێن كو ل ڕۆژا حەشرێ -دەمێ چو سیبەر نەهەین- ل بەر سیبەرا خودێ دئێنە كۆمكرن، و دیار دكەت كو ئێك ژ وان ئەو زەلامە یێ دەمێ ب تنێ دمینت خودێ ل بیرا خۆ دئینتەڤە ڤێجا ژ ترسێن خودێ دا چاڤێن وی

تژی رۆندک دبن.. جزایەکێ کێم نینە ئەگەر ئەم تێ بگەهین، و یا ژ ڤێ ژی مەزنتر: ئیمامێ ترمذی ژ عەبدللاهێ کورێ عەبباسی ڤەدگوهێزت، دبێژت: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆت: ((دو چاڤان ئاگر ڤێ ناکەڤت: ئەو چاڤێ ژ ترسێن خودێ دا کریتە گری، و ئەو چاڤێ ب شەڤ د رێکا خودێ دا بمینتە هشیار نۆبەدارییێ بکەت)).

بهایەکێ گرانە بۆ کارەکێ ب ساناهی، د گەل هندێ ژی بکرِ دکێمن، بۆچی؟

گەلەک جاران ئەم ڤێ پسیارێ ژ خۆ دکەین.. دەمێ ئەم دیرۆکا مرۆڤێن خودێ دخوینین تشتێ ژ هەمییێ بەلاڤتر د ناڤ وان دا ئەم دبینین گرییا ژ ترسا خودێیە، ئێک ژ وان دا ئایەتەکێ خوینت، یان دا گوه لحەدیسەکێ بت ئەو هند دا کەتە گری حەتا سنگێ وی ژ رۆندکان تەرِ دبوو، ئەم ئەڤرۆ هەر وان ئایەت و حەدیسان دخوینین و گوهـ لێ دبین بەلێ خۆ ئەم موییەکی ژی ژ خۆ شاش ناکەین، بۆچی؟

بەرسڤ: ژ بەر سێ ئەگەران:

یا ئێکێ: گونەهێن مە گەلەک ژ باشییێن مە پێن پتر لێ هاتین.

یا دوییێ: ڤێجا دلێن مە پێن رەق و هشکبووین.

یا سێییێ: لەو چاڤێن مە رۆندکان نابارینن.

د حەدیسەکێ دا هاتییە: ((هشیار بن گەلەک نەکەنە کەنی، هندی گەلەک کەنییە دلی دمرینت)).

ڤیانا مە بۆ دنیایێ و غاردانا مە ب دویڤ ڤە هند رێکێ نادەتە مە ئەم دو رۆندکان ژ ترسێن خودێ دا ببارینین، چونکی ئاشکەرایە کو ڤیانا دنیایێ و ترسا خودێ پێکڤە د دلەکی دا کۆم نابن. مرن مە یا ژ بیرا خۆ بری، ئێک ژ مە هند بۆ دنیایێ دکەت دێ بێژی مرن بۆ وی ژی نینە، گاڤا د بەر

موغبەرەکێ رِا دبۆرت پاتکا خۆ ددەتە قەبران دا زەوقێ وی نەخۆش نەبت، و گاڤا د گەل مرییەکێ خۆ چوو سەر زیارەتی نزانت کەنگی دێ وی بن ئاخ کەت دا بزڤرِتە قەسرا خۆ! بێژنە من: ئەوێ ب ڤی رەنگی بت چاوا ژ ترسا خودێ دا دێ کەتە گری؟ چاوا دێ ب خۆشییا هندێ حسییێت کو مرۆڤ ژ ترسا خودێ دا بکەتە گری؟

وەرن دا پێکڤە بەریەرێن دیرۆکا مرۆڤێن خودێ قەلدەینەڤە بەلێ ڤێ جارێ دا بزانین کانێ سەرهاتییا وان د گەل گرییا ژ ترسێن خودێ دا چ بوو..

سەروەرێ هەمی مرۆڤێن خودێ، پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- صەحابییەکێ وی دبێژت: ((رِۆژەکێ ئەز هاتمە نک وی نڤێژ دکر، و هندی هند وی دکرە گری دەنگەکێ وەسا ژ سنگێ وی دهات دا بێژی دەنگێ مەنجەلا ئاڤێیە دەمێ ددانن سەر ئاگری)).

دەیکا موسلمانان عائیشا -ئەوا نێزیکی نەهـ سالان د گەل پێغەمبەری د مالا وی دا ژیای- دبێژت: ((من نەدیت پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- رِۆژەکا ب تنێ وەسا کرییە کەنی کو دەڤێ وی بەش ببت حەتا مرۆڤ نیڤا دەڤێ وی ببینت)). و د حەدیسا معراجێ دا، وەکی ئیمام ئەحمەد ژ ئەنەسی ڤەدگوهێزت، هاتییە: پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ((من گۆتە جبریلی: ئەز نابینم میکائیل دکەتە کەنی، بۆچی؟ وی گۆتە من: ئەڤە رِۆژا خودێ جەهنەم چێکری ئەوی هێشتا نەکرییە کەنی)).

ئیمام (موسلم) ژ عەبدللاهێ کورِێ عەمری ڤەدگوهێزت، دبێژت: ((جارەکێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- سوورەتا ئیبراهیم دخواند گاڤا گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ۝ ﴾ (إبراهيم: ٣٦) پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەستێن خۆ بلندکرن و گری و گری و گۆت: رەببی ئوممەتا من ئوممەتا من، ئینا خودێ

جبریل هنارته نک و گۆتیێ: خودێ دبێژته ته: ئەز دێ ته د دەر حەقا ئوممەتا ته دا ڕازی کەم)).

ئەبوو بەکر -زەلامێ ئێکێ پشتی پێغەمبەری د ناڤ ئوممەتێ دا- هند مرۆڤەکێ دل نازک بوو گاڤا ل سەر مینبەرا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڕادوەستیا هند دکره گری کەسێ ئاگەهـ ژ دەنگێ وی نەدما.. جارەکێ چوو دا نڤێژا بارانێ ل بەرا خەلکی بکەت، ترارەکێ شەربەتا هنگڤینی بۆ وی ئینا، سێ جاران وی ترار بره بەر دەڤێ خۆ بەلێ ژ بەر گرییێ ئەو نەشیا شەربەتێ ڤەخۆت، و هندی وی کره گری گرییا هەڤالێن وی ژی هات، پشتی هنگی وان پسیارا وی کر: ئەو ته خێر بوو؟ وی گۆت: جارەکێ ئەز و پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- ب تنێ د گەل ئێک بووین، ئینا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- د گەل خۆ گۆت: هەرە ژ من دویر بکەڤە، ئینا من گۆتیێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ ئەو تو د گەل کێ دئاخفتی؟ وی گۆت: ئەڤە دنیا بوو هاته بەرچاڤێن من و گۆته من: ئەگەر تو ژ من خلاص ببی ژی یێن پشتی ته ژ من خلاص نابن.

عومەری گەلەک جاران د نڤێژا عەیشا و یا سپێدێ ژی دا سوورەتا (یووسف) دخواند و هند دکره گری حەتا ڕۆندکێن وی سنگێ وی تەڕ دکرن.

عوثمان گاڤا دچوو سەر قەبرەکی هند دکره گری حەتا ڕیهێن وی تەڕ دبوون.

و عەلی سەرهاتییەکا درێژ د گەل ڕۆندکان هەبوو.. جارەکێ پشتی وی نڤێژا سپێدێ ل بەرا موسلمانان کری ئەو ژ جهێ خۆ ڕانەبوو و حەتا ڕۆژهەلاتێ وی کره گری، پاشی ڕابوو و گۆت: ئەز نابینم ئەڤرۆ کەس دکەته گری، من صەحابییێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دیتبوون ب شەڤێ هەمییێ وان نڤێژ دکرن و وان هند دکره گری حەتا ڕیهێن وان تەڕ دبوون، بەلێ خەلک ئەڤرۆ دغافلن. و پشتی هنگی ئەو نەهاته دیتن کرییه کەنی حەتا هاتییه شەهیدکرن.

پشتی ئەو شەهیدبووی، رۆژەکێ هەڤالێ وی (ضرارێ کورێ ضەمورەی) ل دیوانا موعاویەی ئامادەبوو، موعاویەی گۆتێ: بۆ من بێژە کانێ عەلی یێ چاوا بوو؟ وی گۆت: ئەی (أمير المؤمنين) ئەگەر تو من عەفی کەی، وی گۆت: نە، ئەز تە عەفی ناکەم. ضراری گۆت: باشە.. ئەز ب خودێ کەمە ئەوی دویر بەرێ خۆ ددا، هێزەکا دژوار وی هەبوو، گۆتنا وی یا رەهوان بوو، وی حوکم ب دادییێ دکر، زانین ژێ دزا، ژ دنیایێ و خۆشییا وێ درەڤی، صەبرا وی ب شەڤێ و تارییا وێ دهات، ب خودێ ئەو مرۆڤەک بوو گەلەک دکرە گری و گەلەک هزرێن خۆ دکرن، دەستێن خۆ وەردگێران و د گەل خۆ دئاخفت، وی حەز ژ جلکێن کورت و خوارنا سادە دکر، گاڤا ئەم دهاتینە نک وی ئەو وەکی هەر ئێک ژ مە بوو، دەمێ مە پسیارەک ژێ دکر وی بەرسڤا مە ددا، هەر چەندە وی ئەم نێزیکی خۆ دکرین ژێ، و ئەو یێ نێزیکی مە بوو بەلێ ئەو هند یێ ب هەیبەت بوو زوی ب زوی ئەم د گەل نەدئاخفتین، مرۆڤێن ديندار د چاڤێن وی دا دمەزن بوون، و وی حەز ژ فەقیران دکر، خودێ شاهدە جارەکێ من ئەو دیت دەمێ شەڤێ پەردێ خۆ یێ تاری بەردای، و ستێر ئاڤابووین، ئەو چوو د محرابا خۆ دا و وی رِیهێن خۆ گرتن و وەکی وی مرۆڤێ ماری پێڤەدای ئەو دنالی، و وەکی وی مرۆڤێ خەمەکا گران هەی ئەو دگری، دەنگێ وی هێشتا یێ د گوهێ من دا دەمێ دگۆت: یا رەببی یا رەببی! پاشی دا بێژتە دنیایێ: ئەرێ تە خۆ بۆ من خەملاندییە، تو ل هیڤییا منی؟ وێڤە ژ کیڤە دئێت! بۆ خۆ هەرە ئێکێ دی، ب سێ تەلاقان من تو یا بەردای، تو یا عەمر کورت و هەڤالهێلی، تو یا بێخێری، ئاخ ئاخ بۆ کێمییا زادی و دویراتییا قوناغێ و نەخۆشییا رێکێ!

گاڤا موعاویەی ئەڤ گۆتنە گوهـ لێ بووین رۆندکێن وی هند بارین حەتا رِیهێن وی تەربووین، وی ب دەرهچکێ خۆ چاڤێن خۆ پاقژکرن و گوت: ئەرێ ب خودێ بابێ حەسەنی یێ وەسا بوو، ئەی ضرار خەما تە ل سەر وی یا

چاوایە؟ ضراری گۆت: وەکی خەما وێ ژنکێیە یا ئێکانێ وێ د کۆشێ دا هاتییە سەرژێکرن ڤێجا چو جاران خەما وێ ڕانەبت و ڕۆندکێن وێ هشک نەبن.

(خەببابێ کوڕێ ئەرەتتی) گاڤا کەفتییە بەر مرنێ، هندەک هەڤالێن وی هاتنە نک، ئێکی گۆتێ: مزگینییا مە ل تە بت سوباهی دێ گەهییە برایێن خۆ، ئینا خەبباب گری و گۆت: ئەز نە ژ ترسێن مرنێ دا دکەمە گری، هەوە بیرا مـن ل هندک برایێن من ئیناڤە یێن چووین و خێرێن وان د گەل دا، ڕۆژا مە حەمزە ڤەشارتی کفنەک نەبوو ئەم بکەینە بەر، کراسەک د بەر بوو ئەگەر مە سەرێ وی ڤەشارت با پییێن وی دەردکەفتن، و ئەگەر مە پییێن وی ڤەشارت بان سەرێ وی دەردکەفت، دەمێ ئەز د گەل پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەرهەمەکێ ب تنێ ژی من نەبوو، ڤێ گاڤێ چل هزار دەرهەم یێن د مالا من دا، ئەز دترسم ئەم نەگەهینە وێ خێرێ یا ئەو گەهشتینێ.

ئەڤە ژ صەحابییان، و ژ یێن پشتی وان: (ربعییێ کوڕێ خراشی) ئێک ژ وان تابعییانە یێن (بوخاری و موسلمی) حەدیس ژێ ڤەگوهاستین، د عەمرێ خۆ هەمییێ دا وی درەوەکا ب تنێ ژی نەکربوو، وی چو جاران نەدکرە کەنی، ڕۆژەکێ هندەکان گۆتێ: بۆچی تو ناکەیە کەنی؟ وی گۆت: من سویندا خواری حەتا ئەز نەزانم کانێ دێ چمە بەحەشتێ یان جەهنەمێ ئەز ناکەمە کەنی.. هەڤالێن وی دبێژن: گاڤا رحا وی هاتییە هلکێشان و حەتا مە ڤەشارتی ژی سەر و چاڤێن وی ب کەنی بوون.

(ثابتێ بەنانی) ئەوێ ئەنەسێ کوڕێ مالکی دگۆتێ: چاڤێن تە وەکی چاڤێن پێغەمبەرینە، هند دکرە گری حەتا چاڤێن وی کول بووین، ڕابوون حەکیمەک بۆ ئینا، حەکیمی گۆتێ: چاڤێن تە دێ چێ بن بەلێ ب وی شەرتی تو نەکەیە گری، ثابتی گۆتێ: چ خێر د وی چاڤی هەیە یێ نەکەتە گری؟

بەلێ.. دیتنا مرۆڤێن خودێ بۆ مەسەلێ د ڤێ گۆتنێ دا کۆم دبت: چ خێر د وی چاڤی هەیە یێ ژ ترسێن خودێ دا نەکەتە گری؟

(صەلاحەددینێ ئەییووبی) ڕۆژەکێ د ناڤ هەڤالێن خۆ دا یێ ڕوینشتی بوو، ئێک ژ وان تشتەکێ ب کەنی گۆت، هەمییان کرە کەنی، صەلاحەددین تێ نەبت، هندەکان گۆتێ: بۆچی تو ناکەیە کەنی؟ وی گۆت: ئەز ژ خودێ شەرم دکەم بکەمە کەنی و قودس د دەستێن کافران دا بت! ئەگەر ڕۆژێ جارەکێ ب دورستی مە بیرا خۆ ل مرنێ ئینابا، ئەگەر تارییا شەڤێ بیرا مە ل تارییا قەبری ئینابا، چاڤێن مە ژی دا ژ وان چاڤان بن یێن خێر تێدا هەی، بەلێ چ ل دلێ ڕەق بکەین یێ کو ل بن خولییا گونەهێ مای؟

پشتی ڤێ.. کانێ کەرەم کەن دا ئەم قەستا دیوانا ئێک ژ وان مرۆڤێن خودێ بکەین یێن ژ ترسا جەهنەمێ دا چو جاران نەدکرە کەنی.. دا بچینە خزمەتا سەعیدێ کوڕێ جوبەیری.

## ئەو زانایێ زالمەك پێ مری
## سەعیدێ كوڕێ جوبەیری

دەمێ ئەو یێ جحێل وی دیکلەک هەبوو هەر شەڤ بانگ ددا، و ژ بەر دەنگێ وی ئەو ژ خەو ڕادبوو نڤێژ دکرن، شەڤەکێ دیکلی بانگ نەدا، گاڤا سپێدێ ئەو ڕابووی ئەو گەلەک عێجزبوو و وی نفرینەکِ ل دیکلی کر، و گۆت: خودێ دەنگێ وی ببڕت، و وەسا چێبوو، وی دیکلی پشتی هنگی بانگ نەدا، ئینا دەیکا وی گۆتێ: کوڕێ من هشیار بە نفرینان ل کەسێ دی نەکە!

پشتی د عیبادەت و زانینێ دا پێشکەفتی ڕۆژەکێ وی دوعایەک کر کو خودێ وی بمرینت شەهید، و وەسا چێبوو.. گاڤا (حەجاجی) ئەو ئینای دا وی بکوژت، وی نفرینەک کر و گۆت: یا ڕەببی تو ڤی زالمی هند نەهێلییە ساخ کو پشتی من ئەو کەسێ دی بکوژت، و وەسا چێبوو.. پازدە ڕۆژان ب تنێ پشتی وی حەجاج ما ساخ یێ نساخ، لەو نەگەهشت پشتی وی کەسێ دی بکوژت.. ئەڤ مرۆڤێ خودێ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری بوو..

ب شەڤێ دەمێ ئەو ڕادبوو نڤێژ دکرن، وی هند دکرە گری حەتا چاڤێن وی کول بووین، و گاڤا وی نڤێژ ل بەرا هەڤالێن خۆ دکر دەنگێ گرییا وان ب سەر مزگەفتێ دکەفت.. و ڕۆژا ئەو مری زانایەکێ تابعییان گۆت: ئێک ل سەر عەردی نینە پێتڤی ب زانینا وی نەبت. ڤێجا ئەڤ چیایێ زانینێ، ئەڤ شەهیدێ سەعید کی بوو؟

### سەعیدێ کوڕێ جوبەیری وپێناسەیەکا کورت:

* ناڤێ وی سەعیدێ کوڕێ جوبەیرییە، دبێژنێ: بابێ عەبدللاهی. ل سالا (٢١) مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ.

* ل سەر دەستێ هژمارەکا صەحابییان ئەو هاتبوو ب خوادنکرن، و وی حەدیس ژ گەلەک صەحابییان ڤەگوهاستینە، وەکی: ئیمام عەلی، و عەبدللاهێ کورێ عەبباسی، و عەبدللاهێ کورێ عومەری، و عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، و ئەبوو مووسایێ ئەشعەری، و ئەبوو هورەیرەی.. و گەلەکێن دی.

* ئێک ژ مەزنترین زانایێن تابعییانە، و دگۆتن: هەر زانینەکا هەبت وی تێرا خۆ ژێ دزانی.

* ئێک ژ زاهد و تەقوادارێن ئوممەتێ بوو، شەڤ و ڕۆژێن خۆ وی د عیبادەتی دا دبۆراندن، و ژ ترسێن خودێ دا وی چو جاران نەدکرە کەنی و ژ بەر گرییێ ئێشەکێ چاڤێن وی گرتبوو.

* ئەو ئێک ژ وان زانایان بوو یێن سەرێ خۆ بۆ زۆرداریێ نەچەماندی، و ڕوی ب ڕوی بەرانبەر زۆرداریا حەججاجی یا مەزن ڕاوەستای، حەتا دووماهییێ ل سالا (٩٥) ێ مشەختی دەمێ ژییێ وی (٧٤) سال ب دەستێ حەججاجێ ثەقەفی شەهیدبووی. و ڕۆژا ئەو شەهیدبووی ئیمامێ ناڤدار حسەنێ بەصری گۆت: ((ب خودێ ئەگەر خەلکێ ڕۆژهەلات و ڕۆژئاڤایێ پشکداری د کوشتنا وی دا کربا، خودێ دا وان هەمییان هاڤێتە د ئاگری دا)).

## سەعید و کورێ زوبەیری.. و حەججاج:

سەعید ئێک ژ وان کەسان بوو یێن بەیعە دایە عەبدللاهێ کورێ زوبەیری، دەمێ وی ئیعلانا خەلیفاتییا خۆ ل مەکەهێ کری و پشتی عەبدللاه ب دەستێن حەججاجی هاتییە شەهیدکرن، و عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی بوویە خەلیفێ ئێکانە، سەعید ب خەلیفاتییا وی ڕازی نەبوو؛ چونکی ئەو ل وێ هزرێ بوو کو بارا پتر ژ موسلمانان ب حوکمدارییا وی دڕازی نینن.. و حەتا مەیدان بۆ عەبدلمەلکی باش ڤالا ببت وی دەستویری دا والییێن خۆ کو ئەو ب دارێ زۆرێ خەلکی بچەمینن، یێ ژ هەمییان پتر ب ڤی دەوری ڕابووی والییێ عیراقێ بوو: حەججاجێ ثەقەفی.

بێ رەحم و بێ ترس حەججاجی دوژمنێن خۆ ئاخافتن، گەلەک کوشتن و گەلەک ژی گرتن، و هندەک ژی بۆ خۆ رەڤین.. ژ وان کەسان یێن رەڤین سەعیدێ کورێ جوبەیری بوو.

سەعید گەلەک سالان دەر ب دەر بوو، ژ مال و مرۆڤێن خۆ دویرکەفت، ل جهەکی خۆ ڤەدشارت گاڤا خەلک پێ دحەسیا ژ وێرێ دچوو جهەکێ دی.. حەتا جارەکێ والییێ مەکەهێ پێ حەسیای و ئەو گرتی و ب دزی ڤە بۆ حەججاجی هنارتی دا خەلکێ مەکەهێ پێ نەحەسییێن..

## ل دیوانا حەججاجێ ثەقەفی:

سەعیدێ کورێ جوبەیری دەمێ ل مەکەهێ یێ ڤەشارتی فەسادەکی سوحبەتا وی گەهاندە والی، سەعید دبێژت: ((ل مالا خودێ فەسادەکی فەسادی ل من کر، ئەز وی دهێلمە ب هیڤیا خودێ ڤە)) هەڤالەکێ وی دبێژت: گاڤا هاتین سەعید گرتی وی گۆتە مە: ((ئەز دبینم ڤێ جارێ دێ ئێمە کوشتن، وئەز دێ بۆ هەوە بێژم کانێ بۆچی؟ من ودو هەڤالێن خۆ جارەکێ پێکڤە دوعا بۆ خۆ دکرن، گاڤا مە شرینییا دوعایێ تام کری، مە دوعا کر کو خودێ شەهیدبوونێ ب رزقێ مە هەر سییان بکەت، ئەو هەردو یێن شەهید بووین، وڤێ جارێ دۆرا منە)).

وەرن دا هەڤالینییا سەعیدێ کورێ جوبەیری بکەین دەمێ ئەو ل کۆچکا زالمێ عیراقێ هاتییە ئامادەکرن:

ل سەری ژ بیر نەکەن سەعید پیرەمێرە، ژییێ وی نوکە حەفتێ و چار سالە، ریهێن وی یێن سپی رۆناهییەکا پتر ددەنە دێمێ وی یێ گەش، یێ بەرێ خۆ بدەتێ دێ هزر کەت ئەڤە مرۆڤەکە ژ بەحەشتێ هاتی دا دەرسەکێ بدەتە خەلکێ عەردی د بابەتێ خۆگۆریکرنێ دا.

دیسا ژ بیر نەکەن هەردو دەستێن ئیمامی زنجیرەکا وەسا گران یا پێڤە نێزیکە ئەو نشێت زوی ب زوی دەستێن خۆ ژ بەر راکەت و دانت.

بێ دەنگییا ئیمامی پتر هەیبەتێ ددەتە مەوقفی، هێدی ب ژۆرکەفت، چاڤێ وی ب کۆچکێ کەفت، جهێ زالمی یێ ل سەرێ دیوانێ، زێرەڤانێن وی تژی دۆر و ڕەخانە، دویڤەلانکان ژی جهێن خۆ ل کۆچکێ یێن تژی کرین!

ب بەرێخۆدانەکا تژی رەحم و دلپێڤەبوون ڤە ئیمامی بەرێ خۆ دا وان، ما نە تشتەکێ غەریبە خۆ دلێ مرۆڤی ب وی ژی ڤە بت یێ شیرێ خۆ بۆ ستویێ مرۆڤی رویسکری؟

خەلکی دەمێ حەججاج ل ڤی جهی ددیت دەست و پیێن وان ڤەدلەرزین و رحا وان ژ ترسان دا دهاتە سەرێ دفنێ، بەلێ سەعید نە ژ وی ڕەنگێ مرۆڤان بوو، سەعید دەمێ ب ژۆرکەفتی هزرا پێشییەکێ ژی بۆ حەججاجی نەکر، ئیمام ب ژۆرکەفت.. حەججاجی گۆتێ: ناڤێ تە چیە؟

ئیمامی بەرسڤ دا: ناڤێ من سەعیدێ کوڕێ جوبەیرییە.

حەججاج: نە! تو شەقییێ کوڕێ کوسەیریی.

ئیمام: دەیکا من ناڤێ من چێتر دزانت.

حەججاج: شەرمزاری بۆ تە و دەیکا تە بت.

ئیمام: ئێکێ دی غەیبێ دزانت نە تو.

حەججاج: پێش ڤێ دنیایێ ڤە ئەز دێ تە هاڤێمە د ئاگرەکێ شاراندی دا..

ئیمام: ئەگەر من زانیبا ئەڤ تشتە د دەستێ تە دایە ئەز دا پەرستنا تە کەم!

ل ڤێرێ زالم پتر ژ کەربێ هاتە داگرتن، بەلێ.. تو -ئەی حەججاج- چو نینی، و چو ب دەستێ تە نینە، و ئەگەر من زانیبا بەحەشت و جەهنەم ب تەنە من پەرستنا خودێ نەدکر، دا پەرستنا تە کەم.. ئەڤە (مەنطقێ) مرۆڤێن خودێیە، ئەوێن خۆچەماندنێ بۆ خودێ ب تنێ دورست دبینن.

پشتی حەجاجی چەند پسیارەکێن دی ژ ئیمامی کرین د دەر حەقا چەند خەلیفەیەکان دا و مەخسەدا وی ئەو بوو هندەک ئاخفتنان ژێ چێ بکەت دا بۆ خۆ بکەتە هێجەت، بەلێ چو ب دەستان ڤە نەهات.. حەجاجی گۆتێ: تو پتر حەز ژ کیژ خەلیفەی دکەی؟

ئیمامی گۆت: هەچییێ خودێ پتر پێ ژێ رازی بت.

حەجاج: و خودێ پتر ژ کێ ژ وان پێ رازییە؟

ئیمام: خودێ دزانت.

حەجاج: من دڤێت تو د گەل من پێ راست بی.

ئیمام: و من ژی نەڤێت درەوێ ل تە بکەم.

حەجاج: من پێ زانی تو چو جاران ناکەیە کەنی، بۆچی؟

ئیمام: ئەز ژ ئاخێ پێ هاتیمە چێکرن، و ئاخ ب ئاگری دئێتە سۆتن، ڤێجا چاوا ئەز بکەمە کەنی؟

حەجاج: پا بۆچی ئەم دکەینە کەنی؟

ئیمام: چونکی دلێن هەوە نەگەهشتینە..

ل ڤێرێ ناڤبرا ئێکێ ب دوومـاهی دئێت، ب دان و ستاندنێ، و هندەکێ ب رحەتی، حەجاج نەشیا ئیمامی تێ بێخت، ئینا ئسلووب گوهارت و دەست ب ناڤبرا دویێ کر:

حەجاجی فەرمان دا مالەکێ مەزن ژ لۆلۆ و یاقووت و زێران ل بەر سنگێ سەعیدی بێتە دانان، هەر وەکی وی دڤیا ب ڤێ چەندێ و ب رەنگەکێ نە پێ ئێکسەر بێژتە ئیمامی: مە ئەڤە هەمی پێ هەی، پێ د گەل مە بت ئەم دێ ژ ڤی مالی دەینێ.. ئیمام د مەخسەدا وی گەهشت لەو گۆتێ: ئەگەر تە ئەڤ مالە کۆمکر بت دا خۆ پێ ژ ترسا رۆژا قیامەتێ بکری باشە، ژ خۆ ئەگەر ئەو نە بۆ هندێ بت ترسەکا ب تنێ ل وێ رۆژێ بچویکێ ساڤا ژ بیرا دەیکا وی

دبەت، و چو خێر د وی تشتی دا نینە یێ بۆ دنیایێ ب تنێ بت تشتێ پاقژ تێ نەبت.

ئەڤێ ئسلووبی ژی فایدە نەکر، حەججاجی ژ بێ فامییا خۆ ڤیا کەربێن ئیمامی ڤەکەت کانێ چاوا وی کەربێن وی ڤەکرن.. ڕابوو دەست دا ئسلووبێ سێیێ: حەججاجی فەرمان دا هندەک ئامیرەتێن موسیقێ بینن؛ چونکی وی دزانی موسیقە ب دیتنا ئیمامێ تابعییان تشتەکێ حەرامە، و وی گۆتە هندەکان: ل بەر گوهێ وی لێ بدەن. دەمێ سەعیدێ کوڕێ جوبەیری گوهـ ل دەنگێ بلویلێ بووی کرە گری، حەججاجی بۆ تڕانە پێکرن گۆتێ:

- بۆچی تو دکەیە گری؟ ئەڤە یا کەیفێیە.

ئیمامی گۆت: نە.. ئەو یا خەمێیە، پفکرنا بلویلێ بیرا من ل لێدانا بۆرییێ بۆ دەسپێکرنا قیامەتێ ئیناڤە، و خۆ ئەو پەزا داڤێن ڤێ (عوودێ) ژ چەرمێ وێ هاتینە چێکرن ئەو ژی ڕۆژا قیامەتێ دێ ئێتەڕاکرن[1].

حەججاجی گۆت: تێچوون بۆ تە بت سەعید!!

ئیمامی گۆت: تێچوون بۆ وییە یێ ژ بەحەشتێ بێتە لادان و بۆ جەهنەمێ بێتە ڕاخشاندن.

ڤێ گۆتنێ جارەکا دی عەقل ژ سەرێ حەججاجی فڕاند، لەو وی گۆت:

- ئەی سەعید.. ڕەنگەکێ کوشتنێ بۆ خۆ هلبژێرە دا ئەز تە پێ بکوژم، تە دڤێت چاوا ئەز تە بکوژم؟

---

(١) دیرۆک ڤەدگوهێزت کو زرتەکەکێ دی ژی ئەڤ ئسلووبە د گەل هندەک زانایان ب کارئینایە، ئەو ژی ئیبراهیم پاشایێ مصری بوو، دەمێ ل سالا ١٢٣٣ مشەختی وی هێرش دایە سەر وەلاتێ حیجازێ دا گازییا (وەهابییان) -وەکی وی دگۆت- ژ بن ببەت، وی ژی وەکی حەججاجی دەمێ ڤیای هندەک زانایێن سەلەفی بکوژت وی ئامیرەتێن موسیقێ ل بەر گوهان لێدان (أتواصوا بە بل هم قوم طاغون)!

ئیمام: تو ڕەنگەکێ کوشتنێ بۆ خۆ هلبژێرە؛ چونکی ئەز ب خودێ کەمە هەر ڕەنگەکێ تو من پێ بکوژی خودێ ژی ل ئاخرەتێ دێ تە پێ کوژت، ڤێجا تو بۆ خۆ هلبژێرە.

حەجاجی گۆت: تە دڤێت ئەز تە عەفی کەم؟

ئیمامی گۆت: ئەگەر عەفییەک هەبت دێ ژ خودێ بت نە ژ تە.

ل ڤێرێ بێنا حەجاجی تەنگبوو، لەو وی ڤیا مەسەلێ ب دوماهی بینت، ئینا ئەو ل زێرەڤانان خوڕی: وی ببەن بکوژن.

گاڤا وان ئیمام بربیە بەر دەرگەهی، ئیمام کەنی.. کەنییا وی حەجاج دینکر، و هەر جارەکا شەهید ل بەر مرنێ دکەتە کەنی هستریا بۆ زرتەکان چێ دبت، ئاخری وان دڤێت ئەڤێ کەنییێ ژ لێڤان بدزن، ڤێجا ئەڤە چ کەنییە؟

حەجاجی گۆت: کانێ بزڤڕینن..

گاڤا وان ئیمام زڤڕاندی حەجاجی گۆتێ:

- پانێ دبێژن: تو چو جاران ناکەیە کەنی، پا ئەڤە چ کەنییە؟

ئیمام: کەنییا من ژ بەر هندێیە تو چەند ل سەر خودێ پێ بستەیی، و ئەو چەند د گەل تە پێ بێنفرەهە!

ل ڤێرێ شەیتانی چاڤ ل حەجاجی تاریکرن، حەجاج خوڕی: وی بینن ل پێش چاڤێن من سەرژێ بکەن.

هێشتا فەرمان باش ژ دەڤێ (سەرۆکی) دەرنەکەفتی، سەرشۆڕ د فەرمانێ هاتن، جەللاد هات و شیر د دەستان دا.. گاڤا وان سەعید بۆ کوشتنێ درێژکری، وی بەرێ خۆ دا قیبلێ و گۆت: ﴿ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ (الأنعام: ٧٩).

حەجاج ل جەللادی خوڕی: بەرێ وی ژ قیبلێ وەرگێرە.

گاڤا بەرێ ئیمامی ژ قیبلێ هاتییە وەرگێڕان گۆت: ﴿ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِۚ ﴾ (البقرة: ١١٥).

حەججاجی گۆت: وەرگێڕنە سەر زکی.

ئیمامی گۆت: ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ۝ ﴾ (طه: ٥٥).

حەججاجی ب دیناتی ڤە گۆت:

ـ ڤەکوژن دوژمنێ خودێ.. چاوا یێ ئایەتان ددەتە بەر ئێک!

بەری جەللاد شیرێ خۆ یێ هوسی ڕاکەتەڤە دا سەرێ ڤی مرۆڤێ خودێ ژ قالبی ڤەکەت، ئیمامی گۆت:

- ئەز شاهدەیییێ ددەم کو خودایەکێ ب حەق هەیە، و موحەممەد عەبدێ وی و پێغەمبەرێ وییە، ڤێ ژ من بگرە حەتا ئەز و تو ل قیامەتێ ئێک و دو دبینین.. و بەری ئیمام بۆ جارا دووماهییێ شاهدە بدەت نفرینەک کر و گۆت: یا ڕەببی پشتی من تو وی ل سەر کەسێ دی زال نەکە.

ئەگەر مرۆڤەکێ خودێ نەبا هەچییێ دی با دا دوعایەکێ بۆ خۆ کەت کو ئەو ژ دربێ جەللادی ڕزگار بیت، بەلێ مرۆڤێن خودێ هند های ژ خۆ نینە هندی های ژ خەلکی هەی، گرفتاری ئەو نینە ئەو بێتە کوشتن، ئاخری دوعایا وییە بۆ ب جهـ دئێت، گرفتاری ئەوە پشتی وی شیرێ زۆرداریا حەججاجی بگەهتە هندەک بێ گونەهێن دی، لەو وی دوعا بۆ وان کر نە بۆ خۆ. بێژنە من: ڤێ سەرفەرازییێ ژ بلی مرۆڤێن خودێ هوین ل نک کێ دبینن؟

ئیمامی دو جاران شاهدە دا و هێشتا وی جارا سێیێ شاهدەدان ب دووماهی نەئینای شیرێ جەللادی بەری وی ڕاکر، خوینا سەعیدی ئەوا ئاخا دیوانا حەججاجی ئاڤدای، بوو ئەو لەعنەتەکا ل درێژییا پازدە ڕۆژان ل دۆر ستوکورا حەججاجی زڤڕی، حەتا بن ئەو ئاخ کری، ل وان پازدە ڕۆژان هەر

جارەکا حەججاج دنڤست جرفەک ڤێ دکەفت و وەکی دینان ژ خەو ڕادبوو و دکرە هەوار:

- ئەڤە چیە من؟ و سەعیدێ کوڕێ جوبەیری چ د گەل ئێک هەیە؟ هەچی گاڤا ئەز نڤستم ئەو دێ ئێت پیێ من ڕاکێشت و من ب دویڤ خۆ ڤە ڕاخشینت؟

بەری ڕۆژا پازدێ پشتی کوشتنا ئیمامی ب دووماهی بێت حەجاجی ژی سەرێ خۆ بۆ جارا دووماهییێ دانا و ب دویڤ سەعیدی دا چوو؛ دا قەستا مەحکەما مەزن بکەت، وی جهێ سەعیدی ژڤان پێ دایێ..

سلاڤ ل سەعیدێ کوڕێ جوبەیری بت و هەر ئێکێ وەکی وی سەرێ خۆ بۆ زۆرداریێ نەچەماندی.

# سەرکەفتنییێ مەیدانا جەرپاندنێ سەعیدێ کوڕێ موسەییبی

چل سالان نڤێژەکا ب تنێ یا ب جماعەت ژ وی نەچووبوو، دبێژت: بیست سالان من پاتکا کەسێ د نڤێژێ دا نەدیتییە، یەعنی هەرگاڤ ئەو ل ڕێزا ئێکێ بوو.. ئێک ژ حەفت فقهزانێن مەدینێ یێن مەزن بوو، و دگۆتنێ: سەرۆکێ زانایێن مەدینێ، سیهـ و تشتەک هزار زێڕ دانێ، دا گۆتنەکا ب تنێ بێژت کو مفایێ زۆردارەکی تێدا بت، ئەو ل بەر نەهات، و هەرگاڤ وی شیرەت ل هەڤالێن خۆ دکر و دگۆت: ((نە وە بت هوین چاڤێن خۆ ب دیتنا هەڤالێن زالمان ژی تژی بکەن ئەگەر نەڤیانا وان د دلێن هەوە دا نەبت، دا ئەو باشییێن هەوە کرین پویچ نەبن)).

ئەڤ چیایێ زانینێ (سەعیدێ کوڕێ موسەییبی)یە، ڤێ جارێ مە ڤیا هەوە ل دیوانا وی ئامادە بکەین دا بزانین کو خودێ هندەک مرۆڤ هەنە چەنگێ ڕاستییەکا ب تنێ نادەنە ب مالێ دنیایێ هەمییێ..

### سەعیدێ کوڕێ موسەییبی کی بوو؟

* بابێ موحەممەدی، سەعیدێ کوڕێ موسەییبێ کوڕێ حەزنێ قورەیشییە، بابێ وی و باپیرێ وی ژی هەردو ژ صەحابییان بوون، ل ڕۆژا (فەتحا مەکەهێ) موسلمان بووبوون.

* ل سالا دویێ ژ خیلافەتا عومەری -خودێ ژێ ڕازی بت- کو دبتە سالا (١٥) مشەختی، ئەو هاتبوو سەر دنیایێ.

* هەر ژ زارۆکینییا خۆ وی داخوازا زانینێ کربوو، و حەدیس ژ گەلەک صەحابییان وەرگرتبوون وەکی: عوثمانی و عەلی و سەعدێ کوڕێ ئەبوو

وەققاصی و عەبدللاهێ کورێ عەبباسی و ئەبوو هورەیرەی و موعاویەی و عائشایێ.. و گەلەکێن دی. و دبێژن: عەبدللاهێ کورێ عومەری گەلەک کەیف پێ دهات و دگۆت: ئەگەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەڤە دیتبا دا کەیف پێ ئێت.

* هندی ئەو یێ ساخ سەرۆکاتییا زانایێن مەدینێ یا وی بوو، و گەلەک زانایێن تابعییان یێن مەزن وەکی: (عەطائی و موحەممەد ئەلباقری و زوهری) ل بەر دەستێ وی هاتبوونە پەروەردەکرن.

* ل دۆرێن سالا (٧٣) مشەختی، دەمێ خیلافەت د ناڤبەرا عەبدللاهێ کورێ زوبەیری -ل مەکەهێ- و عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی -ل شامێ- هاتییە لێکڤەکرن و فتنە د ناڤ موسلمانان دا پەیدابووی، سەعیدی خۆ نەدا د گەل کەس ژ هەردویان و بەیعە نەدا، لەو وی ژ دەستێ هەردو لایان نەخۆشی دیت.

* سەعید مرۆڤەکێ زێدە زاهد بوو، مالێ دنیایێ ئەو نەدخاپاند و چەند جاران مەزنێن دنیایێ ڤیایە وی ب تێرک و دیارییان بکڕن بەلێ ئەو نەدشیانێ، و حەتا وی ژ دنیایێ بارکری ژی وی ژ کەدا دەستێ خۆ دخوار و پارە ژ مەزنان وەرنەدگرتن.

* ژنکا وی کچا صەحابییێ پێغەمبەری یێ ب ناڤ و دەنگ (ئەبوو هورەیرەی) بوو، لەو بارا پتر ژ حەدیسێن وی ژ ریوایەتا وینە.

* ل سالا (٩٣) مشەختی ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

### کورێ موسەییبی ل دەمێ فتنێ:

مە گۆت: ل دۆرێن سالا (٧٣) مشەختی دوبەرەکی کەفتە ناڤ ریزێن ئوممەتێ پشتی بەیعە بۆ دو کەسان هاتییە دان: عەبدللاهێ کورێ زوبەیری ل مەکەهێ و عەبدلمەلکێ کورێ مەروانی ل شامێ، گەلەک صەحابی و زانایێن تابعییان ژی بەیعە نەدا چو ژ هەردویان و گۆتن: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-

نەهیا مە کرییە کو ئەم د ئێک دەمی دا بەیعێ بدەینە دو کەسان، و دەمێ فتنە ڕوی ددەت دڤێت مرۆڤ خۆ بدەتە پاش، و سەرۆکێ زانایێن تابعییان سەعیدێ کوڕێ موسەییبی ئێک ژ خودانێن ڤێ بۆچوونێ بوو.

گاڤا عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری -خودێ ژێ ڕازی بت- ل مەکەهێ بوویە خەلیفە و گەلەک صەحابی و تابعییان بەیعە دایێ، وی (جابر ئەلئەسوەد) کرە والی و هنارتە مەدینێ.. جابری ڤیا داخوازێ ژ زانایێن مەدینێ بکەت کو ئەو هەمی بەیعێ بدەنە کوڕێ زوبەیری، و ژ بۆ ڤێ ئەگەرێ وی هنارتە ب دویڤ سەعیدێ کوڕێ موسەییبی ژی ڕا؛ و بەیعە بۆ کوڕێ زوبەیری ژێ خواست، بەلێ سەعید ل بەر نەهات و داخوازا وی ب جە نەئینا، و گۆت: حەتا ئوممەت هەمی ل سەر مرۆڤەکی کۆم نەبت ئەز بەیعێ نادەمە کەسێ؛ چونکی چێ نابت بەیعە بۆ دو کەسان د ئێک دەمی دا بێتەدان.

جابری ب ڤێ گۆتنا وی نەخۆش بوو، و دەست دا گەفان، بەلێ سەعید هەر لێڤەنەبوو، ئینا والییێ مەدینێ گەفا خۆ ب جهئینا و شێست جەلدە دانانە ئیمامی، و هنگی ژییێ ئیمامی نێزیکی شێست سالان بوو، پشتی ئیمام هاتییە جەلدەدان وی گۆتە والی: هەچییا تە دڤێت بکە هەما چەند ڕۆژەکن.. و وەسا چێبوو، دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو عەبدللاهێ کوڕێ زوبەیری ب دەستێن حەججاجی هاتە کوشتن، و والییێ وی (جابر) ب دەستێن هەڤالێن عەبدلمەلکی گەهشتە دووماهییەکا ڕەش.

بەلێ بۆ دیرۆک دڤێت بێژین: دەمێ عەبدللاهی ب کاری جابری زانی کاغەزەک بۆ هنارت و گەفێن مەزن ل والییێ خۆ کرن و گۆتێ: نە وە بت جارەکا دی خۆ نێزیکی سەعیدێ کوڕێ موسەییبی بکەی.

کوڕێ زوبەیری ژ مەیدانێ دەرکەفت، و عەبدلمەلک ب تنێ ما، خەلکی هەمییێ -یان پترییا خەلکی- بەیعە دایێ، و دا ئەو پتر شۆلا خۆ موکم بکەت ئەو ڕابوو بەیعە بۆ کوڕێ خۆ وەلیدی ژی ژ خەلکی ستاند، کو پشتی وی ببتە

خەلیفە، سەعید ل بەر ڤێ چەندێ نەهات و بەیعە نەدا وەلیدی، عەبدلمەلکی ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو؛ چونکی وی دزانی بۆچوونا سەعیدی سەنگا خۆ یا گران د تەرازییا ئوممەتێ دا هەیە.

دەمێ عەبدلمەلک -پشتی بوویە خەلیفە- هاتییە مەدینێ، گەلەک کەس چوونە نک و پیرۆزی لێ کر و هەڤالینی د گەل گرێدا.. ل وی دەمی سەعید ل کیڤە بوو؟

وەکی هەر جار بنگەهێ سەعیدی یێ نڤێژکرن و دەرس گۆتنێ مزگەفتا پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن-، نیڤرۆییەکێ خەلیفە ژ خەو ڕابوو گۆتە زێرەڤانەکێ خۆ: هەرە مزگەفتێ بەرێ خۆ بدێ کانێ کی ل وێرییە بێژێ بلا بێتە دیوانا من دا بۆ خۆ سوحبەتێ بکەین.. حەرەسێ خەلیفەی داخوازا وی ب جهئینا و چوو مزگەفتێ، دەمێ ئەو ب ژۆرکەفتی وی دیت پیرەمێرەک ب تنێ یێ ڕوینشتییە عیبادەتی بۆ خۆ دکەت، ئەو چوو هنداڤ سەرێ وی و ب ئیشارەتان گۆتێ: ڕابە د گەل من وەرە.. پیرەمێری خۆ تێ نەگەهاند، ئینا ئەو ب کەرب ڤە چوو نک و گۆتێ: ما تو من نابینی ئەزێ ئیشارەتێ ددەمە تە؟ گۆتێ: تە خێرە؟ حەرەسێ خەلیفەی گۆت: ڕابە د گەل من وەرە (أمیر المؤمنین)ی دڤێت ئێک بێتە نک سوحبەتێ بۆ بکەت.. پیرەمێری گۆتێ: هەرە.. ئەز نە ژ وانم یێن سوحبەتێ بۆ (أمیر المؤمنین)ی دکەن!

زەلام حێبەتی بوو.. ئەڤە کییە؟ زڤڕی نک خەلیفەی و گۆتێ: حال و مەسەلێن من و پیرەمێرەکی ل مزگەفتێ ئەڤەبوون، عەبدلمەلکی گۆتێ: ئەو سەعیدێ کوڕێ موسەییبییە، بەلا خۆ ژێ ڤەکە.

عەبدلمەلکی باش دزانی ئەگەر ئێکِ ل مەدینێ هەبت نەڤێت د گەل وی باخڤت دێ سەعید بت و کەسێ دی نە، لەو ب هەمی ڕێکان ئەو هاتێ کو خۆ ل بەر وی شرین بکەت و چو فایدە نەدا، ڤیا وی بکەتە هەڤالێ خۆ.. نەشیا، ڕابوو ب ڕێکا مالی هاتێ، سیه و تشتەک هزار زێڕ بۆ وی هنارتن، بەلێ وی

زێرەکێ ب تنێ ژی وەرنەگرت و گۆتە قاصدی: من چو پێتڤی ب وان و بنەمالا مەروانی نینە، حەتا ئەز و ئەو بەرانبەری خودێ ڕادوەستین، و ئەو حوکمی د ناڤبەرا من و وان دا دکەت.

ئەڤێ ژی فایدە نەدا..

## جەرباندنەکا ژ ڕەنگەکێ تایبەت:

ئینا خەلیفەی ڕێکەکا دی ب کارئینا: سەعیدی کچەکا نەشویکری هەبوو، گەلەک د قورئانێ و حەدیسێ دا یا زانابوو، و ئەڤە نە عەجێبە، ما ئەو نە کچا سەعیدی و نەڤییا ئەبوو هورەیرەیە؟

عەبدلمەلک ڕابوو هندەک هنارتنە نک سەعیدی دا کچا وی بۆ (ولي العهد)ی بخوازن، بۆ وەلیدێ کوڕێ عەبدلمەلکی ئەوێ پشتی بابێ خۆ دێ بتە خەلیفە، وی هزرکر ئەگەر کچا سەعیدی هاتە د مالا وی دا و کوڕێ وی بوو زاڤایێ سەعیدی، سەعید دێ کەفتە داڤان!

بەلێ ڤێ جارێ ژی یا وی ڤیای چێ نەبوو، ئیمامی خوازگینی دەستڤالا زڤڕاندن، و دەرسەک نە ب تنێ دا خەلیفەی، بەلکی دەرسەکا مەزن دا هەر دەیک و بابەکێ کچەکا شوییان هەبت، کو ئەو ئێمانەتێ د ستویێ وان دا (مەسئوولییەتەکا) د مەزنییا چیایان دایە، دەمێ ژ تە دئێتە خواستن کو تو گۆتنەکێ د دەر حەقا دانەشوییا کچەکا خۆ دا بدەی دڤێت باش هزرا خۆ د پاشەڕۆژا وێ دا بکەی، و مەخسەدا من ب پاشەڕۆژێ نە ئەو بیست سیه سالن یێن کو ئەو د ڤێ دنیایێ دا دبەتە سەری.. نە، ڕۆژەک دێ ئێت تو ب تنێ، ڕویس و رسوا ژ هەر مال و مەنصبەکێ هەبت، دێ ئێیە ئینان، بەرانبەر خودێ تو دێ ڕاوەستی.. هزر بکە ئەگەر وێ ڕۆژێ کچا تە ئەوا تە د دنیایێ دا فرۆتییە جەهنەمێ دا هندەک ڤرێژا دەستان ل خۆ زێدە کەی، ئەگەر ئەو هات و ل نک خودێ دەعوە ل تە کر و گۆت: ئەی خودا ئەڤە بوو بەرێ من دایە ڤێ ڕێکێ.. ئەڤرۆ تو حەقێ من ژێ چێکە.

ئەڤەیە پاشەڕۆژا دورست، هنگی دێ چ کەی؟ وێ ڕۆژێ قائیشا کچا تە یا زێڕی د گەل تە نابت تو خۆ پێ ژ ئاگری بکڕی، مالمەزنی و قەسر و مەنصبێ زاڤایێ تە ژی، هنگی نامینت فایدەکی بگەهینتە تە، ب تنێ هوین و کول و کەسەر دێ پێکڤە مینن.. خەلیفەی، ئەوێ حوکم ل نێزیکی پازدە دەولەتێن مە یێن نوکە دکر، کچا سەعیدێ کوڕێ موسەییبی بۆ کوڕێ خۆ خواست، ئەوێ دێ پشتی بابێ خۆ بتە خەلیفە، ئیمام ل بەر نەهات؛ چونکی وی نەدڤیا کچا خۆ بکەتە د قەسرا زالمەکی ڤە دا سوباهی -ل پاشەڕۆژێ- حەشرا وێ د گەل زالمان نەئێتەکرن!

ب ڤێ چەندێ سەرهاتی ب دوماهی نائێت.. ئیمامی طەلەبەک هەبوو دگۆتنێ: (ئەبوو وەداعە)، مرۆڤەکێ خودێناس بوو، هەر جار ل مزگەفتێ ئامادە دبوو، چەند ڕۆژەکا دیار نەبوو، پشتی هاتییە دەرسێ ئیمامی گۆتێ: تە خێر بوو؟

وی گۆت: ژنکا من ئەمرێ خودێ کربوو، ڤێجا ئەز ژ بەر هندێ یێ موژیل بووم.

ئیمامی گۆتێ: بۆچی تە نەدگۆتە مە، دا ئەم ژی د گەل تە ئێینە سەر زیارەتان؟

پشتی دەرس ب دوماهی هاتی، ئیمامی گۆتێ: تە چو ژنکێن دی بۆ خۆ نەخواستینە؟

ئەبوو وەداعەی گۆت: ما کی دێ ژنکەکێ دەتە من و مالا من هەمییێ ژ دو سێ دەرهەمان پێڤەتر تشتەک تێدا نینە؟

ئیمامی گۆتێ: ئەز!

پاشی وی کچا خۆ، ئەوا نەدایە کوڕێ خەلیفەی، دا خودانێ دو سێ دەرهەمان.

## کچا ئیمامی ل مالا ئەبوو وەداعەی:

ئیمامی هۆسا ب ساناهی کچا خۆ دا ئەبوو وەداعەی، و هوین دزانن داوەتا وان یا ب چ رەنگ بوو؟ ئەبوو وەداعە دبێژت: مەغرەبییا وێ رۆژا ئیمامی گۆتییە من: ئەز دێ کچا خۆ دەمە تە، ئەز د مەزەلکا خۆ ڤە یێ روینشتی بووم، من کارێ فتارا خۆ دکر.

فتارا وی چ بوو؟

دبێژت: پرتەکا نانێ رەق بوو، د گەل سێنیکەکا هندەک زەیت تێدا.. گۆت: من هند دیت ئێکی دەرگەهێ مالا من قوتا، من گۆتێ: تو کییی؟ وی گۆت: ئەز سەعیدم.

سەعید! ئەڤە کیژ سەعیدە ڤێ مەغرەبێ دێ ئێتە نک من؟ گۆت: من هزرا هەمی سەعیدان کر ب تنێ ئیمام تێ نەبت؛ چونکی ئەو چل سال بوو ئیمام ل جهەکی نەهاتبوو دیتن ژ بلی مالا وی و مزگەفتێ، گاڤا من دەرگەهـ ڤەکری و من ئەو دیتی، من د دلێ خۆ دا هزر کر و گۆت: دیارە ئیمام یێ لێڤەبووی لەو یێ هاتی داخوازا لێبۆرینێ دکەت، من گۆتێ: سەیدا! بلا تە هنارتبا ب دویڤ من را ئەز دا ئێمە نک تە، وی گۆت: تو حەقتری ئەم بێینە نک تە.

گۆت: پاشی ئیمامی خۆ دا رەخەکی من دیت تشتەکێ رەش ل پشت وی دیارکر من زانی ئەو ژنکەکە، گۆت: ئەڤە ژنکا تە.. گۆت: ژنک ب ژۆرکەت و ئیمام زڤری، من شەرم کر ئەو شیڤا من ببینت، ئینا من شیڤا خۆ ژ چرایی دویرکر دا ئەو نەبینت.

ب ڤی رەنگی کچا سەعیدێ کورێ موسەییبی هاتە ڤەگوهاستن، و ئەگەر وێ و بابێ وێ ڤیابا ل رۆژا ڤەگوهاستنا وێ ژ دیمەشقێ حەتا مەدینێ دا ئێتە خەملاندن، و ل پتر ژ بازێرەکی شاهی دا ئێتە گێران، بەلێ.. نە! سەعیدی کچا خۆ وەسا ب خودان کربوو وێ ئەو باوەری هەبت کو پرتەکا نانێ رەق و هندەک

زەيت د گەل دو سێ دەرهەمەكان چێترە ژ مەلكاتييەكا ل سەر زۆرداری و كوتەكييێ هاتييە دانان..

### تۆلڤەكرنا خەليفەی:

گاڤا خەليفەی زانی سەعيدی ئەڤ كارە يێ كری، ڤيا تۆلا خۆ ل ئيمامی ڤەكەت.. هوين دزانن چاوا؟

وی كاغەزەک بۆ والييێ خۆ ل مەدينێ هنارت و تێدا گۆتێ: سەعيدی بگرە، و بێژێ بلا بەيعێ بدەتە كورێ من وەليدی، و ئەگەر ئەو ڕازی نەبوو گەفێن كوشتنێ لێ بكە، ئەگەر هەر لێڤە نەبوو تو پێنجی جەلدان لێ بدە و ل سوپكا بازێری بگێرە.. والی مەسەلە بۆ هندەک هەڤالێن خۆ ئاشكەرا كر، ئەو هاتنە نک سەعيدی ل مزگەفتێ و گۆتنێ: والی سێ ڕێک ل بەر تە دانايىنە دڤێت تو بۆ خۆ ئێكێ هلبژێری ئەگەر نە خەليفەی بڕيارا دای ئەو تە بكوژت، يا ئێكێ: دەمێ والی كاغەزا خەليفەی بۆ تە دخوينت تو خۆ بێ دەنگ بكە، نەبێژە: ئە، و نەبێژە: نە، والی يێ قانعە.. ئيمامی گۆت: ئەز ڤێ ناكەم خەلک دێ بێژن: سەعيدی بەيعە دا. وان گۆت: پا چەند ڕۆژەكان بمينە ل مالا خۆ و نەئێ مزگەفتێ دا والی بێژتە خەليفەی: من ئەو نەديتييە.. ئيمامی گۆت: ئەز ڤێ ژی ناكەم، چاوا دەنگێ: (حي على الصلاة، حي على الفلاح) بێتە من و ئەز نەئێمە مزگەفتێ؟ ئەڤە چێ نابت. وان گۆت: پا دێ ژ جهێ خۆ هەرە جهەكێ دی گاڤا ئەو هاتنە تە دێ بێژن: مە ئەو نەديت، وی گۆت: هەوە دڤێت ئەز ژ مرۆڤەكی بترسم؟ بهۆستەكا ب تنێ ئەز ژ جهێ خۆ ناچم..

ئينا ئەو زڤڕينە نک والی و بەرسڤا ئيمامی بۆ بر، والی بڕيار دا ئيمامی ببەنە نک وی، ب ڕێڤە وان گۆتێ: ئەگەر مە تو برييە نک والی د ڤی دەرگەهی ڕا هەرە و د يێ دی ڕا وەرە و خۆ بێ دەنگ بكە، والی چو ددی ژ تە نەڤێت، ئيمامی گۆت: نە.. خەلک دێ بێژن: سەعيدی بەيعە دا، ئەز وە ناكەم.

والی گۆتی: پا (أمیر المؤمنین)ی ئەمرێ من یێ کری ئەز سەرێ تە ببڕم ئەگەر تو بەیعێ نەدەیە کوڕێ وی..

ئیمامی گۆتی: پا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەمرێ مە یێ کری ئەم دو بەیعان پێکڤە نەدەین، پاشی وی ستویێ خۆ بۆ شیری درێژکر!

والی بەرێ خۆ دایێ.. زانی کوشتن ڤی مرۆڤی لێڤە ناکەت، ئینا وی بڕیار دا جلکێن ئیمامی ژ بەر بکەن و کراسەکێ کورت بهێلنە د بەر، و ببەنە بەر حەتاڤێ و ل وێرێ وی ڕاوەستینن و ل بەر چاڤێن خەلکی پێنجی جەلدان لێ بدەن. و هنگی ژییێ وی نێزیکی شێست سالان بوو.

زانایێ ناڤدار (قەتادە) دبێژت: گاڤا وان سەعید ل بەر حەتاڤێ ڕاوەستاندی من گۆتە وی یێ دەستێ من دگرت -و بۆ زانین قەتادە یێ کۆرە بوو-: من نێزیکی وی بکە، گۆت: وی ئەز نێزیکی ئیمامی کرم، و من پسیارێن حەدیسێ و شریعەتی ژێ کرن و وی بەرسڤا من ددا، و خەلکی ئەم ددیتین و ژ مە حێبەتی دبوون، ترسا من ئەو بوو ئەو تشتەکی ل سەعیدی بکەن و ئەز ژ علمێ وی بێبار ببم.

گاڤا ئەو هاتین دا ئیمامی جەلدە بدەن، ژنکەکێ گۆت: وەی بۆ ڤێ شەرمزارییێ! ئیمامی گۆت: ژ شەرمزارییێ ئەم یێن ڕەڤین.. و پشتی سەعید ب ڤی کراسی ل کۆلانێن مەدینێ گێڕای، ڕێ دایێ ئەو بچتە مالا خۆ، بەلێ پشتی وان بڕیار دای و د ناڤ خەلکی دا بەلاڤکری، کو چێ نابت ژ ئەڤرۆ وێڤە کەس ل دیوانا سەعیدی ڕوینت، یان ل دەرسێن وی ئامادە ببت.

پشتی هنگی دەمێ سەعید ل مزگەفتێ دروینشت کەس نەدوێریا خۆ نێزیکی وی بکەت، و ئەگەر مرۆڤەکێ بیانی جارەکێ هاتبا مەدینێ و چووبا نک وی ئەو دا بێژتێ: ئەرێ تە زانییە ئەو ناهێلن کەس ل نک من ڕوینت؟ و مەخسەدا وی ئەو بوو کەس سەرا وی نەئێتە ئێشاندن.

(عەبدللاهێ هوذەلی) دبێژت: گاڤا وان سەعید گرتی ئەز چوومە نک وی ل گرتیخانەیێ، من دیت وان پیستێ پەزەکا سەرژێکری دانابوو سەر پشتا ئیمامی، و هەر جارەکا وی بەرێ خوّ ددا زەندکێن خوّ دا بێژت: یا ڕەببی تو من ب سەر هشامی بێخە، و هشام والییێ عەبدلمەلکی بوو ل مەدینێ.

عەبدلمەلک چوو.. هشام ژی چوو.. و بەری وان جابر ژی چووبوو.. و پشتی وان سەعید ژی چوو، و ژڤان ل نک خودێیە!

﴿ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَيِّ ٱلْقَيُّومِۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ۝١١١ ﴾ (طه: ١١١).

## ئەوێ پێنج چارن شیر بۆ هاتییە ڕاکرن
## (شیخ الإسلام)ێ هەرەوی

د هەڤرکییا خۆ دا د گەل مرۆڤێن دنیایێ، مرۆڤێن خودێ گەلەک ڕەنگێن نەخۆشی و تەنگاڤییێ دبینن، دبت دەرێخستن ژ جهـ و واران ئێک ژ بەرچاڤترینێ وان نەخۆشییان بت.. دەرێخستن (یان بلا بێژین: نەفیکرن) هەر ژ بەرێ وەرە ئێک ژ وان چەکێن چەپەل بوو یێن زۆرداران گەف پێ ل خودانێن حەقییێ و ڕێکا ڕاست دکر، خودایێ مەزن دەمێ سەرهاتییا هەڤرکییا پێغەمبەرێن خۆ و دوژمنێن وان بۆ مە ڤەدگێڕت ل جهەکی ئەمر دکەت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ۝ ﴾ (إبراهيم: ١٣-١٤) یەعنی: ئەوێن کافربووین گۆتە پێغەمبەرێن خۆ: سویند بت ئەم دێ هەوە ژ وەلاتێ خۆ دەرێخین حەتا هوین ل دینێ مە دزڤرن، ئینا خودێ وەحی بۆ پێغەمبەرێن خۆ هنارت کو ئەو دێ وان کافران تێ بەت یێن باوەری ب خودێ و پێغەمبەرێن وی نەئینای. و ئەم دێ دووماهییا باش دەینە پێغەمبەر و دویکەفتییێن وان، و ئەم -پشتی تێبرنا کافران- دێ هەوە ل عەردی ئاکنجی کەین، ئەڤ تێبرنا کافران و ئاکنجیکرنا خودان باوەران ل جهێ وان، کارەکێ مسۆگەرە بۆ وی یێ ژ ڕاوەستانا خۆ یا ل بەر دەستێ من ل ڕۆژا قیامەتێ بترست، و ژ گەف و عەزابا من بترست.

چەکێ مرۆڤێ بێزار ئەوە گاڤا تە حەقی دانا بەر سنگی، و چو هێجەت د دەستێ وی دا نەمان، ئەو دێ دەست ب گەفان کەت، دەمێ پێغەمبەران ڕاستی بۆ مللەتێن خۆ ئاشکەراکری، سەر و گرگرێن کوفرێ چو پێ نەما ئینا

وان گۆت: ئێک ژ دویان، یان هوین دێ ل دینێ مە زڤرن، یان ئەم دێ هەوە ژ عەردێ خۆ دەربێخین.. و باش هزرا خۆ د ڤێ تەعبیرێ دا بکەن ئەوا وەکی خودانێن خۆ یا دارگران: ژ عەردێ خۆ! دێ هەوە ژ عەردێ خۆ دەربێخین! هەر وەکی ئەو عەرد یێ وان ب تنێ و هەچییێ وەکی وان نەبت یێ بیانییە!!

گاڤا هەڤرکی گەهشتە ڤێ دەرەجێ، وەحییا خودێ ئێکسەر بۆ پێغەمبەران دئێت: ﴿ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەڤە ئێک، پاشی ﴿ وَلَنُسۡكِنَنَّكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ ﴾ ئەڤە دو، زالم و زۆردار دێ ئێنە تێبرن، و خودانێن حەقییێ ل جهێ وان دئێنە ئاکنجیکرن.. ئەڤە پەیمانا خودێیە، و نەبوویە کو جارەکێ پەیمانا خودێ ب جهـ نەهاتبت، بەلێ مەسەلێ بێنفرەهی پێ دڤێت. دیرۆکێ بخوینن، هەر ژ دەمێ نووحی و حەتا ئەڤرۆ دا ڕاستییا ڤێ گۆتنێ بزانن.

## (شیخ الإسلام)ێ هەرەوی کییە؟

ب ڤان گۆتنان مە ئاخفتنا خۆ یا ڤێ جارێ دەست پێ کر؛ چونکی ئەو مرۆڤێ خودێ یێ نوکە دێ قەستا میحرابا وی کەین دا چەند دەلیڤەیەکان د گەل دا بژین، ئێک ژ وان کەسان بوو یێن هەمی نەخۆشی د ڕێکا گۆتنا حەقییێ دا هاتینە سەری، پێنج جاران شیر بۆ وی هاتبوو ڕاکرن دا سەرێ وی لێ دەن.. و ئەو لێڤە نەبوو، پشتی ئەو ژ باژێرێ وی هاتییە دەربێخستن، ئیمامێ (بەغەوی) گۆتێ: ((چو قەنجی نەمابوون خودێ د گەل تە نەکرین، ئێک تێ نەبت کو دوژمن تە ژ وەلاتێ تە دەربێخن، ئەو ژی خودێ بۆ تە کر وەکی کو بۆ پێغەمبەرێ خۆ کری))، مەعنا نەفیکرن و دەربێخستنا ژ وەلاتی ب دیتنا مرۆڤێن خودێ قەنجییەکە خودێ د گەل مرۆڤی دکەت؛ دا دەرەجێن وی پێ زێدە ببن.. گۆتنا مە یا ڤێ جارێ دێ ل دۆر (شیخ الإسلام)ێ هەرەوی بت، بابێ ئیسماعیلێ ئەنصاری -خودێ ژێ ڕازی بت-.

* (شیخ الإسلام)، ئیمامێ مەزن، ناڤێ وی یێ دورست عەبدللاهێ کوڕێ موحەممەدێ کوڕێ عەلییێ ئەنصارییە، ئەو ژ دووندەها صەحابییێ ناڤدار

(ئەبو ئەییووبێ ئەنصارییە)، مەزنترین و ناڤدارترین زانایێ وەلاتێ خوراسانێ بوو، و چونکی ئەو خەلکێ بـاژێرێ (هەراتێ)یە دبێژنێ: (شیخ الإسلام)ێ هەرەوی.

* (شیخ الإسلام) ل سالا ٣٦٩ مشەختی، ل باژێرێ (هەراتێ) -ئەوێ نوکە دکەفتە وەلاتێ ئەفغانستانێ- هاتبوو سەر دنیایێ، و هەر ل وێرێ مەزن بووبوو ژی، د زانینا علمێ حەدیسێ دا گەهشتبوو دەرەجا (الحافظ)، و وی پتر ژ دووازدە هزار حەدیسێن پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ژ بەر بوون. و ژ لایێ عەقیدە و بیر وباوەران ڤە ئەو مرۆڤەکێ ڕاست و دورست بوو، و ل سەر ڕێکا ئیمامێ سوننەتێ ئەحمەدێ کوڕێ حەنبەلی -خودێ ژێ ڕازی بت- دچوو، و هەر دەم وی بەرەڤانی ژ عەقیدا (أهل السنة والجماعة) دکر دژی بیر و بۆچوونێن خەلەت و دەستەکێن سەرداچوویی، و سەرا ڤێ چەندێ گەلەک نەخۆشی هاتنە ڕێکا وی.

* ئەو دیرۆکڤانێن ژینا وی نڤیسی دبێژن: ئەو بەلا خودێ بوو ل سەر مرۆڤێن بیدعەچی و نەزان، ل مەیدانا بەرەڤانییا ژ سوننەتێ چیایەکێ سەربلند بوو، چو هرەبا نەدشیان وی بهژینن.. مرۆڤەکێ زێدە زانا بوو، لەو زێدە یێ زاهد ژی بوو، دنیایێ جهێ خۆ د دلێ وی دا نەکربوو، لەو میر و فەقیر ل نک وی وەکی ئێک بوون، سولطان و خەلیفە ژی ژ وی خلاص نەدبوون، دچوو دیوانێن وان و ڕوی ب ڕوی حەقی دگۆتێ و فەرمانا ب باشییێ ل وان دکر، و بەرێ وان ژ خرابییێ ددا پاش، و چو جاران وی خۆ بۆ وان نەدشکاند، بەلێ گاڤا وی زانایەکێ حەدیسێ دیتبا وی هند خۆ بۆ دشکاند دا بێژی یێ ل بەرانبەر سولطانێ ژ هەمییان مەزنتر. هەر ژ بەر ڤێ چەندێ خەلکی حەز ژێ دکر، و دبێژن: ئەو قەدرێ خەلکی بۆ وی دگرت -ئەگەر یا ترسێ نەبا- چو جاران بۆ سولطانێ خوراسانێ نەدگرت.

* ل سالا ٤٧٤ خەلیفێ عەبباسی (المقتدي) کاغەزەک بۆ وی هنارتە (هەراتێ)، و لەقەبێ (شیخ الإسلام، شیخ الشیوخ، زین العلماء) دانا سەر.

* وی چەند کتێبەک دانابوون، بەلێ یا ژ هەمییان ب ناڤ و دەنگتر کتێبا (منازل السائرین) بوو، کو ل دۆر سلووکی و تەصەووفێیە، و زانایێ ناڤدار (ابن القیم)ی شەرحەک ب ناڤێ (مدارج السالکین) ل سەر ڤێ کتێبێ دانایە.

* ل هەیڤا (ذو الحجة) ژ سالا ٤٨١ مشەختی، د ژییێ حەشتێ و چار سالییێ دا، ل باژێرێ (هەراتێ) ئەو چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ.

## (شیخ الإسلام) و بەرەڤانییا ژ عەقیدا دورست:

بەری نوکە ژی مە دیارکر کو د سەدسالێن دەسپێکێ دا ژ دیرۆکا ڤێ ئوممەتێ نەخاسم د سەدسالێن سێیێ و چارێ و پێنجێ دا، و ل بن سیبەرا دەولەتا عەبباسییان بیر و باوەرێن دەستەکا موعتەزلییان ب رەنگەکێ زێدە بەرفرەهـ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبووبوون، و تشتێ مەسەلە زێدەتر ئاسێ کری ئەو بوو موعتەزلییان ب جلکێ بەرەڤانییا ژ ئیسلامێ خۆ نیشا خەلکی دا، لەو شیان -ل هندەک دەمان- هژمارەکا نە یا کێم ژ ئەدیب و نڤیسەران ب لایێ خۆ ڤە بکێشن، هەر وەسا ئەو شیان چەند خەلیفەکێن عەبباسی ژی بگەهینە خۆ، و ڤێ چەندێ کارەکێ زێدە خراب د جڤاکا ئیسلامی دا کر.

مزگەفت و حەلەقێن دەرسان ژی ژ ڤێ کارتێکرنا خراب دپاراستی نەبوون، بەلکی پترین جاران ئەڤ جهە دبوونە مەیدانا سەرەکی یا دان و ستاندنان ل دۆر ڤان مەسەلێن عەقیدێ، لەو زانایێن سەرراست یێن (أهل السنة و الجماعة) خەمەکا مەزن ژ بەرسنگگرتنا بیر و باوەرێن موعتەزلییان خوار، و د دەرس و کتێبێن خۆ دا (ئنحراف) و خەلەتییێن ڤێ دەستەکێ بەرچاڤکرن و ئوممەت ژێ دا پاش، و سەرا ڤی کاری وان نەخۆشییێن مەزن ژ دەستێ موعتەزلییان -و جار ژ دەستێ دەسهەلاتدارییێ- خوارن، بەلێ ڤێ نەخۆشییێ ئەو قەت سست

نەكرن و ئەو ژ ڤی كارێ پیرۆز لێڤە نەكرن، و مە دیت كانێ ڕاوەستانا ئیمام ئەحمەدی بەرانبەر هێرشا موعتەزلییان یا ب چ ڕەنگ بوو.

(شیخ الإسلام)ێ هەرەوی ئێک ژ وان زانایان بوو یێن كو ل سەر وێ عەقیدەیا سوننی یا ڕاست و دورست ئەوا ئیمام ئەحمەدی بەرەڤانی ژێ كری هاتینە پەروەردەكرن، و هەردەم وی د دەرس و نڤیسینێن خۆ دا بەرەڤانی ژ ڤێ عەقیدێ دكر، و سەرا ڤێ چەندێ دەستەكێن (مونحەرف) و كۆمێن بیدعەچی گەلەک نەخۆشی گەهاندێ. (شیخ الإسلام) د گۆتنەكا خۆ دا دبێژت: ((پێنج جاران شیر بۆ من یێ هاتییە ڕاكرن، نەدگۆتنە من: ل گۆتنێن خۆ لێڤە ببە، بەلكی دگۆتنە من: بەحسێ وان نەكە ئەوێن وەكی تە نەبن، من دگۆت: دێ بەحسێ وان كەم)).

## ل دیوانا سولطان ئەلب ئەرسەلانی:

شێخ -وەكی مە گۆتی- خەلكێ باژێرێ هەراتێ بوو، كو ئێک ژ باژێرێن دەڤەرا خەراسانێ بوو، و چونكی ئەو ئێک ژ وان زانایان بوو یێن دوڕوییاتی و حلیسكاتی نەدكر، و هەردەم دەنگێ خۆ ب حەقییێ بلند دكر، (موتەعەصصبێن مەزهەبییان) و (بیدعەچییێن موعتەزلییان) گەلەک دوژمناتییا وی دكر، ل سالا (٤٣٨) مشەختی دەمێ ژییێ وی چل و دو سال، كۆمەكا خودانێن شاشكان، ئەوێن دین بۆ خۆ كرییە ڕێک بۆ كۆمكرنا دنیایێ، ڕابوون خۆ دانە ئێک و گۆتن: دڤێن ئەم حەددەكی بۆ ڤی مرۆڤی بدانین؛ دا بەس ئەو بەحسێ مە بكەت و خەلكی دژی مە ڕاكەت. ڕابوون شاندەک ژ خۆ پێكئینا و قەستا كۆچكا سولطان (ئەلب ئەرسەلانی) ل هەراتێ كرن، و سولطان وە تێ گەهاند كو مانا شێخێ هەرەوی ل باژێرێ هەراتێ گەفەكا مەزنە ل سەر ئیسلامێ، و ئەگەر سولطانی بڤێت خزمەتەكا باش بۆ دینی بكەت دڤێت ئەو وی ژ باژێری دەربێخت، بگرت، بكوژت، نەفی بكەت.. بەس ئەو نەمینتە ل باژێری! سولطان ب گۆتنێن وان هاتە خاپاندن و وی هزركر ڕاستە مانا شێخی خەطەرەكا مەزنە

ل سەر ئیسلامێ، لەو وی هنارتە ب دویڤ ڕا، گاڤا (شیخ الإسلام) ل دیوانا سولطانی ئامادەبووی، سولطانی ب کوشتنێ گەف لێکرن، و گۆتێ: یان ب ڤی شیری دێ سەرێ تە فرینم یان تو دێ ئەزمانێ خۆ کەیە د دەڤێ خۆ و بەحسێ بیدعێن خەلکی ناکەی.. تە چ دڤێت بێژە، بەلێ بەحسێ وان تشتان نەکە یێن کو تو دبێژییێ: بیدعە! شێخی گۆتێ: هەچییا ژ تە بێت بکە، مەسەلا ئەز خۆ ل سەر بیدعە و خەلەتییان بێ دەنگ بکەم ئەڤە نابت!

گاڤا سولطانی دیتی کوشتن ڤی مرۆڤی لێڤە ناکەت، وی بڕیار دا ئەو ب مرۆڤ ڤە ژ باژێڕێ هەراتێ بێتە دەرێخستن و نەفیکرن.

﴿ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ ﴾ چەکەکێ کەڤنە، گەلەکان بەری سولطانی ب کارئینایە، و (شیخ الإسلام)ێ هەرەوی نە ئێکەمین مرۆڤ بوو ژ مرۆڤێن خودێ سەرا حەقییێ هاتییە نەفیکرن، و نە یێ دووماهییێ ژی بوو.

## شێخ ل نەفییێ:

ل سپێدەیا ڕۆژا ئەینییێ بیستی هەیڤا ڕەمەزانێ ژ سالا (٤٣٨) فەرمان هاتەدان شێخ ژ هەراتێ دەرکەڤت، شێخی داخواز ژ وان کر ئەو پیچەکێ دەلیڤەیێ بدەنێ حەتا ئەو نڤێژا خۆ یا ئەینییێ بکەت پاشی دەرکەڤت، بەلێ وان ڕێ نەدایێ و گۆتێ: دڤێت نوکە تو ژ باژێڕی دەرکەڤی. ئینا چو ب وی نەما ئەو ڕابوو عەیالێ خۆ بر و ژ باژێڕی دەرکەفت، و قەستا گوندەکێ ب ڕەخ باژێڕێ هەراتێ ڤە کر، و بارێ خۆ ل وێرێ دانا.. گاڤا دوژمنێن وی زانی چوونێ و گۆتنێ: چێ نابت خۆ تو یێ نێزیکی باژێڕی ژی بی!

شێخ نەچاربوو جارەکا دی مالا خۆ بارکر و قەستا باژێڕەکێ دویر ژ هەراتێ کر، چوو باژێڕێ (بۆشەنجێ)، بەلێ ل وێرێ ژی بیدعەچییان بەلایا خۆ ژێڤە نەکر، و دیسا گۆتنە سولطانی مانا وی ل ڤێرێ ژی خەطەرە؛ چونکی وی دەڤ ژ گازییا خۆ بەرنەدایە، و هەر ل سەر گۆتنا خۆ یێ مجدە.. ئینا سولطانی

بریار دا ئەو ل نەفییێ بێتە حەبسکرن، و د حەبسێ ڤە گەف لێ بێنەکرن کو ئەگەر ئەو ژ گۆتنێن خۆ لێڤە نەبت، ئەو بوو بازێرێ مەرۆیێ ل وەلاتێ پشت رویباری (ما وراء النهر) بێتە هنارتن، و گاڤا چو ب ڤان گەفێن وان ژی ڤە نەهاتی، ئەو رابوون گەفا خۆ ب جهئینا و شێخ نەفی کرە مەرۆیێ.

هەیامەکێ شێخ ما ل مرۆیێ، پاشی ژ وێرێ ژی هاتە دەرێخستن و بەرێ وی بۆ بازێرێ بەلخێ هاتەدان، ل بەلخێ موعتەزلی د دەسهەلاتداربوون، و کەس ل وێرێ نەدوێرییا ب خرابی بەحسێ موعتەزلییان بکەت، دوژمنێن شێخی ئەو هنارتە وێرێ دا ئێک ژ دویان چێ ببت: یان ئەو خۆ بێ دەنگ بکەت، یان ژی موعتەزلی وی ب تەلێفن!

سوحبەت گەهشتە خەلکێ بەلخێ کو ئەڤە شێخ ئەبوو ئیسماعیلێ هەرەوی یێ ب رێڤە دێ بۆ بازێرێ وان ئێتە نەفیکرن، و چونکی وان دزانی نەیارەتییا وی بۆ مەزهەبێ موعتەزلییان چەندە، ئەو رابوون خۆ دانە ئێک و گۆتن: ئەم دێ چینە د رێکا وی دا گاڤا هاتە د بازێری دا، دێ بەران لێ بارینین، و وی رەجم کەین حەتا بکوژین، گاڤا مەزنێ بازێری (ابن نظام الملک) ب کارێ وان ئاگەهدار بووی، ئەو هەمی کۆمکرن و گۆتێ: نە وە بت هوین ڤێ چەندێ بکەن.. ئەگەر هەتکا هەوە دێ چت، و د دیرۆکێ دا دێ شەرمزار بن! شێخ گەهشتە بەلخێ و پشتی هەیامەکێ ل وێرێ مای جارەکا دی فەرمان هاتەدان کو ئەو بزڤرتە بازێرێ مەرۆیێ، و پشتی دەمەکی مایە ل وێرێ بریار هاتەدان ئەو بزڤرتە بازێرێ خۆ هەراتێ ب وی شەرتی کو ل ژێر (إقامە جبریە) بمینت و ژ وەعظ و دەرس گۆتنان بێتە مەنعەکرن. بەلێ ڤێ هەمییێ: گرتنێ، نەفییێ، مەنعەکرنا ژ دەرس گۆتنێ، و (إقامە جبریە)، ترس د دلێ شێخی دا پەیدا نەکر، و ئێکا هند ژێ چێ نەکر ئەو بەژنا خۆ ل بەر نەحەقییا کەسێ بچەمینت.

(ئەبوو نەصر ئەلفامی) خودانێ کتێبا (تاریخ هراة) بەحسێ شێخی دکەت و دبێژت: ((باشییێن وی گەلەک بوون، وەکی: پشتەڤانییا وی بۆ دینی و سوننەتێ، و دژوارییا وی ل سەر دین دوژمن و خودانێن بیدعەیان، وی ژیێ خۆ هەمی د ڤێ چەندێ دا بۆراند بوو، وی چو حلیسکاتی و نەرمی د گەل سولطان و وەزیران نەدکر، سەرا ڤێ چەندێ وی گەلەک نەخۆشی ژ دەستێن حەسوید و دلڕەشان دیتن، پتر ژ جارەکێ ئەو لێ گەڕیان وی بکوژن؛ دا ژ ئەزمانێ وی و دەستێ وی خلاص بن، بەلێ خودێ ئەو پاراست و قەدرێ وی پتر د چاڤێن خەلکی دا مەزن دکر..)).

ئەڤ گۆتنە یا د جهێ خۆدایە و باشترین نیشان ل سەر وێ چەندێ ئەو بوو: ڕۆژا شێخ ژ بازێڕێ هەراتێ هاتییە دەرێخستن کەسێ هەر ئاگەه ژێ نەبوو، و ڕۆژا ئەو بۆ هەراتێ هاتییە زڤڕاندن پشتی نەفیکرنێ، ئەو ڕۆژ ل بەر خەلکی وەکی جەژنێ بوو ﴿وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ ۝٧٠﴾ (الأنبیاء: ٧٠).

# شێخێ زاهدان
# شێخ عەبدلقادرێ گەیلانی

شێـخ عـەبدلقادرێ گـەیلانـی -خودێ ژێ ڕازی بت- ئێـک ژ وان زانـاییێن مەزنە یێن کو د دیرۆکا ئیسلامێ دا پەیدابووین و پێخەمەت چارەسەرییا دەردێن جڤاکا خۆ کارکری، و بزاڤێن مـەزن کرین دا جیلـەکێ وەسا خودان بکـەت کو پەروەردە و زانینێ بهایەکێ مەزن د چاڤێن وان دا هەبت.

گەلەک جاران مرۆڤێن زانا ب خۆ ژی -و مـەخسـەدا مـە ل ڤێرێ زانـاییێن دینینە- دەمێ دینی دئێخنە د قالبێن زانستی یێن هشک دا، و هەمی دەمێ خۆ ب دان و ستاندنێن ل دۆر جەدەلێن فقهی و مـەسـەلێن (فـەلسـەفی) دبۆرینن، دبنە ئەو ئەگەرا مەزن یا دینی ژ دلێن خەلکی دئینتەدەر و ب تنێ د سـەرێ وان دا کۆم دکەن، و وی دکـەنـە هندەک هزر و بیـرێن خورێ مـەنطقی، ل لایێ دی هندەک شێخ پەیدا دبن بۆ سەرڕاستکرنا پێلێ -وەکی ئەو هزر دکەن- ئـەو دینـی ژ سـەرێ خەلکی دئیننەدەر؛ دا د دلی دا بکەنە کۆمەکا مەسـەلێن عـاطفی یێن دویر ژ عەقل و مـەنـطـقـی، ڤێجا هـنـگـی ئـەو ژی دبنـە ئەگـەرا هندێ کو دین ب ڕەنگەکێ نە یێ دورسـت ل بەر چاڤ بێتە دانان؛ چونکی ل سەر دەستێ وان ژی (عەقل) و (دل) ژێک دویر دکەڤن و هەر ئێک ب ڕێکەکێ دا دچت.

ل ڤـان ڕەنگـە دەمـان ئوممـەتـێ پێتڤـی ب وان زانایـان دبـت یـێن کـو سـەرهلدانـەکا رووحی د نـاڤ جڤـاکێ دا پـەیدا دکـەن، دا جڤـاک هـەمـی پێکڤـە (حەقیقەتێ) د چارچووڤەیێ (شریعەتی) دا بناست، و (شریعەتی) ژی ل سـەر بناخەیێ (حەقیقەتێ) ئاڤا بکـەت، نـەکو (شریعەتی) و (حـەقیقـەتێ) وەک دو تشتێن هەڤدژ بناست.

شێخ عەبدلقادرێ گەیلانی -خودێ ژێ ڕازی بت- ئێک ژ ڤان زانایێن خودایی بوو یێن ئوممەتێ پێتڤی ب هەبوونا وان هەی، ڤێجا بۆ بیرئینان مە ڤیا ڤی زانایی ژی ب کورتی ب هەوە بدەینە ناسین.

## گەیلانی کی بوو؟

* زانایێ ناڤدار و سەروەرێ وەلییێن خودێ شێخێ گەیلانی ناڤێ وی یێ دورست عەبدلقادرە کوڕێ عەبدللاهێ کوڕێ جەنگی دۆستێ گەیلانییە، ل سالا (٤٧٠) ل گەیلانێ -یان جەیلانێ وەکی عەرەب دبێژنێ- ئەو هاتبوو سەر دنیایێ، و ل وێرێ وی زارۆکینییا خۆ و پشکەک ژ جحێلینییا خۆ ژی بۆراندبوو بەلێ سەر و بەرێ ژیانا وی ل وێرێ ب فرەهی نەهاتییە زانین، هەر چەندە ژ تشتێن ئاشکەرایە کو ئەو هەر ژ زارۆکینییا خۆ مرۆڤەکێ دیندار و خودێناس بوو، و حەژێکرنا زانینێ و زانایان جهەکێ مەزن بۆ خۆ د دلێ وی دا کربوو، لەو ل سالا (٤٨٨) دەمێ ژییێ وی (١٨) و پێخەمەت داخوازا زانینێ وی قەستا باژێرێ بەغدایێ کر، و زانین ژ هژمارەکا زانایان وەرگرت، وەکی: (أبو الحسين ابن الفراء) و (ابن عقيل) و (أبو سعد المخرمي)، هەر وەسا وی تێکەلییا هژمارەکا شێخێن زاهد و صۆفی ژی کر وەکی شێخ (حماد الدباس)ی، و هەر چەندە ئەڤە شێخەکێ نەخواندەڤا ژی بوو، بەلێ ئەو مرۆڤەکێ خودێناس و زاهد بوو، شێخێ گەیلانی مفایەکێ مەزن بۆ خۆ ژ زوهد و ئەخلاقێ وی کر، هەر چەندە هندەک خەلەتییێن (عەمەلی) د ڕێکا وی ڕا گەهشت بوونێ!

* ژ دەسپێکا سالا (٤٨٨) حەتا سالا (٥٢٠) و ل درێژییا سیه و دو سالان، وی ل باژێرێ بەغدایێ داخوازا زانینێ کر، حەتا ئەو بوویە ئێک ژ ناڤدارترین زانایێن سەردەمێ خۆ، و چونکی شێخ مرۆڤەکێ زاهد بوو، وی گەلەک خەما دنیایێ نەدخوار، لەو ل پترییا ژییێ خۆ ئەو مرۆڤەکێ فەقیر و بەر دەست تەنگ بوو، هەر چەندە ئەو زەنگینییا د دلێ وی دا هەی ئەگەر ل سەر خەلکێ بەغدایێ بەلاڤ کربا دا تێرا هەمییان کەت، دەمێ ئەو یێ جحێل و

هێشتا وی داخوازا زانینێ دکر گەلەک جاران ڕۆژەک یان پتر د سەر وی ڕا دبۆری پارییەکێ ب تنێ ژی ب دەست وی نەدکەت، و ژ تەقواداری و (عیففەتا) خۆ، وی خواستن ژ کەسێ نەدکر و دەستێ خۆ ل بەر کەسێ ڤەنەدگرت، و (تەحەممولا) برس و هەژارییێ دکر، و گەلەک جاران دا چت وی تشتی بۆ خۆ کۆم کەت یێ ژ خەلکی زێدە دبوو و دهاڤێت، دا ئینت و خۆت، د گۆتنەکێ دا شێخ دبێژت: ((جارەکێ من چو نەما ئەز بخۆم، ئینا من دەست ب خوارنا وان تشتان کر یێ خەلکی دهاڤێت، ڕۆژەکێ ئەز چوومە بەر لێڤا ڕویباری دا هندەک تشتێ خەلک دهاڤێت بۆ خۆ کۆم بکەم و بخۆم، من دیت هندەک فەقیران بەری من ڕاکربوو، لەو چو ب دەست من نەکەفت، و ژ برسان دا چو هێز د لەشێ من نەما و نێزیک بوو مرن بێتە ڕێکا من، ئینا ئەز چوومە د مزگەفتەکێ ڤە، من دیت جحێلەک ب ژۆرکەفت و یێ دیار بوو کو ئەو نەعەرەبە، گاڤا ئەو ڕوینشتی نانێ خۆ ئینا دەرێ ب هندەک گۆشتێ براژتی خوار، دەمێ وی پارییێ خۆ ڕادکر ژ برسان دا من دەڤێ خۆ ڤەدکر، وی تێ ئینادەر کو حالێ من یێ نەخۆشە ئینا گازی من کر دا ئەز بچم د گەل وی بخۆم، ئەز ل بەر نەهاتم، دەمێ گەلەک مایە ب من ڤە ئەز نەچاربووم بێی دلێ خۆ من د گەل خوار، گاڤا ئەز چوویمە نک وی وی گۆتە من: تو خەلکێ کیڤەیی و کارێ تە چیە؟ من گۆتێ: ئەز فەقییەکێ گەیلانیمە، وی گۆت: ئەز ژی یێ گەیلانیمە، ئەرێ تو جحێلەکێ گەیلانی دنیاسی ناڤێ وی عەبدلقادرە؟ گۆت: من گۆتێ: بەلێ ئەزم، گۆت وی گۆتە من: ئەڤە ئەز هاتیمە بەغدایێ ئەزێ ل تە دگەڕێم و ئەز ب سەر تە هل نەبوویمە، چی مالێ من هەی هەمی خلاص، لەو ئەز نەچاربووم ڤێ خوارنێ ژ مالێ تە بکڕم، دەمێ ئەز هاتیمە بەغدایێ دەیکا تە هەشت دینار بۆ تە دانە ف من پشتی ئەز ژ تە بێ هیڤی بوویم من بڕیار دا ئەز ڤەگەڕم، بەلێ باش بوو من تو دیتی، ئەڤ خوارنا تو نوکە دخۆی من ژ مالێ تە یا کڕی ڤێجا هەما پشتڕاست بخۆ نوکە ئەز مێڤانێ تەمە)).

ب ڤی ڕەنگی و د سەر ڤێ هەمی زەحمەتێ ڕا شێخ عەبدلقادری صەبر کێشا و بەردەوامی ل سەر داخوازا زانینێ کر، و دەمێ خۆ ب تشتێن بێ مفا ڤە نەدبۆراند، لەو خودێ بەرەکەت هاڤێتە دەمێ وی حەتا ئەو شیای هەر ژ زارۆکینییا خۆ قورئانێ هەمییێ ژ بەر بکەت، و خۆ د هەمی زانینێن شەرعی دا شارەزا بکەت، وەکی: تەفسیرێ، و حەدیسێ، و عەقیدێ، و فقهی و هتد...، و پشتی ئەو ژ قویناغا شاگردەییێ دەرباسبووی، و دەستویری بۆ هاتییەدان کو ببتە سەیدا، و ب دورستی ل سالا (٥٢٠) ل شوینا سەیدایێ خۆ (أبو سعید المخرمي) بوو سەیدا ل مەدرەسا وی، و هژمارەکا مەزن ژ داخوازکەرێن زانینێ قەستا دەرسێن وی کر، و ژ بلی دەرسێن علمی شێخی هندەک ڕوینشتن ل مزگەفتێ بۆ دانا (وەعظی) هەبوون، و ب هزاران مرۆڤ ژ هەمی ڕەنگ و جوینان ل (وەعظێ) وی ئامادە دبوون حەتا وە لێ هاتی جهێ وان د مزگەفتێ ڤە نەکری، لەو شێخ نەچاربوو ژ بازێری دەرکەفت و ل نک شویرهێ ڕوینشت و ل ویرێ -ل چۆلی- دەرس و وەعظ دگۆتن و خەلک لێ کۆم دبوون، پاشی ل وی جهی مزگەفت و مەدرەسا خۆ ئاڤاکر ئەوا ب ناڤێ وی ناڤداربووی.

* شێخی بارا پتر ژ دەمێ خۆ ل مزگەفت و مەدرەسێ دبۆراند، کوڕێ وی عەبدلوەهاب دبێژت: ((بابێ من حەفتییێ سێ ڕۆژان بۆ خەلکی دئاخفت: سپێدەییا ئەینییێ، و ئێڤارییا ئێکشەنبێ، و ئێڤارییا سێشەنبێ، و هژمارەکا مەزن ژ تێگەهشتی و فقهزان و شێخان ل دەرسێن وی ئامادە دبوون، چل سالان وی وەعظ ل خەلکی کر ژ سەرێ سالا (٥٢١) و حەتا سالا (٥٦١)، و سیه و سێ سالان وی ل مەدرەسا خۆ دەرس و فەتوا ددان، ژ سالا (٥٣٨) حەتا سالا (٥٦١)، و دەمێ ئەو دئاخفت چارسەد مرۆڤان ل دیوانا وی ئاخفتنا وی دنڤیسی)).

زانایێ ناڤدار (ابن الجوزی) دبێژت: دەمێ وی وەعظ دکر هژمارەکا مەزن یا گونەهکاران ل سەر دەستێ وی تۆبە دکر.

ژ لایێ زانینێ ڤە گەلەک جاران دەمێ مەسەلەک ل بەر زانایێن عیراقێ ئاسێ ببا دا چنە نک وی، و داخوازا فەتوایێ ژێ کەن، هندی هند زانینا وی یا بەرفرەهـ بوو، و ژ بەر کو ل سەر دەمێ وی گەلەک بیر و باوەرێن خەلەت و دویر ژ راستییا ئیسلامێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ بووبوون ب رێکا صۆفیاتییێ و فەلسەفا یۆنانی، گەلەک جاران شێخی د دەرس و وەعظێن خۆ دا -هەر وەسا د کتێبێن خۆ ژی دا- ئاشکەرا دگۆت: ((عەقیدا مە یا سەلەفییە وەکی وێ یا صەحابییان باوەری پێ هەی)) وەکی ئیمامێ ذەهەبی ژێ ڤەدگوهێزت. ژ بەر ڤێ چەندێ وی دەمێ خۆ ب گۆتنا وان دەرسان نەدبۆراند یێن بەحسێ (علم الکلام) و فەلسەفێ تێدا، (شیخ الإسلام ابن تیمیه) ژ سەیدایێ سەیدایێ خۆ (شهاب الدین السهروردی) ڤەدگوهێزت، دبێژت: من ڤیا (علم الکلام)ی بخوینم، ئینا ئەز رابووم چوومە نک شێخ عەبدلقادری دا پسیارا خۆ پێ بکەم، بەری ئەز سوحبەتا خۆ بۆ بکەم وی گۆتە من: ((ئەی عومەر، ئەو نە ژ وان علمانە یێن مرۆڤ د قەبری دا مفایی ژێ دبینت، ئەو نە ژ کارێ قەبرییە)).

ژ بەر زانینا وی یا زێدە ب مەنهەجێ راست و دورست و پێگیرییا وی یا توند ب رێبازا صەحابی و پێشییێن ئوممەتێ یێن چاک، خودانێن عەقیدێن خەلەت و رێکێن چەپ و چویر نەدشیان وی د سەر دا ببەن، شێخ عەبدلقادر د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((جارەکێ رۆناهییەکا مەزن ل بەر چاڤێن من ئاشکەرابوو عسمان تژی کر، پاشی وەکی شکلەکی هاتە خوارێ و گۆتە من: ئەی عەبدلقادر ئەز خودایێ تەمە، و من تشتێن حەرام یێن بۆ تە حەلالکرین، گۆت: من گۆتێ: دویرکەڤە لەعنەتی، ئەڤ رۆناهییە تاریاتییە و ئەڤ شکلە دوکێلە، گۆت: وی گۆتە من: ئەی عەبدلقادر تو ب زانینا خۆ ژ من رزگاربووی، بەری تە حەفتێ ژ خودانێن طەریقێ من یێن دسەردا برین، من گۆت: حەمد بۆ خودێ بت. هندەکان گۆتێ: چاوا تە زانی ئەو شەیتان بوو؟ گۆت: دەمێ وی گۆتییە من: تشتێن حەرام من بۆ تە حەلالکرن)).

ئەو دیرۆکنڤیس و زانایێن بەحسێ وی دکەن هەمی ل وێ باوەرێنە کو شێخ عەبدلقادر مرۆڤەکێ پیرۆز و خودێناس و زاهد بوو، ژ ڕاستییێ پێڤەتر چو ئاخفتن ژ دەڤی دەر نەدکەفتن، و د هندەک سەرهاتییان دا ژێ دئێتە ڤەگوهاستن کو دەیکا وی دەورەکێ مەزن د ڤێ چەندێ دا هەبوو؛ چونکی هەر ژ بچویکاتی وێ ئەو فێری ڕاستییێ کربوو و دگۆتێ: چو جاران درەوێ نەکە، و ل دۆر سالۆخەتێن وی دیرۆکنڤیس دبێژن: بێ دەنگییا وی ژ ئاخفتنا وی پتر بوو، و ئەگەر بۆ نڤێژێ نەبا ئەو چو جاران ژ مەدرەسێ دەرنەدکەفت، و چو جاران وی خۆ ژ گۆتنا حەقییێ نەددا پاش، و ژ خودێ پێڤەتر ئەو ژ کەسێ نەدترسیا، و تشتێ ژ هەمییێ مەزنتر یێ شێخی د ژیێ خۆ دا کری، ژ بلی پەروەردەکرنا هژمارەکا مەزن ژ زانا و زاهدان، ئەو بوو شێخی ب زانین و زوهدا خۆ شیابوو وێ دویراتییێ چارەسەر بکەت یا کو ل دەمێ وی کەفتییە ناڤبەرا زانا و فەقیهان دا ژ لایەکی ڤە، و زاهد و شێخێن تەصەوفێ ژ لایەکێ دی ڤە، چونکی زانین و عەقیدا وی یا دورست ئەو ل نک زانایان کربوو جهێ باوەرێ، و زوهد و صووفیاتییا وی ژ لایەکێ دی ڤە ئەو ل نک شێخێن تەصەوفێ ژێ کربوو جهێ باوەرێ، و وی ب ڤێ چەندێ شیا خەلەتییا هەر لایەکی بۆ لایێ دی ئاشکەرا بکەت، و بەرێ هەردو لایان بدەتە ئەوی مەنهەجێ ڕاست و دورست یێ صەحابی ل سەر دچوون و زانین و زوهد هەردو د ناڤ خۆ دا حەواندی.

### بەرهەمێ شێخ عەبدلقادرێ گەیلانی:

شێخ عەبدلقادرێ گەیلانی د ژیێ خۆ یێ ب بەرەکەت دا پتر پویتە ددا لایێ خۆپاقژکرن و پەروەردەکرنا مرۆڤان، لەو پترییا دەمێ خۆ وی ب گۆتنا وەعظی و دانا دەرسان ڤە دبۆراند، هەر ژ بەر ڤێ ئەگەرێ بوویە وی بەرهەمەکێ نڤیسی یێ بۆش ل پشت خۆ نەهێلایە، و د گەل کێمییا بەرهەمێ وی یێ نڤیسی مرۆڤ دشێت ب پشتڕاستی بێژت: شێخ ئێک ژ زانایێن مەزن بوویە، و ئەگەر وی پتر ژ دەمێ خۆ ب نڤیسینێ ڤە بۆراند با ئەو دا پەرتۆکخانەیەکا مەزن

بۆ ئوممەتێ ل پشت خۆ هێلیت کو هەر و هەر مفا ژێ بێتە دیتن، بەلێ دیارە شێخ ژ وان ڕەنگە زانایان بوو یێن ئەو باوەری هەی کو مرۆڤێ زانا نە ب تنێ ب ڕێکا دانانا کتێبان دشێت خزمەتێ بگەهینتە زانینێ، بەلکی ب ڕێکا پەروەردەکرنا زانایان ژی ئەو دشێت خزمەتەکا مەزن بگەهینتە ئوممەتێ.

شێخ عەبدلقادری -وەکی دیرۆکنڤیس ژێ ڤەدگوهێزن- ل مەدرەسا خۆ سێزدە علم ب دەرسینی دگۆتنە شاگردەیێن خۆ، بگرە ژ تەفسیرێ و حەدیسێ و ئوصوولێ، حەتا فقهی و نەحوێ و صەرفێ، و د عەقیدێ و فقهی دا ئەو ل سەر مەزهەبێ ئیمام ئەحمەدی بوو، و فەتوایێن وی ژی هەر ل سەر ڤی مەزهەبی بوون، لەو شێخ دئێتە هژمارتن ئێک ژ زانایێن مەزهەبێ حەنبەلی.

ئەو کتێبێن شێخ عەبدلقادری هەین ل سەر دو پشکان دئێنە لێکڤەکرن:

١- ئەو کتێبێن وی ب خۆ د ژیانا خۆ دا نڤیسین و بەلاڤکرین.

٢- ئەو کتێبێن مورید و شاگردەیێن وی پشتی وی ب ناڤێ وی کۆمکرین، و گۆتن و کریارێن وی تێدا نڤیسین.

ئەو کتێبێن شێخی ب خۆ نڤیسین، و هەر د ژیانا وی دا ب ناڤێ وی بەلاڤبووین سێ کتێبن:

١- کتێبا (الغنیة لطالبي الحق) و ئەڤە ژ باشترین کتێبێن فقهی و عەقیدێ و ئادابانە، ژ بلی هندەک صەلەوات و زکر و دوعایێن نەشەرعی کو تێدا هاتینە.

٢- کتێبا (فتوح الغیب) و ئەڤە ل دۆر گەلەک گۆتن و شیرەتان دزڤڕت، و هندەک مەسەلێن پەیوەندی ب نەفسێ ڤە هەین تێدا هاتینە، و (شیخ الإسلام ابن تیمیه)ی -خودێ ژێ ڕازی بت- هندەک بابەتێن ڤێ کتێبێ یێن شرۆڤەکرین.

بۆ زانین هندەک شعر ب ناڤێ شێخ عەبدلقادری ل سەر ڤێ کتێبێ یێن هاتینە زێدەکرن و ئەو ب خۆ نە ژ نڤیسینا شێخینە؛ چونکی گەلەک تشتێن

خەلەت و نەشەرعی ییێن تێدا هەبن، و نە تشتەکێ بەرعەقلە شێخ ڤان گۆتنان بێژت.

٣- کتێبا (الفتح الرباني) و ئەڤە هندەک شیرەت و نصیحەتن پەیوەندی ب باوەرییێ و سلووکی و ئیخلاصێ ڤە هەنە.

هندەک کتێبێن دی ژی هەنە بۆ شێخی دئێنە پالدان، وەکی کتێبا: (الأوراد القادرية) و(السفينة القادرية) و(الفيوضات الربانية)، بەلێ ئەو نە ژ دانانا وینە؛ چونکی ئەو دیرۆکنڤیسێن ژینا وی نڤیسی کەسێ نەگۆتییە شێخی هندەک کتێب ب ڤان ناڤان هەنە، و وەسا دئێتە هزرکرن کو هندەک کەسێن خۆ ب موریدێن شێخی ددەنە نیاسین ئەڤ کتێبە ب ناڤێ وی دانایینە و گەلەک هزر و بیرێن خەلەت -یێن شێخی هەر باوەری پێ نەدئینا- ل سەر ناڤێ وی نڤیسینە.

### ژ شیرەتێن شێخی یێن تەربەوی:

مە گۆت شێخ عەبدلقادی پویتەیەکێ مەزن ددا لایێ پەروەردەکرنێ، و وەعظ و خوتبە و گۆتنێن وی کارەکێ مەزن د خەلکی دکر، و سەیدا (أبو الحسن الندوي) ئەگەرا ڤێ ئێکێ بۆ هندێ دزڤڕینت کو شێخ خودانێ نەفسەکا پاقژ و بژوین بوو، و وی دلەکێ تژی زوهد و قەناعەت هەبوو، ئەوێن باوەرییا وان یا لاواز دەمێ دچوونە دیوانا وی و گوهێ خۆ ددا گۆتنێن وی ب خۆشییێ دحەسیان و وە هەست دکر کو باوەرییا وان یا ب هێز دکەڤت، ئەوێن شک و گومان د دلی دا هەی ل نک وی رحەتی و تەناهی ددیت، ئەوێن حەز ژ زانینێ دکر زانین ل نک وی ددیت، خۆ مرۆڤێن خاڤ و سست ژی ئەوێن خیرەت نەدکر چو بکەن گاڤا ئەو ددیت دلێن وان تژی حەماسەت دبوو، و بەرێ وان دکەفتە کرنا باشییێ، مەعنا: هەر کەسەکی خۆشی و رحەتی و تەناهی بۆ خۆ د گۆتنێن وی دا ددیت، دا بێژی ئەو منارەیەکا سەر بلندا باوەرییێیە د نیڤا بەحرەکا تاری و تژی پێل دا، یا کو خەلک هەمی پێ ب رێکا خۆ دکەڤن، شێخی گۆتنا خۆ بۆ

هەمی تەخ و چینێن جڤاکێ پێشکێش دکر و خێر بۆ وان هەمییان دخواست، لەو هەمییان پێکڤە حەز ژێ دکر و ل دۆرێن وی کۆم دبوون. و ئەگەر مرۆڤ ل کتێبێن وی بزڤڕت، دێ بینت مەزنترین شیرەتێن وی ل هەڤال ودویکەفتییێن خۆ دکرن ئەڤە بوون:

١- شێخی دگۆت: خۆ گەلەک ژ سویندخوارنێ بدە پاش، و نە وە بت تو سویند بخۆی نە ژ ڕاستی نە ژ درەو و نە ب خەلەتی ڤە، و ئەو کەسێ ڤێ چەندێ بکەت، یەعنی خۆ ژ سویندێ بدەتە پاش، خودێ دەرگەهێ ڕۆناهییا خۆ ل بەر وی دێ ڤەکەت، ب ڕەنگەکێ وەسا کو ئەو مفایێ وێ د دلێ خۆ دا ببینت، و دەرەجێن وی د چاڤێن خەلکی دا دێ بلند بن، لەو خەلک دێ چاڤ ل وی کەن و هەیبەتا وی د چاڤێن وان دا دێ زێدە بت.

٢- خۆ ژ درەوێ بدەنە پاش، چ یا ژ دل بت چ ب یاری ڤە بت؛ چونکی ئەو کەسێ خۆ ژ درەوێ دویر بکەت خودێ سنگێ وی دێ فرەهـ کەت، و زانینا وی دێ پاقژ کەت، و ئێدی درەو ڕێکا خۆ ل نک وی نابینت، و دێ وە لێ ئێت کو بۆ وی نەخۆش بت ئەو درەوینەکی ببینت.

٣- هشیار بی سۆزەکێ نەدەی پاشی لێڤە ببی، و هندی ژ تە بێت چو سۆزا نەدە و ل سەر خۆ نەکە مال، و هەچییێ سۆزا خۆ نەشکێنت دەرگەهێ مەردینییێ دێ ل بەر وی ئێتە ڤەکرن، و دێ ژ مرۆڤێن ژ خۆ شەرم ئێتە هژمارتن، و مرۆڤێن ڕاستگۆ هەمی دێ حەز ژ وی کەن، و قەدرێ وی ل نک خودێ دێ پێ زێدە بت.

٤- نەفرەت و لەعنەتێ ل کەسێ نەکە، و نەخۆشییێ نەگەهینە کەسێ؛ چونکی مرۆڤێن چاک و صالح لەعنەتێ ل کەسێ ناکەن و نەخۆشییێ ناگەهیننە کەسێ، و یێ ب ڤی ڕەنگی بت دووماهییەکا باش دێ ب دەست وی ڤە دئێت، د دنیایێ دا خودێ دێ وی پارێزت و نەخۆشییان ژێ دەتە پاش، و وی ل بەر خەلکی شرین دکەت.

٥- نفرینان ل کەسێ نەکە، خۆ ل وی ژی یێ زۆرداری ل تە کری؛ چونکی ئەڤ سالۆخەتەیە یێ دەرەجێن تە بلند دکەت، و یێ ئەڤ چەندە بۆ وی ببتە تبیعەت ل دنیایێ و ئاخرەتێ دێ یێ سەرفەراز بت، ل دنیایێ خودێ حەژێکرنا وی دێ کەتە د دلێ هەمی خەلکی دا، یێ وی بنیاست و یێ نەنیاست دێ حەز ژێ کەت.

٦- وە نەبت شاهدەیێ ب شرکێ یان کوفرێ یان نفاقێ ل سەر ئێکی ژ خەلکێ قیبلێ بدەی؛ چونکی ئەو یا د علمێ خودێ دا، و ئەڤ چەندە پتر مرۆڤی نێزیکی رەحما خودێ دکەت.

٧- خۆ ژ گونەهان بدە پاش و ئەندامێن لەشێ خۆ ژ کرنا گونەهێ بپارێزە؛ چونکی ئەڤ چەندەیە دبتە ئەگەرا هندێ مرۆڤ ل دنیایێ و ئاخرەتێ زوی خێرێ ب دەست خۆ ڤە بینت.

٨- زەحمەتێ بۆ کەسێ چێ نەکە و منەتا وان نەهلگرە؛ چونکی ئەو کەسێ ژ خەلکی بێ منەت بت سەرفەرازی و بلندییا تەقواداران دێ ب دەست خۆ ڤە ئینت، و ئەڤ چەندە پتر دێ هاری وی کەت کو ئەو فەرمانا ب باشییێ ل خەلکی بکەت و وان ژ خرابییان بدەتە پاش؛ چونکی وێ گاڤێ خەلک هەمی ل بەر وی دێ وەکی ئێک بن، و ئەگەر وی وە کر باوەری و خۆ زەنگینکرنا وی ب خودێ دێ وی ژ خەلکی هەمییێ بلندتر لێ کەت، و د سەر هندێ ژی ڕا ئەڤە دەرگەهەکە ژ دەرگەهێن ئیخلاصێ.

٩- دلێ خۆ نەبە وی تشتی یێ د دەستێ خەلکی دا، ئەڤەیە زەنگینییا مەزن و باوەرییا صافی و سەربلندییا دورست؛ و ئەڤە دەرگەهەکە ژ دەرگەهێن زوهدێ و نیشانەکە ژ نیشانێن مرۆڤێن خودێ ئەوێن خۆ دهێلنە ب هیڤییا وی ڤە.

١٠- خۆ مەزن نەکە، و ئەڤە سەرەکانییا هەمی سالۆخەتێن چاکە، و ئەوێ خۆ مەزن نەکەت دێ گەهتە دەرەجا عەبدێن خودێ یێن چاک و تشتێ وی بڤێت

ژ خێرا دنیایێ و ئاخرەتێ دێ گەهتێ، و ژ خۆنەمەزنکرنێیە تو خۆ ژ کەسێ باشتر نەبینی، ئەگەر یێ ژ تە بچویکتر بت بێژە: وی هندی من گونەهـ نەکرینە، و ئەگەر یێ ژ تە مەزنتر بت بێژە: من هندی وی باشی نەکرینە.

## مرنا شێخی:

وەکی مە گۆتی: شێخ عەبدلقادر ل باژێرێ گەیلانێ ل سالا (٤٧١) مشەختی هاتبوو سەر دنیایێ و دەمێ ژییێ وی نێزیکی هەژدە سالییێ وی قەستا باژێرێ بەغدایێ کر، و ل وێرێ ئاکنجی بوو، حەتا ئەو چوویە بەر دلۆڤانییا خودێ ل شەڤا شەنبییێ هەشتی هەیڤا (ربیع الأول)ێ ژ سالا (٥٥١) مشەختی، دەمێ ژییێ وی حەشتێ سال، و ئاشکەرایە کو ئەو ل نێزیکی مەدرەسا خۆ ل باژێرێ بەغدایێ هاتە ڤەشارتن، و هژمارەکا مەزن ژ خەلکی پشکداری د ڤەشارتنا وی دا کر.

خودێ ژێ ڕازی بت و جهێ وی بکەتە بەحەشت، د گەل پێغەمبەر و شەهید و چاکێن خۆ.

# مرۆڤێن خودێ
# و جیهادا د ڕێکا خودێ دا

بەری ئەم قەستا دیوانا شێرێ جیهادێ (صەلاحەددینێ ئەییووبی) بکەین یا د جهـێ خـۆ دایـە ئـەم ل فـەرهـەنگـا مـرۆڤێن خـودێ بزڤـرین دا بـزانین کـانێ تێگەهشتنا وان بۆ جیهادێ یا چاوا بوو..

ب ڕاستی ڤیانا مرۆڤێن خودێ بۆ جیهادا د ڕێکا خودێ دا گەلەک ژ هندێ مەزنترە کو کەسەک بشێت ب گۆتنەکا کورت دەسنیشان بکەت، و ب تنێ شیرێ خودێ خالـدێ کوڕێ وەلیـدی شیایە نێزیـک ببت دەمـێ د کاغـەزەکا خـۆ دا بـۆ مەزنێ لەشکەرەکێ کافران نڤیسی: ((ئەزێ هاتیم هندەک زەلام مـن یێن ئینانینە تە هند حەز ژ مرنێ دکەن هندی هوین حەز ژ ژینێ دکەن)).

بەلێ.. مرۆڤێن خودێ هند حەز ژ جیهادێ و مرنا د ڕێکا خـودێ دا دکـەن، هندی مرۆڤێن دنیایێ حەز ژ ژینـێ و مانـا د دنیـایێ دا دکـەن.. مـرۆڤێن خـودێ کانێ چاوا د مـەیـدانـا حـەژێکرنا خودێ و ڕەڤینا ژ مـەزنێن دنیـایێ دا هـەردەم ل پێشییێ بوون، وەسا د مەیدانا خۆگۆریکرنا د ڕێکا خودێ ژی دا ئەو سەرکێش بـوون، ئـەو ڕۆنـدکێن وان ل شـەڤێن درێـژ ژ ترسـێن خـودێ دا دبارانـدن ژ وان چپکێن خوینێ دکێمتر نەبوون یێن وان ل مەیدانا جیهادێ بۆ خودێ دڕێتن.

یـەحیـایێ کـوڕێ ئـەبوو کـەثیـری د گۆتنـەکـا خـۆ دا دبێـژت: ((ل دو دەمـان بـەحـەشـت دئێتـە خـەملانـدن: ل دەمـێ نڤێـژێ، و ل دەمـێ شـەڕی)). ژ بـەر ڤـێ چـەنـدێ ئێـک ژ وان گاڤـا دچـوو د نڤێـژێ دا تـو دا بێـژی ئـەو یـێ ژ دنیـایێ دەرکەفتی و ل بەحەشتێ یێ ئامادەبووی، و ئێک ژ وان گاڤا ل مەیدانا جیهادێ ژی حازر دبوو ئەو دا بێژتە هەڤالێن خۆ: خۆ ژ ڕێکا من ڤەدەن بێهنا بـەحـەشـتێ

ژ نهالا هه یا دئێته من! و د گۆتنەکا دی دا یەحیایێ کوڕێ ئەبوو کەثیری دبێژت: ((شەش سالۆخەت هەنە هەچییێ ئەو سالۆخەت ل نک هەبن ئەوی باوەرییا وی یا تمامە: کرنا شەڕێ دوژمنێن خودێ ب شیری، و ڕۆژیگرتنا ل هاڤینێ، و شویشتنا دەسنڤێژێ ب تمامی ل زڤستانێ، و چوونا نڤێژێ زوی ل ڕۆژا بارانێ، و هێلانا هەڤڕکییێ ئەگەر خۆ خودان یێ حەق ژی بت، و صەبرا ل سەر موصیبەتێ)).

مەعنا ب دیتنا مرۆڤێن خودێ جیهاد سەردەفتەرا هەمی خێرانە؛ چونکی جیهاد ژ بلی کو ب جهئینانا فەرمانا خودێیە، ئەو سەرکەفتنەکە مرۆڤ دژی دلچوونێن خۆ ب دەست خۆ ڤە دئینت، شاهدەدانەکە ل سەر هندێ کو مرۆڤی ڤیانا دنیایێ هاڤێتییە، ڤێجا یا عەجێب نینە جیهاد ب دیتنا وان ئەو گەمی بت یا کو مرۆڤی ژ هەمی پێلێن تێچوون و نەمانێ ڕزگار بکەت.

مرۆڤێ عەدەتی گەلەک جاران حێبەتی دمینت دەمێ پێشڤەچوونا ڤان مرۆڤان بۆ بەرۆکێن جیهادێ دبینت یان گوهـ لێ دبت: کوڕ دبێژنە بابێ خۆ یێ سەقەت: تو نەئێ جیهادێ خودێ ل تە ناگرت، باب ل وان دخوڕت: ب خودێ ئەز هنگی ڕادوەستم حەتا ڤی پییێ خۆ یێ شل دکەمە د بەحەشتێ دا.. و دچت و شەڕی دکەت حەتا شەهید دبت.

سەرۆکێ لەشکەری دبێژتە زەلامەکی: تە چاڤ نینن خودێ ل تە ناگرت تو بزڤڕەڤە، ئەو لێ ڤەدگێڕت: چونکی من چاڤ نینن لەو ئەز دێ ئێم، کانێ تو ئالایێ لەشکەری بکە د دەستێ من دا، ئەز وان نابینم کو ژ وان برەڤم.. و دچت و دچت حەتا دئێته سەرژێکرن! ڤیانەکا مەزنە بۆ خۆگۆریکرنێ.

عەمرێ کوڕێ عوتبەی ئێک ژ عاشقێن جیهادێ بوو، ڕۆژەکێ د گازییا جیهادێ دەرکەفت، بەرانبەر لەشکەرێ ڕۆمێ ڕاوەستا، کراسەکێ نوی یێ سپی کربوو بەر خۆ، گەلەک ژێ دهات، هندەک هەڤالێن وی گۆتێ: چەند جلکێن تە دخوشکۆکن. وی گۆت: دێ خوشکۆکتر لێ ئێن دەمێ خوین ب سەر ڤێرێ دا

دئێته خوارێ! چ عشقەکا غەریبە بەلێ ل بەر مە، نە ل بەر مرۆڤێن خودێ.
پاشی عەمری گۆت: سێ داخواز من ژ خودێ کربوون، دو یێن داینە من و ئەز یێ ل هیڤیا یا سێیێ، من داخواز ژێ کربوو ئەو دنیایێ ل بەر دلێ من سار کەت، ڤێ گاڤێ ل نک من خەم نینە چ بێت چ بچت، و من داخواز ژێ کربوو ئەو زیرەکییێ ل سەر کرنا نڤێژێ بدەتە من، ئەو ژی دا من، و من داخواز ژێ کربوو ئەو شەهیدبوونێ ب رزقێ من بکەت، و ئەزێ ل هیڤییێ.

پاشی وێ رۆژێ لێ نەبوو ئێڤار حەتا مرادا وی یا سێیێ ژی بۆ ب جهـ هاتی!

و مرۆڤێن خودێ د ڤێ ڤیانا خۆ دا دقەلس و چریک نەبوون، وان دڤیا عەیالێ وان ژی ل سەر ڤێ رێکێ بن.. شەقیقێ کورێ سەلەمەی دبێژت: ((ئەگەر من کورەک هەبت شەڕی د رێکا خودێ دا بکەت ل بەر من خۆشترە ژ هندێ کو سەد هزار بگەهنە من)).

مرۆڤێن خودێ ل چلخانەیان سەری ناهەژینن، و وەکی دەهبەیان ل شەکفتێن چۆل و چیایان ناکەڤنە چو (خولوەیان).. مرۆڤێن خودێ د ناڤ مرۆڤان دا دژین، و بەرێ وان ددەنە رێکا خودێ و کرنا جیهادا د رێکا خودێ دا.. صەلاحەددینێ ئەیووبی هەر جارەکا ب لەشگرانییێ دحەسیا دا بێژت: کانێ هەسپێ من بینن، دا سویار بت و دەرکەڤت قەستا مەیدانا شەڕی کەت، هەڤالێن وی دا بێژنێ: ئەی سولطان! تو یێ نساخی.. ئەو دا بێژتە وان: دەمێ ئەز ل سەر پشتا هەسپی ئەز هەمی نساخییێن خۆ ژ بیر دکەم.

ب ڤێ رووحییەتێ، و ب ڤێ حەژێکرنێ، مرۆڤێن خودێ قەستا بەرۆکێن شەڕی دکەن، لەو گاڤا ئێک ژ وان ل ڤێ مەیدانێ دکەڤت، دکەڤتە د بەحەشتێ دا، و دبێژت: ب خودایێ کەعبێ ئەز ب سەرکەفتم ((فزت ورب الكعبة.. فزت ورب الكعبة)).

# شێرێ جیهادێ
# صەلاحەددینێ ئەییووبی

دەمێ من ڤیای بەحسێ صەلاحەددینی بکەم ئەز حێبەتی مام بەحسێ کیژ لایێ ژیانا وی بکەم:

- ژ وان سالۆخەتێن وی یێن ئەو گەهاندییە ڕێزا مرۆڤێن خودێ؟

- یان دەمێ وی ئوممەت ژ ژێکڤەبوونێ ڕزگارکری و هەمی ل بن ئالایێ (لا إله إلا الله) کۆمکرین؟

- یان دەمێ وی ب شیرێ سوننەتێ ئالایێ بیدعێ سەرنخوینکری؟

- یان ژی دەمێ وی ل زەمانێ بێ هیڤیبوونێ جارەکا دی هیڤی د دلان دا چاندی، و رووحا جیهادی ل دەمێ سست و خاڤییێ جارەکا دی خورتکری؟

- یان دەمێ وی کەنی ل خۆ حەرامکری حەتا قودسا پیرۆز ژ دەستێن خاچپەرێسان بینتە دەرێ؟

ب ڕاستی دەمێ ئەز بەرانبەر صەلاحەددینی ڕاوەستایم ئەز ب وێ حەسیام یا مرۆڤەکێ بەژن کورت پێ دحەسییێت دەمێ بەرانبەر چیایەکێ بلند ڕادوەستت، و گاڤا ئەو گۆتن هاتینە بیرا من یێن هندەک ئەزماندرێژێن مە د دەر حەقا وی دا دبێژن، بیرا من ل وێ مەتەلێ هاتەڤە وەکی دبێژن: جارەکێ هندەک نەزانان ڤیا عەسمانێ ساهی قرێژی بکەن، ڕابوون هەر ئێکی گێسکەک کرە د دەستێ خۆ دا و گۆتن: دێ تۆزێ ڕاکەین دا عەسمانی پیس بکەین، و پشتی وان زێدە خۆ وەستاندی و خۆ د تۆزێ ڕا هێلای، و ئەزمان د دەڤی دا هاتی، ئەو ڕاوەستان و بەرێ خۆ دانێ عەسمان هەر وەکی خۆ یێ بلند و زەلال و سپییە، بەلێ ڕوییێن وان د تۆزێ ڕا یێن ڕەشبووین!

صەلاحەددین کییە:

* ناڤێ صەلاحەددینی یێ دورست یووسف بوو، و ناڤێ بابێ وی ئەییووبێ کورێ شادییە. بابێ وی ئەییووب ژ بنەمالا ئێک ژ مەزنێن ئویجاخا ڕاوەندی یێن کوردە، ژ بابکێ هەزبانییان، و خەلکێ گوندێ دووینێیە.

* ئەییووبێ ڕاوەندی ل سەر دەمێ والییێ بەغدا یێ سەلجووقی موجاهدەددین بەهرۆزی بووبوو حاکمێ کەلا تکریتێ ل ژۆریا عیراقێ.. و دەمێ ئەو ل تکریتێ ل سالا (٥٣٢) مشەختی، بەرانبەر (١١٣٧) زایینی، خودێ کورەک دایێ و وی ناڤێ کورێ خۆ کرە یووسف.

* ل وێ ڕۆژا خودێ ئەو کوڕ دایە ئەییووبی وی مالا خۆ ژ تکریتێ بارکر و هاتە باژێڕێ مووسلێ ل نک عمادەددینێ زەنگی، و چونکی جارەکێ ئەییووبی و برایێ وی شێرکۆی ئەو ژ مرنێ خلاص کربوو، وی گەلەک قەدرێ وان گرت و پشتی ئەو دو سالان ماینە ل مووسلێ زەنگی ئەو کرە والییێ (بەعلەبەکێ).

* صەلاحەددینی زارۆکینییا خۆ ل بەعلەبەکێ قەتاند، و چونکی ئەو کورێ والی بوو وی ژینەکا خۆش برە سەری و چو یێ ژێ کێم نەبوو.. و هەر ل وێرێ وی قەستا مزگەفت و مەدرەسێن دینی کر، و ل نک هژمارەکا زانایان خواندن و زانین وەرگرت، و دەمێ هێشتا ئەو یێ گەنج وی گەلەک حەز ژ ئەدەبی و شعرێ دکر و ب تایبەتی شعرێن (حەماسی).

* پشتی زەنگی مری و کورێ وی نوورەددین هاتییە شوینێ و دیمەشق ئێخستییە بن دەستێ خۆ، وی صەلاحەددین کرە مەزنێ شورطێن دیمەشقێ، و ژ بەر دادی و جامێرییا وی خەلکی هەمییێ حەز ژێ کر.

* ل سالا (٥٥٨) مشەختی مەزنێ مصرێ یێ فاطمی و وەزیرێ خۆ لێککەفتن، ئینا وەزیری هەوارێن خۆ گەهاندنە نوورەددینی، لەو نوورەددینی سەرلەشکەرێ خۆ شێرکۆیێ ڕاوەندی د گەل هێزەکا لەشکەری هنارتە مصرێ، و

برازایێ شێرکۆی صەلاحەددین ژی د گەل ڤێ هێزێ بوو، و ل مصرێ ل سالا (٥٦٤) شێرکۆ بوو وەزیر، و پشتی ئەو بوویە وەزیر ب دو هەیڤان مر و بەری مرنا خۆ وی وەصیەتکر کو برازایێ وی صەلاحەددین ل شوینا وی ببتە وەزیر. و وەصیەتا وی هاتە ب جهئینان و صەلاحەددین ل ژییێ سیهـ و دو سالییێ بوو وەزیر.

* ل سالا (٥٦٧) مەزنێ مصرێ ئەلعاضدێ فاطمی مر و ب مرنا وی صەلاحەددینی دووماهی بۆ دەولەتا وان یا شیعی دانا، و بڕیار دا جارەکا دی مەزهەبێ سوننی ل مصرێ بێتە بەلاڤکرن، و پێخەمەت ڤێ چەندێ وی گەلەک زانا ژ کوردستانێ و شامێ داخوازکرنە مصرێ و مەدرەسە ڤەکرن، و بڕیار دا ل مزگەفتان د خوتبێ دا ناڤێ خەلیفێ عەبباسی بێتە گۆتن.

* هەر چەندە صەلاحەددین بوو سولطانێ مصرێ ژی و حوکم کەفتە د دەستان دا بەلێ د گەل هندێ ژی وی چو (تەمەرروود) ل سەر نوورەددینی ل شامێ، و خەلیفێ عەبباسی ل بەغدایێ نەکر، و هەر خۆ ژ وان حسێبکر.

* ل سالا (٥٦٩) نورەددین مر، و پشتی مرنا وی وەلاتێ شامێ و جزیرە پارچە پارچە بوو، و هەڤڕکی د ناڤبەرا مەزنان دا پەیدا بوو، حەتا هندەک جاران خەلکێ هندەک دەڤەران هەوارێن خۆ دگەهاندنە خاچپەرێسان دژی موسلمانان، و صەلاحەددینی ب دلەکێ تژی قەهر ڤە بەرێ خۆ ددا ڤی حالی، و حەز دکر کو ئەو تشتەکی بکەت ڤی حالێ خراب پێ بگوهۆڕت، لەو دەمێ کاغەزەک ژ خەلکێ شامێ گەهشتییە وی و وان تێدا ژ وی خواست ئەو د هەوارا وان بێت ئەو ئێکسەر د هەوارێ هات.

* ل درێژیا دەهـ سالان -ژ سالا ٥٧٠ حەتا ٥٨٠- صەلاحەددین شیا هژمارەکا مەزن ژ وەلاتێن موسلمانان یێن بژالە بکەتە ئێک، و ل بن سیبەرا ئالایێ خۆ کۆم بکەت، ژ وان وەلاتان: مصر، سوودان، کوردستان، شام، و یەمەن.

* خاچپەرێسان ب ڤێ ئێکبوونا موسلمانان نەخۆشبوو؛ چونکی وان دزانی صەلاحەددین ئەوێ ڤیانا جیهادێ دلێ وی تژی کری، وان ناهێلت ئەو ب کەیفا خۆ ل سەر ئاخا ئیسلامێ بێن و بچن، لەو ترسا صەلاحەددینی کەفتە دلێن وان.

* بەری صەلاحەددینی ب دەهان سالان شەرێن خاچپەرێسان (یان شەرێن فرەنگان وەکی دهاتە نیاسین) دەست پێ کربوون، و ل سالا (٤٩٢)ێ مشەختی باژێرێ قودسێ کەفتبوو بن دەستێ وان.

* عمادەددینێ زەنگی و کورێ وی نوورەددین مەحموودی هندەک دربێن مەزن دانابوونە خاچپەرێسان و رووحا جیهادی د دلێ موسلمانان دا زێندی کربوو، پشتی صەلاحەددین هاتی و شیای ئوممەتێ بکەتە ئێک رێز دیوارێ جیهادێ موکمتر لێ هات، و فێقییێ ڤێ جیهادێ ئەو بوو ل سالا (٥٨٣) باژێرێ قودسێ هاتە پاقژکرن پشتی کو نۆت و ئێک سالان ئەو مایە د دەستێ خاچپەرێسان دا.

* ل سپێدەییا رۆژا چارشەنبێ (٢٧)ی هەیڤا صەفەرا سالا (٥٨٩)ێ مشەختی، بەرانبەر سالا ١١٩٣ زایینی سولطانێ ئیسلامێ یێ سەرکەفتی صەلاحەددین ل باژێرێ دیمەشقێ چوو بەر دلۆڤانییا خودێ و هەر ل وێرێ هاتە ڤەشارتن.

سالۆخەتێن صەلاحەددینی:

١- تەقوادارییا وی:

هەر کەسەکێ صەلاحەددین دیتی، و ژ نێزیک تێکەلییا وی کری شاهدەیی بۆ وی ب تەقوادارییێ دایە، و ئەڤ چەندە نە تشتەکێ غەریبە ژ وی، سەرکێشەکێ وەکی صەلاحەددینی یێ کو ژینا خۆ هەمی بۆ جیهادا د رێکا خودێ دا تەرخانکری دڤێت د مەیدانا تەقوایێ ژی دا سویارەکێ بێ هەڤتا بت، ئەڤ تەقوایە بوو جەرگێ وی کرییە جەرگێ شێران، و ترس ژ رێکا وی لادای.

هەڤالێ وی ئبـن شەددادێ قازی دبێژت: ((ئەوی -خودێ رەحمێ پێ ببەت- بیر و باوەرەکا باش هەبوو، گەلەک زکرێ خودێ دکر، دان و ستاندن د مەسەلێن علمی دا د گەل زانا و سەیداییێن مەزن دکرن، و گەلەک ل نڤێژێ یێ هشیار بوو، و ئەو چەند سال بوون ژێ نەهاتبوو زانین کو نڤێژەکا وی یا ب جماعەت نەبت، و وی گەلەک نڤێژێن سوننەت ژی دکرن، و هەر جار بەری نڤێژا سپێدێ ئەو بۆ کرنا نڤێژێن شەڤێ رادبوو، خۆ دەمێ ئەو نساخ ژی وی نڤێژ ژ پییان ڤەدکرن.. گەلەک حەز ژ گوهدانا قورئانێ دکر، و ئەو هند یێ دلنازک بوو گاڤا وی گوهێ خۆ ددا قورئانێ ئەو نەدشیا چاڤێن خۆ هندی وی دکرە گری، و وی گەلەک حەز ژ گوهدانا حەدیسان ژی دکر.. وی گەلەک قەدرێ دینی و دینداران دگرت و نەیارەتییا دیندوژمنان دکر.. هیڤییا وی ب خودێ گەلەک یا مەزنبوو، گاڤا وی گوهـ لێ دبوو جارەکێ دوژمن یێن هاتین دا قەستا وەلاتێ موسلمانان بکەن وێ شەڤێ هەمییێ دا مینتە هشیار و نڤێژان کەت و سەرێ خۆ دانتە عەردی و دوعایان کەت و بێژت: ئیلاهی پێخەمەت ب سەرئێخستنا دینێ تە هەمی ئەگەرێن عەردی ل بەر من یێن هاتینە برین، ژ تە پێڤەتر من کەسەک نەمایە، ب تنێ وەریسێ تە یێ مای ئەز خۆ پێڤە بگرم، تو تێرا من هەیی و تو باشترین وەکیلی بۆ من..)).

ل جهەکێ دی ئبـن شەدداد دبێژت: ((جارەکێ من ئەو د سوجدێ دا دیت، رۆندکێن وی ب سەر دێمی دا هاتبوونە خوارێ موییێن ریهێن وی یێن سپی و شەملکا وی تەڕ کربوون.. هندی من گوهێ خۆ ددایێ ژ بەر گرییێ دەنگێ وی نەدهاتە من، رۆژا وی وە دکر ئەو رۆژ نەدچوو ئەگەر دەنگ و باسێن سەرکەفتنەکا ل سەر دوژمنی بۆ وی نەهاتبان..)).

بەلێ.. و چ تشتێ ئەم ژ بیر بکەین ئەم وێ ژ بیر ناکەین کو صەلاحەددینی سۆز دابوو ئەو نەکەتە کەنی هندی قودس د دەستێ دوژمنێن

ئیسلامێ دا بت، دگۆت: ئەز ژ خودێ شەرم دکەم بکەمە کەنی و قودس د دەستێن خاچپەرێسان دا بت!

### ٢- دادی و دلۆڤانییا صەلاحەددینی:

سولطانێ سەرکەفتی صەلاحەددینێ ئەییووبی، ئەوێ حوکم ل نێزیکی یازدە دەولەتێن مە یێن ڤێ گاڤێ دکر، ب دادی و دلۆڤانییێ هاتبوو ناسین، نە ب تنێ د گەل هەڤالێن خۆ، بەلکی خۆ د گەل دوژمنێن خۆ ژی، و هەر کەسەکێ دیرۆکا وی بخوینت ئەڤ ڕاستییە دێ بۆ ئاشکەرا بت.

دیرۆکڤانێ بریتانی ئارنۆلد د کتێبەکا خۆ دا بەحسێ صەلاحەددینی دکەت و دبێژت: ((ئەڤ تێکەلییا وی یا ب رەحم بوو ئەگەرا هندێ کو گەلەک خاچپەرێس دینێ خۆ بگوهۆڕن و موسلمان ببن)).

قازی بەهائوددین دبێژت: ((صەلاحەددین -رەحمەت لێ بن- خودان دادی و دلۆڤانییەکا مەزن بوو، و وی گەلەک پشتا مرۆڤێ لاواز و بێ هێز دگرت، دیوانەکا گشتی وی هەبوو حەفتییێ دو ڕۆژان -دوشەنبێ و پێنج شەنبێ- لێ دڕوینشت، قازی و زانا هەمی ل نک خۆ کۆم دکرن و دەرگەهـ ل بەر خەلکی ڤەدکر، و هەر کەسەکێ شۆلەک هەبا دا چتە نک وی و مەسەلا خۆ بۆ بێژت، ئەو ب خۆ دا گوهێ خۆ دەتێ پاشی دا حوکمی دەت، هەردەم وی ئەڤ دیوانە گرێددا، چ ل مال با چ ل سەفەرێ)).

دلەکێ مەزن و سنگەکێ فرەهـ د ڤی مەجالی دا وی هەبوو، و هندی خەلکی بێهنا وی تەنگکربا ئەو عێجز نەدبوو، ڕۆژەکێ مرۆڤەکێ ب ناڤێ عومەرێ خەلاتی دئێتە ناسین چوو نک قازییێ صەلاحەددینی ئبن شەددادی و گازندەیەک ل سولطانی ب خۆ کر، قازی بریار دا هەردو هەڤڕک ل نک وی ئامادە ببن، پشتی هەردو (صەلاحەددین و عومەرێ خەلاتی) ل نک قازی ئامادەبووین، قازی گۆت: هەر ئێک ژ هەوە شاهدێ خۆ بینت، پشتی شاهد هاتین و هەر ئێکی شاهدەییا خۆ دای، دیاربوو کو صەلاحەددین یێ حەقە، لەو

قازی مسەلە بۆ وی ئێخست، بەری هەڤرکێ صەلاحەددینی ژ دیوانێ دەرکەڤت، صەلاحەددینی هندەک پارە دانێ؛ دا ئەو هزر نەکەت کو صەلاحەددینی تشتەک د دەر حەقا وی دا کرە دلێ خۆ.

گاڤا حوکمداری کەفتییە د دەستێ صەلاحەددینی دا وی بڕیار دا خویک و باج و گومرک ل سەر خەلکی بێنە ڕاکرن؛ دا بارێ وان گران نەبت، و فەرمان دا ب عەدالەت هاریکارییا خەلکی بێتەکرن.. و د دەلیڤەیا عەدالەتا صەلاحەددینی ب تنێ دو نموونەیان ژ دیرۆکا وی دێ ڤەگێڕین:

**یا ئێکێ:** جارەکێ پشتی صەلاحەددین ژ سەرکەفتنەکێ زڤڕی و هاتییە دیمەشقێ، مەزنێ دیمەشقێ ڕابوو قەسرەکا مەزن و ژێهاتی ل خۆشترین جهێ دیمەشقێ بۆ سولطانێ سەرکەفتی ئامادەکر دا بۆ وی بکەتە دیاری گاڤا دگەهتە دیمەشقێ. صەلاحەددین هات، پشتی وان قەسر نیشا وی دای و وی جوانییا قەسرێ دیتی، ئەو ما.. بێنەکێ بەرێ خۆ دایێ پاشی گۆت: ئەم نە یێن جهێن هۆساینە، ئەڤ خانییە ب کێر وی کەسی نائێت یێ داخوازا مرنێ بکەت، ئەم یێن هاتینە ڤێرێ ب تنێ بۆ هندێ دا خزمەتێ بکەین. پاشی پشتا خۆ دا وێ قەسرێ و پێ ڕازی نەبوو.

مالا صەلاحەددینی خیڤەتەک بوو ل سەر پشتا هەسپێ وی بوو، جهێ ئەو گەهشتبایێ لێ ڤەددا.. صەلاحەددینی چو قەسر نەبوون ژێ بترست و بێژت: ئەگەر ئەز مرم دێ بۆ کێ هێلم؟

ل بن خیڤەتەکێ صەلاحەددینی حوکم ل یازدە دەولەتێن مە یێن ڤێ گاڤێ دکر و ئەو هنگی ڕاوەستیا حەتا دفنا فرەنسا و ئەلمانیا و بریتانیا د گەل یا پاپایێ وان ل ئاخێ بکێشت!

**یا دوێ:** من دڤێت وی مالی بۆ هەوە بێژم یێ صەلاحەددینی پشتی مرنا خۆ هێلای، ئەبوو شامە دبێژت: سولطانی چو ملک و عەقار پشتی خۆ نەهێلابوون، ڕۆژا ئەو مری دینارەک و چل و حەفت دەرهەم ب تنێ وی هەبوون.

نه قەسر، نه باغ و بیستان، نه زەڤی و رەز.. ب تنێ دینارەک و چل و حەفت دەرهەم! ئەڤە دەمێ ئەو مری.. و دەمێ هێشتا ئەو یێ ساخ هەڤالێ وی ئبن شەددادێ قازی دبێژت: نەهاتییە زانین کو صەلاحەددینی جارەکێ زەکاتا فەرض دابت؛ چونکی چو جاران وی هند مال نەبوو زەکات لێ بکەڤت.

### ٣- مروەت و دلفرەهی و مەردینییا وی:

مروەت و دلفرەهییا صەلاحەددینی جهێ مەتەل پێ ئینانێ بوو خۆ ل نک وان یێن صەلاحەددینی شەرێ وان دکر، و دەمێ ئەم بەحسێ جیهادا وی دکەین هندەک نموونەیان ل سەر ڤێ چەندێ دێ ئینین.

ئبن شەدداد دبێژت: مەردینییا وی گەهشتبوو حەددەکی چو جاران وی نەدهێلا تشتەک بمینتە د خزینەیێ دا، لەو گەلەک جاران خزینەداران مال ژێ ڤەدشارت دا ل دەمێ تەنگاڤییان مەحتل نەبن.

و هندی ئەو مرۆڤەکێ دلساخ بوو وی رێ ددا هەمی کەسان کو ئەو بچنە نک وی و گازندەیێن خۆ بۆ بکەن و ژ بەر ڤێ چەندێ دوژمنێن وی بەرگەریانا کوشتنا وی یا کری، بەلێ هەر جار خودێ ئەو دپاراست.

### سەرهاتییا صەلاحەددینی د گەل جیهادێ:

صەلاحەددین -وەکی پترییا مێرچاکێن مللەتێ خۆ یێ کورد- شێرەکێ دلموکم بوو، نه ترس نه سستی وی نەدناسی، هندی تەنگاڤی ل سەر مشە ببان هێزا وی پتر لێ دهات، وەکی چیایێن کوردستانێ یێ ئاسێ بوو، و وەکی دەشتێن وێ یێ ب ساناهی بوو، هێژ دەمێ ئەو یێ بچویک ئەو ل سەر دەستێ بابێ خۆ ئەییووبی و مامێ خۆ شێرکۆی فێری سویاری و عەگیدییێ بووبوو، و هێشتا ژییێ وی نەگەهشتییە بیست سالییێ ناڤ و دەنگێن وی ب زیرەکییێ د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبوون، و ژ بەر زیرەکییا وی مامێ وی شێرکۆی بۆ هاریکارییێ ئەو د گەل خۆ برە مصرێ، و ئەوی ب زیرەکییا خۆ شیا د حەفت

هەشت سالان دا هژمارەکا مەزن ژ فێرس و عەگیدان ل دۆر خۆ کۆم بکەت و دووماهیێ بۆ دەولەتا عوبەیدیێن رافزی ل مصرێ بدانت، و جارەکا دی ئالایێ سوننەتێ ل مصرێ و رۆژئاڤایا وەلاتێن عەرەبان بلند بکەت، و ب ڕاستی ئەڤ کارێ صەلاحەددینی کری گەلەک یێ کێمتر نەبوو ژ وێ جیهادا صەحابییان کری دەمێ بۆ جارا ئێکێ ئەڤ وەلاتە ل سەر دەولەتا ئیسلامێ زێدەکرین.

صەلاحەددین ل دەمەکی هات گەلەک یێ جودا نەبوو ژ ڤی دەمێ نوکە ئەم تێدا دژین:

ئەگەر ژ لایێ ناڤخۆیی ڤە تە بەرێ خۆ دابایێ دا بینی ئوممەت -ژ لایێ دەسهەلاتدارییێ ڤە- وەکی رستکەکا قەتیای لێ هاتبوو، هەر مۆرکەک بۆ خۆ ب لایەکی ڤە چووبوو، جیهانا ئیسلامی ل سەر هژمارەکا نە یا کێم ژ دەولەت و ویلایەت و میرنشینان یا لێکڤەکری بوو، و ل هەر جهەکی کەسەکی حوکم دکر و گەلەک جاران خۆ دهاڤێتە سەر بەختێ نەیارێن ئیسلامێ و بازرگانی ب ئاخا ئیسلامێ دکر پێخەمەت کو ئەو دەستێ هاریکارییێ بۆ وی درێژ بکەن دژی حاکمەکێ دی یێ موسلمان.

ڕاستییا ئیسلامێ نێزیک بوو ل بەر خەلکی ئالۆز ببت، دەستەکێن بیدعەچی و خودانێن دلچوونان ب ناڤێ ئیسلامێ خەلک ئێخستبوونە بن دەستێ خۆ، و ئەو وەسا تێ دگەهاندن کو داخوازکەرێن دورست بۆ ئیسلامێ ئەون.

ژ لایێ دەرڤەیی ژی ئەورۆپایا دل ب کین و خاچپەرێس ب هەمی ڤە خۆ لێکدابوو و ئەو نێزیکی سەد سالان بوو ب عێل و عەساکر ڤە قیت کربوو رۆژئاڤایا جیهانا ئیسلامی، و هژمارەکا وەلات و باژێران ئێخستبوونە بن دەستێ خۆ، و قودسا پیرۆز ب خۆ ئێک ژ وان باژێران بوو.

ئەڤە حالێ جیهانا ئیسلامی بوو ل سەدسالا شەشێ مشەختی، دەمێ خودێ صەلاحەددین بۆ ئوممەتێ هنارتی.. صەلاحەددین هات، و گاڤا وی

ئوممەت د ڤی حالی دا دیتی، وی ڤیا گوهۆڕینێ بکەت، بارەکێ گران کەفتە سەر ملان، ڕاستە ژ باشییا ئیغبالا وی ئەو بوو بەری وی ب دەمەکێ کێم دو شێرێن دی یێن جیهادێ ڕێک بۆ وی خۆش کربوو، ئەو ژی عمادەددین و کوڕێ وی نوورەددین بوون، بەلێ مرن بەری صەلاحەددینی گەهشتە ڤان هەردویان، مرنێ ئەو برن و بارێ وان ژی بۆ صەلاحەددینی هێلا.

ئەڤ بارێ گران ب دورستی ل سیه و دو سالییێ کەفتبوو سەر ملێن وی دەمێ ئەو ل مصرێ بوویە وەزیر، ل سیه و دو سالییێ وی دەست پێ کر و ل پێنجی و حەفت سالییێ دەمێ ئەو مری بارا پتر ژ هیڤییێن خۆ یێن مەزن وی ب جهئینابوون، ب تنێ دو هیڤی نەبن مانە د دلی دا.. هەڤالێ وی ئبن شەدداد دبێژت: ((ل سالا ٥٤٨ -پشتی زڤڕاندنا قودسێ- صەلاحەددین د خواتر خواستنا لەشکەرێ مصرێ دەرکەفت، برایێ وی (الملک العادل) سەرلەشکەر بوو، ل باژێرێ عەسقەلانێ مە خاترا خواستنا لەشکەری کر، صەلاحەددینی ڤیا د بەر لێڤا دەریایێ ڕا بزڤڕت و بۆ سەح و سوییان خۆ نێزیکی عەککایێ بکەت، کو هنگی د دەستێ خاچپەرێسان دا بوو، و هنگی دەم زڤستان بوو و ڕێک یا ب سلامەتی نەبوو، مە گۆتێ: یا باش نینە ئەم د ڤێ ڕێکێ ڕا بچین، بەلێ وی گوهێ خۆ نەدا مە و دا ڕێ.. دەمەکی ئەز و ئەو یێ دچین ئەو ل من زڤری و گۆت: بۆ تە بێژم کانێ چ د دلێ من دایە؟ من گۆتێ: بەلێ.. وی گۆت: چی گاڤا من کنارێ دەریایێ (ساحل) هەمی ستاند، ئەز دێ وەلاتی ل سەر هندەکان لێکڤەکەم و دێ وەصیەتا خۆ کەم و خاترا خۆ خوازم و دەمە دەریایێ و ب دویڤ وان دا چم و هندی عەرد هەیە دێ چم حەتا کافرەکی ل سەر ڕوییێ عەردی نەهێلم یان ئەز بمرم..)).

ئەڤە ئێک.. یا دویێ: (ئبن شەددادی) گۆت: ((پاشی صەلاحەددینی گۆتە من: ئەز دێ پسیارەکێ ژ تە کەم کیژ مرن ژ هەمییان بلندتر و شەریفترە؟ من

گۆتن: مرنا د ڕێکا خودێ دا، وی گۆت: مسەلە هەمی ئەوە من دڤێت ب مرنا بلندتر و شەریفتر ئەز بمرم))، ئەڤە هیڤییا وی یا دوین بوو.

ئەو چەپەرێ صەلاحەددینی جیهاد تێدا کری چەپەرەکێ بەرفرەھ بوو، نە لایەکێ ب تنێ بوو، و نە جهەکێ ب تنێ ژی، د گەل خاچپەرێسان بوو، د گەل رافزییان بوو، د گەل ئیسماعیلییان بوو، د گەل بیدعەچییان بوو..

ل وەلاتێ مصرێ بوو، ل فلسطینێ بوو، ل شامێ بوو، ل جزیرێ بوو، ل کوردستانێ بوو.. و رۆژا صەلاحەددین مری مەملەکەتەکا ئێکگرتی ل بن ئالایێ سوننەت و جەماعەتێ دورستکر، ئەو ژ ڤان وەلاتان هەمییان پێک دهات: مصر، یەمەن، رۆژهەلاتا توونسێ، کنارێ دەریایێ ل ژۆرییا ئەفریقیا، شام ب هەر پێنج دەولەتێن خۆ یێن نوکە ڤە هندەک دەڤەر ژ فلسطینێ تێ نەبن، د گەل گەلەک دەڤەرێن کوردستانێ ژی، ئەڤە ئەو مەملەکەتە یا دیرۆکڤانان پشتی هنگی گۆتییێ: دەولەتا ئەییووبییان.

## ئەگەرێن سەرکەفتنا صەلاحەددینی:

ئەو ژی ب کورتی ئەڤەنە:

١- چونکی صەلاحەددین مرۆڤێ خودێ بوو:

بەری نوکە مە بەحسێ ڤێ چەندێ کر، و مە ئاشکەرا کربوو کو دەمێ دبوو شەڕ بەرێ صەلاحەددینی بەس دما ل لایەکی.. لایێ خودێ، و وی داخوازا سەرکەفتنێ ژ خودێ ب تنێ دکر، و بەری هنگی ل بەرفرەهییێ وی خودێ ناسی و دینێ وی ب سەر دئێخست لەو ل تەنگاڤییێ خودێ د هەوارا وی دهات و ئەو ب سەر دئێخست.

٢- ب کارئینانا ڕێکێن سەرکەفتنێ:

پشتی صەلاحەددینی ب دورستی خۆ هێلایە ب هیڤییا خودێ ڤە و سەرکەفتن ژ وی ب تنێ خواستی، وی خەمەکا خەم ژ ئامادەکرن و ب کارئینانا

ڕێکێن سەرکەفتنێ ژی خوار، لەشکەرەکێ موکم ئامادەکر، پویتە ب مەسەلا پەیداکرنا چەکی کر، و لایێ (تەعبئێ) ژی ژ بیر نەکر، مرۆڤێن زانا کرنە د ناڤ لەشکەری دا؛ دا جیهادێ ل بەر وان شرین کەن و دینی نیشا وان بدەن و نڤێژێ ل بەرا وان بکەن.

صەلاحەددینی لەشکەرێ خۆ ل سەر سێ پشکان لێکڤە کربوو:

- لەشکەرێ سولطانی: و ئەڤ لەشکەرە هەمی -یان بارا پتر- ژ کوردان پێک دهات، و ئەو هەردەم د گەل صەلاحەددینی بوون و چو بێنڤەدان بۆ وان نەبوو.

- لەشکەرێ میران: و ئەڤ لەشکەرە ئەو بوو یێ د گەل وان میران یێن صەلاحەددینی ڕاکرین، ل دەڤەرێن جودا جودا بوو، و هەر جارەکا سولطان هەوجە بایێ دهنارتە ب دویڤ ڕا.

- لەشکەرێ (موتەطەووع): و ئەڤە ئەو جیهادکەر بوون یێن ل دەمێ شەڕ و تەنگاڤییان خۆ دگەهاندە لەشکەرێ سولطانی.

و صەلاحەددینی پویتە ب چێکرنا چەکی و مین و مەنجەنیقان ژی دکر، و وی میرەک ب ناڤێ (میرێ دەریایێ) دانابوو کارێ وی ئەو بوو سەرکێشییا (ئسطوولێ) ئیسلامی یێ بەحری دکر.

٣- صەلاحەددینی ڕێزێن موسلمانان کرنە ئێک و دوبەرەکی و ژێکڤەبوون ژ ناڤبەرا وان ڕاکر و ئەو هەمی ل بن ئالایێ ئیسلامێ کۆمکرن، و هەر جارەکا موسلمان ل دۆر ئیسلاما دورست کۆم ببن و ببنە ئێک دەست و ئێک دل کەسەک نەشێت خۆ ل بەر بگرت.

٤- ئارمانجا صەلاحەددینی ژ هەمی جیهادا خۆ بلندکرنا دینێ خودێ بوو و چو ددی نە، صەلاحەددینی بۆ چو گازییێن بەرتەنگ گازی نەدکر، و ئارمانجا وی ب سەرئێخستنا چو گازییێن جاهلی ژی نەبوو، هەر وەلاتەکێ مرۆڤەکی سەرێ

خوّ بوّ خودێ لێ چەماندبا وەلاتێ صەلاحەددینی بوو، و هەر جهەکێ بانگێ خودێ لێ هاتبا بلندکرن جهێ صەلاحەددینی بوو.

٥- صەلاحەددینی مەسەلا ئازادکرنا وەلاتێ ئیسلامێ کربوو مەسەلەکا خوری ئیسلامی، مەسەلە نە مەسەلەکا نشتیمانی بوو، نە یا هەرێمی بوو، نە یا نەتەوەیی بوو، مەسەلە مەسەلا ئیسلامێ و جاهلیەتێ بوو، لەو د چەپەرێ صەلاحەددینی دا کورد هەبوون، عەرەب هەبوون، تورک هەبوون، فارس هەبوون، و د چەپەرێ بەرانبەر ژی دا کافرێن عەرەب هەبوون، رۆمی هەبوون، فرەنسی هەبوون، ئەلمانی و ئنگلیز هەبوون. شەر ل بن ناڤێ بلندکرنا ئالایێ ئیسلامێ دهاتەکرن، و ژ بلی ڤی ناڤی جیهانا ئیسلامی چو ناف و نیشانێن دی یێن جاهلی نەدناسین، یان ب تەعبیرەکا دی (ئستیراد) نەکربوون.

## صەلاحەددین.. و خاچپەرێس:

جارەکێ مەزنێ باژێرێ (کەرەکێ) یێ فەلە، ئەوێ دگۆتنێ: (ئەرناط)، پێ ل پەیمانا شەر راوەستاندنێ دانا و هێرش دا سەر کاروانەکێ موسلمانان، پشتی زەلام ئێخسیرکرین و بەری دەست ب کوشتنا وان بکەت هندەک گۆتنێن سەقەت د دەر حەقا ئیسلامێ دا گۆتن و گۆتە ئێخسیران: پا دێ بلا موحەممەد بێت هەوە ژ دەستێن من بینتەدەر.

ئەرناطی پەیمان شکاند و ئەزمانێ خوّ درێژکر!

سوحبەت گەهشتە صەلاحەددینی، ئەو گەلەک تێکچوو و سۆز دا دەرسەکا وەسا نیشا ئەرناطی بدەت ئەو چو جاران ئەو ژ بیر نەکەت.. ئەڤ گۆتنا ئەرناطی ل سالا (٥٨٢)ێ مشەختی هاتبوو کرن، ئینا صەلاحەددین رابوو کارێ لەشکەرێ خوّ کر و ڤێ جارێ کرە دلێ خوّ قودسێ ژ پیسییا خاچپەرێسان پاقژ بکەت، ل هەیڤا چارێ ژ سالا دی (سالا ٥٨٣) صەلاحەددین دەرکەفت.. و ئەو بوو د ڤێ دەرکەفتنێ دا شەرێ حطینێ چێبوو و صەلاحەددین تێدا ب سەرکەفت، و پشتی شەری ئەرناط ب ئێخسیری کەفتە دەستێ موسلمانان،

هندەکان ئەو ئینا نک صەلاحەددینی، صەلاحەددینی گۆتێ: ئەڤرۆ ئەز پێش موحەممەدی ڤە دێ تە کوژم.. و شیرەک ل ستوییێ وی دا.

ل سالا (٤٩٢)ێ مشەختی دەمێ خاچپەرێسان باژێرێ قودسێ ژ دەستێ موسلمانان ئینایە دەرێ دیرۆکڤان دبێژن: وان حەفتێ هزار موسلمان کوشتن. و دەمێ صەلاحەددینی ل سالا (٥٨٣) یێ مشەختی قودس ژ دەستێن وان ئینایە دەر موسلمانان ب ڕەنگەکێ وەسا سەرەدەری د گەل وان داگیرکەران کر دیرۆکڤانێن وان ب خۆ حەتا ئەڤرۆ ژی خۆ مەجبوور دبینن کو ب باشی بەحسێ وێ بکەن دەمێ موقارەنێ د گەل خۆ دکەن!

دەمێ صەلاحەددین هاتییە د قودسێ دا وی بڕیار دا چل ڕۆژان ڕێ بۆ فەلێن قودسێ بێتە ڤەکرن؛ دا هەچییێ بڤێت ب تەناهی و سەربەستی دەرکەڤت و بچتە وی جهی یێ وی بڤێت، و وی بڕیار دا هەر زەلامەک دەه دیناران پێش خۆ ڤە بدەت و هەر ژنکەک پێنج دیناران، و هەر بچویکەک دو دیناران بدەت دا ڕێ بۆ بێتە ڤەکرن، و یێ ڤێ بەدەلێ نەدەت دێ ئێتە ئێخسیرکرن، و هەر چەندە صەلاحەددین و خاچپەرێس ل سەر ڤێ بەندێ پێک هاتن ژی بەلێ دەمێ بوویە دۆرا ب جهئینانا ڤێ بەندێ صەلاحەددینی هێشتا پتر دلۆڤانی ب وان بر، دەمێ وی دیتی گەلەک کەسێن لاواز و پیر و بێ خودان د ناڤ فەلان دا هەنە وی بڕیار دا ڕۆژەکا تایبەت بۆ ڤان ڕەنگە مرۆڤان بێتە دەسنیشانکرن و پارە و دەوار ل سەر وان بێنە لێکڤەکرن دا ب رحەتی و تەناهی ئەو بچن.

ل قودسێ پەتریکەکێ فەلە هەبوو، مالەکێ زێدە وی هەبوو، دەمێ ئەو ژ باژێری دەرکەفتی وی مالێ خۆ هەمی د گەل خۆ بر، و هندی فەقیرێن فەلان ژێ خواست کو ئەو پێش وان ڤە پاران بدەت ئەو ل بەر نەهات و پارە پێش ئێکی ڤە نەدان، هندەکان گۆتە صەلاحەددینی: ئەرێ بۆچی ئەم پارێن وی ژێ ناستینین و بدەینە موسلمانان؟ صەلاحەددینی گۆت: ژ دەه دیناران پێڤەتر ئەز تشتەکی ژێ ناستینم، و ئەز قەت غەدرێ لێ ناکەم.

دیرۆکڤانێ ڕۆژئاڤایی (ستانلی بۆل) دبێژت: مەسەلە گەهشتە هندێ سولطانەکێ موسلمان دەرسەک د قەنجی و خێرێ دا، دا پەتریکەکێ مەسیحی.

گەلەک فەلە ژ قودسێ دەرکەفتن و ب لایێ ئەنطاکیایێ ڤە چوون، و ئەو هنگی د دەستێ خاچپەرێسان دا بوو، و تشتێ غەریب ئەو بوو مەزنێ ئەنطاکیایێ یێ فەلە قەبویل نەکر ئەو فەلە بمیننە ل جهێ وی، لەو ئەو فەلە نەچاربوون چوونە بازێڕێن موسلمانان، و موسلمانان ب سنگەکێ فرەهـ ڤە پێشوازی ل وان کر.

ڕۆژا صەلاحەددین ب سەرکەفتی ب ڤی ڕەنگی سەرەدەری د گەل خاچپەرێسان کر، و ڕۆژا ئەو شیاینە موسلمانان وان ل وی جهێ ئەو دبێژن مەسیحی ئالایێ ئاشتییێ لێ بلند کربوو، حەفتێ هزار موسلمان کوشتن، و هندەک ب ساخی سۆتن!

## صەلاحەددینی چ پێشکێش کرییە؟

ئەڤرۆ -مخابن- هندەک کەس د ناڤ مە دا هەنە دەمێ بەحسێ قەهرەمانێ ئیسلامێ صەلاحەددینی دئێتەکرن لەشێ وان گران دبت و دبێژن: ما وی چ بۆ مە کرییە؟ ب ڕاستی دیرۆک باشترین شاهدە ل سەر هندێ کو صەلاحەددین ئێک ژ (موجەددین) سەدسالا شەشێ مشەختی بوو، و ئەگەر صەلاحەددینی بۆ ڤێ ئوممەتێ تشتەک نەکربت ژ بلی هندێ کو وی رووحا جیهادێ د دلێن موسلمانان دا ساخکری ئەو بەسی وییە.. ئەوێ دیرۆکا صەلاحەددینی بخوینت باش دێ زانت کانێ ڤی سەرکێشێ مەزن چ کرییە، ل ڤێرێ ئەم ب کورتی ئیشارەتێ دێ دەینە هندەک ژ وان (ئصلاحاتان) یێن وی کرین.

١- ژ لایێ دینی و عەقیدێ ڤە:

ئارمانجا صەلاحەددینی یا سەرەکی ئەو بوو بیر و باوەرێن موسلمانان دورست بکەت و وان بیدعە و خرابییێن د ناڤ وان دا پەیدابووین نەهێلت، و

هەر ژ بەر ڤێ چەندێ بیدعەچییان پتر ژ جارەکێ بەرگەریانا کوشتنا وی کر، و حەتا ئەڤرۆ ژی هندەک دەستەکێن بیدعەچی و سەرداچووی لێ دگەریێن ناڤێ صەلاحەددینی د چاڤێن خەلکی دا کرێت بکەن و دەورێ وی کێم بکەن.

صەلاحەددینی دەمێ جهێ پێ خۆ ل مصرێ کری بەری هەر تشتەکی وی خەبات کر مەنهەجێ سوننەتێ جارەکا دی ساخ بکەتەڤە پشتی کو ب دەستێن عوبەیدیيان هاتییە مراندن، مەدرەسە ڤەکرن و بریار دا بانگ ب دورستی بێتەدان، مەزهەبێ رافزییان یێ بێ بنیات ژ مەیدانێ راکر و ل شوینێ مەزهەبێ سوننی -و ب تایبەتی مەزهەبێ شافعی- بەلاڤکر.

دەمێ صەلاحەددین ب پاقژکرنا مصرێ ژ بیدعەیێن عەقائدی رابووی وی دیت عوبەیدییێن رافزی گەلەک بیدعە یێن ساخکرین و د ناڤ خەلکی دا بەلاڤکرین وەکی: گێرانا ئاهەنگان ب هلکەفتنا بوونا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و دانانا دیوانێن شینییێ ل رۆژا عاشوورائێ، و ساخکرنا رۆژا نەورۆزێ.. و گەلەکێن دی. گاڤا حوکم کەفتییە دەستێ صەلاحەددینی وی ئەڤ بیدعەیە هەمی راکرن، و موسلمان ب دورستی ل رامانا (وەلائێ و بەرائێ) هشیارکرن؛ دا ئەو پشتەڤانییا دیندوژمنان نەکەن، و هندی ژێ هاتی وی مرۆڤێن زانا ل وەلاتی زێدەکرن وهاریکارییا وان کر دا ئەو خەلکی ل راستییا دینی ئاگەهدار بکەن و بەرێ وان بدەنە حەقییێ و رامانێن ئیسلاما دورست د دلێن وان دا نوی بکەنەڤە.

٢- ژ لایێ جڤاکی ڤە:

تشتێ ژ هەمییان بەرچاڤتر یێ صەلاحەددین د جڤاکا خۆ دا پێ رابووی ئەو بوو: ئەو شیا خاڤی و سستییێ ل نک خەلکی نەهێلت و ل شوینێ جڤاکەکا مجد و حەژێکەر بوو کاری پەیدا کەت نەخاسم ئەگەر ئەو کار جیهادا د رێکا خودێ دا بت، و ئەو ب خۆ د ڤی لایی دا باشترین نموونە بوو ل سەر ڤێ چەندێ، خۆ دەمێ نساخییا مرنێ ژی ب سەر وی دا هاتی وی هزر دکر کانێ

پشتی ئەو ساخ دبت دێ قەستا کیڤ دەڤەرێ کەت بۆ جیهادێ، و وی دان و ستاندن د ڤێ مەسەلێ دا د گەل هەڤالێن خۆ دکر، و دووماهیێ وی بڕیار دا گاڤا ژ نساخییێ ڕابوو قەستا وەلاتێ ڕۆمێ بکەت، و ژ بەر ڤێ حەژێکرنا وی یا بۆ جیهادێ قازییێ وی بڕیار دا شیرێ وی د گەل وی بکەنە د قەبری دا!

صەلاحەددینی ب ڕەنگەکێ (عەمەلی) و بەرچاڤ جڤاکا خۆ ل سەر ڕەوشتێن باش پەروەردەکرن، وی ئەو فێری تشتێ مجد کرن و ژ کارێن نە ژ هەژی دانە پاش.

صەلاحەددینی خویک و باج ژ سەر خەلکی ڕاکرن، دادی و عەدالەت بەلاڤکر و لێ گەڕیا هەردەم ڕێزێن موسلمانان ئێکگرتی بهێلت و وان کاران نەکەت یێن دلڕەشی و نەڤیان پێ د نساڤ خەلکی دا بەلاڤ ببت، و ژ بەر ڤێ چەندێ صەلاحەددین لێ دگەڕیا مرۆڤێ ب کێرهاتی دکرە بەرپرس و کار دئێخستە د دەستی دا و شیرەت لێ دکر کو دلێ خەلکی نەهێلت و زۆرداریێ ل کەسێ نەکەت. ب ڤی ڕەنگی صەلاحەددین شیا جڤاکا خۆ پاقژ بکەت.

٣- ژ لایێ فێرکرن و زانینێ ڤە:

صەلاحەددینی خەمەکا خەم ژ ڤی لایی ژی دخوار، و بەسی وییە بێژین هەر جهەکێ ئەو چووبایێ وی مەدرەسەکا مەزن ددانایێ، بۆ نموونە: (مەدرەسا صالحییێ) ئەوا صەلاحەددینی ب مالێ خۆ ئاڤاکری، ئێک ژ مەزنترین مەدرەسێن دیمەشقێ بوو، ئاڤاهییەکێ بەرفرەهـ بوو، ب ڕەخ ڤە جهێ نان پێژییێ و سەر شویشتنێ و چەند دکانەک ژی چێکرن.

پشتی ڤەکرنا باژێرێ قودسێ ل سالا (٥٨٣) ئێکەمین کار ئەو پێ ڕابووی ئەو بوو وی مەدرەسەک ئاڤاکر؛ دا دەرسێن شریعەتی لێ بێنە خواندن، و هەر چەندە صەلاحەددین -وەکی بارا پتر ژ کوردان- ل سەر مەزهەبێ ئیمامێ شافعی بوو -خودێ ژێ ڕازی بت- بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن کو ئەو مەزهەبییەکێ (موتەعەصصب) بوو، نەخێر! و باشترین دەلیل ل سەر ڤێ چەندێ ئەو بوو وی

ل سالا ٥٧٢ مەدرەسەک ب ناڤێ (مەدرەسا سیووفی) بۆ خواندنا مەزهەبێ حەنەفی ڤەکر، هەر وەسا وی بڕیار دا هەر چار مەزهەبێن سوننییان ل مەدرەسێن مصرێ و شامێ بێنە خواندن، و بۆ ڤێ ئارمانجێ وی فەرمان دا زانایێن هەر چار مەزهەبان ل ڤان مەدرەسان بێنە دانان؛ دا بەرێ فەقییان ژ تەعەصصویا کۆرە بێتە وەرگێڕان و هزرا وان باش بەرفرەهـ بت و ئەڤ چەندە ئێک ژ مەزنترین ئصلاحاتێن صەلاحەددینی بوو د لایێ فێرکرن و زانینێ دا.

د گەل (تەشجیعا) صەلاحەددینی بۆ دانەخواندنا گەلەک مەزهەبان ل مەدرەسان بێی تەعەصصوب، بەلێ وی قەت رێ نەددا مەزهەبێن پویچ و پەلاچە ل مەدرەسە و مزگەفتان بێنە خواندن، و ژ لایەکێ دی ڤە وی پشتەڤانییەکا مەزن بۆ نڤیسین و بەلاڤکرنا کتێبان دکر، و چێکرنا هندەک کارخانەیێن کاغەزێ ل سەر دەمێ صەلاحەددینی باشترین نموونەیە ل سەر پشتەڤانییا وی بۆ زانینێ.

٤- ژ لایێ ئابۆری و پیشەیی ڤە:

دادییا صەلاحەددینی یا کو مە بەحس ژێ کری کارەکێ باش د خۆشکرنا لایێ ئابۆری یێ جڤاکێ دا هەبوو، نەخاسم پشتی وی خویک و باج و گومرگ ژ سەر بازرگان و حەجییان ڕاکرین، و مالێ دەولەتێ ل سەر مرۆڤێن پێتڤی بەلاڤکری.

صەلاحەددینی پویتە ب چاندن و چێکرنا جۆ و سکران و گەهاندنا ئاڤێ بۆ جهێن چاندنێ کر، و مەخسەدا وی ب ڤێ چەندێ ئەو بوو ئەو مللەتی ژ برسێ ڕزگار بکەت دا هەردەم بۆ بەرەڤانییا ژ دین و وەلاتی یێ ئامادە بت.

سویک و بازار ل سەردەمێ صەلاحەددینی گەلەک ب ڕەواج کەفتبوون و ئێکبوونا وان هەمی وەلاتان ل بن دەستێ صەلاحەددینی و دویرکرنا خەطەرا صەلیبییان کار د ڤێ چەندێ دا هەبوو، و دەرگەهێ بازرگانییا هەڤپشک

د ناڤبەرا مصرێ و هندەک وەلاتێن ئۆرووپییان دا، وەکی ئیطالیایێ هاتە ڤەکرن، و ڤێ چەندێ مفایەکێ باش گەهاندە جڤاکا موسلمانان.

ل باژێرێ طەرابلسا شامێ ل سەر دەمێ صەلاحەددینی کارخانەیەکا چێکرنا کاغەزێ هاتبوو دانان، و دویر نینە ئەو کارخانەیا کاغەزێ ئەوا ل سالا (٥٨٥) مشەختی (بەرانبەر ١١٨٩ زایینی) هاتییە دانان، کو دئێتە هژمارتن ئێکەمین کارخانەیا کاغەزێ ل وەلاتەکێ ئۆرووپی دئێتە دانان، دویر نینە ل بەر ڤێ کارخانەیا طەرابلسێ هاتبتە چێکرن. و دئێتە زانین کو پشتی صەلاحەددینی ب نێزیکی چارسەد سالان ئنگلستانێ ژ نوی چێکرنا کاغەزێ زانی. و ژ بلی چێکرنا کاغەزێ گەلەک پیشەیێن دی ژی ل سەر دەمێ صەلاحەددینی پێشکەفتبوون وەکی: چێکرنا چەکی و جلکان و شویشێ و گەمی و پاپۆڕان..

## ل دووماهییێ:

ل دووماهییێ مسەلەکا فەر هەیە پێتڤییە بەحسێ ژێ بکەین، ئەو ژی ئەڤەیە: نوکە گەلەک موسلمان هەنە دەمێ واقعێ مە یێ ئەڤرۆ دبینن ژ دلسۆزییا خۆ دبێژن: ئەم موسلمان ئەڤرۆ دپێتڤی سەرکێشەکێ وەکی صەلاحەددینینە دا جارەکا دی سەرفەرازییا مە بزڤڕینتەڤە و ڤی واقعی بگوهۆڕت.. ئەڤان ڕەنگە کەسان هەمی هزرا وان ئەوە مە موسلمانان ئەڤرۆ گرفتارییا سەرکێشییێ هەیە.

د گەل کو دەورێ سەرکێشییێ د هشیارکرنا مللەتی دا نائێتە ژ بیرکرن بەلێ یا ژ من ڤە مە گرفتارییا ئوممەتێ -بەری یا سەرکێشییێ- هەیە، و هەر ڕۆژەکا ئوممەت پەیدابوو سەرکێش ب خۆ ژ جەرگێ وێ دێ پەیدا بت، و دوژمن ڤێ چەندێ باش دزانن لەو هەردەم ئەو سرنجێن بەنجکرنێ ل زەندکا ئوممەتێ ددەن.

سەرکێش نە ژ عسمانی دئێتە خوارێ و نە ژ بن ئاخێ دەردکەڤت، ژ ناڤ مللەتی ڕادبت و دەستێ مللەتی دگرت و مللەتە وی پێشڤە دبەت، و مللەت

ئەگەر یێ مری بت چو سەرکێشێن زێندی ژ ناڤ رانابن.. ئەو مللەتێ صەلاحەددین ژ ناڤ رابووی مللەتەک بوو ل سەرفەرازییێ دگەریا، و ب دویڤەلانکی و سەرشۆرییێ رازی نەدبوو، ئیسلام دڤیا، و بۆ ئیسلامێ دژییا، و د ئیسلامێ دگەهشت، ئەگەر نە صەلاحەددین نەدشیا مرییان زێندی بکەت و شەران پێ بدەتەکرن.

سلاڤ ل صەلاحەددینی بت رۆژا بووی، و رۆژا خۆ کرییە ئێک ژ مرۆڤێن خودێ، و رۆژا دفنا خاچپەرێس و بیدعەچییان ل ئاخێ کێشای، و رۆژا پشتا خۆ دایە دنیایێ و قەستا ئاخرەتێ کری: ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ۝ ﴾ (القمر: ٥٥).

## ئەو زانایێ مەزنێن دەولەتێ فرۆتین
## عززێ کورێ عەبدسسەلامی

خواندەڤانێن هێژا: ڤێ جارێ باش کارێ خۆ بکەن؛ چونکی مە ل بەرە قەستا دیوانا سولطانەکی بکەین، بێ گومان ئێکەمین پسیارا نوکە دئێتەکرن ئەڤەیە: ئەرێ ئەو سولطانێ ئەم بەحس ژێ دکەین کییە؟ و حوکم ل کیژ وەلاتی کرییە؟

بەلێ.. لەزێ نەکەن! ئەو سولطانێ ئەم دێ نوکە بەرپەرێ وی ژ ناڤ دەفتەرا دیرۆکێ ڤەکەین، فەرمانداری ل ئێک بوهۆستێ ژی ژ عەردی نەکرییە، رۆژا وی ڤیای مالا خۆ ژ مصرێ بارکەت وی مالا خۆ هەمی ل سەر پشتا دەوارەکی کر، و رۆژا مری سولطانێ مصرێ گۆت: ژ نوی پشتا من راست بوو، ئەگەر ڤی حەزکریا و داخواز ژ خەلکی کریا سەلتەنەتا من دا ژ من ستینت.

مرۆڤەکێ ب تنێ بوو، چو د دەستان دا نەبوو، بەلێ دەمێ وی ئاخفتنەک گۆتبا هەر ژ خەلیفەی بگرە و حەتا یێ ژ هەمییان کێمتر ژ زەلامێن دەولەتێ ئێکی بستە نەدکر پێ ل گۆتنا وی بدانت.. د دیرۆکا دنیایێ دا هەمییێ دا هەوە خواندییە، یان گوهـ لێ بوویە مرۆڤەکێ بێ دەسهەلات رابت چنگلێ میر و مەزنێن دەولەتێ بگرت و ببەتە بازارێ و گازی بکەت: کی دێ ڤی عەبدی ژ من کرت! پاشی وان پاران ببەت بدەتە فەقیران؟

د دیرۆکا دنیایێ هەمییێ دا ئەڤ تشتەتە جارەکێ ب تنێ یێ چێبووی، ئەو ژی ب دەستێن مە موسلمانان، ئوممەتا موحەممەدی.. ئەی دیرۆک، ئەی مرۆڤینی، ڤی تشتی باش بزانە!

## ل دیوانا سولطانێ زانایان:

ئەو سولطانێ مە ل بەرە ڤێ جارێ قەستا دیوانا وی بکەین سولطانێ زانایان (عززەددینێ کورێ عەبدسسەلامییە).

ل سالا (٥٧٧)ێ مشەختی، ل وی دەمێ بنەمالا ئەییووبییان فەرمانداری ل وەلاتێ شامێ دکر، زانایێ ناڤدار عززەددین عەبدلعەزیزێ کورێ عەبدسسەلامی ئەوێ ب ناڤێ (ئەلعز)ی دئێتە ناسین هاتبوو سەر دنیایێ، د ناڤ بنەمالەکا هەژار دا هاتە ب خودانکرن، ل دەسپێکێ وەکی هەر زارۆکەکێ دی یێ وی دەمی، و ل وی جهی، هاتە ب خودانکرن حەتا بوویە نیڤ زەلام، ل شەڤەکێ ئەو ل مزگەفتا ئومەوی ل دیمەشقێ یێ نڤستی بوو مرۆڤەک هاتە خەونێ گۆتێ: ما چاوایە ئەگەر تو دەست ب وەرگرتنا زانینێ بکەی؟

دەمێ ئەو هشیاربووی وی هزرێن خۆ د ڤێ گۆتنێ دا کرن، و پسیار ژ خۆ کر: دیسا ما چاوایە ئەگەر ئەز دەست ب خواندن و نڤیسینێ بکەم؟ ڕاستە ئەو بووبوو نیڤ زەلام و هێشتا یێ نەزان بوو، بەلێ ما چ قەیدییە ئەگەر ئەو قەستا زانایان بکەت و ڕێکا وان بگرت؟

دەسپێکا وی و زانینێ ئەڤە بوو!

ئەو ڕابوو دەست ب وەرگرتنا زانینێ کر، و قەستا مزگەفت و مەدرەسێن دینی کر، و هنگی ڕاوەستا حەتا ناڤ و دەنگێن وی ل وەلاتێ شامێ هەمییێ بەلاڤبووین، و زانایێن شامێ هەمییان ئعتراف ب زیرەکییا وی کری و ئەو ب پێش خۆ ئێخستی ودووماهییێ ناسناڤێ: سولطانێ زانایان ل سەر دانای.

ئیمام عززێ کورێ عەبدسسەلامی هنگی بوو سولطانێ زانایان ڕۆژا وی ب دورستی حەقێ زانینا خۆ داییێ، و مرۆڤێ زانا هنگی دێ یێ ژ هەژی بت د گەل زانایان بێتە دانان، گاڤا زانینا وی دنیا ژ دلێ وی ئینادەر و ژ ترسا خودێ تژی کر، ڤێجا وە لێ بێت خۆشییا دنیایێ، و کورسیکێن بلند، و پارە، و

هەڤالینییا مەزنان، بەریٚ وی ژ گۆتنا حەقییێ نەدەتە پاش.. ڕاستە زانایێ دورست و زانایێ نەدورست هەردو ڕۆناهییێ ژ ئێک ژێدەری وەردگرن، بەلێ ژ بیر نەکەن دەمێ چاڤێ ڕۆژێ ل شویشەکا زەلال و پرتەکا دەپی ددەت وەکی ئێک نینە، شویشە ڕۆناهییێ دستینت و ڕۆناهییێ دزڤرینت، بەلێ پرتا دەپی ڕۆناهییێ دستینت دا بۆ خەلکی دیار بکەت کو ئەو دەپەکێ ڕەق و هشکە!

زانایێ دورست کتێبێن شریعەتی دخوینت و هزرێن خۆ د خودانێ شریعەتی دا دکەت، بەلێ زانایێ نەدورست گاڤا کتێبێن شریعەتی دخوینت خودانێ شریعەتی ژ بیرا خۆ دبەت، لەو دێ بینی زکێ ئێک ژ وان وەکی ئاشێ هێرانێیە بەری هەر تشتەکی دینێ خەلکی دهێرت، پاشی دنیایا وان.

عززێ کوڕێ عەبدسسەلامی ل سەر دەستێ هندەک زانایێن دورست یێن وەکی (ئبن عساکری) هاتبوو پەروەردەکرن، و ئەو ژ وان فێری هندێ بوو کو هەچییێ خودێ بۆ خۆ هلبژێرت و د خەما وێ نەخۆشییێ نەبت یا د ڕێکا وی دا دئێتە سەری، خودێ سەرێ وی دێ ب سەر هەمییان ئێخت.. جارەکێ د ناڤبەرا وی و (الملک الأشرف)ێ ئەییووبی دا هەڤڕکییەک ل دۆر مەسەلەکا علمی چێبوو، شێخ لێڤە نەبوو، ئینا مەلکی بڕیار دا کو چێ نابت ئەو چو فەتوایان بدەت، و چێ نابت کەس پسیاران ژێ بکەت، و دڤێت ئەو ل مالا خۆ ڕوینت و ژ مزگەفتێ پێڤەتر -بۆ نڤێژێ- ئەو نەچتە چو جهێن دی، یەعنی: (إقامە جبریە) دانا سەر..

پشتی دەمەکی سوحبەت ل باژێری بەلاڤبوو، هندەک زانا چوونە نک مەلکی و داخواز ژێ کر ئەو ل ڤێ بڕیارا خۆ لێڤە ببت، مەلکی ب گۆتنا وان کر.. و عەدەتێن زانایانە گاڤا بەرێ وان ما ل خودێ دلێن وان د گەل ئێک پاقژ دبن و پشتا ئێک و دو دگرن، و هنگی چو مەلک خۆ ل بەر هێزا وان ناگرن.

پشتی دەمەکی مەلک نساخبوو، ئینا کەسەک هنارتە نک شێخی و گۆتێ: بێژێ بلا گەردەنا من ئازا بکەت، شێخی گۆتە قاصدی: بێژێ ژ مێژە من

گەردەنا وی یا ئازاکری، عەدەتێ منە هەر شەڤ ئەز گەردەنا خەلکی هەمییێ ئازا دکەم پاشی ئەز دنڤم؛ دا حەقێ من ل سەر کەسێ نەمینت.

بەلێ.. ئەڤەیە مەزنییا مرۆڤێن خودێ، بەری بنڤن ئەو نەڤیانا کەسێ ناهێلنە د دلێن خۆ دا، لەو دەمێ سپێدێ ئەو ژ خەوێ ڕادبن ڕۆناهییا دلێن وان گەشاتییێ ل سەر دێمێن وان ئاشکەرا دکەت.

### قازییێ شامێ.. و مەلکێ ئەییووبی:

شێخ عزێ کوڕێ عەبدسسەلامی قازییێ شامێ بوو، و مەزنێ زانایێن دیمەشقێ بوو، ل سالا ٦٣٨ مشەختی ل ناڤبەرا مەلکێ شامێ ئیسماعیلێ ئەییووبی و مەلکێ مصرێ نەجمەددینێ ئەییووبی نەخۆش بوو، دوژمناتییا وان گەهشتە هندێ مەلکێ شامێ گەلەک جهـ ژ وان جهێن باپیرێ وی صەلاحەددینی ب خوینا موسلمانان ژ دەستێن خاچپەرێسان ئینایندەر وی دوبارە ل وان زڤڕاندن، و (صولحەک) د گەل گرێدا، و داخواز ژ وان کر ئەو هاریکارییا وی دژی ئەییووبییێن مصرێ بکەن، و ل دویڤ بناخەییێن ڤێ صولحێ خاچپەرێسان حەق هەبوو بێنە ناڤ وەلاتێ موسلمانان و ب سەربەستی بێن و بچن، و وەسا چێبوو دەمەکی هندەک ژ لەشکەرێ خاچپەرێسان هاتنە شامێ دا چەکی بۆ خۆ ژ بازارێ بکڕن. هەلویستێ شێخ عززەدینی ژ ڤێ چەندێ چ بوو؟

چونکی سەیدا قازییێ شامێ بوو بەرێ خەلکی هەمییێ ما ل دەڤێ وی کانێ ئەو دێ چ بێژت؟ یان دێ چ فەتوایێ دەت؟

وێ گاڤێ مەلکێ شامێ ئیسماعیلێ ئەییووبی ژ دەرڤەی شامێ بوو.. خەلکی پسیار ژ شێخی کر کانێ حوکمێ شریعەتی د وی کەسی دا چیە یێ چەکی بفرۆشتە صەلیبییان؟

قازی فەتوا دا کو چێ نابت بۆ مرۆڤێ موسلمان کو کڕین و فرۆتنا چەکی د گەل خاچپەرێسان بکەت؛ چونکی ئەو ڤی چەکی دێ د شەڕێ مصرییان دا

ب کار ئینن.. وەکی ئاگری دەمێ بەردبتە پویشی فەتوایا شێخی وەسا د ناڤ خەلکی دا بەلاڤبوو، خەلکێ دیمەشقێ هەمی مانە ل هیڤییا ڕۆژا ئەینییێ کانێ سولطانێ وان یێ بێ تاج عزەددینێ کوڕێ عەبدسسەلامی دێ چ هەلویستێ سیاسی ژ صولحا سولطانێ شامێ وەرگرت، ل ڕۆژا ئەینییێ مزگەفتا ئومەوی ژ مرۆڤان تژیبوو، سولطان هێشتا نەزڤڕی بوو شامێ، سەیدا ب سەر مینبەرێ کەفت، عەدەت بوو هنگی مەلایی ل دووماهییا خوتبێ ناڤێ سولطانی دئینا و دوعا بۆ دکرن، و ئەڤ چەندە نیشانا وەلائا مەلایی بوو بۆ سولطانی، بەرێ خەلکی ما ل دەڤێ شێخی کانێ وەکی هەر جار دێ ناڤێ سولطانی ئینت یان نە، چونکی ئەگەر وی ناڤێ سولطانی نەئینا، مەعنا ئەو ئعترافێ ب سولطانییا وی ناکەت!

گاڤا شێخ گەهشتییە دووماهییا خوتبێ شوینا کو ئەو ناڤێ سولطانی بینت و دوعایێ بۆ وی بکەت وی دەستێن خۆ سەرئەڤرازکرن و گۆت: ((ئەی خودا! تو ڕێکەکێ بۆ ڤێ ئوممەتێ ببینە وەلییێن تە پێ سەرفەراز ببن و دوژمنێن تە پێ سەرشۆڕببن)) و شێخ ژ سەر مینبەرێ هاتە خوار.

سوحبەت وەسا ل باژێری بەلاڤبوو کو سولطانێ زانایان عزەددینێ کوڕێ عەبدسسەلامی سولطان ئێخست و ئیدی ئعترافێ پێ ناکەت، بەری تەختێ سولطانی ب ڤێ فەتوایا شێخی بهژییێت وی ب لەز خۆ ب دیمەشقێ ڕا گەهاند، پشتی ئەو گەهشتییە دیمەشقێ ئێکسەر وی بڕیار دا هەمی مەنصبێن عزەددینێ کوڕێ عەبدسسەلامی یێن ڕەسمی ژێ بێتە ستاندن، و ژ بەر ڤی هەلویستێ وی ئەو د مالا وی دا بێتە گرتن، و ل بن (إقامه جبريه) بێتە دانان.

پشتی هەیامەکێ هژمارەکا زانا و ماقویلێن باژێری چوونە نک سولطانی و داخواز ژێ کر ئەو سەیدای بەردەت بەری کەربا خەلکی بەرێ وان بدەتە هندێ ئەو کارەکێ بۆ سولطانی خراب بکەن پاشی پشتی هنگی پەشێمانی فایدەی نەکەت! سولطانی گوهدارییا وان کر و فەرمان دا شێخ ژ گرتنێ بێتە ئازاکرن،

شێخی داخواز ژ سولطانی کر ئەو دەستویرییێ بدەتێ کو ئەو ژ دیمەشقێ دەرکەڤت و قەستا باژێرێ قودسێ بکەت، سولطانی دەستویری داییێ و شێخ چوو قودسێ و ل وێرێ ئاکنجی بوو.

پشتی هەیامەکێ سولطانێ شامێ د گەل هندەک مەزنێن دەولەتێ قەستا دەڤەرا قودسێ کر؛ دا کۆمبوونەکێ د گەل هندەک خاچپەرێسان بکەت، ل وێرێ سولطان ئیسماعیلێ ئەییووبی زەلامەک هنارتە نک شێخ عززەددینێ کورێ عەبدسسەلامی دا بێژتێ: سولطانی تو یێ عەفیکری و چی مەنصبێ تە بڤێت ئەو دێ دەتە تە ب شەرتەکی کو تو بچی دەستێ وی ماچی بکەی.. و سولطانی گۆتە قاصدێ خۆ: ئەگەر وی گوهێ خۆ نەدا تە، تو وی بگرە و بینە بکە د خیڤەتەکێ ڤە ب رەخ خیڤەتا مە ڤە.

ل ڤێرێ دبت هندەک کەس هەبن پسیار کەن: ئەرێ سولطانەکێ خودان سەلتەنەت و دەسهەلاتداری چ ژ مەلایەکێ بێ دەسهەلات دڤیا؟ ما ئەو بۆ خۆ ژ بەر وی نەرەڤی بوو و چووبوو قودسێ، ئەرێ ئەو د گەل سولطانی بت یان نە ما دێ چ ل سولطانی زێدە بت؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژین: دەمێ زانایان رێکا خودێ دگرت، و ڤیانا دنیایێ و مەنصبان ژ دلێ خۆ دئینادەر، مەزنێن دنیایێ ل دویڤ وان دکرە غار، و هیڤییا وان ئەو بوو جارەکێ ئەو زانا ل دیوانا وان حازر ببن؛ چونکی گۆتنا زانایی بۆ وان و حوکمێ وان وەکی مۆرا سولطانی بوو ل سەر پارەی، و پارەی ل بازارێ چو بهایێ خۆ نابت حەتا مۆرا سولطانەکی ل سەر نەبت.

قاصدێ سولطانی هاتە نک شێخی و گۆتنا سولطانی بۆ وی ڤەگێرا، و گۆتێ: هەما تو دەستێ سولطانی ماچی بکەی ئەو دێ تە عەفی کەت.. شێخی ب دلپێڤەبوون ڤە بەرێ خۆ داییێ و گۆتێ: ((هەی مسکین! ب خودێ ئەز قەبویل ناکەم سولطان بێت و دەستێ من ماچی بکەت، ڤێجا چاوا ئەز دێ ئێم و

دەستێ وی ماچی کەم؟! ئەز تشتەکی دزانم و هوین تشتەکێ دی، حەمد بۆ وی خودایی بت یێ ئەز ژ وێ بەلایێ پاراستیم یا هوین تووش بووینێ!)).

قاصدی گۆتێ: پا سولطانی بڕیار دایە تە بگرت.

وی گۆت: هەچییا هەوە دڤێت بکەن..

ل دویڤ بڕیاراَ سولطانی شێخ د خیڤەتەکا ب ڕەخ خیڤەتا سولطانی ڤە هاتەگرتن، شێخی ئەڤ دەمێ خۆ هەمی ب عیبادەتی و خواندنا قورئانێ ڤە دبۆراند، ڕۆژەکێ هندەک مەزنێن صەلیبییان هاتنە نک سولطانێ ئەییووبی، پشتی وان و سولطانی دان و ستاندنێن خۆ ل بن خیڤەتا سولطانی ب دوماهی ئینایین، دەنگێ شێخ عززەددینێ کوڕێ عەبدسسەلامی ب خواندنا قورئانێ هاتە وان، سولطانێ موسلمان ڤیا خۆ ل بەر مەزنێن صەلیبییان شرین بکەت، ئینا گۆتە وان: هەوە گوهـ ل دەنگێ ڤی شێخی ئەوێ قورئانێ دخوینت هەیە؟

وان گۆت: بەلێ..

سولطانی گۆت: ئەڤە قەشێ مە موسلمانان یێ ژ هەمییان مەزنترە، من ئەو یێ گرتی چونکی ئەو یێ نەڕازییە کو من هندەک جهێن موسلمانان تەسلیمی هەوە کرین، ڤێجا من ئەو ژ هەمی مەنصبان یێ ئێخستی و ژ بەر هەوە من ئەو نوکە یێ گرتی.

سولطانێ شەرمزار هزرکر مەزنێن خاچپەرێسان دێ ئێن دەستێ وی ماچی کەن سەرا ڤێ خزمەتا وی بۆ وان کری، بەلێ (صەدمەکا) مەزن بۆ وی چێبوو دەمێ مەزنێ فرەنگێ گۆتییە وی: ئەگەر ئەڤە قەشێ مەبا یێ هۆسا ئەم دا ئاڤێ ل پییێن وی کەین پاشی دا وێ ئاڤێ ڤەخۆین!

شەڕی د ناڤبەرا ئەییووبییێن مصرێ و شامێ دا دەست پێ کر، و کانێ چاوا خائین هەردەم شەرمزار دبن لەشکەرێ شامێ ب سەرۆکاتییا (الملک

الصالح إسماعيل)ی شكەست، و لەشكەرێ مصرێ ب سەرۆكاتییا (الملک الصالح نجم الدین أیوب)ی ب سەركەفت، و ب ڤێ سەركەفتنێ شێخێ ئیسلامێ عززەددینێ كورێ عەبدسسەلامی ژ ئێخسیرییا سولطانێ شامێ رزگار بوو، و پشتی رزگاربوونێ ئەوی قەستا وەلاتێ مصرێ كر و ل وێرێ ئاكنجی بوو، و كانێ خەلكێ شامێ چەند حەز ژ وی دكر خەلكێ مصرێ ژی هند یان پتر حەز ژێ كر.

### د گەل ئەیییوبییێن مصرێ:

مەزنێن مصرێ یێن ئەیییوبی دەمێ گوهـ ل هەلویستێ شێخی د گەل سولطانێ شامێ بووی، ئەو د چاڤێن وان دا مەزنبوو، و ژ بەر كو شێخ ئێک ژ مەزنە زانایێن سەردەمێ خۆ بوو، ل مصرێ ژی ئەو هاتە هلبژارتن دا ببتە سەرۆكێ قازییان و شێخێ هەمی زانایان، و رۆژ بۆ رۆژێ بهایێ وی د ناڤ خەلكی دا مەزن دبوو و ڤیانا وی د دلان دا زێدە دبوو..

مەزنێ مصرێ هنگی نەجمەددین ئەیییوب بوو، نەجمەددین مرۆڤەكێ زێدە ب هەیبەت بوو، و كەسێ بستە نەدكر ل دیوانا وی سەرێ خۆ راكەت و بەرێ خۆ بدەتە ناڤچاڤێن وی، ژ لایەكی ڤە ئەو سولطانەكێ جامێر و خێرخواز بوو، خەلكی حەز ژێ دكر، و ژ لایەكێ دی ڤە ئەو مرۆڤەكێ ب حوكم بوو یێ ئەو ژێ عێجز ببا، دا فەرمانێ ب گرتنا وی دەت و پشتی هنگی ژ بیر دكر و كەسێ نەدوێریبا بیرا وی لێ بینتەڤە.. كێم دەردكەفتە ناڤ مرۆڤان، عەدەتێ وی بوو ل رۆژا عەیدێ ئەو دەردكەفتە ناڤ بازێری، پشتی سویک و بازار دهاتنە خەملاندن و تژی سەر رێكان لەشكەر و زێرەڤان دبوو.

جارەكێ هندەک مرۆڤ هاتنە نک سەرۆكێ قازییان عززەددینێ كورێ عەبدسسەلامی و گۆتنێ: ل فلان جهی ژ قاهیرە مرۆڤەكێ فەلە یێ هەی دكانەكا عەرەقێ یا هەی، ڤێجا ئەگەر تە گۆتبا سولطانی.. وی گۆت: باشە.

ل رۆژا عەیدێ وەکی هەر سال سولطان ب مەوکبێ خۆ ڤە دەرکەفت، مرۆڤ هەمی ل سەر لێڤێن رێکان راوەستیان ل هیڤیيا دەریاسبوونا سولطانی، سولطان بۆری.. مەزنێن دەولەتێ هەمی ل دۆر ورەخان بوون، زوی ب زوی خەلکی بستە نەدکر بەرێ خۆ بدەنە سولطانی، تژی واران زێرەڤان و عەبدێن چەکدار هەبوون، عززەددینێ کورێ عەبدسسەلامی سەرۆکێ قازییان، دەمێ زانی سولطان دێ ب ڤی رەنگی دەرکەفتە بازارێ چوو د رێکێ دا، گاڤا سولطان نێزیکی وی بووی، شێخ ب نک ڤە چوو و ب دەنگەکێ بلند ڤە گازی کرێ:

ـ ئەییووب!

جرفەک ب سولطانی کەفت.. ئەڤە کییە ب ڤێ بێ تۆرەییێ د گەل وی دئاخڤت؟ ما ئەو نزانت ئەز کیمە؟

دەمێ هەڤالێن سولطانی تێ ئینایەدەر کو سولطان عێجزبوو هندەکان هێدی گۆتێ: ئەڤە شێخ عززەددینێ کورێ عەبدسسەلامییە، دەمێ سولطانی ئەڤە زانی بێ دەنگ بوو، بەرسڤا سولطانی دا و گۆتێ: بەلێ سەیدا، خێر بت؟

سەیدایی گۆتێ: ل فلان جهی ژ بازێرێ موسلمانان، دکانەکا هەی عەرەق لێ دئێتە فرۆتن، تە زانییە یان نە؟

سولطانی گۆت: و ئەو ژی بوویە؟

شێخی گۆتێ: بەلێ ل فلان جهی.

سولطانی بێنەکێ هزرا خۆ کر پاشی گۆت: ها.. تو راست دبێژی، ئەو دکانا تو بەحس ژێ دکەی، هێشتا ل سەر دەمێ بابێ من هەبوو، یەعنی هەر وەکی گۆتی: ل سەر خاترا بابێ خۆ من ئەو دکان نەگرتییە، شێخی گۆتێ: دیارە تو ژ وانی یێن دبێژن: ﴿ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ (الزخرف: ٢٢)؟ سولطانی ب لەز گۆتێ: نە نە، نەخێر، پاشی وی گۆتە هندەکان: هەرن ڤێ گاڤێ وێ دکانێ بگرن.

طـەلـەبەکێ شێخی دبێژت: پشتی هنگی من گۆتێ: سـەیدا ئـەو چ بـوو تـە کری؟ وی گـۆتە مـن: کـوڕێ مـن! گاڤا مـن سـولطـان ب ڤـی ڕەنگی دیتـی ئـەز ترسیام غورروور بۆ وی چێ ببت ڤێجا من ڤیا ئەز وی هشیار بکەم.

گۆت: من گۆتێ: ئەرێ ما تو ژێ نەترسیای؟

وی گـۆت: کـوڕێ مـن! من بیـرا خۆ ل مەزنییـا خـودێ ئینـاڤـە، سـولطـان ل بەر چاڤێن من وەکی کتکەکێ لێ هات.

## شێخ و فەرمانا ب باشیێ وپاشڤە لێدانا ژ خرابیێ:

سولطـانێ زانایان عزەددینـێ کـوڕێ عـەبدسـسـەلامـی، مرۆڤـەک بـوو خـودێ وەسـا ئـەو ئافرانـدبوو کـانێ چـاوا خـەلـک ب خـوارن و ڤـەخـوارنێ دژیـن، و خۆ ڕادگرن، وەسـا ئـەو ب فـەرمـانـا ب باشـیێ و پاشـڤـەبرنا ژ خرابیـێ دژیـا و خۆ ڕادگرت، و مرۆڤێ زانا ئەگەر ئەو بـت یـێ خـودێ خێرا وی ڤیـا بـت، و کـریـتـە ژ زانایێن خێرخواز و سەرڕاست، خەما وی یا مەزن هەر و هـەر دێ ئـەو بـت ئـەو بـەرێ مرۆڤـان بـدەتـە وێ ڕێـکـێ یـا شـریعەتـێ خـودێ پـێ هـاتی، و وان ژ هـەر خرابییەکا هەبت بدەتە پاش.

نە تشتەکی بابەتی زانایێ دینییە ئەو گـۆتـنـەکا وەسـا بکـەت شریعەت وێ ل وی بزڤڕینـت و درەو دەربێخـت، دینـێ دورسـت دوڕوییـاتییێ نزانـت، و هـەر جـارەکـا دوڕوییـاتـی تێکـەلـی دینـی بـوو دیـن پـویچ دبـت، و زانـایێ دینـی ئەگـەر دوڕوییاتی کر: نەگۆتە ڕاستییێ ئەڤە ڕاستییە، و خرابییێ ئەڤـە خرابییـە، هنگـی مەزنترین منافق دێ ژ وی شەریفتر بت، و ڤرێژا ل کراسێ سپی وەکی وێ نینـە یا ل کراسێ ڕەش.

مـنـافـق مـرۆڤـەکـە ژینا وی یا ڤەشارتییە، و زانایێ دینی ژینەکا هلێڤڕی ل بەر چاڤێن خەلکی هەیە؛ چونکی بەرێ خەلکی هەمییێ یێ لێ، ئەو مرۆڤەکە ب دینی ڤە یێ گرێدایـە، یـێ هاتییـەدان دا کـارێ وی ڕێنیشـادانا خـەلکـی بـت،

ڤێجا هەر جارەکا وی ڕێک ل بەر خەلکی بەرزە کر، یان سستی د دیارکرنا ڕاستییێ و خەلەتییێ دا، هنگی خەلک کارێ وی ل سەر دینی دهژمێرن، ئەگەر وی درەوەک کر خەلکێ نەزان دێ بێژن: دین درەوە! ئەگەر وی دوڕوییاتییەک کر ئەو دێ بێژن: دین دوڕوییاتییە!

لەو دەمێ مرۆڤێ زانا د سەردا دچت ئەو دوقات ژ خەلکی خرابتر لێ دئێت؛ چونکی ئەو هنگی عالەمەکا مرۆڤان دێ د سەردا بەت، و زانا جێگرێن پێغەمبەرانە، هندی ئەو ل دویڤ ڕێکا وان بچن، ئەگەر نە.. شەیطان ب هەمی شەیطانییا خۆ ڤە، خۆ ژ وان دکرت!

شێخ عزەددین -وەکی مە گۆتی- بێی فەرمانا ب باشییێ و پاشڤەبرنا ژ خرابییێ نەدشیا بژیت، شێخ سەرۆکێ قازییێن مصرێ بوو، و ئیمام و خوتبەخوین و سەیدا ژی بوو ل مەزنترین مزگەفتا قاهیرە، بارا پتر ژ دەمێ خۆ وی د ناڤ فەقییان دا ل مزگەفتێ دبۆراند، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو ژ سەر و بەرێ بازێری یێ بێ ئاگەهـ نەبوو، شاگردە و فەقییێن وی هەر ئێک بۆ وی چاڤەکێ ڤەکری بوو وی خەلک پێ ددیت، هەر جارەکا فەقییەکێ وی تشتەکێ خەلەت ل عەردەکی دیتبا، دا ئێت جابێ گەهینتە شێخی و شێخ دا ب دەورێ خۆ یێ شەرعی ڕابت.

جارەکێ فەقییەکێ وی هاتە نک و گۆتێ: فلان ئەمیری طەبلخانەیەک ب ڕەخ فلان مزگەفتێ ڤە ئاڤاکرییە.. و طەبلخانە ل وی دەمی بۆ وی ئاڤاهی دهاتە گۆتن یێ کەیف و شاهی لێ دهاتنە گێڕان، و ئامیرێن مۆسیقێ لێ دهاتنە ب کارئینان، وەکی (نادییێن) داوەتان د جڤاکا مە یا ئەڤرۆ دا، گاڤا شێخی ب ڤێ چەندێ زانی، و چونکی ئەو قازی بوو، و حوکم د دەستی دا بوو، ڕابوو کۆمەکا فەقییان دانە دویڤ خۆ و چوو وی جهێ طەبلخانە لێ هاتییە ڤەکرن، دەمێ بۆ وی دیاربووی کو ئەو تشتێ وی گوهـ لێ بووی ڕاستە داخوازا ماهۆلکەکی کر و وی ب خۆ د گەل فەقییێن خۆ دەست ب خرابکرنا وی ئاڤاهی

کر، و هنگی ڕاوەستان حەتا وان ئەو طەبلخانە هەڕفاندی و ئەو تشتێن ل ژۆر هەمی پویچ کرین، و فەتوا ژی دا کو ئەو مالێ هاتییە تەلافتن ژ کیسێ خودانی چوو و بۆ نائێتە بەدەلقەکرن.

ل ڤێرێ دو ڕاوەستانێن کورت د گەل ڤێ سەرهاتییێ مە هەنە:

ئێک: دەمێ شێخ ب ڤی کاری ڕابووی -وەکی مە گۆتی- سەرۆکێ قازییان بوو، یەعنی پشکەک ژ دەسهەلاتدارییێ د دەستی دا هەبوو، لەو وی ئەڤ خرابییە ب دەستێن خۆ گوهاڕت.

دو: ئەڤ طەبلخانە یا میرەکی ژ میرێن دەولەتێ بوو، و ئەو میر ب حوکمێ پەیوەندییێن خۆ د گەل سولطانێ مصرێ دشیا نەخۆشییێ بگەهینتە شێخی، یان هەر چو نەبت وی ژ مەنصبێ وی دەربێخت، بەلێ چونکی شێخ نە مرۆڤەکێ مەنصبپەرێس و مەصلحەتچی بوو وی هزر د ڤێ چەندێ دا نەکر و خۆ ژ واجبێ خۆ یێ شەرعی نەدا پاش.

## شێخ.. و فرۆتنا میران:

هەڤڕکییا شێخ عززەددینی د گەل میر و کاربدەستان ژ بەر گۆتنا وی بۆ حەقییێ ل ڤی توخوبی ڕانەوەستا.. سولطانێ مصرێ نەجمەددینێ ئەیووبی پایتەختا دەولەتا خۆ ژ عەبدان تژی کربوو و وی ئەڤ عەبدە هەمی چەکدار کربوون و هندەک ژ وان کربوونە میر و مەزنێن دەولەتێ، نە ب تنێ هندە بەلکی (نائب السلطنە) ب خۆ ژی، کو د دەولەتێ دا زەلامێ دویێ بوو، ئەو ژی عەبد بوو.

مەمالیکان (یان ئەو عەبدێن سولطانی بازێڕ ژێ تژی کری) بارێ خەلکی زێدە گران کربوو، و ژ بەر کو ئەو زەلامێن سولطانی بوون کەس نەدوێرییا د گەل وان باخڤت، دەمەکی وان جهێن خەلکی ژێ کرین و د پشت سولطانی ڕا حوکمداری دکر، شێخ عززەددین مەزنێ زانایێن قاهیرە بوو و سەرۆکێ قازییان

بوو، یەعنی ل شوینا مەحکەمێن مە یێن ئەڤرۆ بوو، هەر کڕین و فرۆتنەکا چێ ببا دڤیا وی مۆر کربا ئەگەر نە ئەو (عەقد) نەدبوو (عەقدەکا شەرعی)، هەر عەقدەکا چووبا نک وی، و لایەکێ عەقدێ ئێک ژ مەمالیکان با، وی ئەو عەقد مۆر نەدکر دگۆت: ئەڤە عەبدە و ب شریعەت کڕین و فرۆتنا مرۆڤێ عەبد یا دورست نینە.

مەمالیکان ب ڤێ چەندێ نەخۆش بوو، و بێهنا وان تەنگبوو، لەو ئەو چوونە نک جێگرێ سولطانی (و ئەو ژی ژ مەمالیکان بوو) و گازندەیێن خۆ ژ شێخی بۆ وی کرن، وی هندەک مرۆڤ هنارتنە نک شێخی دا پسیارا ڤێ چەندێ ژ وی بکەن و کانێ وی چ دڤێت، شێخی گۆتە قاصدان: هوین عەبدن، و حەتا کڕین و فرۆتنا هەوە ب شریعەت یا دورست بت دڤێت هوین بێنە ئازاکرن، و چونکی خودانێن هەوە نەدنیاسن دڤێت هوین ل بازارێ بێنە فرۆتن پاشی ئەگەر ئەوێ هەوە دکڕت، هوین فرۆتن، و هوین ئازابوون هنگی کڕین و فرۆتنا هەوە دێ یا دورست بت.

جێگرێ سولطانی ژ ڤێ گۆتنا شێخی دینبوو، چاوا ئەڤە دێ چێ بت؟ قازییەکێ پیر، یێ خەرفتی، ئێکێ وەکی من ببەتە بازارێ و بفرۆشت؟ ئەڤە قەت چێ نابت، و ئەو ڕابوو چوو نک سولطانی و مەسەلە بۆ ڤەگێڕا، سولطانی گۆت: ئەڤە نە شۆلا وییە!

ئاخفتن گەهشتە قازی ئینا وی گۆت: ما دەم تشتەک هەیە نە شۆلا من بت، ژ ئەڤرۆ وێڤە ئەز قازی نابم.. شێخی (ئستقالە) ژ (مەنصبێ) خۆ دا، و داخواز ژ سولطانی کر کو دەستویرییێ بدەتێ دا ئەو مالا خۆ ژ مصرێ بارکەت و بچتە شامێ، سولطانی گۆتێ: بلا. شێخی دو دەوار ئینان، ژنکا خۆ و کوڕێ خۆ ل دەوارەکی سویارکرن، و مالا خۆ هەمی ل دەوارا دی سویارکر، و کەفتە ڕێ و ب بێ دەنگی ژ باژێری دەرکەفت..

مەسەلە هۆسا ب بێ دەنگی ب دووماهی نەهات، گاڤا سوحبەتا دەرکەفتنا شێخی گەهشتییە خەلکی زانایێن باژێری هەمییان خۆ دا ئێک و ب دویڤ شێخی دا ژ باژێری دەرکەفتن، و گاڤا خەلکی زانا ب ڤی ڕەنگی دیتین ئەو ژی ب دویڤ وان دا دەرکەفتن، خۆ صنعەتکاران ژی دکانێن خۆ گرتن و ب دویڤ شێخی دا دەرکەفتن، مەسەلە مەزن بوو، ب هزاران خەلکی دا ب دویڤ شێخی ڤە، هندەک ب لەز چوونە نک سولطانی و گۆتنێ: ئەگەر تو نەگەهییە شێخی و وی نەزڤڕینی، کەس د باژێری دا نامینت تو سولطانیێ لێ بکەی!

گاڤا سولطانی دیتی مللەت هەمی یێ د گەل شێخی نەچاربوو هنارتە ب دویڤ شێخی ڕا دا بزڤڕتە باژێری، و گۆتێ: بزڤڕە سەر هەمی کارێن خۆ یێن بەرێ، و چێ نابت کەس مایێ خۆ د تە بکەت، شێخ ڤانعبوو، زڤڕی ڤاهیرە و خەلک ژی د گەل زڤڕین، و پشتی ئەو زڤڕییە سەر کارێ خۆ ئێکسەر وی دەست ب فرۆتنا مەمالیکان (مەزنێن دەولەتێ) کر، گاڤا جێگرێ سولطانی دیتی ئەو ل سەر ڤی کاری یێ مجدە عەقل د سەری نەما و گۆت: ئەو لێڤە نەبت دێ وی ب ڤی شیری کوژم! و دا ئەو گەفا خۆ ب جهـ بینت ڕابوو زەلامێن خۆ دانە ب دویڤ خۆ ڤە، و ب سویاری قەستا مالا شێخی کر، شیرێ وی د دەستان دا بوو، دەرگەهێ مالا شێخی قوتا، کوڕێ شێخی دەرگەهـ ڤەکر، گاڤا وی جێگرێ سولطانی ب ڤی ڕەنگی دیتی، ب لەز زڤڕی د ژۆر ڤە و گۆتە بابێ خۆ: خۆ خلاص بکە، حال و مەسەلێن جێگرێ سولطانی ئەڤەنە، شێخی گۆتە کوڕێ خۆ: کوڕێ من! بابێ تە ژ هندێ کێمترە کو د ڕێکا خودێ دا بێتە کوشتن.. پاشی دەرکەفتە بەردەری، و گۆتە جێگرێ سولطانی: کەرەم بکە تە خێرە؟

تو دا بێژی هندەک چریسک ژ چاڤێن شێخی ڤەپەشین و ژ گەهێن دەستێ (نائبی) گرتن و سۆتن، گاڤا (نائبی) شێخ دیتی دەستێ وی ڤەلەرزی و شیر ژێ دەرکەفت، وی هند خۆ دیت یێ دکەتە گری و خۆ د دەستێ شێخی وەردکەت و دبێژتێ: دوعا بۆ من بکە! پاشی گۆتێ: سەیدا تو دێ چ ل مە کەی؟

شێخی گۆت: دێ هەوە فرۆشم!

گۆت: و کی دێ پارێن مە وەرگرت؟

شێخی گۆت: ئەز!

گۆت: و دێ چ لێکەی؟

شێخی گۆت: دێ ل سەر موسلمانان لێکڤە کەم..

میر و مەزنێن دەولەتێ کەفتنە بەرانبەر واقعەکێ بەرتەنگ و وان زانی وان چو رێکێن دی ژ بلی یا شێخ دبێژت نینە، ئینا ئەو نەچاربوون خۆ ب دەست شێخی ڤە بەردا، و هەر ئێکی گۆتە هەڤالەکێ خۆ: رۆژا شێخ من دفرۆشت وەرە من بکرە و ئەگەر ئێکی زێدەکر تو هێشتا ل سەر زێدە بکە، و تە خەم پێ نەبت.. شێخی ژڤان دا خەلکی و ل بازێری کرە دەنگ: سەرۆکێ قازییان شێخ عززەددینێ کورێ عەبدسسەلامی ل فلان رۆژێ، مەزنێن دەولەتێ ژ مەمالیکان دێ فرۆشت، و هەچییێ بڤێت ئێک ژ وان بۆ خۆ بکرت بلا ئامادە ببت..

رۆژا ژڤان هات، شێخی میرێن مەمالیکان هەمی ژ جێگرێ سولطانی بگرە و حەتا یێ ژ هەمییان کێمتر ئینانە مەیدانێ، و ئێک ئێکە ل مەزادێ فرۆتن، و پاشی ئەو پارە یێ ب وان ڤە هاتی بر کرە د خزینەیا دەولەتێ دا و ل سەر فەقیران بەلاڤکر!

### ل سەر دەمێ مەمالیکان:

پشتی سولطانێ ئەییووبی نەجمەددین ئەییووب مری، فەرمانداری ژ دەستێ بنەمالا ئەییووبییان هاتەدەر، و مەمالیک بوونە حوکمدارێن مصرێ، و هەر چەندە شێخی پترییا وان ل بازارێ فرۆتبوون ژی، بەلێ دەمێ حوکم کەفتییە دەستێ وان، وان بهایەکێ مەزن دا شێخ عززەددینی، و چو کارەکێ مەزن یێ پەیوەندی ب دەولەتێ ڤە هەی وان بێی وی نەدکر.

جارەکێ ل سەردەمێ مەلک (سەیفەددین قوطزی) وەسا چێبوو لەشکەرێ تەتەرییان گەلەک جهـ ژ وەلاتێ شامێ گرتن، و دلێ وان چوویێ بەر ب مصرێ ژی ڤە بچن، گرفتاری ل سەر موسلمانان زێدە مەزنبوو و ترس کەفتە دلێ خەلکێ مصرێ، سولطانێ مصرێ یێ مەملووک سەیفەددین قوطزی بریار دا لەشکەرەکێ مەزن ئامادە بکەت و ببەتە بەرسنگێ تەتەرییان بەری ئەو شامێ هەمییێ بستینن و بێن قەستا مصرێ بکەن، بەلێ دورستکرنا لەشکەرەکێ ب ڤی ڕەنگی پێڤە هاتنێن مەزن بو دڤێن، سولطانی بریار دا مەزنێن دەولەتێ و ماقویل و زانایان کۆم بکەت و دان و ستاندنێ ل دۆر ڤێ مەسەلێ د گەل وان بکەت، مەلکی گۆتە وان: حال و مەسەلە ئەڤەنە هوین چ دبێژن ئەم چ بکەین؟

هەمی ل سەر هندێ کۆمبوون کو دڤێت لەشکەرەکێ مصری یێ ب هێز بێتە ئامادەکرن دا بەرگرییا تەتەرییان پێ بێتەکرن، مەلکی و مەزنێن دەولەتێ ژ مەمالیکان گۆت: ژ بیر نەکەن ئامادەکرنا لەشکەرەکێ ب ڤی ڕەنگی پارەکێ مەزن بۆ دڤێت و میزانییا دەولەتێ تێرا ڤێ چەندێ ناکەت.. پاشی سولطانی گۆت: ئەز دبێژم یا باش ئەوە ئەم بێشەکێ ژ زەنگینێن بازێری وەربگرین هند پارە دێ کۆم بن ئەم لەشکەرێ خۆ پێ دورست بکەین، هوین چ دبێژن؟

حازران هەمییان گۆت: گەلەک هزرەکا د جهێ خۆ دایە.

و بەرێ هەمییان ما ل شێخ عززەددینی کانێ ئەو دێ چ بێژت؛ چونکی بەس ئەو مابوو دەنگ نەکری، سولطانی گۆتێ: سەیدا تو چ دبێژی؟

سەیدای گۆت: ئەز دبێژم نە! هوین سولطان و میر و مەزنێن دەولەتێ کەس ژ هەوە زەنگینتر نینە، هوین زێرێن ژنێن خۆ و ناڤمالییێ خۆ یێ زێدە بینن بفرۆشن و ب وی پارەی لەشکەری ئامادە بکەن، و چی گاڤا وی پارەی تێرا مە نەکر هنگی ژ نوی دێ بێژینە خەلکی بلا هاریکارییێ بکەن.

سولطانی گۆت: بەلێ سەیدا، دێ ئەو بت یا تە گۆتی.

پشتی ئامادەبووی ڤەرەڤین سولطانی بڕیار دا مەزنێن دەولەتێ -و بەری هەمییان ئەو ب خۆ- زێڕێ خۆ و تشتێ زێدە د مالێن خۆ دا بفرۆشن و وی پارەی بینن دا لەشکەری پێ دورست بکەن، و پارێن وان ب تنێ تێرا کرن و زێدە ژی! لەشکەر هاتە دورستکرن و شەڕەکێ گران ڤی لەشکەری د گەل تەتەرییان کر و تێدا ب سەر کەفت، و ب ڤی سەرکەفتنێ خودێ شام و مصر ژی ژ خرابییان تەتەرییان پاراست.

## مرنا شێخی:

ل سەر دەمێ (الملک الظاهر بێپرس)ی، و ب دورستی ل سالا ٦٦٠ مشەختی سولطانێ زانایان عززێ کوڕێ عەبدسسەلامی، ل بازێڕێ قاهیرە چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و خەلکێ بازێڕی هەمی ب دویڤ جەنازێ وی دا دەرکەفتن، و دبێژن: دەمێ مەلکی ئەڤ دیمەنە دیتی وی گۆت: ژ نوی پشتا من ڕاستبوو، ئەگەر ڤی شێخی ڤیابا دشیا خەلکی ب من ڕا بەردەت حەتا سەلتەنەتا من ژ من بستینن.

شێخی پتر ژ چل کتێبان د گەلەک بابەتێن شەرعی دا نڤیسی بوون.

## بۆچی سولطانێ زانایان بوو؟

پشتی مە ئەڤ گەشتە د گەل سولطانێ زانایان کری ڕەنگە گەلەک ژ مە پسیار بکەن: ئەرێ چاوا ئەڤ زانایە شیا بوو هندە (شەعبییەتێ) بۆ خۆ د ناڤ خەلکی دا چێ بکەت، حەتا جڤاک هەمی بۆ وی پێکڤە بۆ وی ببتە ئەو (قاعیدە) یێ موکم یێ ئەو (ئنطلاقێ) ژێ بکەت بۆ گوهۆڕینا خرابییێ؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژین: ب کورتی ژ بەر شەش ئەگەران:

١- چونکی وی خۆ ژ دنیایا خەلکی بێ منەت کربوو و خەلک نەدشیان خۆ ژ دینێ وی بێ منەت بکەن.

٢- دینی ئێکا هند ژ وی چێکربوو ژ خودێ پێڤەتر بەرێ وی ل چو نەبوو، و ئەو زانایێ دلێ خۆ نەبەتە وی تشتێ د دەستێ خەلکی دا خەلک دێ حەز ژێ کەن.

٣- شێخ ب واقعێ ئوممەتێ یێ زانا بوو وهەر دەم ئەو یێ نێزیکی خەلکی بوو، و چو جاران وی مەصلحەتا خۆ یا تایبەت ب پێش مەصلحەتا خەلکی یا گشتی نەدئێخست.

٤- گۆتن و نڤیسینێن وی ل دۆر مەسەلێن مەزن یێن مللەتی بوون، و ئەو ژ خەم و خیالێن خەلکی یێ دویر نەبوو.

٥- وی و زانایێن دی هەمییان خۆ کربوو ئێک چەپەر نە حاکمی و نەخەلکی نەدشیا وان ژێکڤە کەن، لەو وان هەیبەتا خۆ د چاڤێن خەلکی و دەسهەلاتێ ژی دا هەبوو، و ئەگەر ئەو هەمی گاڤان ب سەر و ستوییێن ئێک و دو ڤە بان دا ب ساناهی ژێک ئێنە دزین.

٦- دنیا د چاڤێن وی دا ژ هندێ کێمتر بوو ئەو دلێ خۆ ببەتێ، یان سەرا مەنصبان سەرێ خۆ شۆڕ بکەت، و مرادا وی ئەو بوو ئەو د ڕێکا خودێ دا بێتە شەهیدکرن.

ژ بەر ڤان ئەگەران ڤیانا وی کەفتبوو دلێن خەلکی، و گۆتنا وی کربا د دەولەتێ دا کەس نەبوو ل بەر ڕاوەستت.. سلاڤ ل سولطانێ زانایان عززێ کوڕێ عەبدسسەلامی بن دەمێ هاتییە دنیایێ، و دەمێ خۆ فرۆتییە خودێ.

# مرۆڤێن خودێ
# د گرتیخانەیێن زۆرداران دا

﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ ﴾ (یوسف: ٣٣) ئەڤە گۆتنا مرۆڤەکی ژ مرۆڤێن خودێ بوو، کو یووسف پێغەمبەرە -سلاڤ لێ بن-، دەمێ ژێ هاتییە خواستن کو ئێک ژ دویان بۆ خۆ هلبژێرت:

- یان بێ ئەمرییا خودێ بکەت و قەستا وی کاری بکەت یێ خودێ پێ نەخۆش.

- یان ژی گرتنێ و چوونا د گرتیخانەیێ ڤە..

وی یا دویێ هلبژارت، و دەمێ وی گرتیخانە بۆ خۆ هلبژارتی ئەو یێ کەیفخۆش بوو ژێ!

مرۆڤێن دنیایێ ئەوێن سەرڤە سەرڤە د تشتان دگەهن، هزر دکەن کو گرتن ڕەوستانا ژ کارییە و دویرئێخستنا ژ ژیانێیە، لەو ئێک ژ وان دەمێ بەحسێ گرتنا خۆ گوهـ لێ دبت هەست ب نەخۆشییەکا مەزن دکەت، بەلێ مرۆڤێن خودێ بەرێخۆدانا وان بۆ ڤێ مەسەلێ یا جودایە..

دیسا دێ بێژین: د هەڤڕکییا خۆ دا د گەل مرۆڤێن دنیایێ، مرۆڤێن خودێ تووشی گەلەک تەنگاڤییان دبن، زۆردار هەردەم دخوازن وان ئاستەنگان بێخنە د ڕێکا مرۆڤێن خودێ دا یێن وان ژ کارێ وان یێ پیرۆز پاشدا دبەن، بەلێ وەکی هەر جار هزرا وان خاڤ دەردکەڤت؛ چونکی چو ئاستەنگ نینن بشێن بەرێ وان ژ کارێ وان بدەتە پاش، کو بەلاڤکرنا ڕۆناهییا خودێیە د ناڤ خەلکی دا.

گرتن، یان مانا ب کوتەکی د مال دا، ئەوا ب عەرەبی دبێژنێ: (الإقامە الجبریە)، ئێک ژ وان ئاستەنگانە یێن ژ بەرێ وەرە زۆردار دئێخنە د ڕێکا

گازیکەرێن حەقییێ دا، یا ژ زۆرداران ڤە ئەوە ئەو ب ڤێ چەندێ دێ شێن دویراتییێ ئێخنە د ناڤبەرا مرۆڤێن خودێ و خەلکی دا، بەلێ دیرۆک شاهدە کو ئەو د ڤێ هزرا خۆ دا دبێ فام بووینە؛ چونکی نەبوویە جارەکێ گرتن مرۆڤی ژ حەقییێ لێڤەکەت یان حەتا سست ژی بکەت. گرتن بۆ (ئیرادا) خودانی وەکی ئاگرییە بۆ زێڕی، کەنگی تو دێ زێڕێ عەسلی نیاسی؟ ئەگەر تە ئەو ب ئاگری جەڕباند، مرۆڤێ خودان ئیرادە ژی هنگی دئێتە نیاسین ئەگەر ب سەرکەفتن ژ گرتیخانەیێ دەرکەفت بێی ئارمانجا خۆ ژ دەست بدەت.

گرتیخانە جهەکێ عنتیکەیە، و سەرهاتییا مرۆڤێن وێ د دیرۆکێ دا هێشتا عنتیکەترە، گەلەک جاران هندەک کەس ژ سەر کورسیکا مەزناتییێ دئێنە ڕاکرن و بەرێ وان بۆ گرتیخانەیێ دئێتەدان، و گەلەک جاران ژی هندەک ژ گرتیخانەیێ یێن هاتینە دەرێخستن و بەرێ وان بۆ کورسیکا مەزناتییێ یێ هاتییەدان!

(سجن) ئەڤ جهێ بێ ڕەوش، ژ پێغەمبەران هەبووینە لێ ژیاین، ژ چاکان ژ زانا، ژ باشان و ژ خرابان ژی، هندەک جاران ئەڤ سجنە یا بوویە مەدرەسە ژ بۆ بەلاڤکرنا بیر و باوەران، و هندەک جاران ژی ئەو یا بوویە جهێ لێک داجڕیانا مرۆڤێن خراب..

گرتن.. ئامیرەتەکێ کەڤنە زۆرداران دژی نەیارێن خۆ ب کارئینای، وەکی مە گۆتی: یا ژ وان ڤە ئەو دێ شێن ب ڤێ چەندێ چرایێ ڕاستییێ ڤەمرینن و گازیا حەڤییێ بێ دەنگ کەن، بەلێ وێڤە ژ کیڤە دئێت! ئەگەر هندەک جاران ئەو شیابن لەشێن خودانێن ڕاستییێ بگرن و بهاڤێژنە د گرتیخانەیان دا، ئەو قەت و قەت نەشیاینە دلێن وان داگیر بکەن و هزرا وان دەستەسەر بکەن؛ چونکی هەر خودان ڕاستییەکێ هەبت دلەکێ هەی نائێتە سجنکرن! دلەکە هەردەم بلند بەر ب مەلەکووتا خودێ ڤە دفڕت، بەر ب عەسمانەکێ ساهی ڤە یێ پاقژ ژ هەمی ڕەشە عەوران.

رۆژا سولطان ل سەر زانایێ مەزن عززێ کورێ عەبدسسەلامی ب غەزەب هاتی و بڕیار دای وی بێختە ژێر مانا ب کوتەکی (إقامە جبریە) و وی د مالا وی دا وی بگرت، وی مرۆڤەک هنارتە نک (عززی) دا ڤێ بڕیارا سولطانی بگەهینتێ.. بەرسڤا ڤی زانایی بۆ قاصدێ سولطانی ئەو بوو وی گۆتێ: ((ئەڤە ئێک ژ قەنجییێن خودێ یێن مەزنە یێن وی د گەل من کرین، دڤێت ئەز شوکرا وی سەرا بکەم، دەمێ ئەز د مال دا دئێمە گرتن، ئەز نە ل مال دڕوینمە خوارێ، نە.. ئەز هنگی یێ د ناڤ بیستانەکی دا، ئەز شعوورێ ب کەیفخۆشییێ دکەم چونکی دێ مینمە ب تنێ و بەطال بۆ کرنا عیبادەتێ خودێ، ئەڤە دیارییەکە خودێ دایە من، فلان کەس! هانێ بۆ تە ڤێ شەملکێ دیاری ژ من دا تو نڤێژان ل سەر بکەی، و ب خودێ ئەگەر من تشتەکێ دی یێ ب بهاتر ژ ڤێ شەملکێ هەبا ئەز دا دەمە تە..)).

ما نەتشتەکێ غەریبە ئێک مزگینییا گرتنا مرۆڤی بۆ مرۆڤی بینت، مرۆڤ ڕابیت تشتێ خۆ یێ ژ هەمییان ب بهاتر بۆ وی بکەتە دیاری؟ ئەگەر ل نک مرۆڤێن دنیایێ یا غەریب بت، ل نک مرۆڤێن خودێ یا غەریب نینە ئەوێن گۆتنا یووسفی بۆ خۆ کرییە دوریشمە: ﴿رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ﴾.

رۆژا پێغەمبەرێ خودێ مووسایێ کورێ عمرانی -سلاڤ لێ بن- هاتییە دیوانا فیرعەونێ مصرێ دا بەرێ وی بدەتە حەقییێ، وی هەڤرکییا حەقییێ کر، و دەمێ مووسایی چو ڕێک بۆ نەهێلاین، شوینا فیرعەون ل زۆرداریا خۆ لێڤە ببت، ئەو ڕابوو دەست دا گەفان و گۆت: ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ٢٩﴾ (الشعراء: ٢٩) فیرعەونی دەست دا چەکێ زرتەکییێ و گۆت: ئەی مووسا، گەلەک درێژ نەکە، سویند بت تو خودایەکێ دی ژ بلی من بناسی ئەز دێ تە هاڤێمە د زیندانێ دا و تو دێ ژ وان بی یێن گرتی..

ئەوێن ژ سجنێ دترسن ژ بەر هندێ دترسن چونکی ئەو ژ گەلەک خۆشییێن دنیایێ دویر دکەڤن، یان ژی چونکی هزر دکەن گرتن دێ بتە ئاستەنگ د ڕێکا

وان و ئارمانجێ دا، بەلێ ل نک مرۆڤێن خودێ ڤان هەردو ئەگەران چو بهایێ خۆ نینە: ئەگەر سجن دویرکەفتنا ژ خۆشیێن دنیایێ بت، ئەو نە ئارمانجا مرۆڤێن خودێیە.. ئەگەر ڕاوەستانا ژ کاری بت کارێ وان ل چو جهان ڕاناوەستت، کارێ ژ دەرڤەی سجنێ ئەو پێ ڕادبن، ئەو دشێن د سجنێ ب خۆ ژی ڤە پێ ڕابن، و گەلەک جاران ژی کارێ ئەو د سجنێ ڤە پێ ڕادبن ئەو نەدشیان ژ دەرڤەی سجنێ پێ ڕابن.

د دیرۆکا مرۆڤێن خودێ دا بەرپەرەک هەیە مرۆڤێن وەکی مە دەمێ دخوینن حێبەتی ڕادەوستن و پسیار دکەن: ئەرێ ئەڤە چ ڕەنگێ مرۆڤان بوون؟

ئەو بەرپەرێ ئەم ل ڤێرێ بەحس ژێ دکەین: کارێ نڤیسین و دانانا کتێبانە.. وەکی ئەم دزانین ئێک ژ کارێن مەزن یێن مرۆڤێن خودێ پێ ڕادبن نڤیسینا وان کتێبانە یێن بەرێ خەلکی ددەنە ڕێکا خودێ، و دانانا کتێبان کارەکە مرۆڤێن خودێ خۆ ل وی دەمی ژی پێ ڕادبوون دەمێ دهاتنە گرتن، و هەر جارەکا برینێن وان خوین دزا، قەلەمێن وان خورتتر لێ دهاتن.. گرانییا قەید و زنجیران دەستێن وان بەطال نەدکرن، و ئەگەر هەوە هندەک نموونە ل سەر ڤێ گۆتنێ بڤێن، کەرەم کەن:

* (شمس الأئمه السرخسي) کتێبا خۆ یا فقهی (المبسوط)، ئەوا نوکە د سیهـ جلدان دا چاپبووی د گرتیخانەیا باوزجندێ ڤە نڤیسیبوو، پشتی وی هندەک شیرەت ل خاقانی کرین و خاقانی بڕیار دای وی بکەنە د چالەکێ دا، د بنێ چالێ دا ئەو دئاخفت و طەلەبێن وی ئاخفتنا وی دنڤیسی و ئەڤ نڤیسینەیە بوویە (کتاب المبسوط).

* (ابن قتیبه)یێ قازی ل مصرێ، ل سەر دەمێ (ابن طولوون)ی هاتبوو سجنکرن، کولەکەک د دیوارێ سجنا وی هەبوو طەلەبێن وی قەلەم و کاغەزێن خۆ دبرن و دچوونە بەر کولەکێ، وی ب دەنگەکێ بلند مەسەلێن علمی بۆ وان دگۆتن و وان دنڤیسی.

* (شیخ الإسلام ابن تیمیه) خودانێ سەرهاتییەکا تایبەت د گەل گرتن و نەفییێ، بارا پتر ژ بەرهەمێ خۆ د سجنێ ڤە نڤیسی بوو، و وی سجن کربوو مەدرەسەیا بچویک دەرس تێدا دگۆتنە گرتییان، لەو زۆرداران ئەڤ چەندە ژێ دیتی ڕابوون بەرێ وی دا (سجنەکا ئنفرادی) یا وەسا ئەو د هندەک نڤیسین خۆ دا دبێژت: خوزی سجنا من وەکی وان سجنان با یا جوهی و فەلان لێ دگرن! و دووماهییێ قەلەم و کاغەز ژی ژێ مەنعەکرن ئینا وی ب ڕەژییێ ل سەر دیواری دنڤیسی!

* (شێخ ئەحمەدێ سەرهەندی) ئێک ژ زانایێن هندێ یێن مەزن بوو، ل سالا ١٠١٤ مشەختی جەهانگیری فەرمان ب گرتنا وی دا، و د گرتیخانەیا (کوالیارێ) ڤە ئەو شیا چەند سەد کافرەکان موسلمان بکەت و سجنێ بکەتە مەدرەسە و مزگەفت، ئینا چو ب مەلکی نەما بڕیار دا شێخ بێتە بەردان.

* زانایێ کورد مەلا سەعیدێ نوورسی دەمێ ب دەستێ کەمالییێن بێ کەمال هاتییە گرتن ل سالا ١٩٤٨، بڕیار ئەو بوو ئەو ب تنێ د مەزەلکەکێ ڤە بێتە گرتن، و هندەک طەلەبێن وی ژی د مەزەلکەکێ ب ڕەخ مەزەلکا وی ڤە هاتنە گرتن، د ناڤبەرا هەدو مەزەلکان دا کولەکەکا بلند هەبوو سەیدای د مەزەلکا خۆ ڤە نامەیا (الحجه الزهراء) ل سەر هندەک کاغەزکێن بچویک دنڤیسی و دپێچان و دکرنە د قالکا شخاتێ دا و د کولەکێ ڕا دهاڤێتنە وێ مەزەلکا طەلەبێن وی لێ و وان کاغەزک ژ شخاتێ دئینانە دەر و د دەفتەرەکێ دا دنڤیسی.

* ل سالێن پێنجییان ژ سەدسالا بیستێ دەمێ هزرڤانێ مەزن (سەیید قوطب) ل مصرێ هاتییە گرتن، وی پشکەکا مەزن ژ تەفسیرا خۆ (في ظلال القرآن) د سجنێ ڤە نڤیسی، و دەمێ دەسهەلاتداری هاتییێ دا وی بەرتیل بکەت وی گۆت: ((ئەو تبلا بۆ شاهدەدانێ دئێتە بلندکرن ل سەر خۆ قەبویل ناکەت پەیڤەکا ب تنێ ژی بۆ زۆردارەکی بنڤیست)).

ژ ڤان نموونەیان بۆ مە دیار دبت کو گرتن قەت نەشیایە چو جاران سکرەکی د ناڤبەرا مرۆڤێن خودێ و ئارمانجا وان دا ئاڤا کەت، دیسا گرتن نەشیایە ببتە ئەو ئامیرەتێ ب سەهم یێ مرۆڤێن خودێ ژ گۆتنا حەقییێ پاشدا بیەت:

* دەمێ (ئەبوو جەعفەرێ مەنصوور) فەرمان دای ئیمامێ مەزن (ئەبوو حەنیفە) بێتە جەلدەدان و گرتن، دەیکا (ئەبوو حەنیفەی) چوو سجنێ سەرا بدەت، گۆتێ: کورێ من نوعمان! ئەو علمێ ژ قوتانێ و گرتنێ پێڤەتر چو فایدە نەگەهاندییە تە، ب بەر هندێ دکەڤت تو ژێ برەڤی! وی گۆت: دادێ! ئەگەر من دنیا ڤیابا گەلەک یا ب ساناهی بوو ئەز بگەهمێ، بەلێ من ڤیا خودێ بزانت کو من علم پاراست و نەفسا خۆ نەبرە هلاکێ.

هوین دزانن ئەو چاوا بوو وی علم پاراستی و خۆ نەبرییە هلاکێ؟

ڕۆژەکێ خەلیفەی هنارتە ب دویڤ ڕا و گۆتێ مە بڕیار دا تو ببییە قازی، (ئەبوو حەنیفەی) گۆتێ: ئەگەر تو بێژییە من یان دێ ببیە قازی، یان د ڕوبارێ فوراتی دا دێ تە خەندقینم، ئەز دێ خەندقاندنێ هلبژێرم، ئەوێ ببتە قازی دڤێت بەری هەر تشتەکی تە و بنەمالا تە حوکم بکەت.. و ئەز ب کێر ڤی کاری نائێم. خەلیفەی گۆتێ: تو درەوان دکەی چاوا تو ب کێر نائێی ببییە قازی؟ ئیمامی گۆت: ئەرێ چاوا تو مرۆڤەکێ درەوین دێ کەیە قازی؟ ئەو بوو خەلیفەی بڕیار دا ئیمام بێتە جەلدەدان و گرتن، و پشتی هاتییە بەردان ئەو ل بن (إقامە جبریە) هاتە دانان حەتا مری، و بەری ئەو بمرت وی د وصیەتا خۆ دا گۆت: ئەگەر ئەز مرم من ل وی جهی نەڤشێرن یێ خەلیفەی ب تەعدایی ژ خەلکی ستاندی، ئینا خەلیفەی گۆت: ب ساخییا خۆ، و ب مرنا خۆ ژی ئەبوو حەنیفە بەلا خۆ ژ مە ڤە ناکەت! ب ڤی ڕەنگی ئیمامی علم پاراست و خۆ نەبرە هلاکێ و ئەڤە (موعادەلەیەکە) تێگەهشتنا وێ ل نک مرۆڤێن دنیایێ گەلەک یا ب زەحمەتە.

* ئیمام ئەحمەد پشتی ژ سجنێ هاتییە بەردان ڕۆژەکێ وی بەحسێ نەخۆشی و عەزابا خۆ بۆ هەڤالەکێ خۆ ڤەگێڕا، هەڤالێ وی کرە گری، ئیمامی گۆتێ: ((نەگری.. ما کیژ چێتر بوو: ئەز کافر ببام یان وان ئەز عەزابدابام؟))
مادەم گرتنا وان بۆ ئیمامی بەرانبەر هندێیە ئەو ل سەر بیر و باوەرێن خۆ بمینت، هنگی گرتن مەزنترین خەلاتە وی وەرگرتی.

* (ئەبوو یەعقووبێ بوەیطی) ئێک ژ هەڤالێن ئیمامێ شافعی بوو، دەمێ موعتەزلییێن بیدعەچی ئەو سەرا مەسەلا (خلق القرآن) گرتی، و ئەگەر وی پیچەکێ (موجامەلە) د گەل وان کریا ئەو نەدهاتە گرتن، وی دەستێن خۆ یێن زنجیرکری د پشت شفشێن سجنێ ڕا بلند دکرن و دگۆت: لازم ئەز د ڤێرێ ڤە بمرم؛ دا خودێ بزانت هندەک هەبوون سەرا ڤێ عەقیدێ د سجنان ڤە یێن مرین.

و وەسا چێبوو.. ئەو د سجنێ ڤە مر.

## قەهرەمانێ هەمی مەیدانان
## (شيخ الإسلام ابن تيميه)

**دەستپێک:**

د هەمی مەیدانان دا شێرەکێ بێ هەڤتا بوو، د مەیدانا جیهادێ دا هەر دەم ل سنگی بوو، گاڤا دبوو بەرەڤانییا ژ ئیسلامێ ب قەلەمی کەس نەدشیا دەستێ وی بگرت یان جارەکێ ڤێرا بگەهت.. پتر ژ (٢٦٠٠) رۆژان هاتبوو گرتن، نە ژ بەر چو ب تنێ چونکی وی سۆز دابوو هەر جارەکا حەقی بۆ دیار ببت بێ دودلی و ترس ئەو وێ بۆ خەلکی بێژت.

ل شێست و پێنج سالییێ بەرێ وی دانە گرتیخانەیەکا وەسا بێ سەر و بەر چو جاران وان جوهی و فەلە ژی لێ نەدگرتن، قەلەم و کاغەز ژێ ستاندن و نەهێلان ئەو تشتەکی د سجنێ ڤە بنڤیست، ئینا وی ب رەژییێ ل سەر دیواری و پرتێن جلدی دنڤیسی، و د گەل هندێ ژی وی دگۆت: ((ئەم یێن خۆشییەکا وەسا دا دژین ئەگەر میر وحاکمان زانیبا یا چەندە ئەو ب شیری دا وێ ژ مە ستینن)).

دەمێ هاتین دا وی ببەن بگرن، وی گۆت: ((ما دوژمنێن من دێ چ ل من کەن، و باغ و بیستانێ من یێ د سنگێ من دا؟ گرتنا من خەلوەیە، و کوشتنا من شەهادەتە، و دەرێخستنا من ژ وەلاتێ من سیاحەتە..)).

شاگردەیێ وی ئبن قیم د دەر حەقا وی دا دبێژت: ((خودێ دزانت کەسەکێ وەکی وی ژین پاقژ من نەدیتییە، هەر چەندە ئەو د بەرتەنگی و نەخۆشییێ دا دژییا ژی، و هەردەم یێ وەستیای و گرتی و گەفلێکری ژی بوو، د گەل هندێ ژی ئەو ژ خەلکی هەمییێ یێ سنگ فرەهتر بوو، و دلێ وی ژ یێ هەمییان

موکمتر بوو، و ناڤچاڤێن وی ژ یێن هەمییان دڤەکریتر بوون، گەشاتی ژ دێمێ وی ڤەدپەشی، گاڤا ل مە دبوو تەنگاڤی و ترسا مە زێدە دبوو، و بێهنا مە تەنگ دبوو ئەم دهاتینە نک و دەمێ مە ئەو ددیت و مە گوهێ خۆ ددا ئاخفتنێن وی ئەم ب دلفرەهییێ دحسیاین و کەیفا مە خۆش دبوو و باوەرییا مە پتر لێ دهات.. دەمێ ئەو یێ گرتی گەلەک جاران وی دگۆت: مرۆڤێ گرتی ئەوە یێ دلێ وی ژ زکرێ خودێ هاتییە گرتن، و ئێخسیر ئەوە یێ یێ بوویە ئێخسیرێ هەوایێ نەفسا خۆ. وی د سجنێ ڤە نڤێژ دکرن و دەمێ وی سەرێ خۆ ددانا عەردی وی دگۆت: یا ڕەببی تو هاریکارییا من ل سەر زکری و شوکرێ و عیبادەتێ خۆ بکە..)).

ڕۆژا خودێ ئێمانەتێ خۆ ژێ ستاندی و وی بۆ جارا دووماهییێ سەرێ خۆ دانای د سجنێ ڤە یێ گرتی بوو، قورئان دخواند، و خواندنا وی گەهشتبوو ڤێ ئایەتێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ۝ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ۝﴾ (القمر: ٥٤-٥٥).

### (ابن تيميه) ب کورتی:

* (شيخ الإسلام تقي الدين أبو العباس ابن تيميه) ناڤێ وی یێ دورست ئەحمەدە کوڕێ عەبدلحەلیمێ کوڕێ عەبدسسەلامێ حەرانییە، خەلکێ باژێڕێ (حەرانێ)یە کو ئێک ژ ناڤدارترین باژێڕێن کوردستانێیە.

* ل ڕۆژا دوشەنبێ دەهی هەیڤا ڕەبیعولئەووەلا سالا (٦٦١) مشەختی (بەرانبەر ١٢٦٢ ز) ل باژێڕێ حەرانێ هاتبوو سەر دنیایێ، و ل شەڤا دوشەنبێ بیستی هەیڤا (ذو القعده) ژ سالا ٧٢٨ مشەختی (بەرانبەر ١٣٢٨ ز) د گرتیخانەیا کەلێ ڤە ل دیمەشقێ چووبوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و ئەو ژی وەکی هەمی کوڕێن بنەمالا خۆ ب ناڤێ کوڕێ تەیمییێ دئێتە ناسین و تەیمیە ناڤێ داپیرا وان یا مەزنە، و بنەمالا وان ئێک ژ بنەمالێن زانا و ناسیارێن دەڤەرێ بوو.

* شەش سالێن ئێکێ ژ ژییێ خۆ، وی ل باژێرێ حەرانێ بۆراند بوون، پاشی ژ بەر هێرشێن تەتەرییان ل سەر رۆژئاڤایا کوردستانێ ل سالا (٦٦٧) بنەمالا وان ژ باژێرێ حەرانێ بەر ب شامێ ڤە رەڤی و ل دیمەشقێ ئاکنجی بوو.

* سەیدا ل دیمەشقێ مەزن بووبوو، و ل نک زانایێن وێ یێن وی سەردەمی زانینا خۆ وەرگرت، و هەر ژ بچویکاتی نیشانێن زیرەکییێ ل نک وی دیاربوون، و دبێژن: چی تشتێ وی دخواند د گاڤێ دا ژ بەر دکر، و سەیدایێن وی ژ دوسەدان پتر بوون.

* هەر زوی ناڤ و دەنگێن وی ل دیمەشقێ بەلاڤبوون، و دەمێ ژییێ وی بوویە بیست و دو سال ئەو ل شوینا بابێ خۆ بوو سەیدا ل مەدرەسا (دار الحديث السكريه) ل شامێ، و دەست ب گۆتنا دەرسان و نڤیسینا کتێبان کر.. و پشتی هنگی ب هەیڤەکێ وی دەست ب گۆتنا دەرسێن تەفسیرێ کر ل مزگەفتا ئومەوی.

* ل سالا (٦٩٣) -دەمێ ژییێ وی سیه و دو سال- ئەو د گەل شێخ زەینەددینێ فارەقی هاتە جەلدەدان، و ئەگەرا ڤێ چەندێ ژی -وەکی زانایێ ناڤدار ئبن کەثیر دبێژت- ئەو بوو: مرۆڤەکێ فەلە ل شامێ هەبوو دگۆتنێ عەسساف، جارەکێ -و ب شاهدەییا گەلەک مرۆڤان- ل دیوانەکێ خەبەر گۆتنە پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، ئینا ئبن تەیمیەیە و شێخێ فارەقی چوونە نک ئەمیری دا ل دۆر ڤێ مەسەلێ باخڤن، پشتی وان گۆتنا خۆ د گەل ئەمیری ب دوماهی ئینای دەرکەفتن، ل وی دەمی ئەو مرۆڤێ فەلە کەفتە دەستێن خەلکی و ئەو پێ وەرهاتن و تیر پێ دادان، ئەمیری هزرکر ئبن تەیمیەیەی و فارەقی خەلکێ پالدای کو ڤێ چەندێ بکەن، لەو وی بڕیار دا هەردو بێنە جەلدەدان.. پشتی ئەمیری مەسەلە ب دورستی زانی داخوازا لێبۆرینێ ژ وان

کرن، و د ڤێ هەلکەفتێ دا شێخی کتێبا خۆ (الصارم المسلول على شاتم الرسول) دانا.

* ل دووماهییا سالێن نۆتێ ژ سەدسالا شەشێ مشەختی وەلاتێ شامێ کەفتە بن گەفا هێرشێن تەتەرییان و ترسا وان کەفتە دلێن خەلکی ئینا شێخی بارا پتر ژ دەرسێن خۆ بۆ بەحسێ جیهادێ و خێرا شەهیدبوونێ تەرخان کرن، هەر وەسا وی گەلەک نڤیسین ژی د ڤێ دەربارەیێ دا نڤیسین، و مەخسەدا وی ب ڤێ چەندێ ئەو بوو دلێ خەلکی موکم بکەت دا ئەو بشێن خۆ ل بەر هێرشێن تەتەرییان بگرن و نەرەڤن.

* ل سالا ٦٩٨، تەتەرییان هێرشەک ئینا سەر شامێ و نێزیکی باژێرێ دیمەشقێ بوون، سولطانێ مصرێ و جێگرێ وی ل شامێ ب لەشکەر ڤە شکەستن، و رەڤینەکا مەزن کەفتە رێزێن خەلکی، هەمی ب لایێ رۆژئاڤایێ ڤە چوون، هندەکان قەستا قودسێ کر، و هندەک بەر ب مصرێ ڤە چوون.. زانایێ ئێکانە مایە ل دیمەشقێ ئبن تەیمیە بوو، ئەوێ نەچاربووی رێبەرییا خەلکی بکەت حەتا ئەڤ تەنگاڤییە بۆری، و هەر چەندە خەلکێ شامێ دگۆت بەرگرییا لەشکەرێ تەتەرییان ب مە ڤە نائێت و یا باش بۆ مە ئەوە ئەم خۆ ب دەست وان ڤە بەردەین، بەلێ شێخی قەبویل نەکر و بەرگری ب وان دا کرن.

## د گەل تەتەرییان:

دەمێ تەتەری نێزیکی باژێرێ دیمەشقێ بووین ل سالا (٦٩٨)ێ مشەختی، و خەلکێ شامێ زانی کو بەرگرییا تەتەرییان ب وان ڤە نائێت وان گۆت: یا باش بۆ مە ئەوە ئەم هندەک مرۆڤان فرێ کەینە موعەسکەرێ تەتەرییان؛ دا دان و ستاندنێ د گەل وان بکەن.. ئینا ئەو رابوون چەند مرۆڤەک هنارتنە نک تەتەرییان و (شیخ الإسلام) ئێک ژ وان بوو.

گاڤا ئەو مرۆڤ گەهشتینە موعەسکەرێ تەتەرییان، ئەو بۆ خیڤەتا مەزنێ تەتەرییان (قازانی) هاتنەبرن، ل نک قازانی ئبن تەیمیە بێ ترس ئاخفت و

گۆت: وەکی مە گوهـ لێ بووی تو دبێژی: تو مرۆڤەکێ موسلمانی، د گەل هندێ ژی تو یێ هاتی وەلاتێ مە بستینی، باپیرێ تە هۆلاکۆ مرۆڤەکێ کافر ژی بوو بەلێ وی ئەڤ چەندە نەکربوو، وی پەیمان دا و پەیمانا خۆ ب جهئینا، و تە پەیمان دا و تە غەدرە کر!

مرۆڤێن حازر گۆت: مە هزرکر مەزنێ تەتەریان فەرمانێ ب کوشتنا ئبن تەیمیەی دێ دەت ژ بەر ڤان گۆتنێن وی..

دەمێ بوویە نیڤرۆ مەزنێ تەتەرییان گۆتە شاندێ خەلکێ دیمەشقێ: هوین ناچن حەتا فراڤینێ ل نک مە دخۆن، گاڤا وان خوارن ئینای هەمییان دەست ب خوارنێ کر ئبن تەیمیە تێ نەبت وی نەخوار، مەزنێ تەتەرییان گۆتێ: بۆچی تو ناخۆی؟

ئبن تەیمیەی گۆت: ئەڤ گۆشتێ هەوە لێنای یێ وی پەزییە یێ هەوە ژ خەلکی ستاندی، و ئەو دارێن هەوە زاد ل سەر لێنای ژی دارێن خەلکینە هەوە بێی وان یێن برین، ڤێجا چاوا ئەز بخۆم؟

گاڤا قازانی ئەڤ چەندە ژ وی دیتی زانی ئەو مرۆڤەکێ زاهدە لەو گۆتێ: پیچەکێ بۆ من باخڤە..

ئبن تەیمیەی بۆ وی بەحسێ جەهنەمێ کر، قازانی گۆتێ: هەچییێ هاتییە نک من بەحسێ بەحەشتێ بۆ من یێ کری، بۆچی تو ب تنێ بەحسێ جەهنەمێ دکەی؟ شێخی گۆتێ: وان بەحسێ جهەکی بۆ تە یێ کری تو ناچییێ، و ئەز یێ بەحسێ جهەکی بۆ تە دکەم تو دێ چییێ!

ئینا قازانی، ئەوێ پشتی موسلمانبوونا خۆ ناڤێ خۆ کرییە مەحموود، گۆتە شێخی: دوعایەکێ بۆ من بکە.

ئبن تەیمیەی دەستێن خۆ سەرئەڤراز کرن وگۆت: ((ئەی خودا! ئەگەر عەبدێ تە مەحموود بۆ هندێ هات بت دا دینێ تە ب سەربێخت، تو وی ب سەربێخە،

و پشتا وی بگره و ملکێ وی بەرفرەهـ بکە، و ئەگەر ئەو بۆ هندێ هات بت دا خۆ ب سەربێخت و ئیسلامێ ڕەزیل بکەت، تو وی شەرمزار بکە و عەردی ل بن پییێن وی بهژینە و وی بپەلخینە..)).

وی ئەڤ دوعایە دکر، و قازانی د دویڤ دا دگۆت: (ئامین)!

پشتی ڤێ دیدارێ قازانی بڕیار دا ژ شامێ بزڤڕت و تەناهییێ بدەتە خەلکێ دیمەشقێ. و دەمێ شاندا خەلکێ شامێ ژ موعەسکەرێ تەتەرییان زڤڕی، ئەو کەسێن د گەل ئبن تەیمیەی گۆتنێ: ئەڤە چ گۆتن بوون تە گۆتینە خانێ تەتەرییان؟ نێزیکبوو تو خۆ ژی تێ ببەی و مە ژی! هەرە ئەم د گەل تە نازڤڕین.. وان خۆ ژ شێخی ڤەدەرکر، و ژ ترسان دا د گەل وی نەزڤڕینە باژێڕی، ئبن تەیمیە و هندەک هەڤالێن خۆ مانە ب تنێ، دەمێ خەلکی سوحبەتا شاندێ د گەل قازانی زانی، هاتنە بەراهییا ئبن تەیمیەی و نێزیکی سێسەد کەسان ل دۆرێن وی کۆم بوون و پێکڤە زڤڕینە دیمەشقێ، و ئەوێن دی یێن خۆ ڤەدەرکری هندەک تەتەری هاتنە د ڕێکا وان دا و ئەو هەمی شەلاندن!

## ل مەیدانا جیهادێ:

ل سالا (٧٠٢) جارەکا دی لەشکەرێ تەتەرییان قەستا شامێ کر، ب وێ ئنیەتێ کو دیمەشقێ بگرن، ترسەکا مەزن بۆ خەلکێ شامێ چێبوو، و گەلەک ژ وان بەر ب مصرێ ڤە ڕەڤین.. ڤێ جارێ ژی ئبن تەیمیە ما ل مەیدانێ، د ناڤ خەلکی دا ڕابووڤە و جیهاد ل بەر وان شرینکر، و پێخەمەت موکمکرنا دلێ خەلکێ شامێ ئبن تەیمیەی دو پێگاڤێن گرنگ هاڤێتن:

ژ لایەکی ڤە وی د گەل بەریدێ قەستا مصرێ کر و چوو نک سولطانێ مصرێ، ئەوێ حوکم ل شامێ ژی دکر، و گۆتێ: تو سولطانێ شامێ یی ژی، لەو یا فەرە تو لەشکەرەکی د هەوارا خەلکێ شامێ بهنێری، چونکی ئەگەر تەتەری شیانە مە، د دویڤ دا دۆرا هەوەیە.

ژ لایەکێ دی ڤە ئەو د ناڤ خەلکێ شامێ دا ڕابووڤە و گۆت: تەتەری -ئەوێن ب دەڤی خۆ ژ موسلمانان دهژمێرن- یێن هاتین دا پێ ل عەردێ مە و ناموسا مە بدانن، بێ دودلی هوین شەڕێ وان بکەن، و خۆ ئەگەر هەوە ئەز ژی د ناڤ وان دا دیتم و قورئان ل سەر سەرێ من بت مـن بکوژن! ئەگەر ئەو کافر بن کوشتنا وان یا حەلالە، و ئەگەر موسلمان ژی بن -وەکی ئەو دبێژن- هەر کوشتنا وان یا دورستە؛ چونکی مەتەلا وان مەتەلا خەوارجانە.

ب ڤێ چەندێ وی دەورەکێ سەرەکی د ئامادەکرنا لەشکەری و نەفسی یا خەلکێ شامێ دا هەبوو..

لەشکەرێ مصرێ د هەوارا خەلکێ شامێ هات، و ل دویی هەیڤا رەمەزانێ ژ سالا (٧٠٢) شەڕەکێ مەزن د ناڤبەرا تەتەریان ژ لایەکی ڤە، و شامی و مصرییان ژ لایەکێ دی ڤە چێبوو، و ڤی شەڕی پتر ژ ڕۆژەکێ ڤەکێشا، و دووماهییێ لەشکەرێ شامێ و مصرێ ب سەرکەفت، و تەتەری پاشپاشکی زڤڕین و ڕەڤین.

د ڤی شەڕی دا (شیخ الإسلام) ل بەراهییا لەشکەری بوو، ل دەمێ بێنڤەدانێ ئایەتێن جیهادێ بۆ وان دخواندن و شەرح دکرن، و دەمێ شەڕی دەست پێ کری طەلەبێ وی ئبن عەبدلهادی دبێژت: ((شێخ چوو بەراهییا ڕیزێ و گۆتە ئەمیرەکێ شامی: من ببە جهێ مرنێ، ئینا وی ئەمیری شێخ برە بەرانبەر لەشکەرێ تەتەرییان و گۆتێ: سەیدا ڤێرێ جهێ مرنێیە، و ئەڤە دوژمنە.. ئبن تەیمیەی بەرێ خۆ دا لەشکەرێ تەتەرییان یێ بۆش پاشی سەرێ خۆ بلندکرە عەسمانی، و لێڤێن خۆ لڤلڤاندن هەر وەکی وی نفرینەک ل وان دکر.. هەر د وێ ڕۆژێ دا لەشکەرێ تەتەرییان شکەست و خودێ موسلمان ب سەرئێخستن)).

ل مەیدانا جیهادا ناڤخۆیی ژی هەردەم سەیدا ل پێشییێ بوو: دەمێ مەزنێن شامێ و قازی و موفتی هەمی ژ ترسێن تەتەرییان ژ دیمەشقێ ڕەڤین خەلک ل دۆر ئبن تەیمیەی کۆمبوون و بەرێ هەمییان ما ل وی.. دەمەکێ

تەنگاڤ بوو، دوژمن ل بەر دەرێ باژێری بوو میر و حاکم و لەشکەر ژ باژێری دڕەڤین، هنگی ئبن تەیمیە بوو حاکمێ (فعلی) ل باژێری و خەلک ل دۆر کۆمبوون، و ئەو بوو شێخی ڕێبەرییا خەلکی کر حەتا تەتەری شکەستین، و د گەل ڤێ بزاڤێ ئبن تەیمیە دەمێ مایە ب تنێ ل دیمەشقێ و خۆ بەرپرس دیتی، وی هژمارەکا طەلەبان دانە دویڤ خۆ، و چوون ل جهێن خراب ل باژێری گەڕیان و ب دەستێن خۆ خرابی ڕاکرن، و هندەک شێخێن طەریقان گرتن و کەزییێن وان بڕین، و جلکێن وان یێن پیس ژ بەرکرن، و نوینۆکێن وان تراشین، و ئەو گونبەد و جهێن خەلکی شرک ل نک دکر خرابکرن، و خەلک ژ شرک و بیدعەیان دانە پاش، ئەڤە هەمی بەری قستا مەیدانا شەڕێ د گەل تەتەرییان بکەن.

ئەڤ ئەگەرە بوون و گەلەکێن دی ژی دلێ هندەک مەصلحەتچییان د دەر حەقا وی دا تژی کری، حەتا ئەو لێ گەڕیاین ب گەلەک ڕێکان بێنێ دا وی تێ بێخن، و ب دەستێن مەزنان بدەنە گرتن و ئێشاندن.

ئێکەمین درەو وان د دەر حەقا ئبن تەیمیەی دا کری پشتی ڤێ سەرهاتییێ ئەو بوو وان گۆت: ئبن تەیمیەی دلێ د مەزنییێ هەی، و حەز دکەت ببتە مەزنێ خەلکی، لەو ئەو ڤان کاران دکەت. بەلێ ئەڤ بزاڤا وان ب چو نەچوو؛ چونکی مەزنان بەری عامییان دزانی ئبن تەیمیە زەلامێ ئوممەتێیە نەکو زەلامێ دەولەتێ، چاوا نە.. و ئبن تەیمیە ئەو بوو یێ هەردەم دگۆت: ئەگەر ملکێ شامێ و مصرێ هەمییێ ب دو فلسان بدەنە من، من نەڤێت!

## (العقيدة الواسطية):

جارەکێ مرۆڤەکێ خەلکێ دەڤەرا واسط هاتە شامێ، و داخواز ژ (شيخ الإسلام)ی کر کو ئەو کتێبەکا بچویک د بابەتێ عەقیدا ئیسلامی دا بۆ وی بنڤیست؛ دا ئەو د گەل خۆ ببەت و نیشا زارۆکێن خۆ بدەت.. شێخی داخوازا وی ب جهئینا و ڕابوو کتێبەکا بچویک ل بن ناڤێ (العقيدة الواسطية) دانا،

و تێدا ئەو ئایەت و حەدیس کۆمکرن یێن بەحسێ عەقیدێ دکەن، و وی د ڤێ کتێبا خۆ دا پشتەڤانییا عەقیدا سەلەفی کر، و ژ بەر کو پترییا زانایێن شامێ د عەقیدا خۆ دا ئەشعەری بوون، وان ب ڤی کارێ شێخی نەخۆشبوو، لەوا ئەو لێ گەڕیان نەخۆشییێ بۆ شێخی چێ بکەن؛ دا وی ژ ڤێ بۆچوونێ لێڤە بکەن، دا خەلک ل دۆر کۆم نەبن و ب دویڤ نەکەڤن.

زانایێ ناڤدار ئبن کەثیر -کو ئێک ژ شاگردەیێن ئبن تەیمیەی بوو- دبێژت: ژ بەر کو شێخ (تقي الدين بن تيميه) مرۆڤەکێ ب بها بوو ل نک مەزنێن دەولەتێ ژی و ل نک خەلکی ژی، و خەلکی گەلەک حەز ژ وی و دەرس و نڤیسینێن وی دکر، هندەک فقەهزانان چاڤ پێ ڕانەبوون و حەسویدی پێ بر، و لێ گەڕیان نەخۆشییێ بگەهیننێ.

ئێک ژ وان قازییێ مالکییان (ئبن مەخلووف) بوو هەر وەسا شێخ (نەصرێ مەنبجی) ڤان هەر دویان کاغەزەک بۆ سولطانی هنارتە مصرێ و تێدا نڤیسی: شێخ (تقي الدين)ی کتێبەکا نڤیسی هندەک تشتێن دژی عەقیدا ئیسلامی یێن کرینە تێدا، لەو دڤێت حسێب د گەل وی بێتەکرن. سولطانی د بەرسڤا کاغەزا وان دا کاغەزەک بۆ جێگرێ خۆ ل شامێ هنارت و گۆتێ: ئبن تەیمیەی، و وان یێن گازندە ژێ کری کۆم بکە، و بلا ئەو ڕوی ب ڕوی دان و ستاندنێ د گەل ئێک و دو بکەن، و ل دویڤ ئەنجامێ دان و ستاندنا وان تو حوکمی د ناڤبەرا وان دا بکە.

جێگرێ سولطانی ل شامێ فەرمانا سولطانی ب جهئینا، و ل هەشتێ هەیڤا ڕەجەبا سالا (٧٠٥) مشەختی، وی ل کۆچکا خۆ دیوانەک گرێدا و ئبن تەیمیە و هەڤڕکێن وی کۆمکرن و گۆتە وان: کتێبا ئبن تەیمیەی بینن بخوینن، و کانێ چ خەلەتی تێدا هەیە ئاشکەرا بکەن.. ل دویڤ داخوازا جێگرێ سولطانی ئەو کەفتنە دان و ستاندنێ هەر ژ سپێدێ و حەتا ئێڤاری، چی جهێ وان دگۆت یێ خەلەتە شێخی دەلیل ژ قورئانێ و سوننەتێ و گۆتنێن زانایێن ئوممەتێ

ل سەر دئینان و ئەو بێ دەنگ دکرن.. ل رۆژئاڤاییێ دیوان ڤەرەڤی، و پشتی هنگی ب چار رۆژان، بۆ جارا دوییێ دیوان هاته گرێدان، دیسا ئبن تەیمیەی ل بەر چاڤێن ئەمیری و مرۆڤێن حازر هەڤرکێن خۆ هەمی بێ دەنگ کرن، لەو وان گۆت: ئەم دێ هنێرینە ب دویڤ (كمال الدين بن الزملكاني) را بلا ئەو بێت و پێش مە ڤە باخڤت، ئبن تەیمیەی گۆت: بلا.. و پشتی ئەو هاتی وی ژی چو ژێ چێ نەکر!

ئبن تەیمیەی گۆتە وان: ژ ئەڤرۆ و حەتا سێ هەیڤێن دی ئەز دێ دەلیڤەیێ دەمە هەوە هەرن ل کتێبان بگەرێێن و چی گاڤا هەوە گۆتنا زانایەکێ موعتەبەر ژ هەر سێ جیلێن ئێکێ یێن ئوممەتێ دیت وەکی گۆتنا هەوە بت بینن و ئەڤ مرۆڤە هەمی شاهد ئەز دێ ل گۆتنا خۆ لێڤە بم.

پشتی پتر ژ بیست رۆژان و ب دورستی ل حەفتی هەیڤا شەعبانێ بۆ جارا سێییێ هەردو لا ل نک جێگرێ سولطانی کۆمبوون، و بەری دیوان ڤەرەڤت هەڤرکێن (شيخ الإسلام)ی نەچاربوون ئعترافێ بکەن کو ئەو دخەلەت بوون و کتێبا ئبن تەیمیەی یا دورستە.

ب ڤێ چەندێ ئبن تەیمیە پتر د چاڤێن مەزنێن دەولەتێ و خەلکی ژی دا مەزنبوو، تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ کو پتر دلێن هەڤرکێن وی تژی کەرب و نەڤیان بین.

مەسەلە ب ڤێ چەندێ ب دووماهی نەهات.. پشتی روینشتنا سێییێ ب سەرکەفتنا ئبن تەیمیەی ب دووماهی هاتی، قازی ئبن صەصرایی دەست ژ کارێ خۆ بەردا، و دەمێ سوحبەت گەهشتییە سولطانی ل مصرێ وی کاغەزەک بۆ جێگرێ خۆ هنارت و تێدا فەرمان دا قازی بزڤرتە سەر کارێ خۆ.. و پشتی هەڤرکێن ئبن تەیمیەی دیتی ئەو ب رێکا دان و ستاندنێ نەشێنێ رابوون کرە دیعایەت کو ئبن تەیمیە ل مەزنییێ دگەرێێت و وی دڤێت د گەل تەتەرییان ئنقلابەکێ بکەت!!

دەمێ ئەڤ دیعایەتە گەهشتییە سولطانی ل مصرێ وی کاغەزەک بۆ جێگرێ خۆ هنارت و تێدا خواست ئەو ئبن تەیمیەی و ئبن صەصرایێ قازی بهنێرتە مصرێ.

جێگرێ سولطانی داخوازا سولطانی ب جهئینا و هەردو ل بیست و دویی رەمەزانا سالا (٧٠٥) گەهشتنە (قاهیرە).. هەڤرکێن ئبن تەیمیەی هەمی کۆمبوون، و داخواز کر ئەو و ئبن تەیمیە کۆم ببن و دان و ستاندنێ د گەل وی بکەن ل دۆر وان مەسەلێن عەقیدێ یێن وی د کتێبا خۆ دا (العقیدة الواسطیة) گۆتین، داخوازا وان هاتە ب جهئینان و هەمی ل کەلێ کۆمبوون..

قازییێ مالکییان (ئبن مەخلووفێ) ئەشعەری گۆت: ئبن تەیمیە دبێژت: خودێ یێ ل عەسمانی ل سەر عەرشی، و خودێ دئاخڤت، و ئەڤە کوفرە. قازی گۆتە ئبن تەیمیەی: تو چ دبێژی؟ وی حەمدا خودێ کر و سلاڤ دانە سەر پێغەمبەری، ئێک ژ وان گۆت: لەزێ بکە، مە تو نەئینای دا خوتبەکێ بخوینی! ئبن تەیمیەی گۆت: دیارە چێ نابت مرۆڤ حەمدا خودێ ژی بکەت؟! پاشی گۆت: ئەرێ کی دێ حوکمی د ناڤبەرا مە دا کەت؟ وان گۆت: قازییێ مالکییان ئبن مەخلووف. ئبن تەیمیەی ب عێجزی ڤە گۆت: چاوا دێ چێ بت هەڤرکێ من ببتە حاکم؟ ئەڤ روینشتنە یا بەطالە.

ل شوینا ئەو حاکمەکێ بێ لا بینن دا حوکمی د ناڤبەرا هەردو لایان دا بکەت رابوون فەرمانەک دەرێخست کو ئبن تەیمیە بێتە سجنکرن و هەڤرکێ وی ئبن صەصرا بزڤرتە شامێ و ببتە قازی، و هەر کەسەکێ ل شامێ تاگیرییا ئبن تەیمیەی بکەت بێتە گرتن و ئێشاندن!

ل شەڤا جەژنا رەمەزانێ ژ سالا (٧٠٥) شێخ ل بازێرێ قاهیرە هاتە گرتن، و ئەڤە جارا ئێکێ بوو ئەو بێتە گرتن بەلێ یا دووماهییێ نەبوو.

## گرتنا ئێکێ:

سێ هەیڤان ژ سالا (٧٠٥)، د گەل سالا (٧٠٦) هەمییێ، و سێ هەیڤان ژ سالا (٧٠٧)، یەعنی: سالەک و شەش هەیڤان ئبن تەیمیە ما د گرتیخانەیا (الجب) دا ل قاهیرە، نە ژ بەر چ ب تنێ چونکی وی دگۆت: خودێ دئاخڤت و ئستوئا ل سەر عەرشی کری!

ب گرتنا وی بیدعەچییێن شامێ ب کەیفا خۆ کەفتن، زانایێ ناڤدار ئبن کەثیر دبێژت: ((سالا شێخ (تقي الدين) هاتییە گرتن (صلاة الرغائب) ئەوا ل شەڤبەراتێ دئێتەکرن دوبارە ل مزگەفتا دیمەشقێ هاتەکرن، و ئەو چار سال بوو ئبن تەیمیەی ئەو بەطال کربوو و نەدهێلا ئەو بیدعە بێتەکرن)).

د سجنێ ڤە شێخ یێ بەردەوام بوو ل سەر نڤیسین و دەرس گۆتنێ بۆ گرتییان حەتا وە لێ هاتبوو یێ چووبا سجنێ دا هزر کەت ئەو یێ هاتییە د مەدرەسەیەکێ ڤە.

ل هەیڤا سێییێ ژ سالا (٧٠٧) میرەکێ عەرەبان ب ناڤێ (حسام الدين ابن عيسى) هاتە قاهیرە و ئەو ب خۆ چوو (شيخ الإسلام) ژ سجنێ دەرێخست و بڕیار دائەو ل مالا جێگرێ سولطانی ل قاهیرە کۆم ببن و هەمی قازی و زانا بێنە کۆمکرن دا دان و ستاندنێ ل دۆر ئەگەرا گرتنا ئبن تەیمیەی بکەن.. میرێ عەرەبان و جێگرێ سولطانی و ئبن تەیمیەی ل دیوانێ حازربوون بەلێ چو قازی ئامادە نەبوون، هەر ئێکی هێجەتەکا بێخێر بۆ خۆ گرت، لەو بۆ هەمییان دیاربوو کو ئەو د نەحەق بوون.

پشتی شێخ ل هەیڤا سێییێ هاتییە بەردان حەتا هەیڤا دەهێ ئەو ما ل قاهیرە و وی سەربەست دەرس دگۆتن و کتێب دنڤیسین، و ل وی دەمی وی کتێبا خۆ یا ب بها (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح) نڤیسی کو رەخنەیەکا بنەجهە بۆ وان فەلەیێن دینێ خودێ گوهارتی و درەو ب پێغەمبەرینییا عیسای -سلاڤ لێ بن- کری.

**گرتنا دویێ:**

ل هەیڤا شەووالێ ژ سالا (٧٠٧) هندەک صۆفییێن خودان طەریقە ل نک دەولەتێ گازندە ل ئبن تەیمیەی کر و گۆتن: ئەو د کتێب و دەرسێن خۆ دا دبێژت: چێ نابت مرۆڤ ژ بلی خودێ هەوارێن خۆ بگەهینتە کسەکێ دی، ئەگەر خۆ ئەو ئێک پێغەمبەر ژی بت، و ئەو دنڤیسینێن خۆ دا دهاڤێتە هندەک (ئەقطاب) و وەلییان وەکی شێخ ئبن عەرەبی، و ئەم ڤێ چەندێ قەبویل ناکەین.

پشتی گازندەیا وان گەهشتییە بەر دەستێ قازی، قازی هنارتە ب دویڤ ئبن تەیمیەی ڕا و گۆتێ: یان تو دێ ڤان سوحبەتان بەس کەی، یان ژی بۆ خۆ ئێک ژ سێ تشتان هلبژێرە: زڤڕین بۆ شامێ، یان نەفیکرن بۆ ئەسکەندەرییێ، یان گرتن!

ئبن تەیمیەی گۆت: من گرتن!

هندەک هەڤالێن وی مانە پێڤە دا ئەو زڤڕینێ بۆ شامێ هلبژێرت، وی نەڤیا دلێ وان بهێلت لەو گۆت: بلا ب کەیفا هەوە بت. گاڤا هەڤڕکێن وی زانی وی زڤڕین هلبژارت، گۆتن: ئەم قەبویل ناکەین؛ چونکی ئەو ل شامێ ژی دێ هەر ڤان گۆتنان د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ کەت.. لەو وان ل بەر سولطانی شرین کر کو ئەو وی بگرت و چو ددی نە!

لەو سولطانی بڕیار دا جارەکا دی شێخ بێتە گرتن، و شێخی جارەکا دی سجنا خۆ کرە مەدرەسە و جهێ عیبادەتی و نڤیسینا کتێبان.. وان دڤیا هزر و بیرێن وی سجن بکەن، بەلێ ئەو هند ب خۆ حسیان خەلک یێن دچن قەستا سجنێ دکەن دا پسیارێن خۆ ژ ئبن تەیمیەی بکەن، و فەتواییێن ئبن تەیمیەی و کتێبێن وی ژ سجنێ یێن دەردکەڤن و دئێنە نڤیسین و بەلاڤکرن، و یا ژ ڤێ ژی مەزنتر -ل بەر وان- ئەو بوو: گەلەک کەس یێن کو سەرا دزییێ و خرابییان

هاتینه گرتن، ل خرابییێن خۆ لێڤه بوون و بوونه ژ هەڤالێن ئبن تەیمیەی و د سجنێ ڤه دەرس ل نک خواندن و بوونه پشتەڤانێن وی.

سالەک و پێنج هەیڤان شێخ ل قاهیره ما د سجنێ ڤه، و ل هەیڤا صەفەرا سالا (٧٠٩) شێخ نەصرێ مەنبجی ژ سولطانی خواست ئەو ئبن تەیمیەی ژ سجنێ دەربێخت و نەفی بکەتە باژێرێ ئەسکەندەرییێ، گۆت: خەلکێ ئەسکەندەرییێ گەلەک حەز ژ ئبن عەرەبی دکەن، و ئبن تەیمیەی د دەرس و نڤیسینێن خۆ دا دهاڤێته ئبن عەرەبی، ئەگەر مە ئەو نەفیکره وێرێ، یان ئەو دێ خۆ بێ دەنگ کەت، یان ئێک دربەکی دێ دانتێ و بەلا وی دێ ژ مە ڤەبت!

سولطانێ مصرێ (جاشەنگیر) ئەوێ سولطانێ بەری خۆ (ئەلناصر محەمەدێ کورێ قەلاوونی) عەزلکری و ل جهێ وی بوویە سولطان، بڕیار دا ئبن تەیمیە بۆ ئەسکەندەرییێ بێتە نەفیکرن.. و شێخ ژ سجنێ دەرکەفت و قەستا نەفییێ کر.

**ل نەفییێ:**

(شیخ الإسلام) هەشت هەیڤان ما نەفیکری ل ئەسکەندەرییێ، د ڤان هەشت هەیڤان دا خودێ تەوفیقا وی دا، و ئەو شیا ب ڕەنگەکێ زێدە بەرفرەهـ علمێ کیتاب و سوننەتێ بەلاڤ بکەت، و خودێ وەسا حەزکر ڤیانا وی کەفتە دلێن خەلکی، و گازییا وی د ناڤ خەلکی دا دەنگ ڤەدانەکا باش هەبوو، نە وەکی هەڤرکێن وی هزرکری کو خەلکێ ئەسکەندەرییێ دێ دربەکی داننێ.

دەمێ شێخ ل ئەسکەندەرییێ، وەسا چێبوو سولطانێ مصرێ یێ عەزلکری ئبن قەلاوون شیا جاشەنگیری لابدەت و جارەکا دی بزڤڕتە سەر تەختێ سەلتەنەتێ، و دەمێ ئەو زڤڕییە سەر حوکمی وی ڤیا حسێبا خۆ د گەل جاشەنگیری و پشتەڤانێن وی صافی بکەت، و یێن ژ هەمییان پتر وی کەربا خۆ هاڤێتییێ ئەو مەلا و قازی بوون یێن پشتەڤانییا جاشەنگیری دژی وی کری، و ئەو مەلا و قازی هەمی ئەو بوون یێن هەڤرکی د گەل ئبن تەیمیەی دکر،

ئبن قەلاوونی بەری هەر تشتەکی بڕیار دا ئبن تەیمیە ژ نەفییێ بێتە زڤڕاندن و ئنیەتا وی ئەو بوو وێ هەڤڕکییا د ناڤبەرا ئبن تەیمیەی و وان مەلایان دا بۆ خۆ (ئستغلال) بکەت و ب هێجەتا وی دربەکی ل نەیارێن خۆ بدەت.

گاڤا ئبن تەیمیە گەهشتییە قاهیرە، سولطانی ئەو داخوازکرە دیوانا خۆ، و زێدە قەدرێ وی گرت، پاشی دیوان خالی کر و گۆتە ئبن تەیمیەی: سەیدا، تو دزانی فلان قازی و فلانی و فلانی گەلەک بەرگەڕیان دکر دا تە بگرن و نەفی کەن، و ڕۆژا ئەز هاتیمە عەزلکرن ژی هەر ئەو بوون دوژمناتییا من کری، و پشتا نەیارێن من گرتی، ئەڤرۆ خودێ ئەو شەرمزارکرن و ئێخستنە دەستێ مە، ڤێجا من دڤێت تو فەتوایەکێ بدەی دا ئەز وان ئێک ئێکە بکوژم.

ئبن تەیمیەی گۆت: ئەڤ گۆتنا تو دبێژی قەت چێ نابت، ئەڤ مرۆڤێن تە ناڤێن وان ئیناین زانایێن باژێرینە، و مرۆڤێن خودان قەدرن، ئەگەر تە ئەو کوشتن تو کەسێ دی یێ وەکی وان نابینی.

سولطانی گۆت: ئەوێن هە ئەو بوون یێن تو دایە گرتن و نەفیکرن، و گەلەک جاران وان دڤیا تە بکوژن ژی!

ئبن تەیمیەی گۆت: هەچییێ نەخۆشییەک گەهاندبتە من، من گەردەنا وی یا ئازاکری، و هەچییێ نەیارەتییا خودێ و پێغەمبەری کربت، خودێ دێ تۆلێ لێ ڤەکەت و ئەز تۆلا خۆ ژ کەسێ ڤەناکەم.

هندی سولطان ما پێڤە نەشیا چو فەتوایان ژێ چێ کەت، لەو چو هێجەتێن شەرعی ب دەست وی نەکەفتن کو ئەو وان پێ بکوژت، دوژمنێ ئبن تەیمیەی یێ مەزن ئبن مەخلووفی گۆت: ((کەسێ وەکی ئبن تەیمیەی مە نەدیتییە، مە سولطان پالددا؛ دا وی بێشینت و ئەم نەشیاینێ، و گاڤا ئەو شیایە مە وی ئەم عەفی کرین و بەرەڤانی ژ مە کر)). ژ بەر ڤی هەلویستێ وی گەلەک هەڤڕکێن وی پەشێمان بوون و داخوازا لێبۆرینێ ژێ کر.

### ل قاهیره:

پشتی شێخ ژ نەفییێ زڤری دو سالان ما ل قاهیره، و د ڤان هەردو سالان دا ئەو یێ بەردەوامبوو ل سەر نڤیسینا کتێبان و دەرس گۆتنێ، و وە نەبت بێتە هزرکرن کو هەڤرکێن وی د ڤان هەردو سالان دا بەلا خۆ ژێ ڤەکر، نە! بەلکی وان هەر پیلان دگێران و لێ دگەریان نەخۆشییێ بۆ وی چێ بکەن.. و تشتێ ژ هەمییێ کرێتتر وان د گەل وی کری ئەو بوو ل هەیڤا رەجەبێ ژ سالا (٧١١) وان هندەک نەزان پالدان کو بێنە د رێکا ئبن تەیمیەی دا دەمێ ئەو دچتە نڤێژێ و تێر بقوتن! و وان ئەڤ کارە ب جهئینا، گاڤا خەلکی پێ زانی هاتنە نک ئبن تەیمیەی و گۆتنێ: دەستویرییێ بدە مە دا ئەم تۆلا تە ژ وان ڤەکەین، وی گۆت: نە، بهێلنە ب هیڤییا من ڤە. و هەر ل وێ رۆژێ ئبن تەیمیە رابوو چوو مزگەفتا وان و پشتی نڤێژا ئێڤاری روینشتە خوارێ و دەست ب تەفسیرا سوورەتا فاتحێ کر و حەتا بانگێ مەغرەب ما و گۆت: ئەوێن ئەڤ نەخۆشییە گەهاندییە من، من عەفیکرن. گاڤا وان ئەڤ چەندە دیتی هاتنە نک شێخی و داخوازا لێبۆرینێ ژێ کر.

### زڤرین بۆ شامێ:

ل هەیڤا یازدێ ژ سالا (٧١٢) سەیدای دەستویری ژ سولطانی خواست دا بزڤرتە شامێ پشتی حەفت سالان ژ دویرکەفتنێ ژ مال و مرۆڤێن خۆ، و سولطانی دەستویری دایێ و ئەو زڤری شامێ، و رۆژا ئەو گەهشتییە دیمەشقێ خەلک هند چوونە بەراهییێ دا بێژی جەژنە.

پشتی ئبن تەیمیە زڤرییە شامێ دەست ب نڤیسین و دەرس گۆتنێ کر و وی د نڤیسین و دەرسێن خۆ دا پتر (تەرکیز) ل سەر بابەتێن عەقیدێ دکر، و ژ بلی عەقیدێ ژی وی پویتەیەکێ مەزن ددا تەفسیر و حەدیس و فقهێ ژی، و هەر چەندە شێخ د مەزهەبێ خۆ یێ فقهی دا (حەنبەلی) ژی بوو، بەلێ د گەل هندێ ژی ئەو گەهشتبوو دەرەجا (ئجتهادێ) و هەر جارەکا دەلیلێ شەرعی یێ

دورست بۆ وی دیار بیا ئەو ل دویڤ دچوو، و کار پێ دکر، و فەتوا پێ ددا، و هندەک جاران ئجتهادا وی ئەو دگەهاندە بۆچوونەکا جودا ژ بۆچوونێن هەر چار مەزهەبان، و نە تشتەکێ ڤەشارتییە کو ئیسلام ژ هندێ مەزنترە کو د چارچووڤەیێ مەزهەبەکی یان چەند مەزهەبەکان دا کۆم ببت.

ئەڤ ئجتهادێن شێخی یێن فقهی بوونە ئەگەرا هندێ گەلەک فقهزانێن مەزهەبان کەرب ژێ ڤەببن، و نەیارەتییا وی بکەن، و گازندەیان ل نک قازی و میران ژ وی بکەن، و ئەو بوو ل سالا (٧١٧) شێخی فەتوایەک د مەسەلا (طەلاقێ) دا دا، و ئەو وەکی فەتوایا مەزهەبی نەبوو لەو مەزهەبییان فتنەکا مەزن ل سەر سەرێ وی ڕاکر و مەسەلە گەهشتە وی حەددی سولطانی ژ مصرێ کاغەزەک بۆ جێگرێ خۆ ل شامێ هنارت تێدا فەرمان دا کو: چێ نابت ئبن تەیمیە د مەسەلا (طەلاقێ) دا چو فەتوایان بدەت..

ئەو مەسەلا خیلاف ل سەر چێبووی ئەڤە بوو: ئەگەر ئێکی ب طەلاق سویند خوار و سویندا خۆ ب جهـ نەئینا کانێ طەلاقێن وی دێ کەڤن یان نە؟

مەزهەبییان دگۆت: بەلێ دکەڤن، و ئبن تەیمیەی گۆت: نەخێر؛ چونکی ئەوێ ڤێ چەندێ بکەت دێ کفارەتا سویندێ دەت.

هەر وەسا هاڤێتنا سێ طەلاقان د ئێک دیوانێ دا چ ب ئێک لەفظ بت یان نە، مەزهەبییان گۆت: حسێب دبت سێ طەلاق و ئبن تەیمیەی فەتوا دا کو ئەو ئێک طەلاقە..

دەمێ فەرمانا سولطانی هاتی کو ئبن تەیمیە چو فەتوایان د مەسەلا طەلاقێ دا نەدەت، وی پێگیری ب فەرمانا سولطانی کر، حەتا سالا (٧٢٠)، هنگی دوبارە پسیار ژ شێخی هاتەکرن ل دۆر مەسەلا طەلاقێ وی ژی دوبارە ڕەئیا خۆ ئاشکەرا کر، جارەکا دی مەزهەبی تێک هاتن و تێک چوون و ل شوینا ئەو دان و ستاندنەکا علمی بکەن و بۆچوونا مەزهەبێن خۆ بۆ خەلکی ئاشکەرا

بکەن، ئەو ڕابوون چوونە نک جێگرێ سولطانی و گۆتنێ: ئبن تەیمیە چو پویتەی نادەتە سولطانی و فەرمانا وی لەو دڤێت ئەو بێتە ئێشاندن!

جێگرێ سولطانی هنارتە ب دویڤ شێخی ڕا و ب ئامادەبوونا موفتی و قازییان گازندە ژێ کرن و گۆتێ: بۆچی تو ڤان فەتوایێن هۆسا ددەی؟ وی گۆت: ئەگەر پسیار ژ من هاتەکرن بۆ من چێ نابت ئەز حەقییێ ڤەشێرم. مەزهەبییان دەمێ دیتی شێخ ل سەر بۆچوونێن خۆ یێ مجدە بەرێ جێگرێ سولطانی دا هندێ کو ئەو شێخی بگرت، و وی داخوازا وان ب جهئینا و بڕیار دا ئبن تەیمیەی ل گرتیخانەیا (کەلێ) ل دیمەشقێ بێتەگرتن، و ڤێ جارێ -کو جارا سێیێ بوو ئەو دئێتە گرتن- ئەو پێنج هەیڤ و هەژدە ڕۆژان هاتە گرتن.

## گرتنا چارێ:

ل سالا (٧٢٦) دەمێ ژییێ ئبن تەیمیەی شێست و پێنج سال، و ب دورستی ل هەیڤا شەعبانێ شێخ بۆ جارا چارێ ب دەستێ مەزهەبییان هاتە گرتن و ڤێ جارێ گرتنا وی ژ بەر مەسەلا چوونا سەر قەبران بوو.

(شیخ الإسلام)ی دگۆت: یا دورست نینە بۆ مرۆڤێ موسلمان کو سەفەرێ ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی بکەت بۆ هندێ دا سەرا قەبرەکی بدەت؛ چونکی ئەڤە ئەو (شد الرحال)ە یا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ئەم ژێ داینە پاش. گاڤا هەڤڕکێن وی ئەڤ گۆتنا وی گوهـ لێ بووی ڕابوون وەسا د ناڤ خەلکی دا بەلاڤکر کو ئبن تەیمیە نەیارێ پێغەمبەری و وەلییانە لەو ئەو دبێژت چوونا سەر قەبرێن وان حەرامە! و ئەڤە وەرپادانەک بوو وان ئێخستییە گۆتنا شێخی؛ چونکی وی نە دگۆت: چوونا سەر قەبرێن وان حەرامە، وی دگۆت: (شد الرحال) بۆ سەر قەبرەکی یا دورست نینە، و ئاشکەرایە کو فەرقەکا مەزن د ناڤبەرا هەردو گۆتنان دا هەیە، و دەلیلێ وی ل سەر ڤێ چەندێ ئەو حەدیسا دورستە یا کو دبێژت: ((**لا تشد الرحال إلا إلى ثلاثة مساجد..**)) و د گەل ڤێ بۆچوونا وی یا ئاشکەرا و ئاڤاکری ل سەر حەدیسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ

بن- هەڤڕکێن وی مەسەلە مەزن کر و درەو ب دویڤ ڤەنان دا ئەو وی بدەنە گرتن.. و مرادا وان ب جهەات.

گاڤا ئەو هاتین دا بڕیارا گرتنا شێخی بگەهیننێ وی گۆت: ئەز ل هیڤییا هندێ بووم.. و ئەو ب ڤێ ب تنێ ڕازی نەبوون گۆتن: هەر کەسەکێ ل سەر رەئیا ئبن تەیمیەی ژی بت دڤێت بێتە گرتن، لەو وان دەست ب گرتنا طەلەبێن وی ژی کر، و بۆ کێمکرن وان هندەک ل دەواران سویارکرن، و ل باژێرێ گێڕاندن و زانایێ ناڤدار (ئبن قەییم) ئێک ژ وان بوو، پشتی هنگی وان طەلەبێن وی هەمی بەردان ئبن قەییم تێ نەبت ئەو ژی د گەل سەیدای هێلا گرتی.

ڤێ جارێ دو سال و سێ هەیڤان ئەو ما گرتی.. و جهێ گرتنا وی یا چاوا بوو؟

وان ئەو کرە د گرتیخانەیەکا (ئنفرادی) ڤە، گۆتن: دڤێت کەس د گەل وی نەبت؛ دا ئەو وی وەکی خۆ لێ نەکەت، بەس وان هێلا برایێ وی یێ بچویکتر (زەینەددین) د گەل وی بت دا خزمەتا وی بکەت؛ چونکی ئەو وەکی مە گۆتی پیرەمێر بوو. و ئەو سجنا وان شێخ لێ گرتی ژ بلی کو سجنەکا (ئنفرادی) بوو گەلەک یا بێ سەر و بەر ژی بوو، سەیدا د نڤیسینەکا خۆ دا دبێژت: حەمد بۆ خودێ بت ئەو جهێ وان ئەز لێ گرتیم جهەکێ وەسایە چو جاران ئەو جوهی و فەلان ژی لێ ناگرن.

شێخی دەمێ گرتنا خۆ هەمی ب نڤیسین و عیبادەت و خواندنا قورئانێ ڤە دبۆراند، ل دەمەکی شێخەکێ ب ناڤێ (ئەخنائی) کتێبەک نڤیسی تێدا هاڤێتە بۆچوونا ئبن تەیمیەی و گاڤا کتێبا وی گەهشتییە ئبن تەیمیەی، ئبن تەیمیەی بەرسڤا وی دا و د بەرسڤا خۆ دا وی نڤیسیبوو کو (ئەخنائی) مرۆڤەکێ نەزانە، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەخنائی زێدە تۆرەبوو و چوو نک سولطانی و گازندە ژێ کرن و گۆت: ئەڤە چ گرتنە مە ئەو گرتی؟! چی تشتێ وی دڤێت ئەو د سجنا خۆ ڤە یێ دنڤیست و د ناڤ خەلکی دا بەلاڤ دکەت.

ئینا سولطانی بڕیار دا چو کتێب و کاغەز ل نک وی نەمینن.. لەو ئەو ڕابوون چوون هەمی کتێب ژ نک وی دەرێخستن، و هژمارا وان کتێبێن وی ل وان هەردو سالان نڤیسین شێست (موجەللەد) و چاردە دەفتەر بوون، وان ئەو کتێب هەمی ژ سجنێ دەرێخستن و برنە مەدرەسا (عادلییێ) ل دیمەشقێ، سەیدا د نڤیسینەکا خۆ دا دبێژت: خودێ قەنجییەکا مەزن د گەل من کر کو وی دوژمنێن من بۆ من (موسەخخەر) کرن و وان ب خۆ کتێبێن من برن ل سەر خەلکی بەلاڤکرن.

پشتی وان کتێب ژ نک شێخی دەرێخستین کاغەز و قەلەم ژی ژێ مەنعەکرن، ئینا وی ب ڕەژییێ دنڤیسی و پتر دەمێ خۆ ب خواندنا قورئانێ ڤە دبۆراند.. برایێ وی ئەوێ د گەل وی د سجنێ ڤە دبێژت: هەر ژ ڕۆژا ئەم هاتینە گرتن و حەتا شێخ مری (یەعنی د دو سال و سێ هەیڤان دا) وی حەشتێ جاران قورئان ختم کر، و دەمێ ئەو مری وی ختما خۆ یا حەشتێ و ئێکێ دخواند و گەهشتبوو ڤێ ئایەتێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ۝ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ۝﴾ (القمر: ٥٤-٥٥).

دەمێ ئەو یێ گرتی د سجنا (القلعە) ڤە ل دیمەشقێ ل شەڤا دوشەنبێ (٢٠) هەیڤا (ذو القعدە) ژ سالا (٧٢٨) مشەختی ئەو چوو بەر دلۆڤانییا خودێ، و گاڤا بوویە سپێدە و خەلکی ب مرنا وی زانی هەمییان قەستا بەر دەرێ سجنێ کر، زانایێ ناڤدار ئبن کەثیر دبێژت: ئەو مرۆڤێن د گەل جەنازێ وی دەرکەفتین ژ شێست هزار کەسان دکێمتر نەبوون، و دبێژت: هندی قەرەبالغ چێببوو لەشکەر هات خەلک ژ جەنازەی پاشدا برن!

### بناخەیێن گازییا ئبن تەیمیەی:

هژمارەکا زانایێن مەزن ل سەر دەستێن ئبن تەیمیەی هاتبوونە پەروەردەکرن، و مفایەکێ مەزن بۆ خۆ ژێ وەرگرتبوو و ژ وان زانایان -بۆ نموونە-: (ئبن قەیم) و ئەڤە نێزیکترینێ شاگرەدیێن وی بوو بۆ وی، و

(ئیمامێ ذەهەبی) زانایێ حەدیسێ یێ ناڤدار، و تەفسیرزان و دیرۆکنڤیسێ ناڤدار (ئبن کەثیر)، و حەدیسزانێ مەزن (الحافظ العلائي) و (الحافظ ابن عبد الهادي) و گەلەکێن دی.. و ئەوێ ب ژین و بەرهەمێ وی و یێ شاگردەیێن وی ئاگەهدار بت دێ زانت کو (شیخ الإسلام)ی گازییا خۆ ل سەر چەند ستوینەکێن سەرەکی ئاڤاکریوو، ژ وان ستوینان:

١- عەقیدە بەری هەر تشتەکی:

بێ گومان دورستکرنا بیر و باوەران ئەو کارێ فەرە یێ کو بەری هەر تشتەکی دئێت، و یێ کو دڤێت هەر (موصلحەک) ژێ دەست پێ بکەت و پویتەکێ گرنگ بدەتێ.. شێخی خەمەکا مەزن ژ ڤی لایی دخوار و هەردەم وی بەرێ شاگردەیێن خۆ -ب تایبەتی- و جڤاکێ -ب گشتی- ددا هندێ کو بەری هەر تشتەکی ئەو بیر و باوەرێن خۆ دورست بکەن، و قورئانێ و سوننەتێ ب تێگەهشتنا پێشییێن ئوممەتێ بۆ خۆ بکەنە رێبەر و رێنیشاندەر.

٢- دویکەفتنا مەنهەجێ (سەلەفی):

گەلەک رێباز و مەنهەج هەنە وەسا خۆ نیشا خەلکی ددەن کو ئەو ل دویڤ کیتاب و سوننەتێ دچن، بەلێ ئەگەر بێت و مرۆڤ ژ نێزیک بەرێ خۆ بدەتێ دێ بینت ئەو ژ رووحا کیتابێ و سوننەتێ ددویرن؛ چونکی ئەو وەسا دکیتابێ و سوننەتێ نەگەهشتینە وەکی هەر سێ جیلێن ئێکێ یێن ئوممەتێ تێ گەهشتین و باوەری پێ ئینای و کار پێ کری، لەو زانایێن ئوممەتێ یێن سەرراست هەردەم (تەرکیز) ل سەر هندێ کرییە کو دویکەفتنا کیتابێ و سوننەتێ نائێتەکرن ئەگەر خودان ل دویڤ مەنهەجێ سەلەفێن ئوممەتێ نەچت د (وەرگرتن) و (ب کار ئینانا) ئیسلامێ دا.

و (شیخ الإسلام) ب خۆ ژی ئێک ژ وان زانایان بوو یێ د نڤیسین و دەرس و خوتبەیێن خۆ دا خەمەکا مەزن ژ ڤی لایی خواری.

٣- بەرگرییا بیدعەچییان:

بێ گومان ساخکرنا مەنهەجێ (اتباع)ێ هندێ دخوازت کو مرۆڤ خەلەتییێن مەنهەجێن (ابتداع)ێ ئاشکەرا بکەت و خەلکی ژێ بدەتە پاش، تشتێ دبتە ئەگەرا هندێ کو ئالاهلگرێن (ابتداع)ێ دوژمناتییا مرۆڤی بکەن و لێ بگەڕیێن ئاستەنگان بکەنە د ڕێکێ دا، و ئەڤ چەندە دڤێت مرۆڤی سست نەکەت و ژ حەقییێ لێڤە نەکەت..

(شیخ الإسلام) ژ وان زانایان بوو یێن ئالایێ نەیارەتییا بیدعێ بلند ڕاکری، و پشکەکا مەزن ژ گۆتن و نڤیسینێن خۆ بۆ دیارکرنا شەرمزارییێن بیدعەچییان تەرخانکری، لەو داخوازکەرێن سوننەتێ ل دۆر وی کۆمبوون، کانێ چاوا بیدعەچی د چەپەرێ بەرانبەری وی دا هەمی کۆمبوون.

٤- نەیارەتییا تەقلیدا کۆرە:

ل وی دەمێ سەیدا تێدا هاتی ئوممەت تێکدا موبتەلایی دەردەکێ مەزن بووبوو: دەردێ تەقلیدا کۆرە چ بۆ مەزهەبێن فقهی بت، چ بۆ طەریقان بت، و د ئەنجامێ ڤێ تەقلیدێ دا (تەعەصوبەکا) زێدە دژوار پەیدابووبوو حەتا گەهشتبوو وی حەددی هندەک جاران موسلمانی گۆتنا خودێ و پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- لا ددا ئەگەر یا ڕێککەفتی نەبا د گەل گۆتنا مەزهەبێ وان، و هندەک جاران ژی ئێکی نڤێژ ل دویڤ کەسەکێ دی نەدکر ئەگەر نە ژ مەزهەبێ وی با!

شێخی ب هەمی هێزا خۆ نەیارەتییا ڤێ تەقلیدا کۆرە دکر و شاگردەیێن خۆ ل سەر هندێ فێر دکرن کو ئەو دویکەفتنا دەلیلی بکەن دویر ژ تەعەصوبێ بۆ فلانی و بێڤانی، و ئەو بوو ئەڤ کارییە ل دلێن مەزهەبییان نەهات لەو وان نەیارەتییا وی کر و بێبەختی پێڕا دان و پتر ژ جارەکێ ئەو دا گرتن ژی. بەلێ هزرا ئبن تەیمیەی ما و بەر ژ خۆ دا حەتا وە لێ هاتی ئەڤرۆ -وەکی هزرڤانێ مەزن مالک بن نەبی دبێژت- بوویە ئەو (ترسانەیا فکری) یا هەمی بزاڤێن

(ئصلاحى) ل جیهانا ئیسلامی (مەدەدێ) بۆ خۆ ژێ وەردگرن، ئبن تەیمیە و هزرا وی مان و هەڤرکێن وی ئەگەر ژ بەر هندێ نەبا کو ناڤێن وان د ژیاننامەیا ئبن تەیمیەی دا دئێنە گۆتن هەر کەسێ ناڤێن وان ژی نەدزانی!

# هلگرێ ئالایێ سوننەتێ
# ئیمام موحەممەدێ کوڕێ عەبدلوەهابی

**بەری دەسپێکێ:**

هەر جارەکا مرۆڤ ژ ڕۆناهییا سوننەتێ دویرکەفت، و پشت دا چرایێ پێغەمبەرینییێ دێ بتە هەڤڕێ د گەل دو دەردێن کوژەک:

- هزرا وی دێ خراب بت؛ چونکی دێ کەفتە داڤێن بیدعە و شەعوەذێ..

- و ژینا وی ژی دێ تاری بت؛ چونکی دێ کەفتە ژێر دەسهەلاتا گەلەک طاغووتان، و بەری هەمییان طاغووتێ نەفسێ و گرداریێن وی.

ل وی دەمی ڕۆناهییا دینی کز دبت و باطل و بێدینی بێ ترس سەرێ خۆ ڕادکەت و دربێ خۆ دوەشینتە دینداریێ، و بەری هەر تشتەکی دینێ نەزانان وەردگێرت.. (لات و عوززا) نەوێن جارا ئێکێ ب دەستێ ئالاهلگرێن ئیسلامێ هاتینە هویر هویرکرن، ل گەلەک جهان دوبارە دئێنە مەیدانێ بەلێ هەر جار ب ناڤ و ڕەنگەکێ جودا پەیدا دبن.. و ل ڤان دەمان نەزانین دبتە دەسهەلاتا ئێکانە و خۆشتڤییا بەر دلان، ما نە تشتەکێ عنتیکەیە مرۆڤ ببتە ئەڤینداری نەزانینێ و دوژمنێ سەرێ زانین و زانایان؟

**دەسپێکەکا فەر:**

پشتی دویرکەفتنەکا نەیا شرین ژ چرایێ سوننەتێ، و شکەستنەکا سیاسی یا مەزن بەرانبەر هێرشا مەغوولییان د ناڤ ئوممەتێ دا پەیدابووی، بێ ئومێدی د دلان دا پەیدابوو.. هنگی خودێ وەسا حەزکر دەولەتەکا گەنج و یا خودان هێز

ئالایێ بەرەڤانییا ژ ناڤێ ئیسلامێ هلگرت، ئەڤێ دەولەتێ -ئەوا ب ناڤێ دەولەتا ئۆسمانی هاتییە ناسین- نێزیکی شەشسەد سالان ئالایێ ئیسلامێ هلگرت، و ب ناڤێ دەولەتا ئیسلامی ئاخفت، و ئەگەر چ ئەو دەولەت ل گەلەک دەمێن ژییێ خۆ شیابوو وێ بێ ئومێدییێ د دلان دا نەهێلت نەخاسم پشتی زێدە د ناڤ جەرگێ ئۆرووپایێ دا چووی، بەلێ مخابن ئەڤ دەولەتە نەشیا ئوممەتێ دوبارە ل چرایێ سوننەتێ کۆم بکەتەڤە، بەلکی ل هندەک جاران ئەڤ دەولەتە ب خۆ بووبوو ئەو ئاستەنگا مەزن یا کەفتییە د ناڤبەرا ئوممەتێ و زڤرینا ل سوننەتێ دا.

ڕاستە دەولەتا ئۆسمانی -ل گەلەک دەمان- ئیخلاصەکا بەرچاڤ بۆ ئیسلامێ هەبوو، و عەبقەرییەتەکا سیاسی و عەسکەری ژی ل نک هەبوو، و ئەو ئێک ژ ئەگەرێن سەرەکی بوون یێن ئوممەت ل دەمێ داکەفتنێ ڕاکری، بەلێ ئەڤە نابتە مانع کو بێژین: ڤێ دەولەتێ و نەخاسم ل دوسەد سالێن دووماهییێ ژ ژییێ خۆ ئوممەت بەر ب ژۆردانییەکا ب ترس ڤە دبر.. ئۆسمانییان گەلەک حەز ژ ئیسلامێ دکر، بەلێ گرفتارییا وان یا مەزن ئەو بوو وان -یان پترییا وان!- ئیسلاما صافی ب ڕاستی و دورستی وەرنەگرت بوو، دەولەتا وان پتر ژ کو دەولەتەکا عەقائدی بت، ئەو دەولەتەکا جیهادی بوو، هەردەم وان ب عەقلییەتەکا عەسکەری هزر دکر، لەو خۆ نظاما وان یا ئیداری ژی نێزیک بوو نظامەکا عەسکەری بت.

ژ لایێ دینی ڤە: دەولەتا ئۆسمانییان کەفتبوو ڕەشە داڤێت (تەعەصصوبا مەزهەبی)، و دڤێت ژ بیر نەکەین کو دەولەتا ئۆسمانی یا حەنەفی -وەک بەرەڤانی ژ مەزهەبییەتا بەرتەنگ- ب بڕیارەکا سیاسی دەرگەهێ (ئجتهادێ) گرتبوو، و ب گرتنا دەرگەهێ (ئجتهادێ) دەولەتێ ڕێ دا (جموود و تەقلید و تەعەصصوبێ) کو جهێ خۆ د مەیدانا ڕەوشەنبیری دا بکەت. ژ لایەکێ دی ڤە شێخێن طەریقان شیان دەولەتێ بخاپینن و سولطانان وەسا تێ بگەهینن کو

دین طەریقەتە و بێ طەریقەت دین ژ کەسێ نائێتە قەبویلکرن، و د ئەنجام دا دین د سەرێ خەلکی دا بوو (تەقلید) و کۆمەکا خورافاتێن (أقطاب) و شێخێن خودان کەرامەتێن ژ دەرەو! و ڕۆژا دین بوویە (تەقلیدەکا هشک) ئەو بوو لەشەکێ بێ ڕح، بوو ڕۆتینەکێ موزعج، لەو جڤاکێ هێدی هێدی خۆ ژێ دویرکر و بۆ وی ل پێگوهۆڕەکی گەڕیا.. و چونکی شریعەت ب گرتنا دەرگەهێ ئجتهادێ بووبوو پارچەیەکا هشک خەلک بۆ خۆ ل تشتەکێ زێندی گەڕیان یێ گرفتارییێن وان چارەسەر بکەت.. و گرفتاری ئەو بوو وان بەرێ خۆ دا ئۆرووپایێ، و سولطانێ ئۆسمانی (سولەیمان) ئەوێ ب ناسناڤێ سولەیمانێ قانوونی هاتییە نیاسین، ئێکەمین سولطانێ موسلمان بوو دەرگەهـ بۆ (ئستیرادکرنا) قانوونێن نە ئیسلامی ڤەکری.. و ئەڤی کارێ وی ئەوێ ژ ئەنجامێ (تەعەصوبا مەزهەبی) و (سلبییەتا صۆفیاتییێ) هاتی دەرگەهـ بوو بێدینییێ ل تاق کر.

پسیار ل ڤێرێ ئەڤەیە: ئەرێ د ناڤ ڤێ گێلەشۆکێ دا هەلویستێ مرۆڤێن خودێ چ بوو؟

بۆ بەرسڤ دێ بێژین: مرۆڤێن خودێ ئەوێن هەردەم کویر و هویر بەرێ خۆ ددەن، دەمێ ئوممەت د ڤی کراسی دا دیتی وان تێ ئینادەر کو ئوممەت یا بەر ب بەرزەبوونەکا ب ترس ڤە دچت، بەرزەبوونەکا وەسایە ئەگەر خودێ نەکەت یا بەردەوام بت دێ بەرێ ئوممەتێ دەتە هندێ کو ناسنامەیا خۆ ژ دەست بدەت، لەو وان ب ڕەنگەکێ (مەوضووعی) بەرێ خۆ دانە واقعێ ئوممەتێ ب ئنیەتا چارەسەرکرنا گرفتارییان.. مرۆڤێن خودێ پەیوەندییا دەرمانی ب دەردی ڤە ژ بیر نەکر، وان باش دزانی فەسادا عەقائدی و دویرکەفتنا ژ ڕاستییا ئیسلامێ ئەگەرا سەرەکی یا فەسادا (جڤاکی و سیاسی و ئابۆری و علمی)یە. لەو دەمێ ئەو ب دەسنیشانکرنا دەرمانی ڕا بووین وان ژ عەقیدێ دەست پێ کر.. چاوا؟

سەرهاتییا (شیخ الإسلام) بابێ عەبدللاهی موحەممەدێ کوڕێ عەبدلوەهابێ نەجدی باشترین بەرسڤە بۆ ڤێ پسیارێ..

## کورێ عەبدلوەهابی وپێناسەیەکا کورت:

* (شیخ الإسلام) ناڤێ وی (موحەممەدە) کورێ شێخ (عەبدلوەهابێ) کورێ (سولەیمانێ) تەمیمییە، ل سالا ١١١٥ مشەختی (بەرانبەر ١٧٠٣ ز) ل باژێرێ عویەینە ل باکوورا (ریاضێ) ل دەڤەرا نەجدێ ژ جەزیرا عەرەبان ئەو هاتبوو سەر دنیایێ.

* بابێ وی شێخ (عەبدلوەهاب) قازییێ باژێری بوو، و ئێک ژ زانایێن ناڤدارێن دەڤەرێ بوو، و ڤێ ئێکێ کار ل شێخ موحەممەدی کر کو ئەو هەر ژ زارۆکینییا خۆ و ب دورستی ل حەفت سالییێ قەستا زانایێن دەڤەرێ بکەت پێخەمەت داخوازکرنا زانینێ و ل دوازدە سالییێ ئەو ژ نەجدێ دەرکەفت و قەستا وەلاتێ حجازێ کر، و چوو باژێرێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دا ل نک زانایێن وێرێ علمی بخوینت.

* ل مەدینێ سەیدایێ قەستا حەلەقا شێخ (عەبدللاهێ نەجدی) کر و صەحیحا (بوخاری و موسلمی) ل نک خواند حەتا ئیجازا علمێ حەدیسێ ژێ وەرگرتی، و چونکی زانایێ حەدیسێ یێ ناڤدار (موحەممەد حەیاتێ سندی) ژی هنگی ل مەدینی بوو سەیدایێ قەستا وی ژی کر و دەرسێن حەدیس و شریعەتێ ل نک خواندن.. ڤان هەردو زانایێن مەزن عەبدللاهێ نەجدی و موحەممەد حەیاتێ سندی کارەکێ بەرچاڤ ل هزر و بیرێن سەیدایی کر، و بەرێ وی دا بەرەڤانییا ژ سوننەتێ و نەیارەتییا بیدعە و بیدعەچییان، و چونکی ڤان هەردو زانایان عەقیدەیەکا سەلەفی یا پاقژ هەبوو وان بەرێ شاگردەیێ خۆ دا خواندنا کتێبێن عەقیدێ یێن دورست، وەکی کتێبێن ئیمام ئەحمەد و ئبن تەیمیە و ئبن قەییمی.

* ژ بلی ڤان هەردو زانایان سەیدایی زانین ژ گەلەک سەیدایێن دی ژی وەرگرتبوو، وەکی: ئیسماعیلێ عەجلوونی و موحەممەدێ ئەحسائی و عەلییێ داغستانی و گەلەکێن دی.

* پشتی چەند سالەکان ژ مانا وی ل مەدینی ئەو زڤری باژێرێ خۆ عویەینێ ل نەجدێ، و هەیامەکا درێژ پێڤە نەچوو وی دەستویری ژ بابێ خۆ خواست کو قەستا شامێ بکەت دا بۆ خۆ زانینێ ژ زانایێن وێرێ ژی وەرگرت.. ئینا بابێ وی دەستویری داییێ.

* چونکی سەیدایی زانیبوو کو ل باژێرێ بەصرایێ هندەک زانایێن هێژا هەنە وی ڤیا رێکا خۆ د وێرێ ژی بێخت و علمی بۆ خۆ ژ وان ژی وەرگرت، و گاڤا ئەو گەهشتییە بەصرایێ وی قەستا زانایەکێ سەلەفی شێخ موحەممەدێ مەجمووعی کر، و دەرس ل نک وی خواندن.. و وی دیت ئەڤ سەیدایە ژی گەلەک ژ واقعێ ئوممەتێ یێ دلکولە، لەو بۆ سەیدایی مسۆگەر بوو کو گەلەک زانا هەنە ب ڤی واقعێ ئێشەوی درازی نینن بەلێ هەر ئێک ژ بەر ئەگەرەکێ خۆ بێ دەنگ دکەت.

* ل بەصرایێ قەناعەت بوو سەیدایی چێبوو کو دڤێت ئێک هەبت باخڤت، راستییێ بۆ خەلکی دیار بکەت و بەرێ وان بدەتە سوننەتێ، ئەگەر نە خەلک دێ میننە د نەزانین و بێفامییا خۆ دا، لەو هەر ل وێرێ وی دەست ب نڤیسینێ کر و هندەک کتێبێن بچویک نڤیسین هێرش تێدا دانە سەر وان بیدعەیێن کو د ناڤ خەلکی دا دبەلاڤ، و داخوازکر کو خەلک ل مەنهەجێ کیتابێ و سوننەتێ بزڤرن.

* بیدعەچییان ژ خودانێن طەریقێ و مەزهەبێن بەرتەنگ ب ڤی کارێ وی نەخۆش بوو، و بەرگەریان کر کو نەخۆشییێ بگەهیننە شێخ موحەممەدی و سەیدایێ وی شێخ موحەممەدێ مەجمووعی، حەتا دووماهییێ مەسەلە گەهشتییە هندێ خەلکێ بەصرایێ بچویک و نەزانێن خۆ ب شێخی را بەردان، و وان دا ب دویڤ وی ڤە حەتا ئەو نەچارکری کو ل نیڤا رۆژەکا گەرم بێ ئاڤ و نان بۆ خۆ ژ بەصرایێ برەڤت، و بەر ب ناحییا (زوبەیر) ڤە بچت.

* دەمـەکـی ئـەو مـا ل (زویـەیـر)، پاشی قستا دەڤەرا ئەحسائێ کر و ل وێرێ بوو مێڤانێ شێخ موحەممەدێ شافعی، پاشی پشتی دەمەکی ئەو زڤڕی بازێڕێ خۆ عویەینێ، و هزرا چوونا شامێ ژ سەرێ خۆ ئینادەر.

* گاڤا ئەو زڤڕییە عویەینە وی دیت بابێ وی یێ چوویە (حەریملایێ)، ئینا ئەو ب دویڤ بابێ خۆ دا چوو، و ل وێرێ ئاکنجی بوو، و وی خواندنا خۆ ل نک بابێ خۆ تمام کر، و ل حەریملایێ بۆ جارا ئێکێ وی ب ئاشکەرایی دەست ب بەلاڤکرنا گازییا خۆ کر و د دەرس و کتێبێن خۆ دا وی هێرش دانە سەر وان بیدعەیان یێن کو د ناڤ خەلکی دا دبەلاڤ، و مەنهەجێ کیتاب و سوننەتێ بۆ خەلکی رۆهن و ئاشکەراکر. و ئاشکەرایە کو ئەڤ گازییە ل دلێن بیدعەچی و مەزهەبییان خۆش نائێت، و چونکی دەسهەلات هنگی یا ڤان رەنگە مرۆڤان بوو وان شێخ نەچارکر کو ژ بازێڕێ حەریملایێ دەرکەڤت و بەر ب عویەینێ ڤە مشەخت ببت.

* مەزنێ عویەینە هنگی میرەکێ نەجدی بوو دگۆتنێ: عوثمانێ کوڕێ حەمەدی، ڤی میری گەلەک کەیف ب گازییا شێخی دهات، لەو وی ب سنگەکێ بەرفرەهـ ڤە پێشوازی لێ کر، و سۆز دایێ ئەو پشتەڤانییا وی بکەت.. لەو شێخی ب ئاشکەرایی دەست ب بەلاڤکرنا مەنهەجێ سەلەفی کر، و ئالایێ سوننەت و جەماعەتێ بلندکر و ب پشتەڤانییا میری وی ئەو هەمی مەزارێن خەلکی طەواف ل دۆر دکر و دوعا بۆ خۆ ژێ دکرن هەرفاندن، و ئەو تێ گەهاندن کو ئەڤ کارە یێ دورست نینە، و ژ لایەکێ دی ڤە شێخی میر پالدا کو ئەو حودوودێن شەرعی وەکی د قورئانێ دا هاتین ب کار بینت، و تەشجیعا زانایان بکەت کو کتێبێن عەقیدا دورست ل مزگەفت و مەدرەسان بێژن.. و ب ڤی رەنگی بازێڕێ عویەینە بوو جهێ بەلاڤکرنا گازییا کیتاب و سوننەتێ.

* دەنگ و باسێن شێخی و میری ل جەزیرێ بەلاڤبوون، بیدعەچی و نەزانان ب ڤێ چەندێ نەخۆشبوو، و هندەک ژ وان چوونە نک میرێ ئەحسائێ و گۆتنێ: ل عویەینە مرۆڤەکێ دەرکەفتی دبێژنێ: موحەممەدێ کورێ عەبدلوەهابی دوژمناتییا دینی دکەت، و ئاخفتنێن نە جوان د دەر حەقا وەلییان دا دبێژت، و دبێژت: باب و باپیرێن هەوە دنەزان بوون.. و حەتا دوومااهییێ، ژ وێ کەلیشا حەتا ئەڤرۆ ژی مە گوهـ لێ دبت!

میرێ ئەحسائێ ڕابوو کاغەزەک بۆ میرێ عویەینە هنارت، تێدا ژێ خواست ئەو موحەممەدێ کورێ عەبدلوەهابی بکوژت، ئەگەر نە نەیارەتی د ناڤبەرا وان دا دێ پەیدا بت.. و چونکی بەرگرییا میرێ ئەحسائێ ب میرێ عویەینە ڤە نەدهات وی گۆتە شێخی: ئەز حەز دکەم تو ژ باژێرێ مە دەرکەڤی. لەو شێخ نەچاربوو داخوازا وی ب جهـئینا.

### د گەل ئبن سعوودی:

ل سالا ١١٥٨ مشەختی، دەمێ ژیێ سەیدایی پێنجی و پێنج سال، ئەو ژ عویەینێ دەرکەفت و چوو درعییێ ل نک میرێ وێ موحەممەدێ کورێ سعوودی، ئبن سعوودی گەلەک کەیف ب گازییا شێخی هات و سۆز دایێ ئەو پشتەڤانییا وی د بەلاڤکرنا وێ دا بکەت، و پێخەمەت ڤێ ئارمانجێ وان دەستێن خۆ کرنە تێکدا، ئێکی ب زانینا خۆ و یێ دی ب دەسهەلاتا خۆ، و هەردویان پەیمان دا ئالایێ سوننەتێ ل دەڤەرا نەجدێ بلند بکەن، و هندی بشێن بەرگرییا بیدعە و شرکێ و نەزانینێ بکەن.

جزیرا عەرەبان -ئەوا هنگی ب ناڤی ل بن دەسهەلاتا دەولەتا ئۆسمانی- ل سەر هژمارەکا نە یا کێم ژ میرنشین و حاکمییاتێن بچویک و لێککەفتی یا پارچەکری بوو، و ئەڤ چەندە گەلەک ل دلێ دەولەتێ دهات.. گاڤا شێخ هاتییە درعییێ و میرێ وێ پشتەڤانییا وی کری، شێخی کاغەز بۆ گەلەک میر و زانایایێن جزیرێ هنارتن، و تێدا ژ وان خواست ئەو دەستێن خۆ بکەنە تێکدا

ژ بۆ بەلاڤکرنا ئیسلاما ڕاست و دورست، یا دویر ژ وەربادان و تەفسیراتێن بەرتەنگ و خەلەت، و ئەڤ چەندە ب خۆ کارەک بوو ل دلێ دەولەتێ نەدهات؛ چونکی ئێکبوونا میرێن دەڤەرێ لاوازکرنە بۆ دەسهەلاتا دەولەتێ ل سەر وان.

بەرسڤا هژمارا مەزنتر ژ وان میر و زانایێن شێخ موحەممەدی کاغەز بۆ هنارتین ئەو بوو وان گۆت: ئەم ڕێکا باب و باپیرێن خۆ بەرنادەین ئەگەر خۆ یا خەلەت ژی بت!

میرێ درعییێ ئبن سعوودی دەست دا هێزێ و هژمارەکا جهـ و باژێران ئێخستنە بن دەستێ خۆ و ل سەر میرنشینا خۆ زێدەکرن، و هەر جهەکێ وی ڤەگرتبا وی (حودوودێن) شەرعی ب جهـ دئینان، و زانا و قازی لێ ددانان؛ دا علمێ شەرعی یێ دورست بەلاڤ بکەن.

ل ڤی دەمی شێخ یێ بەردەوام بوو د دەرسگۆتن و کتێب نڤیسینێ دا، و ژ لایەکێ دی ڤە وی چاڤدێری ل کار و بارێن دینی یێن میرنشینا ئبن سعوودی دکر، ئەوا ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بەرفرەهبووی حەتا ل سالا ١١٨٧ باژێرێ ریاضێ ژی ڤەگرتی.

### مرنا شێخی و بەرهەمێ وی:

ل هەیڤا (ذو القعدە) ژ سالا ١٢٠٦ مشەختی (بەرانبەر ١٧٩١ ز) د ژییێ نۆت و ئێک سالییێ دا شێخ موحەممەدێ کوڕێ عەبدلوەهابی چوو بەر دلۆڤانییا خودێ پشتی بەرهەمەکێ هێژا ل پشت خۆ هێلای.. و ژ بلی بزاڤێن وی یێن بەردەوام د دەرسگۆتن و بەلاڤکرنا زانینێ دا، سەیدایی هژمارەکا کتێب و نامیلکەیێن ب بها ل پشت خۆ هێلاینە حەتا ئەڤرۆ ژی مفا ژێ دئێتە دیتن، و وی د نڤیسینێن خۆ دا (تەرکیزەکا) باش ل سەر دیارکرنا عەقیدا ئیسلامی یا دورست کرییە، و ژ بەرهەمێن وی یێن ناڤدار:

١- (کتاب التوحید).

٢- (مسائل الجاهلية).

٣- (ثلاث عشرة رسالة في التوحيد والإيمان).

٤- (مختصر السيرة النبوية).

و گەلەکێن دی کو هەمی نوکە د یازدە بەرگێن مەزن دا چاپبووینە.

مرنا شێخی کارەکێ مەزن ل زانا و تێگەهشتییێن وی سەردەمی کر و گەلەک ژ وان شعر ب مرنا وی ڤەهاندن، ژ وان زانایێن ناڤدار: شێخ محەمەدێ کورێ ئسماعیلێ صەنعانی خودانێ کتێبا (سبل السلام) ئەوێ هێشتا د ساخییا سەیدایی دا شعر پێ ڤەهاندین و مەدحێن وی کرین، و ئیمامێ (شەوکانی) خودانێ تەفسیرێ و کتێبا (نیل الأوطار).

## سالۆخەتێن شێخی:

ئەو دیرۆکڤانێن ژیاننامەیا شێخ موحەممەدی نڤیسی دبێژن: ئەو مرۆڤەکێ نەرم و حەلیم بوو، یێ ناڤچاڤ ڤەکری و دلفرەهـ بوو، و دەستێ وی هەردەم بۆ هاریکاری و خێرخوازییێ یێ ڤەکری بوو، مرۆڤەکێ رحەت و نەرم بوو د گەل هەر کەسەکی ب تنێ د گەل وان نەبت یێن نەیارەتییا کیتاب و سوننەتێ دکر، ئەو ل سەر وان یێ دژوار بوو، و هندی ئەو مرۆڤەکێ مەرد بوو گەلەک جاران وی ژ مالێ خۆ خەرجی ل طەلەبێن خۆ یێن فەقیر دکر، و هندەک جاران وی مال دەین دکر و هاریکارییا مرۆڤێن پێتڤی پێ دکر، و ئەو مرۆڤەکێ خودان هەیبەت بوو و گەشاتی ژ ناڤچاڤان دپەشی.

دیرۆکڤان ئبن بشر دبێژت: ((ب راستی ئەو (شیخ الإسلام) بوو، زانایەکێ مەزن بوو، بەرەکەتا علمێ وی خەلک هەمی ڤەگرتبوو، خودێ سوننەت ب وی ب سەرئێخست و ئوممەت ب وی سەرفەرازکر، ل وی دەمێ ئیسلام د ناڤ خەلکی دا بوویە تشتەکێ غەریب ئەو هات و دین بەلاڤ کر، ئالایێ جیهادێ بلندکر و تەوحیدا دورست نیشا بچویک و مەزنان دا..)).

## گازیبا شێخی وکارتێکرنا وێ ل سەر ئوممەتێ:

ئەو بزاڤا (شیخ الإسلام) بەری پتر ژ دوسەد سالان ل جەزیرا عەرەبان پێ ڕابووی دئێتە هژمارتن ئێکەمین پێگاڤا موکم د ڕێکا چاککرنا واقعێ ئوممەتێ یێ هەڤچاخ دا هاتییە هاڤێتن، گازییەک بوو ئەگەر هنگی ئوممەت پێ هشیار ببا ڕوییێ دیرۆکێ دا ئێتە گوهاڕتن، بەلێ مخابن ئەو ئوممەتا ب (سلبییەتا صۆفییان) و (تەعەصصوبا مەزهەبییان) هاتییە بەنجکرن کەفتبوو خەوەکا گران لەو هزرکر ئەو گازییا دئێتە گوهان کابووسەکێ موزعجە دڤێت بێتە بێ دەنگ کرن!

شێخ موحەممەدی د ڤیا ب گازییا خۆ یا سەلەفی ئوممەتێ ل ڕاستییا ئیسلامێ هشیار بکەت، و بەرێ وان بدەتە مەنهەجێ کیتاب و سوننەتێ، ئەو دورست د ئیسلامێ بگەهن و دورست ب کار بینن، و ئەو نە ئێکەمین زانابوو دیرۆکا ئیسلامێ د ڤی مەجالی دا نیاسی، بەلکی گازییا وی هەر طایەک بوو ژ دارا وێ گازییێ یا ئیمام ئەحمەدی و ئبن تەیمیەی و گەلەکێن دی ب خوهـ و خوینا خۆ ئاڤدای.. بەلێ گەلەک لا هەبوون حەز دکر ئوممەت نڤستی بمینت؛ دا ئارمانجێن وان ب جهـ بێن، لەو ڤان لایان هەمییان دەستێن خۆ کرنە تێکدا و بوونە ئێک چەپەر دژی گازییا شێخی و بزاڤا وی یا خورت.

ل دەمێ شێخ هاتی و دەنگێ خۆ ب گازییا خۆ بلندکری دەولەتا ئۆسمانی بەر ب لاوازی و هلوەشیانێ ڤە دچوو، دەولەتێن ئۆرووپییان (و ب تایبەتی بریتانیا و فەرەنسا و رووسیا) بەرگەڕیان دکر ڕێکا هلوەشیانا ڤێ دەولەتێ خۆش بکەن، و خەون ب وێ ڕۆژێ ڤە ددیتن یا ئەڤ دەولەتە تێدا دمرت، و ئەو میراتێ وێ ل خۆ لێکڤە دکەن.. و چونکی گازییا شێخێ نەجدی ڕێکا چارەسەرکرنا وێ فسادا عەقائدی بوو یا دەولەتێ پشتەڤانی لێ دکر، و چونکی وان دزانی هەر جارەکا ئوممەت د گازییا شێخی هات، و ل ڕاستییا ئیسلامێ زڤڕی خەون و خەیالێن وان دێ خاڤ دەرکەڤن، وان بەرگەڕیان کر ئاستەنگان

بێخنە د رێکا ڤێ گازییێ دا؛ دا خەلک ل دۆران کۆم نەبن.. و ئەڤە یا غەریب نینە، بەلێ یا غەریب ئەو بوو دەولەتا خیلافەتێ ب خۆ ژی ب ڤێ گازییێ نەخۆش بوو و بۆ دیرۆک دڤێت بێتە گۆتن کو گونەها مەزن یا دوژمناتییا دەولەتێ بۆ ڤێ گازییا (إصلاحي) دکەفتە ستوییێ وان خودان شاشکێن مەزهەبپەرێس و طەریقەچی یێن سولطان وە تێ گەهاندی کو شێخ موحەممەد و هەڤالێن وی کۆمەکا دز و جەردەچییانە رێکێ ل خەلکی دگرن، و نەیارەتییا شێخ و وەلییان دکەن و دوژمنێن ئیمامێن مەزهەبانە، و ناهێلن کەس صلاوەتان بدەنە سەر پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-.. و هتد.

وەکی بەری هنگی ڤان رەنگە مرۆڤان بێبەختی ل (ئبن تەیمیەی) کری کو وی دڤێت ئنقلابەکێ ل سەر سولطانی بکەت، وەسا هندەکان گەهاندە سولطانێ ئۆسمانی ژی کو ئەڤ شێخە و هەڤالێن وی (حزبەکا سیاسینە) لێ دگەرێن دەولەتێ پارچە پارچە بکەن و ئوممەتێ ژێکڤە بکەن.

### بۆچی (وەهابی):

دا ئەڤ مرۆڤە پتر قەناعەتێ بۆ سولطانی و بۆ خەلکی ژی چێ بکەن کو شێخ و هەڤالێن وی جماعەتەکا جوداخوازن و گازییا وان گەفەکا مەزنە ل سەر ئیسلامێ، رابوون دو پێگاڤ د ڤێ دەلیڤەیێ دا هاڤێتن:

یا ئێکێ: وان ژ طەریقەچی و مەزهەبییان خواست کو دەست بدەنە نڤیسینا کتێب و نامیلکەیان دژی شێخی و گازییا وی، و تشتێ غەریب ئەو بوو ئەو کەسێن دژی شێخی کتێب نڤیسین کەس ژ وان ئەو نەبوو یێ رێزەکا ب تنێ ژی ژ کتێبێن شێخی خواندی یان د گەل وی روینشتی و دان و ستاندن د گەل کری! ودا ئەو خەلکی وە تێ بگەهینن کو شێخ موحەممەد خودانێ مەزهەبەکێ نوییە رابوون بەرگەریان کر دا ناڤەکی ل سەر وی و هەڤالێن وی بدانن و وان پێ بدەنە ناسین، چ ناڤ بدانن سەر؟

ئەگەر بێژنێ: (سەلەفی)، ئەڤە دێ بۆ وان بتە مەدح؛ چونکی مەعنا وێ ئەوە ئەو ل دویڤ (سەلەفێن) ئوممەتێ دچن، ئەگەر بێژنێ (موحەممەدی) نە کو هندەک هزر بکەن ئەو ل دویڤ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دچن، و ئەڤە ژی ل دلێ وان نائێت، گۆتن: یا باش ئەوە ئەم بێژینێ: (وەهھابی)، ئەڤ ناڤە یێ نوییە و ل بەر خەلکی دێ یێ غەریب بت، و ب ڕاستی دانانا ڤی ناڤی ژ لایێ وان ڤە ل سەر داخوازکەرێن تەوحیدێ و مەنهەجێ سەلەفی نیشانا بێفامییا وانە، ئەگەر نە.. ما بابێ شێخی (عەبدلوەهھابی) چ پەیوەندی ب گازییا وی ڤە هەیە؟

دەمێ دوژمنێن گازییا سەلەفی دیتی ڤێ پێگاڤێ چو پێڤە نەهات و بەر بەرە گازییا وی د ناڤ وەلاتێن موسلمانان دا یا بەلاڤ دبت و زانایێن ناڤدار یێن پشتەڤانییا وی دکەن، ئەو ترسان بزاڤێن وان سەری نەگرن، لەو وان پێگاڤا دویێ وان هاڤێت.

پێگاڤا دویێ: ئەو بوو وان سولطان وەسا تێ گەهاند کو بزاڤا (وەهھابییان) تەمەرڕودەکا سیاسییە ل سەر دەولەتێ، لەو دڤێت هێز د گەل وان بێتە ب کارئینان، و ئەو ب ئەزمانێ عسکەری د گەل وان باخڤن.. و ئەو بوو سولطانێ ئۆسمانی دەستویری دا والییێ خۆ ل مصرێ -زەلامێ فەرەنسا- کو دربەکێ عسکەری بوەشینتە (وەهھابی) یێن نەجدێ، و ئەو والییێ دوژمنێ سەرێ دەولەتێ و هەڤالێ نەیارێن دەولەتێ ژ ئۆروویپییان د گاڤێ دا فەرمانا سولطانی ب جهئینا، و پشتی لەشکەرێ وی (یێ سەرکەفتی!) زڤڕییە مصرێ ئنگلیزان نینەرێ خۆ (فورستر سادلیر) هنارتە مصرێ دا پیروزباهییا دەولەتا ئنگلیزان بگەهینە لەشکەرێ مصرێ، ما نە تەڤنەکێ غەریبە؟!

دیرۆک ڤەدگێرت کو ئیبراهیم پاشایی دەمێ هێرشا خۆ کرییە سەر وەلاتێ نەجدێ و حجازێ وی هندەک جۆقێن مۆسیقی و تیاترۆ د گەل خۆ برن و دەمێ وی فەرمان دای هندەک زانایێن سەلەفی یێن وەکی شێخ سولەیمانێ کوڕێ

عەبدللاهێ کورێ شێخ موحەممەدی بێنە کوشتن، وی ژ جۆڤێن خۆ یێن مۆسیقی خواست ئەو موسیقێ د بەر را لێ بدەن؛ دا پتر کەربێن وان ڤەکەن!

هەژی گۆتنێیە کو: دوژمنێن گازییا شێخی ب ڤان هەر دو هێرشێن خۆ ڤە -یا هزری و لەشکەری- نەشیان وێ دووماهییا دلێ وان دخوازت بۆ ڤێ گازییێ بدانن، بەلکی رۆژ بۆ رۆژێ ڤێ گازییێ بەر ژ خۆ دا، حەتا ئەو رۆژ هاتی یا کارتێکرنا وێ یا ئیجابی گەهشتییە هەمی لایێن جیهانا ئیسلامی، و ئەو بوویە هێڤێنێ وان هەمی گازییێن چاکساز یێن پشتی هنگی ل جیهانا ئیسلامی سەر هلداین.

## مەلا سەعیدێ نوورسی
## زەلامێ باوەرییێ ل دەمێ تەنگاڤییێ

د نڤیسینەکێ دا ئەو بەحسێ خۆ دکەت و دبێژت: ((من رێکا رزگارکرنا باوەرییا جڤاکێ دا دنیایا خۆ هەمی گۆریکر، هەمری ژییێ من ل مەیدانا شەڕی، ل زینندانێن ئێخسیرییێ، ل دادگەهێن دەولەتێ دەرباسبوویە.. نەخۆشییەک نەمایە من نەدیتی، د دادگەهێن لەشکەری دا وان وەکی مێرکوژەکی سەرەدەری د گەل من کر، ژ جهەکی بۆ جهەکێ دی ئەز هاتمە نەفیکرن، د زینندانێن دەولەتێ دا ئەز ب هەیڤان هاتمە ڤەشارتن و ژ دیتنێ هاتمە قەدەغەکرن، چەند جاران ئەز هاتمە ژەهردان، گەلەک رەنگێن زۆردارییێ ل من هاتنەکرن، هندەک دەم ب سەر من دا دهاتن من مرن تێدا هزار جاران ژ ژینێ پتر دڤیا.. خولقییەتا من زۆرداری و سەرشۆڕی قەبویل نەکر، وان دڤیا ئەز سەری بۆ دوژمنەکێ خوینوار بچەمینم، بەلێ من قەت سەرێ خۆ ل بەر وی شۆڕ نەکر، زۆردەستی و خوینخوارییا وی من ددا بەر رویێ وی)).

ئەو مرۆڤێ خودێ یێ ڤێ جارێ مە ل بەرە بەحس ژێ بکەین، پتر ژ سیه و پێنج سالان ژ ژییێ خۆ هاتبوو گرتن و نەفیکرن، خۆ پشتی ئەو مری ژی دوژمنێن وی ژێ دتەنا نەبوون لەو وان بڕیار دا وی ژ قەبرێ وی بیننەدەر و ببەن ل جهەکێ وەسا ڤەشێرن کەس ڤێ نەکەڤت.. خۆ پشتی مرنا وی ژی ئەو ژێ دترسیان!

جارەکێ ژ جاران گاڤا ئەو هاتییەگرتن ب گونەها داخوازا ب کارئینانا شریعەتی، ئەو ل دادگەهەکا لەشکەری هاتە ئامادەکرن، بەری ببتە دۆرا مەحکەما

وی، دادگەهێ بڕیارا قنارەکرنا پازدە هەڤالێن وی دا، پاشی ئەو هاتە گازیکرن، سەرۆکێ دادگەهێ گۆتێ: تە ژی دڤێت شریعەت بێتە ب کارئینان؟

پاشی وی گەف ب سێدارەدانێ لێ کرن، و مافێ ئاخفتنێ دایێ، ئەو ڕابووڤە و وی گۆت: ((ئەگەر من هزار ڕح هەبن ئەز قەت دودل نابم کو وان گۆری ڕاستییەکا ب تنێ بکەم ژ ڕاستییێن ئیسلامێ، بەری نوکە من گۆتبوو: فەقییەکم، داخوازکەرێ زانینێمە، لەو هەر تشتەکێ هەبت ئەز ب تەرازییا ئیسلامێ دکێشم، ژ بلی ئیسلامێ ئەز ئعتیرافێ ب چو تشتەکی ناکەم، ئەز گەلەک ب لەزم ل ئاخرەتێ، و هەر نوکە ئەزێ ئامادەمە د گەل وان بچم یێن هەوە سێدارە بۆ چکلاندین.. حوکمەتا مە ئەڤرۆ نەیارەتییا ژینا مە دکەت، و ئەگەر حوکمەت ئەڤە بت هەر بژیت ديناتی، هەر بژیت مرن، و بۆ زۆرداران هەر بژیت جەهنەم)).

پشتی وی گۆتنا خۆ ب دووماهی ئینای و بەری دادگەهـ بڕیارەکێ د دەر حەقا وی دا بدەت، مرۆڤ ب هزاران ل دۆر ئاڤاهییێ دادگەهێ کۆمبوون و هەمییان ب ئێک دەنگ گازی کر: ((بۆ زۆرداران هەر بژیت جەهنەم)).

هنگی حاکم نەچاربوو وی بەردەت..

ئەڤ زەلامێ بیر و باوەران یێ کو ل دەمێ تەنگاڤییێ هاتی و د فێرگەها ئیسلامێ دا بوویە خزمەتکارێ قورئانێ و ڕزگارکەرێ ئیمانێ، سەیدایێ مەشهوور مەلا سەعیدێ کوردییە، یێ ب ناڤێ (بەدیعوززەمان) مەلا سەعیدێ نوورسی هاتییە نیاسین، ڤێجا ئەڤ چیایێ خۆگۆڕیکرنێ کی بوو، و سەرهاتییا وی د گەل دوژمنێن دینی چ بوو؟

### بەدیعوززەمان کی بوو:

* ل ویلایەتا بدلیسێ، ل قەزایا هیزانێ، ل گوندێ نوورسێ، و ل بهارا سالا ١٢٩٣ مشەختی (١٨٧٣ ز) و د ناڤ مالەکا کوردا هەژار دا مەلا

سەعیدێ نوورسی هاتبوو سەر دنیایێ، بابێ وی میرزایێ کورێ نووری بوو، مرۆڤەکێ دیندار و رێنجبەر بوو.

* دەمێ ژییێ وی بوویە نەهـ سال، برایێ وی یێ مەزن مەلا عەبدللاهی ژێ خواست ئەو قەستا مزگەفت و مەدرەسەیێن دینی بکەت دا ببتە فەقی، و ل بەر دەستێن سەیدایان فێری خواندن و نڤیسینێ ببت، و ژ بەر کو ئەو هەر ژ زارۆکینییا خۆ مرۆڤەکێ بیرتیژ و تێگەهشتی بوو د دەمەکێ کێم دا وی نێزیکی نۆت مەتنان ژبەرکرن.

* دەست و دارێ خواندنێ ل مەدرەسێن فەقییان، و شێوەیێ هلبژارتنا کتێبێن رێزێ ل وی دەمی ب تمامی ب دلێ وی نەبوو، وی دگۆت: هندەک ژ ڤان علمێن دئێنە خواندن نوکە دبێ مفانە، یان مفایێ وان کێمبوویە، و بەرانبەر وێ چەندێ هندەک علمێن دی هەنە زانینا وان ئەڤرۆ یا بوویە تشتەکێ فەر، ژ بەر ڤێ چەندێ وی خواندنا خۆ ب رەنگەکێ جودا برە سەری، و ژ بەر زیرەکییا وی یا زێدە ئەو شیا وان کتێب و علمێن فەقی د چەند سالێن درێژ دا دخوینن ب دەمەکێ کێم خلاص بکەت، و دووماهییێ وی ئیجازا خۆ ژ مەلا محەمەدێ جەلالی وەرگرت ل بایەزیدێ.

* پشتی وی ئیجازە وەرگرتی ئەو ل گەلەک گوند و باژێرێن کوردستانێ گەریا، و وی ژ نێزیک بەرێ خۆ دا سەر و بەرێ جڤاکی و علمی و حەتا یێ سیاسی ژی یێ خەلکی، و رۆژ بۆ رۆژێ بۆ وی پتر ئاشکەرابوو کو ڤی مللەتی ئێشەکا گران هەیە دڤێت بێتە چارەکرن، ئەو ژی ئێشا نەزانین و ژێکڤەبوون و هەژارییێیە، و ئەو ل وێ باوەرێ بوو کو پشکەکا مەزن ژ ڤێ گونەهێ دکەفتە ستویێ مەزن و زانایێن کوردان. ژ بەر ڤێ چەندێ هێژ سەیدا یێ جحێل وی گەلەک دان و ستاندن د گەل مەزن و زانییێ کوردان دکر، و داخواز ژ وان کر ئەو ل ڤی مللەتی خودان دەرکەڤن، و کاری بۆ چارەکرنا دەردێ وان بکەن، بەلێ بەرەڤاژی وێ چەندێ ئەو هەردو جوین ل وی بوونە نەیار.

* دەمێ ژیێ وی بیست و ئێک سال والیێ مێردینی ئەو نەفیکرە بدلیسێ ژ بەر کو وی ب ئاشکەرا بەحسێ خەلەتییێن وی دکر و ژێ دخواست ئەو ل خۆ بزڤڕت.. ل بدلیسێ وی دەست دا خواندنا هندەک علمێن نوی وەکی کیمیا و فیزیا و جیۆلوچیا.. و هتد، و پشتی هنگی دەمێ ئەو چوویە وانێ ژی وی گەلەک دان و ستاندن د گەل شێخ و مەلایان دکرن و ژ وان دخواست ئەو پشتەڤانییا وی بکەن بۆ ئاڤاکرنا مەدرەسەیەکێ بۆ فەقییان کو ل سەر هندەک بناخەیێن نوی بێتە ئاڤاکرن، خواندن تێدا ب زمانێ عەرەبی و تورکی و کوردی ژی بت، و زانینێن نوی و (عەصری) لێ بێنە خواندن، و ل شوینا شێخ و مەلایێن کورد پشتەڤانییا وی بکەن ئەو ڕابوون نەیارەتییا وی کر و ل نک مەزن و کاربدەستان گازندە ژ وی کرن، ب هێجەتا هندێ کو وی دڤێت ئوصوولا مەدرەسەیان خراب بکەت، و مایێ خۆ د سیاسەتێ بکەت!

* ئارمانجا وی ئەو بوو زانینگەها مەزن ب ناڤێ (مەدرەسەیا زەهرائێ) ل کوردستانێ ئاڤا بکەت ململانێ د گەل زانینگەها ئەزهەرا مصرێ بکەت، و وی دگۆت: ڤێ مەدرەسەیێ دڤێت سێ چەقێن خۆ هەبن: بنگەهـ ل وانێ بت و چەقەکێ وێ ل دیاربەکرێ و ئێک ل هەکاری بت، و دەمێ ئەو ژ مەلا و مەزنێن کوردان بێ هیڤی بووی کو هاریکارییا وی د ڤێ چەندێ دا بکەن، وی ل سالا ١٩٠٧ قەستا ستەنبۆلێ کر، و ئەڤ پرۆژەیێ خۆ یێ علمی پێشکێشی سولطان عەبدلحەمیدێ دویێ کر، و وەک گەفەک وی د نڤیسینا خۆ دا بۆ سولطانی گۆت: ئەگەر ئەڤ مەدرەسە ل کوردستانێ ڤەنەبت، و خەلک ژ نەزانینێ نەئێتە ڕزگارکرن تشتێن مەزن دێ چێ بن! بەلێ هندەک کسان خۆ گەهاندە سولطانی و ئەو وە تێگەهاند کو مەلا سەعید مرۆڤەکێ دینە.. ل سەر بناخەیێ گۆتنا وان سولطانی بڕیار دا ئەو ل خەستەخانەیا دینان بێتە دانان و چارەکرن!

* پشتی حزبا (ئتتحاد و تەرەقی) شیای سولطان عەبدلحەمیدی لادەت، و حوکمێ دەولەتێ یێ (فعلی) بێختە دەستێ خۆ، و کاری بۆ هندێ بکەت کو

شریعەتی هێدی هێدی ژ ژیانا خەلکی دەربێخت، ل سالا ۱۹۰۹ فەرمان ب گرتنا سەیدای هاتەدان ب هێجەتا هندێ کو ئەو کاری بۆ هندێ دکەت حوکم ب شریعەتی بێتەکرن، و فەرمان ب قنارەکرنا وی هاتەدان، بەلێ -وەکی بەری نوکە ژی مە ڤەگێڕای- وان ژ ترسێن خەلکێ سەرهلدای دا بڕیارا خۆ گوهاڕت و سەیدا بەردا..

* پشتی ئەو ژ سولطانی و دەولەتێ ژی بێ هیڤی بووی، ئەو ل سالا ۱۹۱۱ زڤڕی کوردستانێ، و هەر جهەکێ ئەو چووبایێ وی مللەت پالددا کو ئەو داخوازا ئازادی و مافێن خۆ یێن شەرعی بکەن، و ل ڤی دەمی وی کتێبا خۆ (ڕاچێتا کوردان) نڤیسی و وەکی ژ ناڤی دیار ئەو د ڤێ کتێبێ دا بەحسێ دەر و دەرمانێ جڤاکا کوردان دکەت.

* ناڤ و دەنگێن وی ل کوردستانێ هەمییێ بەلاڤبوون، و ئەو وەک (بەیعوززەمان) و (مەلا سەعیدێ مەشهوور) هاتە نیاسین، و ل ڤێ قووناغێ ژ ژیانا خۆ ئەوا وی ب خۆ ناڤێ (سەعیدێ کەڤن) ل سەر دانای وی زێدە مایێ خۆ د سیاسەتێ دا دکر، و وی پشکداری د هژمارەکا کۆمەلە و ڕێکخستنێن سیاسی یێن کوردی دا کر، هەر وەسا وی ب نڤیسینێن خۆ یێن کوردی و ترکی پشکداری د چەند ڕۆژنامەیێن کوردی دا کرو نڤیسین و گۆتنێن وی هەمی ل دۆر هندێ بوون کو دڤێت کورد ژی وەکی هەر مللەتەکێ دی مافێ خۆ بستینن و ب ئازادی ل سەر عەردێ خۆ بژین، و وی گەلەک (تەئکید) ل سەر هندێ دکر کو ئەڤ ئازادی و سەربەستییە دڤێت د چارچووڤەیێ شریعەتێ خودێ دا بت.

* دەمێ شەڕێ جیهانی یێ ئێکێ ڕویدای سەیدای د گەل هژمارەکا شاگردەیێن خۆ پشکداری تێدا کر، و ئەو د گەل لەشکەرێ ئۆسمانی ل چەپەرێ بەرانبەر رووسان ڕاوەستیان، و ل ڤی دەمی وی کتێبا خۆ (إشارات الإعجاز) ب زمانێ عەرەبی نڤیسی کو تەفسیرەکا درێژە بۆ هندەک ئایەتێن دەسپێکێ ژ سوورەتا (البقرة)، و د ڤی شەڕی دا ئەو ژ لایێ لەشکەرێ ڕووسان ڤە هاتە

گرتن، بەلێ پشتی مانا وی ل ئێخسیرییێ چەند هەیڤەکان، ئەو شیا خۆ خلاص بکەت، و بێتە باژێرێ ستەنبۆلێ.

* پشتی (مصطەفا کەمال) و هندەک کەسێن وەکی وی هاتینە پێش و هێدی هێدی حوکمێ وەلاتی کەفتییە دەستان، و وان کار بۆ هندێ کری دەولەتێ بەر ب بێدینییێ ڤە ببەن، و ب ڕەنگەکێ ڕەسمی دەولەتا ئۆسمانی هلوەشینن و ل سەر شوینوارێن وێ دەولەتەکا نوی یا قەومی و بێدین ئاڤاکەن، سەیدای هەمی هێز و شیانێن خۆ دژی ڤان کەسان ب کارئینان، و ئاشکەرا دان و ستاندن د گەل وان کرن، و خەلک ل هندێ هشیارکرن کو ڤێ دەستەکا نوی دڤێت دکتاتۆورییەتەکا نوی ب ناڤێ (مەدەنییەتێ) ل سەر خەلکی ب جهـ بینن و دین و دنیایا خەلکی خراب بکەن.. و پشتی دەمەکی و ل دەسپێکا سالێن بیستان دا سەیدای بڕیار دا شێوەیێ خۆ د بەرهنگارییێ دا بگوهۆڕت، و قووناغا (سەعیدێ نوی) دەست پێ بکەت، ئەو سەعیدێ ئارمانجا خۆ کرییە گوهۆڕینا سیاسەتێ دویر ژ سیاسەتێ! و ڕزگارکرنا باوەرییێ ژ وان هێرشێن دژوار یێن بێ باوەر پێ ڕادبن.

* ل ڤی دەمی سەیدا زڤڕی کوردستانێ، و خۆ ژ سیاسەتێ دا پاش، و کارێ خۆ کرە بەلاڤکرنا ڕاستییێن قورئانێ د ناڤ خەلکی دا. پشتی تێکچوونا سەرهلدانا شێخ سەعید ل سالا ١٩٢٦ دەولەتا ترکان بڕیار دا شێخ و زانا و ماقویلێن کوردان هەمییان بگرت و نەفی بکەتە ڕۆژئاڤایا وەلاتی، ئەگەر خۆ وان پشکداری د سەرهلدانێ دا نەکر بت.. و مەلا سەعیدێ نوورسی ئێک ژ وان زانایان بوو یێن ڤێ بڕیارێ ژێ گرتی، و هنگی ژیانا وی یا گرتن و نەفیکرن دەست پێ کر، و حەتا ڕۆژا دووماهییێ ژی ژ یانا وی ما..

* ل سەری وان ئەو نەفیکرە باژێرێ (بارلا) ل ویلایەتا (ئسپارطایێ)، هەشت سال و شەش هەیڤان ئەو ما ل وێرێ، پاشی ئەو ژ لایێ دەسهەلاتێ ڤە هاتە گونەهبارکرن ب ئاڤاکرنا کۆمەلەکا نهێنی یا کاری بۆ گوهۆڕینا دەسهەلاتێ

دکـەت، و داخـوازا ب کارئینانـا شـریعەتی دکـەت، و د ئـەنجام دا وان بڕیـار دا سەیدا بێتـەگرتن و هنـارتن بـۆ گرتیخانـەیا (ئەسـکی شـەهرێ) و هـەر چەنـدە وان نەشیا ئەو چو دەلیلان ل سەر گۆتنا خۆ بینن ژی بـەلێ وان سـەیدا یـازدە هـەیڤان گرت.

* پشـتی دەرکـەفتنا وی ژ گرتیخانـەیێ بڕیـار هاتـەدان ئـەو ڤێ جارێ بـۆ باژێڕێ (قەستەموونی) بێتە نەفیکرن، ل باکۆرێ ئەنادۆلێ، و ئەو هەشت سالان ل وێرێ ما ل ژێر مانا ب کوتەکی (إقامة جبرية)، و زێرەڤانییا دژوار ژی ل وی هاتەکرن، پشتی بۆرینا حەفت سالان جارەکا دی فـەرمان ب گرتنـا وی هاتـەدان، پاشی بڕیارا ڤەگوهاستنا وی بۆ باژێڕێ (ئەمیرداغێ) ل نیڤا ئـەنادۆلێ هاتـەدان، و پشتی دەمەکی حوکمەتێ فەرمان ب گرتنا وی دا و ڤێ جارێ بیست هـەیڤان ئـەو ل بـاژێڕێ (ئـافیوونێ) هاتـەگرتن، و ڤـێ جـارێ پتـر ژ هـەمی جـاران وان نەخۆشی گەهاندێ.. هنگی ژیێ وی حەفتێ و دو سـال بـوون، د گـەل هنـدێ ژی وان ئەو ب تنێ هاڤێتـە د زیندانـەکا پیس و تـەنگ دا، و ڕۆژێ ژ پرتـەکا نـانێ ڕەق و دو پـەرداغێن ئـاڤێ پێڤـەتر تشـتەک نـەددایێ، و پتـر ژ جـارەکێ وان بەرگەڕیانا ژەهردانا وی کر، بەلێ هەر جار خودێ ئەو دپاراست.

* پشـتی بۆرینـا سـالەک و هەشـت هـەیڤان د سـەر گرتنـا وی ڕاپارتییـا دیمۆقراتی ل تورکیا هاتە سەر حوکمی، و وان نەخۆشی چەندەکێ ل سەر سـەیدای سڤککر، و فەرمان لێ کر ئەو ل باژێڕێ ئسپارطـایێ ڕوینت.

* حەتا بەری مرنا خۆ ب چەند ڕۆژەکێن کێم سەیدا ل ڤی بـاژێڕی بـوو، و ل سالا ١٣٧٩ مشـەختی (١٩٦٠ ز) دەمێ ژیێ وی حەشتێ و چـار سـال، وی داخواز ژ هندەک هەڤالێن خۆ کر ئەو هاریکارییا وی بکەن و وی بزڤڕینە وەلاتـێ وی؛ ژ بەر کو وی دڤیا دەمێ ئەو دمرت ئەو ل وەلاتێ خۆ بت، هەڤالێن وی ئەو ب دزی ڤـە ژ ئسپـارطـایێ دەرێخسـت و بـەر ب کوردسـتانێ ڤـە ئینـا، و گاڤـا حوکمەتێ زانی سەیدا نەمایە ل باژێڕی وان ب ڕێکا رادیـۆیێ ئاگەهداری دان کـو

هەر جهەکێ ئەو لێ بت دڤێت بزڤرتە ئسپارطایێ، بەلێ شاگردە و هەڤالێن وی گوهدارییا حوکمەتێ نەکر، و ب چی حالێ هەی وان ئەو گەهاندە بازێرێ ئورفایێ، ل وێرێ حوکمەت پێ حەسیا و هندەک پولیس هنارتنێ، وی گۆتە پولیسان: ((هوین یێ من دبینن کانێ ئەز یێ د چ حالی دا، ئەز یێ هاتیم دا ل ڤێرێ بمرم، ڤێجا بەلایا خۆ ژ من ڤەکەن))، و گاڤا خەلکێ ئورفایێ ب هاتنا وی حەسیاین هەمی هاتنە وێ ئوتێلێ یا ئەو لێ و گۆتن: ئەم قەبویل ناکەین سەیدا ژ بازێرێ مە بێتە دەرێخستن.. ل ڤی جهی و ل شەڤا بیست و حەفتێ هەیڤا رەمەزانێ (بەرانبەر ٢٣ ئاداری) سەیدا د مەلکەکا ئوتێلێ ڤە ل بازێرێ ئورفایێ چوو بەر دلوڤانییا خودێ، و ل وی جهێ دبێژنێ: دەرییێ ئیبراهیم خەلیل، ئەو هاتە ڤەشارتن.

* پشتی ڤەشارتنا سەیدای ب نێزیکی چار هەیڤان حوکمەتێ بریار دا جەنازەیێ وی ژ قەبری بێتە دەرێخستن، و برن دا ل جهەکێ نەنیاس بێتە ڤەشارتن.

* ژ گۆتنێن سەیدای یێن ناڤدار یێن کو وی ل بەرانبەر دادگەهێ گۆتین: ((ئەز ل سەرێ چیایێن کوردستانێ یێ مەزنبوویم، کەربا هەوە ژ من چو فایدەی نادەت، ئەز نە بۆ مەعاشەکی هاتیمە ڤێرێ دا هوین وی ژ من ببرن، ئەزێ هاتیم دا خزمەتا گەلێ خۆ بکەم، ڤێجا هوین چ دکەن بکەن)) و جارەکا دی وی گۆت: ((کانێ چەند موی ب سەرێ من ڤە هەنە، ئەگەر من هند رح هەبن، و هەر رۆژ هوین رحەکێ ژ وان ژ من بستینن ئەز سەرێ خۆ یێ من گۆری قورئانێ کری بۆ هەوە ناچەمینم)).

* سەیدا ب چار ئەزمانان یێ زانا بوو: کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی، و پترییا نڤیسینێن وی ب عەرەبی و تورکی بوون، و هندەک گۆتارێن وی ب کوردی ژی هەنە، و ناڤدارترین بەرهەمێ وی ئەو کۆما نڤیسینانە یا ب زمانێ ترکی و د چار بەرگان دا ب ناڤێ (ریسالەیێن نوور) هاتییە چاپکرن،

ژ بلی هـژمـارەکا کتێبان یێن وی ل قووناغـا (سەعیدێ کەڤن) نڤیسین، کو ب زمانێ عەرەبی و ترکینە ل دۆر هژمارەکا مژاران.

**جهـ و دەمێ سەیدا لێ ژیای:**

دەولەتا ئۆسمانی ئەوا سەیدای نیڤا ئێکێ ژ ژیێ خۆ ل بەر سیبەرا وێ بۆراندی، ب ناڤێ ئیسلامێ دئاخفت، و خۆ ب بەرەڤان ژ ئیسلامێ دنیاسی، ل دوسەد سالێن دووماهیێ ژ ژیێ خۆ تووشی گرفتاریەکا مەزن بووبوو، و ژ بەر گەلەک ئەگەران ئەو رۆژ بۆ رۆژێ بەر ب هلوەشیانێ ڤە دچوو، و ل وی دەمێ ئەڤ دەولەتا بەرفرەهـ تێک دچوو دەولەتێن ئەورۆپی ب دلەکێ خۆش ڤە بەرێ خۆ ددا ڤێ چەندێ و خوزی رادهێلان کو ئەو رۆژ بێت یا ئەو هەرفاندنا ڤێ دەولەتێ تێدا دبینن؛ دا هەر ئێک ژ وان خۆ د پارچەیەکا میراتێ وێ وەرکەت.. مە گۆت: وان خوزی رادهێلان، بەلێ وە نەبت بێتە هزرکرن کو ئەو ل وەلاتێن خۆ رحەت و تەنا درووینشتیبوون و چاڤەرێ یی وێ رۆژێ دکر یا دەولەتا ئۆسمانی تێدا دکەڤت، نەخێر! هەر کارەکێ خرابێ هەبا وان د رێکا نەیارەتییا ڤێ دەولەتێ دا دکر.

دەمێ دەولەتا ئۆسمانی ل سەر هێزا خۆ، دەولەتێن ئۆرووپی هەمییان سەرێن خۆ ل بەر مەزنییا ڤێ دەولەتێ شۆر دکر، و ئەو ژ ترسێن ڤێ دەولەتێ دا ل مالێن خۆ رحەت نەدبوون.. گاڤا ئەڤ دەولەتە گەهشتییە پیراتییێ دەولەتێن ئەورۆپی یێن گەنج رابوونە سەر خۆ و کارێ خۆ کر دا کەریا هندە سالان دارێژن.

سال هاتن و سال چوون، ئەو چێبوو یا خودێ حەزکری و مە د کتێبێن دیرۆکێ دا خواندی، ئوممەتا ئیسلامێ لاوازبوو و هێدی هێدی ژ راستییا ئیسلامێ دویرکەفت، و پارچە پارچە بوو، و گەلەک کەس یێن ل سەر ڤێ ئوممەتێ دهاتنە هژمارتن بوونە دوژمنترین کەس بۆ ئوممەتێ، و ل وی دەمێ رۆناهییا ئیسلامێ کز دبوو تارییا جاهلییەتا ئۆرووپا یا نوی بەلاڤ دبوو و

ب هێز دکەفت، حەتا ڕۆژەک هاتی سەرکێشییا دنیایێ کەفتییە دەستان..
ل ڤێرێدو ڕاستی هەنە پێتڤییە موسلمانێ ئەڤرۆ خۆ لێ هشیار بکەت؛ دا نەکەفتە د خەلەتییێ دا:

یا ئێکێ: ڕاستە شارستانییا ئۆرووپی یا نوی ژ لایێ علمی و ماددی ڤە زێدە یا پێشکەفتییە، بەلێ ژ لایێ دینی و رووحی و ئەخلاقی ڤە ئەو شارستانییەکا جاهلییە؛ چونکی ئەو ل سەر بناخەیێ خودێ نەناسی و دین دوژمنییێ یا ئاڤاکرییە، و نیاسین خودێ یا دورست و دینێ وی یێ ڕاست چو پشک و بار تێدا نینە، بەلکێ وێ حەتا خوڕستی و فیطرەتا مرۆڤی ژی دەرنشیفکرییە.

ڕاستییا دوێ: هێزا دەولەتێن ئۆرووپی پەیوەندییەکا بەرەڤاژی ب هێزا ئوممەتا ئیسلامێ ڤە هەیە، ئۆرووپییێن هەڤچاخ ب پێشکەفتن و سەرکەفتنێن خۆ یێن ماددی گەلەک خاپاندییێن مە وە تێ گەهاندینە کو ئۆرووپی ب خوڕستییا خۆ ئوممەتەکا شارستانی و پێشکەفتییە، و هەما ئەو ب کێر سەرکێشییا کاروانێ مرۆڤینی و شارستانییێ دئێت. بەلێ هەر کەسەکێ ب دو چاڤێن ڤەکری دیرۆکا وان بخوینت دێ زانت ئەڤە درەوەکە وان بۆ خۆ چێکری، و ل دەمێ پێشکەفتنا خۆ یا ماددی ئەم تێگەهاندین.

فەرە موسلمانێ مە ئەڤرۆ باش بزانت کو پێشکەفتنا ئۆرووپییان یا ماددی ژ بلی کو ئەو ل سەر بناخەیێن شارستانییا ئیسلامی یا هاتییە ئاڤاکرن، وێ پەیوەندی ب نفشێ چو ملەتان ڤە نینە، و ئەو ژ (خاصییەتا) چو کەسان نینە، و هەر ملەتەکێ ئەگەرێن پێشکەفتنا ماددی ب کار بینت دێ پێشکەڤت.

ل بەر سیبەرا پێشکەفتنا ئۆرووپییان موسلمان تووشی (شکەستنەکا نەفسی) یا مەزن بوون، ئەو شکەستنا ڕێ بۆ گەلەک نەخۆشییێن دی ل بەر مە ڤەکری، وەکی:

- داگیرکرنا لەشکەری، پاشی یا ڕەوشەنبیری پەیدابوو.

- د ئەنجامێ ڤـێ چەنـدێ دا (ئیلحـاد) و (بێدینییـەکا) مـەزن ب نـاڤێ زانین و پێشکەفتن و مەدەنییەتێ پەیدابوو.

- و ب ڤـێ چەنـدێ ئیسـلام د چـاڤێن (هنـدەک) ژ خـەلکێ مـە دا وەک تاوانبارەک هاتە دیتن، و وان هزرکر کو ئیسلام ئەگەرا پاشکەفتنا مەیە.

- بێ ئەخلاقی و سەربەردان ب ناڤێ سەربەستی و ئـازادییێ د نـاڤ مـە دا بەلاڤبوو.

- ژن بێ ستارە بوون پشتی کو زەلام بێ عار ماین.

- زۆرداری و (دکتاتۆرییـەتا سیاسـی) بـۆ شـەرتەکێ سـەرەکـی بـۆ وان دەسـهەلاتێن ب پشـتەڤانییا دەولـەتێن ئـۆروپی یـێن داگیرکـەر ل سـەر ستویێ موسلمانان هاتینە دانان..

د ئـەنجامێ ڤـێ شـێل و بێلییـێ دا ڕاسـتییا ئیسـلامێ ژ سـەرێ گەلـەک خەلکی هاتەدەر کانێ چاوا شریعەت ژ ژیانا گەلـەک ژ وان هاتـەدەر، و ل سـەر بناخەیێ ڤی واقعێ کرێت و خەلەت ل درێژی و پانییا جیهانا ئیسـلامی گەلـەک پارت و کۆمەل و دەولەت ل سەر بناخەیێ بێدینییێ هاتنە دورستکرن، و دەمـەک هات ب پشتەڤانییا ئۆروپییێن بێدین و داگیرکەر ئەڤ کۆمە هاتنە پێش و حوکم کەفتە دەستان، و ئێکەمین حزبا ب ڤی ڕەنگی حزبا ئتتیحاد و تەرەقی بوو ئـەوا ڕێ بۆ ئێکەمین دەولـەتا بێدین ل جیهانا ئیسلامی خۆشکری کـو کۆمـارا تـورکی بوو ئەوا ل سەر بناخەیێ توخمپەرێسی و بێدینییێ هاتییە ئاڤاکرن.

ل ڤی دەمی بارێ مرۆڤێن خودێ زێدە گرانبـوو؛ چـونکی یـا پێتڤـی ل سـەر وان ئەو بوو ئەو ب هەمی هێزا خۆ بەرگرییا ڤـی واقعی بکـەت یێ کـو بـۆ جـارا ئێکێیە د ناڤ موسلمانان دا پەیدا دبت، ڕاسـتە بـەری هنگـی جیهانـا ئیسـلامی پتر ژ جارەکێ تووشی شکستنێن لەشکەری بووبوو، و گەلـەک جـاران دوژمنـان هندەک جهـ حەتا یێ گرنـگ ژی ژ ڤـێ جیهـانێ داگیرکربـوون، و گەلـەک کـەس

کوشتبوون، بەلێ ئەڤە بۆ جارا ئێکێیە موسلمان تووشی شکەستنەکا نەفسی دبن، و ڕاستییا دینی د چاڤێن وان دا شێلی دبت، و ئەو ب ڕەنگەکێ کرێت پشتا خۆ ددەنە دینی و نەیارەتییا ڕەسەنییا خۆ دکەن.. مرۆڤێ خودێ یێ ئێکێ -ئەگەر نەبێژین یێ ئێکانە- کو بەرانبەر ڤێ بێدینییێ ڕاوەستای سەیدا بەدیعوززەمان مەلا سەعیدێ کوردی بوو.

سەیدا، هەر چەندە یێ دەستڤالا بوو ژ هەر هێزەکا ماددی، و چو کۆم و حزب و دەستەک د پشت وی ڕا نەبوون ژی، بەلێ ئەو ب هێزا خۆ یا رووحی و ب بێنفرەهییا خۆ بەرانبەر (طوغیانا) کەمالییان شیا ڕاوەستت، نەخۆشییەکا زێدە مەزن هاتە ڕێکا وی، بەلێ ڕۆژەکا ب تنێ ژی ئەو ژ گازییا خۆ سست نەبوو.. (پەیامێن ڕۆناهییێ) ئەوێن سەیدایێ نوورسی بەلاڤ دکرن دبەردەوام بوون د بەلاڤکرنا ڕۆناهییا باوەرییێ دا د سەر وان هەمی ئاستەنگان ڕا یێن بێ باوەران ددانانە د ڕێکێ دا.

نێزیکی پێنجی سالان ئەو د هەڤڕکییەکا بەردەوام دا بوو د گەل بێدینان، پتر ژ جارەکێ سەیدا ب گونەها داخوازکرنا ب جهئینانا شریعەتێ تاوانبار کر، و هندەک جاران دلێ وان چوویێ کو وی نەهێلن.

نێزیکی سیهـ و پێنج سالان وان سەیدا گرت و نەفیکر، بەلێ ئەو نەشیان وی بێ دەنگ بکەن، ل سالا ١٩٠٨ دەمێ دستوور د دەولەتا ئۆسمانییان دا هاتییە ڕاگەهاندن، و سولطان عەبدلحەمیدێ دویێ ژ دەسهەلاتێ هاتییە لادان، سەیدای د گۆتن و نڤیسینێن خۆ دا گەلەک (تەئکید) ل سەر هندێ کر کو دڤێت دستوور ب شریعەتێ ڤە یێ گرێدای بت، ئەگەر نە.. (ئستیبدادەکا) خرابتر ژ یا بەرێ دێ پەیدا بت.

دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو بۆ خەلکی هەمییێ دیاربوو کو داخوازکرنا دستووری ئەوا ب ناڤێ (مەشرووطییەتێ) دهاتە نیاسین، ئەو پەردەیێ تاری بوو یێ بێدینییێ خۆ د پشت ڕا ڤەشارتی، لەو گەلەک زانا هەر ژ سەری ترسا

خۆ ل سەر ڤێ چەندێ ئاشکەراکر، و سەیدا مەلا سەعید ئێک ژ وان زانایان بوو، ب تێگەهشتنا خۆ یا فرەهـ وی زانی کو کۆمەلا (ئتتیحاد و تەرەقی) ئەو خیڤەتە یا ماسوونییێن قنێت جوهی و توخمپەرێسێن تۆرانی ل بن کۆم دبن، لەو وی بڕیار دا پشکدارییێ د کۆما (ئتتیحادا موحەممەدی) دا بکەت و بزاڤەکا دژوار دژی ئتتیحادییێن بێدین دا بکەت.

ئتتیحادییان ئەڤ چەندە زانی، لەو وان ل سالا ١٩٠٩ سەیدا د گەل هژمارەکا هەڤالێن وی گرتن و بەرێ وان دا دادگەهەکا لەشکەری و پازدە ژ وان قنارەکرن.. سەیدای ل بەرانبەر دادگەهێ ب هەمی دەنگێ خۆ گازیکر: ((ئەز شانازییێ ب خۆ دبەم کو ئەز ئێک ژ وێ کۆمێ بم یا چارسەد ملیوون ئەندام تێدا، ئەو کۆما سەرۆکێ وێ (فەخرولکائینات) موحەممەد سلاڤ لێ بن..)).

ل جهەکێ دی سەیدا دبێژت: ((من ددیت حالێ کوردان ل کوردستانێ گەلەک یێ پەریشانە، و من باوەری هەبوو کو مەدەنییەتا مە ب ڕێکا زانین و هۆنەرێن نوی دێ پێک ئێت، و هەر وەسا من باوەری هەبوو کو ئەڤ هۆنەرە دڤێت ب ڕێکا مەدرەسەیان و ب دەستێن زانایان بێنە کوردستانێ دا کو ئەو زانین ل بەر کوردان کەهی ببن، چونکی سەرکێشییا کوردان هێشتا د دەست زانایێن دینی دایە، و ژ بەر ڤێ چەندێ ئەز هاتە (دار السعادە) ل وی دەمێ دکتاتورییەت گەهشتییە کلۆڤانکێ، و من ئەو هەمی بەلگەیێن پەیوەندی ب حالێ کوردستانێ ڤە هەین د گەل خۆ ئینان، و هیڤییا من ئەو بوو (سەعادەتێ) ب دەست خۆ ڤە بینم، و هەر چەندە ئەحکامێن دکتاتورییەتێ -ئەوێن نوکە بەلاڤبووین- هنگی هەمی د دەستێن سولتان عەبدلحەمیدی دا دکۆمکریبوون ژی بەلێ ئەو نەشیا کوتەکییێ ل من بکەت دا ئەز وان بەرتیلان قەبویل بکەم یێن وی داینە من دا ئەز پێشڤە خۆ بێ دەنگ بکەم، من هەمی پێشنیارێن وی لێ زڤڕاندن و عەقلێ خۆ کرە قوربان، بەلێ من ناڤێ مللەتێ خۆ کێم نەکر، و من خۆ بۆ وی نەچەماند.

ئەڤە سال و نيڤن ئەز ل ڤێرێ كارێ پێخەمەت بەلاڤكرنا زانينێ ل كوردستانێ دكەم، و وەكى بارا پتر ژ خەلكێ ستەنبۆلێ دزانت من دڤێت ئاشكەرا بێژمە هەوە: هەچييێ بڤێت من بگەهينتە خۆ ئەو دشێت ب ڤيانێ نە ب كوتەكييێ وێ چەندێ بكەت، و ئەز كورێ پالەيەكێ هەژارم و چو رۆژان من خۆ ب رەنگەكێ دى نەئينايە پێش، و من رێ نەدايە دنيايێ كو بچتە د دلێ من دا هەر چەندە ئەو گەلەك ب نك من ڤە دهات ژى، و من چيايێن كوردستانێ يێن بلند -كو ل بەر دلێ من ژ هەر جهەكێ دى د خۆشتڤيترن- هێلاينە بۆ هندێ دا ئەز مەصلحەتێن مللەتێ خۆ ب جهـ بينم، و ئەز ب وان كاران رابووم يێن بووينە ئەگەر كو بۆ خەستەخانەيا دينان بێمە هنارتن، پاشى كوتەكى ل من بێتەكرن كو ل گرتيخانەيا ئێكێ بمينم، پاشى پشتى ڤێ هەمييێ كو ل سەر دەمێ مەشرووطييەتێ ژى ئەز ل گرتيخانەيێ بێمە گرتن و گەلەك رەنگێن نەخۆشييێ ببينم، ڤێجا پشتى ڤێ هەمييێ ئەز ب تاوانێ ژى بێمە گونەهكاركرن؟)).

مەعنا: گونەها سەيداى يا مەزن ئەو بوو وى دڤيا شريعەتێ ئيسلامێ يێ حاكم بت، و ل ژێر سيبەرا حوكمێ شريعەتى مللەتێ كورد يێ مەحرووم ژى مافێن خۆ وەرگريت، و ئەڤە ئەو گونەهـ بوو يا ل بەر تورانييێن توخمپەرێس نەئێتە غەفراندن.

ل سالا ١٩٢٠ بەديعوززەمان د گەل مصطەفا كەمالى كەفتە دان و ستاندنەكا دژوار، سەرا نەنڤێژكرنا هندەك ئەندامێن پەرلەمانى، و ئەڤ هەڤركييە گەهشتە حەددەكى كو سەيدا ئەنقەرە بهێلت و بزڤريتە وانێ، هەر چەندە مصطەفا كەمالى دب تێ هەبوو وى ب لايێ خۆ ڤە بكێشت، و پێخەمەت ڤێ چەندێ پاشايى گۆت: ئەز دێ تە كەمە سەرۆكێ زانايێن رۆژهەلاتا ئەنادۆلێ و ئەندامێ سەرۆكاتييا زانينگەها (دار الحكمة)، و قەسرەكا مەزن ل ئەنقەرە دێ دەمە تە.. بەلێ سەيداى ئەڤ هەمييە نەڤيان، و هەڤالينييا وى ژى نەڤيا و

زڤڕی کوردستانێ و ل گوندەکی ژ گوندێن وانێ ئاکنجیبوو و بڕیار دا سیاسەتێ بهێلت، و ژیانەکا نوی دەست پێ بکەت.

ل سالا ١٩٢٥ دەمێ سەرهلدانا شێخ سەعیدی چێبووی، سەیدا ل گوندەکێ وانێ دویر ژ سیاسەتێ دژیا، و پشتی سەرهلدان تێکچوی دەولەتا تورکان یا نوی ئەوا ل سەر بناخەیێ توخومپەرێسییێ هاتییە ئاڤاکرن، بڕیار دا کوردستانێ ژ زانا و تێگەهشتی و خەباتکەران ڤالا کەت، چ ب رێکا کوشتنێ بت، یان ب گرتن و نەفیکرنێ بت، و سەیدا مەلا سەعید ئێک ژ وان کەسان بوو یێن هاتینە نەفیکرن.

بەرێ وی بۆ دەڤەرا ئسپارطایێ هاتەدان، و گونەها بەدیعوززەمانی وەکی یا هەمی زانایێن دی یێن کورد ئەو بوو وی دڤیا مللەتێ کورد یێ بێبار نەبت ژ مافێن خۆ یێن رەوا.

دەمێ سەیدای دیتی ئەو جمهوورییەتا ل سەر کاڤلێ ئۆسمانییان هاتییە ئاڤاکرن نە ب تنێ دەولەتەکا بێ دینە بەلکی ئەو دەولەتەکە نەیارا دینی ژی دکەت، وی خەما خۆ یا سەرەکی کرە ئەو ئەو بەرەڤانییێ ژ ئیسلامێ بکەت، و باوەرییێ رزگار بکەت، و ئەڤ چەندە ل دلێ مەزنێن دەولەتێ نەهات، لەو وان دەست دا دارێ زۆردارییێ و نەخۆشی ل دویڤ نەخۆشییێ بۆ سەیدای و شاگردێن وی چێ کر.

وەکی مە گۆتی: هەر ژ سالا ١٩٢٦ و حەتا سالا ١٩٦٠ سەیدا ل نەفییێ دژیا، و ل نەفییێ ب خۆ ژی گەلەک جاران ئەو دهاتە گرتن و مەحکەمەکرن ب هێجەتا هندێ کو ئەو یێ کارەکێ سیاسی دکەت، و وی دڤێت حزبەکا دینی چێ کەت دا ئنقیلابەکێ پێ بکەت.

هەر چەندە دەولەتێ باش دزانی کو ئەڤ هێجەتە یا بێ بناخەیە ژی بەلێ د گەل هندێ ژی وان تەنگاڤی ل سەر سەیدای سڤک نەکر، و سەیدای ژی ژ لایێ خۆ ڤە خەباتا خۆ د رێکا ئارمانجا خۆ دا سست نەکر.

ب راستی ئەو کارێ سەیدا پێ رابووی کارەکێ کێم و ب ساناهی ژی نەبوو، ل ژێر دەسهەلاتەکا زۆردار و دین دوژمن وی ب گۆتن و نڤیسین ژی دەنگێ خۆ ب گازییا ئیسلامێ بلندکر، چو هێز و لەشکەر ل پشتا وی نەبوو، ئەو مرۆڤەکێ ب تنێ بوو، ژ وێ جەمەدانییا د سەری و وی شەلوالێ دپییا پێڤەتر وی تشتەک ژ مالێ دنیایێ نەبوو.

وی دگۆت: کارێ من بەس ئەوە ئەز راستییا ئیسلامێ بۆ خەلکی دیار بکەم، و رۆناهییا قورئانێ نیشا خەلکی بدەم. و گەلەک جاران وی دگۆت: زەمان زەمانێ صوفیاتی و طەرقەتان نینە، زەمان زەمانێ رزگارکرنا باوەرییە. وی دزانی باوەری یا کەفتییە ژێر هێرشەکا دورندە ژ لایێ بێ دین و بێ باوەران ڤە، لەو دڤێت هەر کەس ژ لایێ خۆ ڤە باوەرییا خۆ رزگار بکەت.

بەری ئەم گۆتنا خۆ ل دۆر سەیدای ب دووماهی بینین، ئەز حەز دکەم هندەکێ ژ وێ گۆتنێ بۆ هەوە ڤەگێرم یا سەیدای ل سالا ١٩٤٤ ل بەرانبەر دادگەهێ گۆتی دەمێ دەولەتێ ئەو ب چێکرنا فتنێ گونەهبارکری ب رێکا نڤیسینا کتێبا (رسائل النور)، سەیدا دبێژت:

((حاکمێن هێژا: ئەز بۆ ڤێرێ یێ هاتیمە ئینان ب گونەها هندێ کو ئەز مرۆڤەکێ پاشکەفتیمە، من دڤێت دینی بۆ خۆ بکەمە رێک دا تەناهییا گشتی پێ تێک بدەم، و ئەز دبێژم: هندی شیانا کرنا کارەکییە مەعنا وێ ئەو نینە ئەو کار دڤێت بێتەکرن، یان جزار ل سەر بێتەدان، زلکێ شخاتێ دشێت خانییەکی بسوژت، بەلێ مەعنایا ڤێ شیانێ ئەو نینە تاوانەک یا هاتییەکرن. موژیلبوونا من ب زانینێن ئیسلامێ ڤە ب تنێ بۆ هندێیە دا خودێ ژ من رازی ببت، و نە بۆ تشتەکێ دی.

ب چ رەنگ هوین دێ شێن بزاڤا (رسائل النور) راوەستینن، و هندی ئەوە ب تنێ خزمەتەکە بۆ راستییێن قورئانێ، و قورئان راستییەکە ب عەرشێ خودێ ڤە یا گرێدایە، و ئەو کییە بشێت قۆچانێ بکەت دا ل بەرانبەر راستییەکا

گرێدای ب عەرشی ڤە ڕاوەستت؟ ئەز گەلەکێ عەجێبگرتیمە چاوا هندەک مرۆڤ بێنە تاوانبارکرن چونکی ئەو ڕاستییێن قورئانێ بۆ ئێک و دو دبێژن ب هێجەتا هندێ کو ئەو ب سیاسەتێ دئاخفتن و کۆمەلەیێن نهێنی چێ دکەن، ل وی دەمێ بۆ سەرداچوویەکێ وەکی دکتۆر دۆزی دورست بت بێبەختییان د دەر حەقا قورئانێ دا بکەت ب هێجەتا هندێ کو هەر کەسەکێ مافێ هەیە ب ئازادی هزر بکەت؟ ئەڤە ئازادییا بیر و باوەرانە ، بەلێ ڕۆناهییا قورئانێ تشتەکێ ب ترسە و سیاسەتەکا خرابە؟!

هوین دبێژن: جمهوورییەتا مە جمهوورییەتەکا علمانییە چو پەیوەندی ب دینی ڤە نینە، بەلێ ئەڤە هوین یێ ڕێ بۆ هەر کرێتییەک و تاوانەک و بێ ئەخلاقییەکێ ب ناڤێ ئازادییێ خۆش دکەن، و گاڤا هەوە گوهـ لێ بوو ئێکی ئایەتەک شرۆڤەکر هوین دێ ڤەجنقن و ب دەنگەکێ بلند بێژن: کۆمەلەیەکا نهێنییە، سیاسەتە، خەطەرە!

هوین باش بزانن ئەگەر هزار ڕح من هەبن ئەزێ ئامادەمە وان هەمییان گۆری دینێ خودێ بکەم، ب تنێ من تشتەکێ هەی ئەز خۆ پێ ژ هەوە بپارێزم، ئەو ژی ئەڤەیە: (حسبنا الله ونعم الوكيل)، هوین هێرڤە دئێن و هۆڤە دچن دبێژن: کریارێن من یێن دینی ڕێکەکە بۆ تێکدانا تەناهییێ، و ئەز دبێژم: ئەڤ گۆتنا هەوە ڕێکەکە بۆ نەهێلانا دینی ب ناڤێ پاراستنا تەناهییێ، باش گوهێ خۆ بدەنە من ئەی ئەو کەسێن هەوە دینێ خۆ دایە ب دنیایێ: چی تشتێ ژ هەوە دئێت بکەن، هیڤییا مە ئەوە ئەم سەرێن خۆ گۆری ڕاستییەکا ژ هەمییان بچویکتر ژ ڕاستییێن ئیسلامێ بکەین، هەردەم ئەم یێ ل هیڤییێ هوین مە قنارە بکەن، ئەڤ مانا ب ڤی ڕەنگی سەد جاران ژ مرنێ خرابترە..)).

# ئەو ژنێن
# مرۆڤاینییا خودێ هلبژارتی

دویر نینە هندەک کەس هەبن ژ ڤان ناڤ و نیشانان حێبەتی بمینن و پسیار بکەن: ئەرێ ما چێ دبت ژن ژی مرۆڤاینییا خودێ هلبژێرن و بگەهنە رێزا مرۆڤێن خودێ؟

ژن ئەوا د چاڤێن گەلەک نەزانان دا چێکرییەکا نزم و بێ بها، ژێدەرا خەلەتی و گونەه و سەرداچوونێ، چاوا دێ گەهتە پێکەکێ ب کێر هندێ بێت ئەم بێژینێ: مرۆڤا خودێ؟

هێشتا هندەک کەس هەنە ب ڤێ نزمییێ بەرێ خۆ ددەنە ژنێ، نە ژ بەر چو ب تنێ چونکی ئەو ژنە، لەو ئەڤ مرۆڤە د هەمی حسێبێن خۆ دا شاش دبن و هەمی راستییان دەرنشیف دکەن.. ڤێجا پێخەمەت دیارکرنا شاشییا ڤان رەنگە مرۆڤان مە خواست د ڤێ ناڤبرا تایبەت دا ئەم چەندەکێ ل دۆر وان ژنان باخڤین یێن مرۆڤاینییا خودێ هلبژارتی؛ دا بۆ هەر کەسەکی ئاشکەرا ببت کو رێکا مرۆڤاینییا خودێ ل بەر ژنێ ژی -وەکی مێری- یا ڤەکرییە. و هەر وەسا دا بۆ مە ئاشکەرا ببت کو هژمارەکا مرۆڤێن خودێ ژ زەلامان، ژ وان یێن ناڤ و دەنگێ وان د ناڤ خەلکی دا دبەلاڤ، ئەو بوون یێن ل سەر دەستێ هندەک ژنێن مرۆڤێن خودێ هاتینە پەروەردەکرن، حەتا رۆژەک هاتی ئەو شیاین بگەهنە وێ بلندییێ یا ئەو گەهشتینێ.

### د پشت هەر مەزنەکی را ژنەک هەیە:

ئیمام (سوفیانێ ثەوری) -ئەوێ بەری نوکە مە بەحس ژێ کری- ژنکەکێ ژ مرۆڤێن خودێ ئەو ل راستییا زوهدێ هشیارکر بوو، وەکی ژ ڤێ سەرهاتییێ

ئاشکەرا دبت: دەمێ سوفیانی ل بارێرێ کووفە دەست ب وەرگرتنا حەدیسێ کری دەیکا وی گۆتێ: کورێ من! بۆ خۆ بخوینە و بلا تە چ خەم نەبن، ئەز ب تەشییا خۆ دێ تە ب خودان کەم.. ئەی کورێ من! هەر جارەکا تە دەهـ حەرف خواندن بەرێ خۆ بدێ ئەگەر تو چو نەهاتبییە گوهارتن و چو ل تە زێدە نەبت، تو بزانە ئەوا تە خواندی چو مفا نەگەهاندییە تە. و وەسا چێبوو سوفیان ب تەشییا دەیکا خۆ هاتە ب خودانکرن، و ب شیرەتا وێ کر، حەتا رۆژەک ب سەر دا هاتی ئەو بوویە (أمير المؤمنين) د علمێ حەدیسێ دا.

ل جهەکێ دی سوفیان بەحسێ دەسپێکا خۆ دکەت و دبێژت: ((ژنەکا عیبادەتکەر ل کووفە هەبوو دگۆتنێ (بنت أم حسان)، رۆژەکێ ئەز چوومە مالا وێ، من دیت مالەکا خالییە ب تنێ حێسیلکەکا دریای لێ هەبوو، گاڤا من حالێ وێ دیتی من گۆتێ: تە هندەک پسمامێن زەنگین یێن هەین، ما ئەگەر تو داخوازێ ژ وان بکەی ئەو هندەک زەکاتا خۆ بدەنە تە چێتر نینە ژ ڤی حالی یێ تو تێدا؟ ئینا ئەو ل من زڤری و گۆت: ئەی سوفیان حەتا ڤێ دەلیڤەیێ تو د چاڤێن من دا گەلەک بووی، بەلێ ژ نوکە وێڤە تو د چاڤێن من دا هاتییە خوار.. ئەی سوفیان تو ژ من دخوازی ئەز دنیایێ ژ وان بخوازم یێن دنیا نە د دەستی دا؟ ب خودێ کەمە ئەز شەرم دکەم دنیایێ ژ وی بخوازم یێ دنیا د دەستان دا..)).

هنگی سوفیانی کرە گری، ژنکێ گۆتێ: ئەی سوفیان بێژە (الحمد لله)، وی گۆت: (الحمد لله)، وێ گۆت: تە حەمدا خودێ کر؟ وی گۆتێ: بەلێ، وێ گۆت: ڤێجا پێتڤییە تو شوکرا خودێ بکەی کو وی تەوفیقا تە دای حەتا تو حەمدا وی بکەی، سوفیانی گۆت: من شەرم ژ خۆ کر و ئەزمانێ من نەگەریا، و گاڤا من ڤیای دەرکەڤم وێ گۆتە من: ئەی سوفیان! تێرا مرۆڤی هەیە کو مرۆڤ یێ نەزان بت ئەگەر وی کەیف ب زانینا خۆ هات، و تێرا مرۆڤی هەیە کو مرۆڤ یێ زانا بت ئەگەر ئەو ژ خودێ ترسیا، ئەی سوفیان! تو بزانە هندی دلە

ژ کەفتنێ ڕزگار نابت حەتا هەمی خەمێن وی نەبنە ئێک خەم! سوفیان دبێژت: هەر جارەکا دبوو شەڤ ئەڤ ژنکە دا ڕابت دەست ب نڤێژێن شەڤێ کەت و بێژت: ئیلاهی! نوکە هەر ئێک و خۆشتڤییێ خۆ یێن ماینە د گەل ئێک، و ئەز یا مایمە د گەل تە ئەی خۆشتڤی. و گاڤا هندەکان گۆتبایێ پیچەکێ بۆ خۆ ڕازێ، ئەو دا بێژت: ڕازانا د قەبری دا تێرا من هەیە. سوفیان دبێژت: من بەرێ خۆ دا خۆ و بەرێ خۆ دا وێ من خۆ دیت ئەز چو نینم.

(بشر ئەلحافی) ئەوێ تەقوا گەهشتییە نک وی و ڕاوەستیای دبێژت: من تەقوا بۆ خۆ ژ خویشکا خۆ وەرگرتییە.. خویشکا وی ئەوا سەرهاتییەکا وێ د گەل ئیمام ئەحمەدی پشتی دەلیڤەیەکا دی دێ ڤەگوهێزین.

زاهدێ ئوممەتێ (عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی) حەتا مری ژی ب ژنکەکا خودان باوەر یێ داخبار بوو، جارەکێ وی ئەو ل مەکەهێ دیتبوو ئەو چل سال بوو ژ ئایەتێن قورئانێ پێڤەتر چو ئاخفتن ژ دەڤێ وێ دەرنەکەفت بوون، ئەو دترسیا گۆتنەکا خەلەت بێژت ڤێجا خودێ غەزەبێ لێ بکەت.

### ژن.. دەمێ دبتە مرۆڤا خودێ:

مرۆڤ -چ ژن بت چ مێر- دەمێ دگەهتە پێکەکا بلند د باوەرییێ دا، و دبتە مرۆڤێ خودێ، ڤیانا خودێ ب ڕەنگەکێ وەسا دکەفتە د دلی دا کو ژ خودێ پێڤەتر ئەو کەسێ دی نەبینت، و چونکی ئەو کەسێ دی نابینت ئەو ژ کەسێ دی ناترست، و مرن وی ژ حەقییێ پاشدا نابەت، ما نە خودێیە رزقی ددەت؟ ما نە ئەوە خۆشی و نەخۆشییێ ددەت؟

- بەلێ!

ڤێجا بۆچی ئەو هیڤییێ ژ ئێکێ دی بکەت، یان ژ ئێکێ دی بترست؟

فیرعەون، ئەوێ حەتا ئەڤرۆ ناڤێ وی بوویە نیشانا سەربڕین و ستەمکارییێ، زرتەکەک بوو ژ وی ڕەنگێ ژ خۆ نەدگرت زوی ب زوی ل سەر

عەردی ب ڕێڤە بچت، غورروورا وی و سەرشۆرییا مللەتێ وی ئەو گەهاندبوو هندێ کو ئەو هزر بکەت خودایێ بلندتر ئەوە، فیرعەونەکێ وەسا بوو مەڕییێن خەلکی کلیل کربوون، و نەدهێلا کەسەک بێی دەستوێرییا وی هزرێن خۆ بکەت یان خەونەکێ ببینت!

دەمێ خودێ ڤیای دفنبلندییا ڤی فیرعەونی دەرنشیف بکەت و لاوازییا وی بەرچاڤ بکەت ژنکەک ڤێرا بەردا.. کابانییا مالا وی (ئاسیایێ) کوفر ب خودێنییا وی کر، و بەرگرییا زڕتەکییا وی کر.

چاوا ئەو فیرعەونێ چیا دحەلینت، و بچویکا د زکێن دەیکێن وان دا دبزدینت ئەڤرۆ ژنکەک هەڤڕکییا وی بکەت و پێ ل بڕیارا وی بدانت؟ ئەڤە چێ نابت! فیرعەون ب هەمی ڕێکان هاتێ، و نەشیایێ.. طەماعکرنێ چو پێڤە نەهات، گەف و ترساندن یا ژ خۆ بوو، دووماهییێ وی بڕیار دا ئەو بێتە عەزابدان؛ دا بزانت کانێ هێزا فیرعەونی چەندە..

زەبانییێن فیرعەونی ئەو بر ل سەر خیزەکێ شاریای و ل بەر چاڤێ ڕۆژا ئاریای ڕازاند، دەست و پییێن وێ ب عەردی ڤە زنجیرکرن، جار ئاڤا کەلاندی لێ دڕەشاند و جار ژی ب پرچا سەری ڤە دهلاویست، کەڤر ددانانە سەر سنگی و یاری بۆ خۆ ب عەزابدانا وێ دکر، و ئەو هەر یا ب گرنژین بوو، ناڤێ خۆشتڤییێ وێ یێ ئێکانە ژ سەر ئەزمانی نەدچوو، (ئەللاهـ، ئەللاهـ) ئەو ئاوازێ شرین بوو یێ خەما وێ ل بەر وێ سڤک دکر، دووماهییێ دەمێ عەزاب ژ هێزا وێ دژوارتر لێ هاتی، بەرێ وێ ما ل عەسمانی و دلێ وێ د گەل ئەزمانێ وێ یێ ژ بەر عەزابێ گرانبووی دگۆت: خودایێ من! تو خودانێ منی، تو ئاڤاهییەکی بۆ من ل نک خۆ د بەحەشتێ دا ئاڤا بکە، و من ژ فیرعەونی و کارێ وی ڕزگار بکە. و خودێ داخوازا وێ ب جهئینا، و ڕحا وێ ستاند، و ئەو ژ ناڤ لەپێن زەبانییێن فیرعەونی ئینادەر، و سەرهاتییا وێ بۆ خودان باوەران ڤەگێڕا و کرە نموونەیێ خۆگۆریکرنێ.

جارەکا دی ژی مرۆڤەکا خودێ د گەل ڤی فیرعەونی ب هەڤرکی چووبوو:

کچا فیرعەونی خدامەک هەبوو هەر جار کارێ وێ دکر، رۆژەکێ دەمێ خدامێ سەرێ وێ شە دکر، شەیێ وێ ژ دەستان کەفت وێ گۆت: ب ناڤێ خودێ.. کچکێ گۆتێ: بابێ منە خودێ؟ خدامێ گۆتێ: نە! ئەللاهـ خودایێ منە و خودایێ بابێ تەیە، کچکێ گۆت: دێ بۆ تە بێژمە بابێ خۆ، وێ گۆت: بێژێ.. دەمێ فیرعەونی ب مەسەلا وێ زانی گەلەک تەنگاڤبوو، چاوا دێ چێ بت دینێ مووسایی رێکا خۆ ل مالا من ببینت؟ دڤێت ئەو تشتەکێ وەسا بکەت هەیبەتا خۆ بکەتە د سەرێ خەلکی را؛ دا کەسەکێ دی چاڤ ل خدامێ نەکەت، فیرعەونی بریار دا خدامێ ب عەیال ڤە بۆ وی بینن، چەند دەلیڤەیەک بوون خدام هاتە ئامادەکرن، فیرعەونی پسیار ژێ کر، وێ راستی نەڤەشارت و گۆتێ: من باوەری ب خودێ ئینایە، هندی هاتێ خدام لێڤە نەبوو، فیرعەونی گۆت: مەنجەلەکا مەزن بینن تژی زەیت بکەن و بداننە سەر ئاگرەکێ بۆش، پاشی وان ژنک ئینا و وان گۆتێ: یان دێ لێڤە بی یان ژی دێ کورێ تە ل پێش چاڤێن تە هاڤێینە د مەنجەلێ دا.. وێ گۆت: ئەز لێڤە نابم، وان کورێ وێ هاڤێتە د مەنجەلێ دا و د گاڤێ دا گۆشتێ وی حەلیا، پاشی عەیالەکێ وێ یێ دی ئینا و گۆتێ: دێ لێڤە بی یان ڤی ژی بهاڤێژینە د مەنجەلێ دا؟ وێ گۆت: ئەز لێڤە نابم، ئینا وان ئەو ژی هاڤێتە د مەنجەلێ دا و سۆت، و ب ڤی رەنگی وان عەیالێ ژنکێ هەمی سۆت، و دەمێ دۆرا وێ هاتی و بەری وێ ژی بهاڤێنە د مەنجەلێ دا وێ گۆتە فیرعەونی: داخوازەک ب تنێ من ژ تە هەیە.. وی گۆت: بێژە، ژنکێ گۆت: ئەگەر تە ئەز ژی کوشتم هەستیکێن من و عەیالێ من پێکڤە ڤەشێرە!

## خۆگۆریکەرا ئێکێ:

دتا نەئێتە هزرکرن کو ئوممەتا ئیسلامێ ژ ڤان نموونەیێن خۆگۆریکرنێ یا بێبارە، کەرەم کەن د گەل ڤان نموونەیان:

مالەک هەبوو ژ سێ مرۆڤان پێک دهات: دەیک و باب و کورەک، دەمێ رۆناهییا ئیسلامێ بەلاڤبووی وان هەر سییان دلێن خۆ بۆ ڤەکرن، و گەهشتنە ناڤ رێزا مرۆڤێن خودێ، دوژمنێن خودێ گەلەک ب ڤێ چەندێ تەنگاڤبوون، رابوون کەربا خۆ هەمی دارێتە سەر خەلکێ ڤێ مالا بچویک و هەژار و کەیفخۆش، هێرشەکا درندە دا سەر مالێ، هەر ئێک ب لایەکی ڤە بر، پاشی هەر سێ ل جهەکی کۆمکرن و دەست ب عەزابدانا وان کر، و هندی عەزابەکا دژوار بوو هەر بێن بێنە ئێک ژ وان دلگرتی دبوو.. و عەدەتێ پێغەمبەری بوو -سلاڤ لێ بن- هەر رۆژ جارەکێ دا د بەر وی جهی را چت یێ ئەڤ خێزانە لێ دهاتە عەزابدان، دلێ وی بۆ دحەلیا و چو پێڤە نەدهات، گاڤا دهاتە راستا هەر سییان و ئەو د ڤی حالی دا ددیتن ب نک وان ڤە سەح دکر و دگۆت: ((صبرا آل یاسر، فإن موعدکم الجنة)) ئەی بنەمالا یاسری صەبرێ بکێشن، ژڤانێ هەوە بەحەشتە.

ئەگەر ئەو د دنیایێ دا هەوە بژالە کەن، خودێ ل بەحەشتێ دێ هەوە گەهینتە ئێک.. ئەگەر هەوە بڤێت بەرێ خۆ بدەنە خێزانەکا خەلکێ بەحەشتێ بەرێ خۆ بدەنە خێزانا یاسری: یاسرێ کورێ عامری، و ژنکا وی سومەییایا کچا خەییاطی، و کورێ وان عەممار. بابێ و کورێ نوکە دێ هێلین و دەلیڤەیێ دێ بۆ دەیکێ خۆش کەین؛ دا بزانین کانێ چاوایە دەمێ ژن بەرپەرێن خۆگۆریکرنێ تۆمار دکەت..

فیرعەونێ ڤێ ئوممەتێ (ئەبووجەهلی) ڤیا سەرهاتییا برایێ خۆ فیرعەونی کەڤن دووبارە بکەتەڤە، و ئەو ژی قەهرەمانییا خۆ ل سەر سەرێ ژنەکا بێ دەسهەلات ب کار بینت، فەرمان دا سومەییا ل سەر خیزێ شارییای بێتە درێژکرن، و دەست و پییێن وێ ب عەردی ڤە بێنە گرێدان، شیان سەر و چاڤێن وێ ب ئاسنێ سۆرکری داخ کەن و ب ئاڤا کەلاندی بسوژن، بەلێ پا نەشیان دلێ وێ داگیر بکەن.. رۆژەکێ فیرعەونێ ئوممەتێ گۆتێ: خەبەران بێژە

موحەممەدی وخودایێ وی. وێ چو پێڤە نەهات دەست و پییێن وێ دگرێدای بوون، لەو دەڤێ خۆ تژی تف کر و سەر و چاڤێن ئەبوو جەهلی پێ تەڕکرن، و ئەگەر دەستێن وێ هنگی دڤەکری بان، دویر نینە وێ دەستێ خۆ دابا پاش و شەقەکا وەسا تێ وەراندبا سەرێ وی هژیابا؛ دا بەلکی عەقلەک هاتبایێ! ئەبوو جەهلی دەست دا ڕمەکی و ل پێش چاڤێن کوڕێ وێ و زەلامێ وێ دربەکێ وەسا دانایێ ڕحا وێ بلندکرە بەحەشتێ..

ئەڤە ئێکەمین بەرپەرێ خۆگۆریکرنێ بوو د دیرۆکا ئیسلامێ دا ب دەستێ ژنەکا خودان باوەر هاتییە تۆمارکرن، و ئێکەمین مرۆڤی ژ ئوممەتا موحەممەدی ڕحا خۆ پێشکێشی دینێ خودێ کری سومەییا بوو.

ئەی خودانێن بەرێخۆدانا نزم بۆ ژنێ ڤێ ڕاستییێ باش بزانن!

**نموونەیێن بژارە:**

ژن ژی -وەکی زەلامی- گاڤا بوو ئێک ژ مرۆڤێن خودێ دنیا ب هەمی خۆشییێن خۆ ڤە نشێت پێ بەستێ ل دلێ وێ بکەت، یان ئێکا هند ژێ چێ کەت کو ئەو کەسەکێ دی ژ بلی خودێ ببینت..

گەلەک ژن هەنە ئەم دبینین ژ بەر کێم باوەرییا وان گاڤا مالخۆیێ وان دمرت، ئەو ژ هەمی دلێ خۆ هزر دکەن کو ئێدی خلاص دەرگەهێ رزقی ل وان هاتەگرتن، لەو دێ بتە لاڤلاڤا وان، بۆ ڤان توخمە ژنان ڤان سەرهاتییێن کورت دێ ڤەگێرین:

١- ل سەر دەمێ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- دەمێ موسلمان ژ غەزایەکێ زڤڕین، ژنکەکا موسلمان چوو بەراهییا لەشکەری پسیارا زەلامێ خۆ کر کانێ یێ ب سلامەتە یان نە؟ گاڤا زانی یێ شەهیدبووی، هندەک ژنکان -هەر وەکی بۆ جەڕباندن- گۆتێ: ئەڤە مالخۆیێ مالا تە چوو، کی دێ تە ب خودان کەت؟ ژنکێ گۆتە وان: ب خودێ من ئەو نەنیاسییە (رازق) من ئەو یێ نیاسی خورا.

یەعنی: نە ئەو بوو رزق ددا مە، خودێ بوو ئەو چەندە دکر، و ئەگەر ئەو مر و چوو خودێ یێ مای و نامرت: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ٢٢ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ٢٣ ﴾ (الذاريات: ٢٢-٢٣) مرۆڤێن خودێ باوەرییەکا موکم هەیە کو ئەوێ رزقی ددەت ب تنێ خودێیە، و نە کەسێ دییە، لەو ئەو قەت خەما رزقی ناخۆن.

٢- (حاتەمێ ئەصەم) ناڤەکێ گەشە ل عەسمانێ زوهدێ، و نێزیکە بێژین ئەو و زوهد د دیرۆکا ئیسلامێ دا دو پەیڤن بۆ ئێک رامانێ.. ئەڤی حاتەمی سالەکێ کرە دلێ خۆ بچتە حەجێ، و دەمێ وی ئەڤ داخوازا خۆ بۆ خەلکێ مالا خۆ ڤەگێڕای وان گۆتێ: چوونا حەجێ ب هەیڤان ڤەدکێشت و گاڤا تو چووی ئەم دێ مینینە بێ خودان، تو دێ مە بۆ کێ هێلی؟ کچەکا حاتەمی هەبوو ژ بابێ خۆ فێری زوهدێ بووبوو، وێ گۆت: بهێلن بلا ئەو بچت، رزقێ مە د دەستێ وی دا نینە.

حاتەم چوو، هەچی تشتێ د مال دا هەی عەیالێ وی خوار حەتا چو نەمای، ئینا هەمییان گازندە ژ کچکێ کرن و گۆتێ: ئەگەر تو نەبای بابۆ نەدچوو، ئەڤە ئەم مانە برسی، کی دێ پارییەکێ نانی دەتە مە؟

ڤان گۆتنێن وان کچک تەنگاڤ کر، ئینا وێ دەستێن خۆ سەرئەڤرازکرن و هەوارێن خۆ گەهاندنە خودێ: یا ڕەببی! تو من شەرمزار نەکە، تویی رزقی ددەی تو د هەوارا مە وەرە.. وێ ڕۆژێ میرێ باژێری د بەر خانیکێ وان ڕا بوری، گازی زەلامەکێ خۆ کر: کانێ هندەک ئاڤێ بۆ من ژ ڤێ مالێ بینە ئەزێ تێنیمە. پشتی ئاڤ بۆ وی ئینای، میری پسیارکر: ئەڤە مالا کێیە؟

هندەکان گۆت: مالا حاتەمێ ئەصەمە، میری ناڤ و دەنگێن حاتەمی و زوهدا وی گوهـ لێ بووبوون، لەو وی ڤیا سەرا حاتەمی بدەت، و گاڤا وی قەستا مالێ کری زانی حاتەم یێ چوویە حەجێ و کەس نەمایە چاڤێ خۆ بدەتە مالا وی، ئینا میری ئەو پارێن زێڕی یێن ڤێ هەین هەمی هاڤێتنە بەر عەیالێ

حاتەمی و گۆتە هەڤالێن خۆ: هەچییێ ئەز بڤێم دێ وێ کەت یا من کری، وان ژی چاڤ ل میری کر و زێڕێن خۆ دانانە وێرێ و چوون.

کەیفەکا مەزن بۆ عەیالێ حاتەمی چێبوو، گاڤا کچا حاتەمی ئەڤ چەندە دیتی کرە گری، دەیکا وێ گۆتێ: تە خێرە؟ کچکێ گۆت: دادێ ئەز ژ بەر هندێ یا دگریم ئەڤە عەبدەک بوو بەرێ خۆ دا مە ئەم زەنگین بووین، ڤێجا پا دێ چاوا بت ئەگەر خودێ بەرێ خۆ بدەتە مە؟

٣- سەرهاتییا دەیک و بابێن عەبدللاهێ کوڕێ موبارەکی بەری نوکە مە ڤەگوهاستبوو، و بۆ مە ئاشکەرا بوو کانێ چ زوهد بوو ئەو گەهاندییە ئێک، و بۆ پتر مفا ل ڤێرێ دێ دوبارەکەینەڤە:

موبارەک مرۆڤەکێ ترک بوو، قەدەرێ بۆ وی حەزکر بوو ئەو ببتە عەبدێ مرۆڤەکێ هەمەدانی یێ دەولەمەند، ئەڤی مرۆڤی بیستانەکێ تێر دار و بار و خودان بەرهەم هەبوو، لەو وی فەرمان ل عەبدێ خۆ موبارەکی کربوو کو حەرەسییێ ل ڤی بیستانی بگرت.. ڕۆژەکێ زەلامێ هەمەدانی چوو ناڤ بیستانی و گۆتە عەبدێ خۆ:

- هنارەکا شرین بۆ من بینە.

ئەو چوو هنارەک بۆ کر و ئینا، گاڤا خودانی هنار شکاندی و تام کرییێ دیت یا ترشە، ئینا وی ب عێجزی ڤە گۆتێ: من گۆتبوو تە هنارەکا شرین بۆ من بینە نە یا ترش!

ئەو چوو هنارەک ژ بنەکا دی کر و بۆ سەییدێ خۆ ئینا، پشتی سەییدی تام کرییێ ئەو ژی ترش دەرکەفت، ئینا لێ حەیتاند و گۆتێ: دیارە تو ترشی و شرینی ژێکجودا ناکەی؟ ئەزێ دبێژمە تە هنارەکا شرین.. ئەو چوو هنارەکا دی ئینا ئەو ژی ترش دەرکەفت، عەقل د سەرێ خودانی نەما، گۆتێ:

- تو نابێژییە من مەسەلا تە چیە؟

مویارەکی ب ئەدەبەکێ زێدەڤە گۆتێ: ل من نەگرە، ب ڕاستی ئەز نزانم کیژ بن یا شرینە و کیژ یا ترشە!

زەلامی باوەر نەکر.. گۆتێ: ما تە تام نەکرییە هناران؟

وی گۆت: نەخێر.. تە ئەزێ دانایمە بەر بیستانی دا حەرەسییێ لێ بگرم و تە دەستویری نەدایە من کو ژێ بخۆم.

خودانێ بیستانی ژ گۆتنا وی حێبەتی ما، و چەند ڕۆژەکان زێرەڤانی لێ کر دا بزانت کانێ گۆتنا وی یا ڕاستە یان نە، و پشتی ڕاستییا گۆتنا وی بۆ خودانێ بیستانی ئاشکەرابووی ئەو د چاڤێن وی دا مەزن بوو، و ئنیەتەک کرە دلێ خۆ.. ڕۆژەکێ چوو ناڤ بیستانی و ل نک مویارەکی ڕوینشت و گۆتێ: من کچەکا هەی گەلەک کەسان یا خواستی، تو بێژی ئەز وێ بدەمە کێ؟

مویارەکی گۆتێ: ل جاهلیەتێ بەرێ خەلکی ل مالبات و مالمەزنان بوو، و جوهییان بەرێ وان ل زەنگینییێ بوو، و فەلان بەرێ وان ل جوانییێ بوو، و بەرێ ڤێ ئوممەتێ یێ ل دینی.

زەلامێ هەمەدانی زڤڕی مال و سوحبەتا عەبدێ خۆ بۆ ژنکا خۆ ڤەگێرا، و گۆتێ: ژ مویارەکی پێڤەتر کەس ب کێر کچا مە نائێت..

وی مویارەک ئازاکر و کچا خۆ دایێ، و چونکی کۆمبوونا وان بۆ خودێ بوو نەبوو چو تشتێن دی، خودێ بەرەکەت هاڤێتە ڤێ کۆمبوونێ و عەبدللاهێ کوڕێ مویارەکی بەرهەمێ ڤێ دارا پیرۆز بوو..

٤- کانێ چاوا مرۆڤاینییا خودێ ئێکا هند ژ خودانی چێ دکەت کو ئەو -د ڕێکا خودێ دا- ب کەیف خۆ بهاڤێتە د ئاگری دا، وەسا ئەو خودانی وە لێ دکەت کو ڤیانا پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- د سەر هەر تشتەکی ڕا ببینت:

ل ڕۆژا ئوحودێ دەمێ ئەو ب سەرێ موسلمانان هاتی یا هاتی، کافران کرە دەنگ کو وان پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- یێ کوشتی، منافقان ئەڤ سوحبەتە

گەهاندە مەدینێ، ئەنسێ کورێ مالکی دبێژت: رۆژا ئەم ژ شەرێ ئوحودێ زڤرین ژنکەکا ئەنصاری هاتە بەراهییا مە؛ دا پسیارا مرۆڤێن خۆ بکەت، و گاڤا وێ زانی کو باب و کور و برا و زەلامێ وێ هەمی یێن هاتینە شەهیدکرن وێ گۆت: بێژنە من حالێ پێغەمبەری چیە؟

هندەکان گۆتێ: یێ باشە ئەڤیە د گەل مە. وێ گۆت: کانێ نیشا من بدەن.. و گاڤا ئەو هاتییە راستا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەز ب دایباب ڤە گۆری تە بم ئەی پێغەمبەرێ خودێ! پشتی تە هەر موصیبەتەکا هەبت یا سڤکە، هندی تو یێ ساخ بی ئەز خەما تشتەکی ناخۆم.

٥- دڤێت ژ بیر نەکەین کو هەر ل رۆژا ئوحودێ دەمێ تەنگاڤی ل سەر موسلمانان دژواربووی، و گەلەک خودان باوەر هژیاین و سەرێن رێکا ل بەر بەرزە بووین، و هندەکان شیرێن خۆ داناین و گۆتین: ما شەرکرنا مە بۆچیە مادەم پێغەمبەر -سلاڤ لێ بن- هاتە کوشتن؟ هنگی کتەکا کێم ژ خودان باوەران کو ب تبلێن دەستی دهاتنە هژمارتن ل سنگێ شەری بوون و ل دۆرێن پێغەمبەری بووبوونە مەتالەکێ پیلایی دا چو نەخۆشی نەگەهنێ، ئێک ژ وان نوسەیبایا کچا کەعبێ ئەنصاری بوو، ئەوا ل وێ رۆژێ سێزدە برین کەفتینە لەشی.. نوسەیبایێ ل مەیدانا شەری کورێ خۆ عەبدللاهـ دیت یێ بریندارە و خوین یا ژ برینا وی دزێت، ب نک ڤە چوو برینا وی گرێدا و گۆتێ رابە شەری بکە!

٦- هندا کچا عوتبەی ئەوا ل رۆژا ئوحودێ دەمێ دیتی شکەستن کەفتە ناڤ رێزێن لەشکەرێ قورەیشییان پاشپاشکی رەڤی و قێژی و هاوارێن وێ و هەڤالێن وێ دگەهشتنە عەسمانی، پشتی مرۆڤاینییا خودێ هلبژارتی و هاتییە د ئیسلامێ دا د گەل لەشکەرێ موسلمانان چوو شەرێ یەرمووکێ، گاڤا وێ دیتی شەر دژواربوو و کوشتنەکا مەزن کەفتە ناڤ رێزێن موسلمانان، دارێ خیڤەتێ هلکێشا و گۆتە هەڤالێن خۆ ژ ژنکێن موسلمانان ئەوێن ل پشت لەشکەری: وەرن دا د هەوارا موسلمانان بچین.. ب ستوینا خیڤەتێ!!

## ژن و عیبادەت و ترسا ژ خودێ:

مرۆڤێن خودێ -وەکی گەلەک جاران مە گۆتی- هەر تشتەکێ دنیایێ دەمێ ئەو دبینن بێهنا مرنێ ژێ سەح دکەن.. یەزیدێ رەققاشی دبێژت: ((ئەگەر تە پێ خۆش بت بەرێ خۆ بدەیە خۆشییێن دنیایێ، وەرە دا بۆ تە بێژم: د گەل جەنازەکی دەرکەڤە ئەها دنیا هەمی ئەوە، و هەر گاڤ قەبرەکی د گەل خۆ هلگرە، نە ئاخا وی، هزرا وی..)).

١- عەفیرا ژنەکا خودێناس بوو، هند عیبادەت دکر خەلکی ناڤێ وێ کربوو (عەفیرایا عیبادەتکەر)، رۆژەکێ هندەک مرۆڤان گۆتێ: دوعایان بۆ مە ژ خودێ بکە، وێ گۆت: ئەگەر گونەهکار لال ببان پیرا هەوە هەر نەدشیا باخڤت، بەلێ پا خودێ خودانێ قەنجییان ئەمرێ مە گونەهکاران کرییە کو دوعایان ژێ بکەین، خودێ جهێ هەوە بکەتە بەحەشت و مرنێ قەت ژ بیرا هەوە نەبەت!

دبێژن: جارەکێ برازایەکێ عەفیرایێ ژ سەفەرەکێ زڤڕی، هندەک چوونە نک دا مزگینییێ بدەنێ، وێ کرە گری، وان ب مەندەهۆشی ڤە گۆتێ: ئەڤرۆ رۆژا کەیف و خۆشییێیە ڤێجا ئەڤە چ گرییە؟ وێ گۆت: ئەز ب خودێ کەمە هندی بیرا ئاخرەتێ د دلێ من دا هەبت کەیف جهێ خۆ ل نک من نابینت، هاتنا برازایێ من بیرا من ل وێ رۆژێ ئینا دەمێ ئەم بۆ نک خودێ دئێینەبرن، ڤێجا وێ رۆژێ یێ ب کەیف و یێ ب خەم ژێکجودا دبن.

٢- هەر تشتەکێ هەی بیرا وان ل مرنێ دئینتە ڤە، لەو ب شەڤ و رۆژ ئەو لەزێ ل خێران دکەن، ریاحێ قەیسی ئێک ژ وان مرۆڤان بوو یێن کو ب شەڤ و رۆژ عیبادەتێ خودێ دکر، جارەکێ وی ژنەک بۆ خۆ ئینا.. گۆت: ئەز دێ وێ جەرببینم کانێ ئەو چ ژنە؟ ل شەڤەکێ وی خۆ د خەو بر، ل چارێکا ئێکێ ژ شەڤێ ژنک رابوو دەست ب نڤێژان کر و گازی زەلامێ خۆ کر، گۆتێ: هلۆ نڤێژان بکە، وی گۆت: باشە دێ رابم، و رانەبوو.. گاڤا بوویە نیڤا شەڤێ

جارەکا دی گازی کرێ، وی گۆتێ: باشە، و ڕانەبوو، ل دووماهییا شەڤێ جارەکا دی ژێ خواست ئەو ڕابت عیبادەتی بکەت، بەلێ ئەو ڕانەبوو، ئینا وێ ریاح هژهژاند و گۆتێ: شەڤ بۆری و عیبادەتکەرێن قەنجیکار جڤاتێن خۆ دانان و هێشتا تو یێ نڤستی یی، هەوار ئەڤە کی بوو تو ل من کرییە بەلا؟

٣- حەبیبێ عەجەمی ژی ژنەک هەبوو ب شەڤێ بۆ کرنا عیبادەتی ئەو هشیار دکر و دگۆتێ: ڕابە، شەڤ بۆری، و ڕێکەکا دویر یا ل بەرا تە هەی، زادەکێ کێم تە یێ هەی، و کاروانییا بەری مە یا ڕاکری و ئەم یێن هێلاین..

٤- ڕۆژەکێ ژنکەک هاتە مالا ئیمام ئەحمەدی و دو پسیار ژێ کرن، گۆتێ: ئەز ژنکەکم تەشی درێسم، هندەک جاران ب شەڤێ چرایێ من ڤەدمرت ئەز ل بەر تاڤە هەیڤێ تەڤنێ خۆ درێسم، ئەرێ ڕۆژا د دویڤ ڕا دەمێ ئەز تەڤنێ خۆ دبەمە بازارێ دا بفرۆشم ما ئەز بێژمە بکڕی ئەڤە ل بەر چرایی من یێ چێکری و ئەڤە ل بەر تاڤە هەیڤێ؟

ئیمامی گۆتێ: ئەگەر ل نک تە جوداهییەک د ناڤبەرا هەردو تەڤنان دا هەبت دڤێت بۆ دیار بکەی. وێ گۆت: ئەی ئیمام! ئەگەر مرۆڤێ نساخ بنالت ما ئەڤە دێ بتە گازندە ژ خودێ؟

ئیمامی گۆت: هیڤییا من ئەوە ئەو ببتە گازندە بۆ خودێ نە گازندە ژ خودێ.. پشتی ئەو ژنک ژ مالا ئیمامی دەرکەفتی ئیمامی گۆتە کوڕێ خۆ: من گوهـ لێ نەبوویە مرۆڤەک ڤان ڕەنگە پسیاران بکەت، کانێ ب دویڤ ڤێ ژنکێ دا هەڕە و بزانە کانێ دی چتە کیژ مالێ.. عەبدللاهێ کوڕێ ئیمامی دبێژت: ئەز ب دویڤ دا چووم من دیت ئەو چوو مالا (بشر ئەلحافی) من پسیارا وێ کر، گۆتن: ئەو خویشکا بشرییە، گاڤا ئەز زڤڕیمە نک بابێ خۆ و من گۆتییێ: ئەو خویشکا بشری بوو، وی گۆت: من دزانی ئەڤ ژنە دڤێت خویشکا بشری بت.. و ئەڤە ئەو بوو یا بشری دگۆت: من زوهد یا بۆ خۆ ژێ گرتی.

# فاطمایا کچا عەبدلمەلکی
# خاتوینا بنەمالا ئومەیيەی

بازێرێ دیمەشقێ، پایتەختا حوکمدارییا بنەمالا ئومەیيەی، ل رۆژا ئەینییێ دەهی هەیڤا صەفەرێ ژ سالا نۆت و نەهێ مشەختی، د حالەتەکێ نە یێ طەبیعی دا دژیا، ل بەر سنگێ مزگەفتا مەزن ئەوا دکەفتە نیڤا بازێری و پشتی هنگی ب ناڤێ مزگەفتا ئەمەوی هاتییە نیاسین، قەرەبالغەکا مەزن هەبوو، زەلامێن دەولەتێ و میرێن بنەمالا خەلیفەی ژ برا و برازا و پسمامێن وی هەمی تێک دهاتن و تێک دچوون، پشتی ل بازێری بەلاڤبووی کو سولەیمانێ کورێ عەبدلمەلکی خەلیفێ ئومەوی یێ حەفتێ یێ نساخە، نێزیکە بازێر ژ حەرەکێ و هاتن و چوونێ یێ ڤالا بت، چونکی حەرەکا بازێری هەمی کەفتبوو حەوش و بەر دەرێ (قەسرا کسک) ئەوا دکەفتە بەر قیبلا جامعا ئومەوی، کۆچکا قەسرێ یا تژی ئەمیر و قائدێن لەشکەری و زەلامێن دەولەتێ بوو، هەر ئێک ل جهەکی یێ رووینشتی بوو و گوهێ وی ل دەرێ وێ مەزەلێ بوو یا خەلیفە تێڤە کانێ چ دەنگ و باسێن نوی دێ ژێ ئێن، چونکی دیعایەتەک ب دزی ڤە دهاتە بەلاڤکرن کو خەلیفە یێ د سەکەراتێ دا.

ل لایێ دی یێ قەسرێ ژی، ل جهێ ژنکان، هژمارەکا نە یا کێم ژ ژنکێن بنەمالا ئومەیيەی کۆمبووبوون، و گوهێ وان ژی ل سەر دەنگ و باسێن نوی یێن خەلیفەی بوون، وان وەسا د خۆ دئینادەر کو ئەو ب خەمن ژ بەر خەلیفەی و دترسن ئەو ژ ڤێ نەخۆشییا خۆ رانەبت، و ئەو ب خۆ گەلەک ژ وان د دل دا حەز

دکر خەلیفە زوی بمرت ب شەرتەکی ئەگەر هات و خیلافەت پشتی وی یا زەلامێ ویێ بت، دا ئەو ببتە خاتوینا قسرا کەسک ئەوا هەر خەلیفەکێ نوی یێ بەیعا وی بێتەکرن مالا خۆ دئینتێ، و ژنکا وی دبتە خاتوینا ڤێ قسرێ ئەوا گەلەک کەس خەونان پێڤە دبینن.

بێ دەنگییێ مەزەلکا خەلیفەی د ناڤ خۆ دا پێچابوو، خەلیفەی ئەوێ ل سەر تەختی درێژکری پشتی ئێشا وی گرانبووی هنارتە ب دویڤ زانایێ مەزن رجائێ کورێ حەیوەی ڕا، کو ئێک ژ زانایێن تابعییان یێن مەزن بوو و هەر جار خەلیفەی پسیارێن خۆ ب وی دکرن، و پشتی ئەڤ زانایە هاتی خەلیفەی ئەمر کر وی و رەجائی بهێلنە ب تنێ د گەل ئێک، و ژ دەرڤەی مەزەلا خەلیفەی گەلەک کەس هەبوون دلێن وان ب لەز خۆ دقوتان، چونکی حەتا وی دەمی خەلیفەی کەسەک نەکربوو (ولی العهد) بوو خۆ پشتی وی ببتە خەلیفە، لەو هەر ئێکی ژ برا و پسمامێن وی د دل دا دگۆت: بەلکی ئەو من بکەتە خەلیفە!

گاڤا ئێش ل خەلیفەی دژوار بووی خەلیفەی ڤیا کورێ خۆ ئەییووبی ئەوێ هێشتا بالغ نەبووی بکەتە خەلیفە ل شوینا خۆ، و کیتابەک ژی ب ڤێ چەندێ نڤیسی، ئینا رەجائی گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین) تشتێ خەلیفەی د قەبرێ وی دا دپارێزت ئەوە ئەو مرۆڤەکێ چاک ل جهێ خۆ بدانت، گاڤا وی ئەڤ ئاخفتنە گوهـ لێ بووی زانی ئەو یێ چ دبێژت، لەو کاغەزا خۆ دڕاند، پاشی گۆتێ: پا تو چ دبێژی بۆ کورێ من یێ دی داوودی؟ رەجائی گۆتێ: ئەو یێ چوویە قسطەنطینییێ و تو نزانی کانێ دێ زڤڕت یان نە، خەلیفەی گۆت: پا تو چ دبێژی بۆ عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی؟ وی گۆت: هندی ئەز وی دنیاسم ئەو مرۆڤەکێ باشە.. خەلیفەی گۆتێ: تو ڕاست دبێژی، بەلێ ئەگەر ئەز وی بدانمە جهێ خۆ کورێن عەبدلمەلکی فتنەکێ دێ کەن، و بەلا خۆ ژ وی ڤەناکەن وەسا تێ نەبت ئەز ب وی شەرتی وی بدانمە جهێ خۆ کو پشتی وی ئێک ژ کورێن

عەبدلمەلکی ببتە خەلیفە.. رەجائی گۆتیێ: تو ڕاست دبێژی، یەزیدێ کوڕێ عەبدلمەلکی بلا پشتی عومەری بت.

خەلیفەی سولەیمانێ کوڕێ عەبدلمەلکی کیتابەک ب ڤێ چەندێ نڤیسی و ختمکر و ئەو گرت و جابا زەلامێن بنەمالا خۆ هنارت و هەمی کۆمکرن، و عەهد ژ وان وەرگرت کو ئەو بەیعێ بدەنە وی یێ وی ناڤێ وی د کیتابا خۆ دا نڤیسی و ل سەر ب خیلاف نەچن، و وان عەهد دایێ، و خەلیفەی گۆتە رەجائی: بلا کیتاب ل نک تە بت، و تو وێ نیشا کەسێ نەدە هندی ئەزێ ساخ بم.

حێبەتییا زەلامێن بنەمالا ئومەییەی زێدەتر لێ هات پشتی وان ئەڤ تەصەروفا خەلیفەی دیتی، و خوزییا هەر ئێک ژ وان ئەو بوو ئەو بزانت کانێ چ د کیتابا خەلیفەی دا هەیە، عومەرێ کوڕێ عەبدلعەزیزی خۆ گەهاندە زانایێ ناڤدار رەجائێ کوڕێ حەیوەی و گۆتێ: بابێ مقدامی، تو باش دزانی کو سولەیمان گەلەک حەز ژ من دکەت، و ئەو ئحترامەکا زێدە ل من دگرت، ڤێجا ئەگەر تو بزانی کو وی خیلافەت یا دایە من بێژە من هێشتا ئەوێ ساخ دا ئەز بچم بێژمێ من عەفی کەت ژ ڤێ چەندێ، چونکی ئەگەر ئەو مر ئێدی فایدە ناکەت، رەجائی گۆتێ: ب خودێ حەرفەکێ ئەز بۆ تە نابێژم، ئینا عومەر ب عێجزی ژ نک وی دەرکەفت، پشتی هنگی هشامێ کوڕێ عەبدلمەلکی هاتە نک رەجائی و گۆتێ: بێژە من کانێ سولەیمانی کی دانایە جهێ خۆ، ئەگەر ئەز بم دا خۆ بێ دەنگ بکەم، و ئەگەر ئەز نەبم دا بزانم دێ چ کەم، رەجائی چ بۆ وی ژی نەگۆت، ئینا ئەوی دەستێن خۆ لێکدان و گۆت: دێ کی بت ئەگەر ئەز نەبم؟!

ل ڕەخێ ژنکان ژی ژ قسرێ عەینی حێبەتییێ هەبوو، ژنکەکا خودان جوانی و هەیبەت ل ڕەخێ دیوانێ یا ڕوینشتی بوو، کەسێ پویتەیەکێ تایبەت نەددایێ، چونکی هزر هەمی بۆ هندێ دچوون کو هەر چاوا بت خاتوینا قسرێ یا

پاشەڕۆژێ ئەو نابت، ڕاستە ئەو کچا عەبدلمەلکییە و خویشکا سولەیمانییە، بەلێ زەلامێ وێ عومەر نە کوڕێ خەلیفەیە و نە برایێ وییە، و عەدەتێ خەلیفێن ئومەوی ئەو نەبوویە ئێک ژ وان کوڕ و برا هەبن ڕابت پسمامەکێ خۆ بکەتە جێگر بۆ خۆ، فاطمایا کچا عەبدلمەلکی ب خۆ ژی چو طەمەعی د هندێ نەبوو ئەو خاتوینا ئێکێ بت ل قەسرێ یان نە، مادەم ئەو د چاڤێن پسمامێ خۆ عومەری دا خاتوینا ئێکێیە، و هەچی تشتێ وێ دڤێت یێ ژێ کێم نینە، و صەدمە بۆ ژنکێن دیوانێ هەمییان چێبوو دەمێ خەبەر ژ لایێ مەجلسا زەلامان ڤە هاتی کو خەلیفە مر، بەلێ صەدمە یا مرنا خەلیفەی نەبوو، چونکی ئەو تشتەکێ موتەوقع بوو، بەلێ ئەو ژ بەر هندێ بوو دەمێ وان زانی کو خەلیفەی پسمامێ خۆ عومەر یێ دانیە جهێ خۆ، و ب ڕەنگەکێ نە یێ ئێکسەر عەهدا ژ کوڕێن خۆ و برایێن خۆ وەرگرتی کو ئەو بەیعێ بدەنە عومەری، و چەند دەلیڤەیەکێن کورت بوون ڕەخێ دیوانێ ئەوێ فاطما لێ بوو سەرێ دیوانێ، چونکی هەر جهەکێ مرۆڤەکێ مەزن لێ بت ئەوە سەرێ دیوانێ! و دەمێ دیوان ڤەرەڤی ژنکێن ئەمیران ڤەمان دا ڕێک بۆ ژنکا خەلیفێ نوی بێتە ڤەکرن، و هوین چ دبێژن بۆ وێ ژنکێ ئەوا ژ نشکەکێ ڤە خۆ ببینت کابانییا زەلامەکێ وەسا یێ پتر ژ بیست دەولەتێن نوکە د بن دەستان ڤە، ژ وەلاتێ ئەفغانستانێ بگرە ل ڕۆژهەلاتێ و حەتا تو دگەهییە وەلاتێ مۆریتانیا و ئسپانیا؟ فاطما زڤڕی قەسرا خۆ و چاڤێ وێ ما ل زەلامێ وێ کانێ کەنگی دێ ئێت دا فەرمانێ بدەت مالا وی بۆ (الدار الخضراء) قەسرا خەلیفان بێتە ڤەگوهاستن، ئەو جهێ خاتوینێن بنەمالا ئومەییەی هەمییان بەر لێ.

ل ڤێرێ مە نەڤێت ب درێژی بەحسێ عومەری بکەین، و کانێ ئەو کییە، چونکی بەری نوکە مە ئەڤ چەندە ئاشکەراکرییە، بەلێ مە دڤێت بێژین: گاڤا زانایێ تابعییان ڕەجائێ کوڕێ حەیوەی کیتابا خەلیفەی پشتی مرنا وی بۆ زەلامێن بنەمالا ئومەییەی خواندی و گەهشتییە ناڤێ عومەری، سەر و بەر هاتە

وەرگێڕان و (صەدمە) بۆ گەلەکان چێبوو هشامێ کوڕێ عەبدلمەلکی ڕابووڤە و گۆت: ئەم قەت بەیعێ نادەینێ چاوا خیلافەت ژ مالا مە دەرکەڤت، ڕەجائی گۆتێ: ب خودێ تو ژ بەیعا خۆ لێڤە ببی سەرێ تە دێ ژ سەر قالبێ تە ڕاکەم! ڕابە هەرە دەستی.. هنگی ئەو مەجبووربوو بەیعە دا عومەری، و دەستێ وی گرت و برە سەر مینبەرێ و گۆت: مادەم ئەڤ شۆلە ژ دەستێن کوڕێن عەبدلمەلکی دەرکەفت (إنا لله وإنا إليه راجعون)، عومەری گۆت: بەلێ مادەم ئەو گەهشتە من (إنا لله وإنا إليه راجعون)، پاشی عومەری دەست ب ئاخفتنێ کر و گۆت: گەلی مرۆڤان هوین هەمی دزانن ئەڤ بەلایە بێی داخوازا من کەفتە د ستویێ من دا، و کەسێ بۆ ڤێ چەندێ نە ڕەئیا من و نە ڕەئیا چو موسلمانان ژی وەرنەگرتییە، ژ بەر ڤێ چەندێ من هوین ئازاکرن کو ژ بەیعا خۆ لێڤە ببن، و من ئەڤ کارە نەڤێت، ڤێجا کانێ هەوە کی دڤێت وی بۆ خۆ هلبژێرن..

گاڤا خەلکی ئەڤ چەندە ژێ دیتی هەمییان ب ئێک دەنگ گازی کر: مە تو هلبژارتی، و ژ تە پێڤەتر مە کەس نەڤێت.

## عومەر و فاطما:

ئەو سێ ڕۆژ بوو فاطمایێ زەلامێ خۆ نەدیتی، چونکی ئەو ب سەر و بەرێ ڤەشارتنا خەلیفەی ڤە یێ موژیل بوو، ژ بلی کو ئەو بووبوو زەلامێ ئێکێ د دەولەتێ و کار هەمی کەتبوونە سەر ملێ وی، گاڤا فاطمایێ سەر و بەرێ وی دیتی دا بێژی ئەڤە سێ سالە وێ ئەو نەدیتییە هند هاتبوو گوهۆڕین، عومەر ئەوێ بەری وی و پشتی وی بێنا خۆش دفڕی وەکی پیرەمێرەکێ حەفتێ سالی لێ هاتبوو، گاڤا عومەر ب ژۆر کەفتی دبێژن: دەنگێ گرییێ ب سەر مالێ کەفت.. بەلێ دەنگێ گرییێ، و ئەگەر نە عومەر و فاطما بانە دا دەنگێ تلیلیان بلند بت، و شەربەت و بەقلاوە دا ئێنە گێڕان!

عومەری گۆتە ژنکا خۆ: ئەی فاطما تو یا دبینی بارەکێ چەندێ گران کەفتە سەر ملێن من، پسیارا ڤێ ئوممەتێ هەمییێ دێ ژ من ئێتەکرن، و حەتا

ئەز حەقێ وان ب دورستی ژ سەر خۆ ڕاکەم وەختێ من هەمی دێ ب وان ڤە چت، و ئەز دترسم ئەز هند موژیل ببم ڤێجا ئەز سستییێ د حەقێ تە دا بکەم، و د ڤێ دنیایێ دا کەسەک من وەکی تە نەڤێت، بەلێ من نەڤێت ئەز زولمێ ل تە بکەم، ڤێجا ئەگەر تو تەحەممولا وی ڕەنگێ ژیانێ نەکەی یێ من بۆ خۆ هلبژارتی و تە دل د دنیایێ هەبت، ئەز دێ تە فڕێکەمە مالا بابێ تە..

فاطمایێ گۆتێ: و تو دێ چ کەی؟

عومەری گۆتێ: ئەڤ هەمی مال و پارەیێ بنەمالا تە کۆمکری هەمی مالێ ئوممەتێیە، ب تەعدایی ژ وان یێ هاتییە ستاندن، و من ل بەرە ئەز وی مالی هەمییێ بۆ خودانان بزڤڕینمەڤە، و ئەز دێ ژ خۆ دەست پێ کەم، هەچی مالێ من هەی دێ زڤڕینمە (بیت المال)ێ ئەو پارەیا عەردی نەبت یا من کەدا دەستێ خۆ کری وێ ب تنێ دێ هێلم دا پێ بژیم.

فاطمایێ گۆتێ: بۆچی؟

وی گۆت: من نەفسەکا (طەمووح) یا هەی هەر تشتەکێ ئەز گەهشتیمێ دلێ منێ چوویە تشتەکێ بلندتر، دەمێ خیلافەت گەهشتییە من دلێ من چوو تشتەکێ بلندتر کو بەحەشتە.

و گاڤا گۆتینە عومەری مالا خۆ بینە (قەسرا کەسک) جهێ خەلیفان وی گۆت: نە ل پشتا مزگەفتێ -جامعا ئومەوی ل نێزیکی قەبرێ صەلاحەددینی نوکە- خانیکەک منێ هەی دێ ل وێرێ بم.. یەعنی: ئەو قەسرا بەری هنگی ئەو تێڤە ئەو ژێ هێلا، و چوو د وی خانیکی ڤە یێ ل سەر وێ پارچەیا عەردی هاتییە ئاڤاکرن یا وی ب کەدا دەستێ خۆ کری.

هەلویستێ فاطمایێ دێ چ بت کچا خەلیفەی، و خویشکا چار خەلیفان، ئەوا هەر ژ زارۆکینییا خۆ د ناڤ زێڕ و زینەتان دا مەزنبووی، و بابێ وێ ئەو ب نازداری مەزنکری، ئەڤرۆ پشتی زەلامێ وێ بوویە خەلیفە و وێ هزرکری

هنده دنیا هەمی کەفتە د دەستان دا، ئەڤرۆ زەلامێ وێ داخوازەکا غەریب یێ ژێ دکەت.. خۆ ئەو رستکا د ستوییێ تە ژی ئەوا بابێ تە ب دیاری دایەتە، ئەو ژی بێ حەق ژ مالێ ئوممەتێ یا هاتییە راکرن، دڤێت وێ ژی بزڤرینییە (بیت المال)ێ..

ئێک ژ دو رێکا ل بەر خاتوینا بنەمالا ئومەیییەی هەبوو: یان دنیایێ هلبژێرت و زێر و زینەت و خۆشییێ، یان: مالا خەلیفێ نوی ئەوێ کرییە دلێ خۆ بیرا خەلکی جارەکا دی ل (سیرەتا باپیرێ خۆ عومەرێ ئێکێ) بینتەڤە، وێ چ کر؟

گۆتێ: ئەی (أمیر المؤمنین) وێ بکە یا تە دڤێت، ئەزا د گەل تە، و ئەز ب خودێ کەمە ئەز یا وەسا نابم ل بەرفرەهییێ هەڤالینییا تە بکەم، و ل دەمێ تەنگاڤییێ تە بهێلمە ب تنێ، ئەزا رازیمە ب تشتێ تو پێ رازی بی.. و فاطمایێ زێر و زینەتا خۆ ژ بەر خۆ کر، و کرە د دەستێ خەلیفەی دا، دا ل خزینا دەولەتێ بزڤرینتەڤە.

## هندەک سەرهاتی ژ ژینا فاطمایێ:

حەتا هوین حالێ فاطمایێ یێ نوی بزانن، ل ڤێرێ ب تنێ دو سێ سەرهاتییێن کورت ژ ژینا وێ یا نوی دێ بۆ هەوە ڤەگێرم، ژینا وێ یا نوی پشتی بوویە خاتوینا ئێکێ د وێ دەولەتێ دا یا نیڤا عەردی ل وی دەمی ڤەگرتی: رۆژەکێ ژنکەکا هەژار ژ مصرێ هاتبوو پسیارا قصرا خەلیفەی کر، هندەکان گۆتێ: هەرە فلان جهی مالا وی یا ل وێرێ، گاڤا ئەو چوویە وی جهی خانیکەکێ بچویک دیت، وێ هزرکر ئەوان مرۆڤان ترانە بۆ خۆ پێن پێ کرین، چوو بەر دەرگەهی و پشتی ئەو ب ژۆر کەفتی ژنکەک دیت ل سەر دۆشەکەکا پنیکری یا روینشتییە و هندەک جلکێن کەڤن یێن ل بەر، یا تەقنێ چێ دکەت، و ب رەخ وێ ڤە زەلامەکێ وێ تەقنێ د دیواری دهوسیت، پشتی وێ زانی ئەڤ ژنک کابانییا خەلیفەیە ئەو مەندەهۆش بوو، فاطمایێ گۆتێ: تە خێرە تو هندە

یا حێبەتی، وێ گۆتێ: ئەزا ژ حالێ تە مەندەهووشم تو ژنکا (أمیر المؤمنین)ی چاوا تو یا ب ڤی سەر و بەری یی ل نک ڤی زەلامی؟ فاطما گرنژی و گۆتێ: نێ ئەڤ زەلامێ دەستێن وی د تەڤنێ را ئەوە (أمیر المؤمنین).

هوین پسیارا حێبەتی و مەندەهووشییا وێ ژنکێ نەکەن کانێ چەند زێدەتر لێ هات.

جارەکا عومەر نساخبوو، پسمامێ وی مەسلەمەیێ کورێ عەبدلمەلکی هات سەرا بدەت، دیت جلکەکێ قرێژی یێ د بەر ئینا وی گۆتە خویشکا خۆ فاطمایێ: ئەڤ کراسێ د بەر (أمیر المؤمنین)ی یێ قرێژییە ژ بەر بکەن و بۆ بشۆن، وێ گۆت: باشە، رۆژا د دویڤ هات مەسلەمە جارەکا دی هات و دیت هەر ئەو کراس یێ دبەر خەلیفەی، ئینا ب عێجزی ڤە گۆتە خویشکا خۆ فاطمایێ: ما من نەگۆتبوو تە کراسێ خەلیفەی بشۆن شەرمە خەلک یێ دئێتە نک؟ فاطمایێ گۆتێ: ب خودێ ژ وی کراسی پێڤەتر وی چو کراس نینن!

عومەری خلمەتکارەکێ ب تنێ هەبوو، کورە جحێلەک بوو، رۆژەکێ دەمێ سفرا خوارنێ هاتییە دانان، بەرێ خۆ دایێ نیسکە، ئینا ب عێجزی ڤە گۆت: نیسک، نیسک، ما دێ هەرۆ نیسکێ خووین؟ فاطمایێ گۆتێ: کورێ من! ئەڤە خوارنا (أمیر المؤمنین)ییە.

رۆژەکێ دلێ (أمیر المؤمنین)ی چوو تری، ئینا چوو مال گۆتە ژنکا خۆ فاطمایێ: چو دەرهەم تە نینن ئەم هندەک تری بۆ خۆ پێ بکرین؟ فاطمایێ گۆتێ: تو (أمیر المؤمنین)ی و تە دەرهەمەک نینە تری بۆ خۆ پێ بکری؟ عومەری گۆتێ: ما ئەز چ بکەم ئەو پارێن من هەین تێرا من ناکەن، بەلێ صەبرا ل سەر ڤێ چێترە ژ ئاگرێ جەهنەمێ.

و عومەری هەڤالەکێ چاک هەبوو، رۆژەکێ عومەری گۆتێ: شڤێدی هەمییێ ئەز نەنڤستیمە، من هزرا خۆ د قەبری دا دکر، وی زەلامی گۆت: پا تو

چ دبێژی ئەگەر پشتی سێ ڕۆژان تو بچی قەبری ڤەکەی و بەرێ خۆ بدەیە حالێ خودانێ وی پشتی گۆشتێ وی دحەلیێت و کرم بەرددەنێ، و ئەو ئەو بوو یێ جلکێن تازە دکرنە بەر خۆ و بێنێن خۆش ل خۆ دکرن؟ گاڤا وی ئەڤ ئاخفتنە گۆتی: عومەری هند کرە گری حەتا دلگرتی بووی، ئینا فاطمایێ گۆتە ئێکی: کانێ ڤی زەلامی دەربێخن، پشتی ئەو زەلام دەرکەفتی فاطما چوو ژۆر و ئاڤ ل سەر و چاڤان کر حەتا هشیاربووی، گاڤا عومەری چاڤێن خۆ ڤەکرین دیت فاطما یا ل هنداڤ سەری دکەتە گری، گۆتێ: تو بۆچی دکەیە گری؟ وێ گۆت: بیرا من ل مرنا تە هات دەمێ تو ژ دنیایێ بار دکەی و دچی بەرانبەر خودێ ڕادوەستی حالێ تە دێ چ بت، ڤێجا گرییا من هات.

هێشتا ئەو یێ ساخ فاطمایێ ل سەر دکرە گری، و پشتی ئەو مری وێ هند ل سەر کرە گری حەتا چاڤێن وێ کولبووین.. ڕۆژەکێ برایێ وێ هشام خەلیفێ نوی، و برایێ وێ یێ دی مەسلەمە هاتنە نک وێ دکرە گری، گۆتنێ: تە چ دڤێت ئەم دحازرین، وێ گۆت: گرییا من نە ژ بەر مالەکی یان نعمەتەکێیە، گرییا من ژ بەر سەرهاتییەکا وییە نوکە هاتە بیرا من، وان گۆتێ: کیژ سەرهاتییێ؟

گۆت: شەڤەکێ وی نڤێژ دکر، دەمێ گەهشتییە ڤێ ئایەتێ: ﴿ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ۝ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ۝ ﴾ (القارعة: ٤-٥) دەنگەک ژێ دەرکەت من هزرکر مر، و هنگی ئەو ڕابوو حەتا من گازی کریێ دا ڕابتە نڤێژا سپێدێ.

گاڤا برایێ وێ یەزید بوویە خەلیفە زێڕ و زینەتێن وێ ژ (بیت المال) ئینانەدەر و گۆتێ: ئەڤە مالێ تەیە، وێ گۆت: ببەن، من چو هەوجەیی پێ نینە، ئەز ژ وان نابم یێن ب ساخییا وی گوهدارییا وی کری و پشتی مرنا وی بێ ئەمرییا وی دکەن.

و ئەگەر بێژن: د پشت هەر زەلامەکێ مەزن را ژنکەکا مەزن هەیە، د پشت عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی را دۆتماما وی فاطما کچا عەبدلمەلکی هەیە.. و دا حالێ دنیایێ باش بۆ مە ئاشکەرا ببت، ل دووماهیییێ گوهدارییا ڤێ گۆتنێ بکەن: خەلیفێ عەبباسی ئەبوو جەعفەرێ مەنصوور رۆژەکێ گۆتە عەبدررەحمانێ نەڤیچرکێ ئەبووبەکری: شیرەتەکێ ل من بکە، وی گۆت: رۆژا عومەرێ کورێ عەبدلعەزیزی مری مالێ وی لێکڤەکر هەر کورەکێ وی نۆزدە دەرهەم گەهشتنێ، و رۆژا هشامێ کورێ عەبدلمەلکی مری مالێ وی لێکڤەکر هەر کورەکێ وی هزار هزار (یەعنی: ملیوون) گەهشتنێ، و من ب چاڤێن خۆ دیت کورەکێ عومەری رۆژەکێ بارێ سەد دەواران مال کرە خێر د رێکا خودێ دا، خودێ هند داین، و من دیت کورەکێ هشامی خەلکی خێر ددانێ..

# ژڤان خودێیه!

ل سەری دەمێ مە دەست پێ کری مە گۆتبوو: مرۆڤێن خودێ د دنیایێ دا د گەشتەکێ دا دژین، ژ نک خودێ دەست پێ دکەن و بۆ نک خودێ دزڤڕن، دنیا ب هەمی خۆشی و نەخۆشییێن خۆ ڤە نەشێت بەرێ وان ژ ئارمانجێ وەرگێڕت..

د دنیایێ دا دژین، بەلێ یێ وان ببینت دێ هزرکەت ئەو نە د دنیایێ دانە، گەشاتییا دنیایێ چاڤان ل وان تاری ناکەت، گاڤا جارەکێ دنیا کەفتە ڕێکا وان، یان دنیایێ خۆ خەملاند و خۆ نیشا وان دا ئەو پشتا خۆ ددەنێ و دەستان ژێ دشۆن، مانێ مەتەلا وان و دنیایێ -وەکی د حەدیسەکێ دا هاتی- وەکی مەتەلا وی ڕێڤنگییە یێ ل غەریبییان قەستا بن دارەکا خۆش و هوین دکەت، پاشی ڕادبت ژێ بار دکەت و دچت قەستا وارێ خۆ دکەت، ئەرێ ما ژ عەقلدارییێیە ئەو ژ بەر خۆشییا سیبەرا ڤێ دارێ وارێ خۆ یێ دورست ژ بیر بکەت؟

مرۆڤێن خودێ وەکی مە مرۆڤن، ب وێ کەیفخۆش دبن یا ئەم پێ کەیفخۆش دبین، و ب وێ دئێشن یا ئەم پێ دئێشین، بەلێ ئەو تشتێ زێدە یێ ل نک وان هەی ئەوە ئەو دژین نە بۆ ژیانێ چونکی ژیانێ پێتڤی ب وان هەیە، و ئەڤ تشتە ل نک هەمی کەسان نینە.

مرۆڤێن خودێ گاڤا دمرن عەرد و عەسمان، خودان رح و هشکاتی بۆ دگرین و ژێ خەریب دبن.. چەند سەرهاتییەکا عەجێبە وان د گەل ڤێ ژینێ

هەی، رۆژەکێ ئێکی گۆتە (ئووەیسێ قەرەنی): تو و زەمان د گەل ئێک دچاوانن؟ وی گۆت: ((ما دێ زەمان یێ چاوا بن د گەل وی زەلامی یێ ئەگەر لێ بوو سپێدە نزانت کانێ دێ لێ بتە ئێڤار یان نە، و ئەگەر لێ بوو ئێڤار نزانت کانێ دێ لێ بتە ئێڤار یان نە، و کانێ مزگینی ب بەحەشتێ دێ بۆ وی ئێتەدان یان ب ئاگری.. هندی مرنە چو خۆشی بۆ خودان باوەرەکی نەهێلایە)).

مرۆڤێن خودێ هەر چەندە ژینا خۆ هەمییێ د خزمەتا مرۆڤینییێ دا دبەنە سەری، بەلێ ئەو گەلەک و گەلەک ژ ئاستێ مرۆڤینییێ دبلندترن، د ناڤ مرۆڤێن دنیایێ دا دژین، بەلێ ژ دنیایێ دشیرڤەکرینە، د دنیایێ دا ب رۆژینە و مرن فتارا وانە، گاڤا ئێک و دو دبینن ژڤانی ددەنە ئێک.. ل کیڤە؟

- ل نک خودێ، رۆژا پێکڤە رادبن، دەستێن خۆ دکەنە تێک دا، و قەستا بەحەشتا خودێ دکەن!

رۆژەکێ هندەک مرۆڤێن خودێ ل دۆر هەڤالێ خۆ سومەیطێ کورێ عەجلانی کۆمبوون دا بەحسێ غەریبییا خۆ د ڤێ دنیایێ دا بکەن، هندەکان گازندە ژ ڤێ ژینێ کر، ئینا هەڤالێ وان سومەیطی گۆت: ((صەبرێ ل سەر نەخۆشییێن وێ بکێشن، و ژڤان خودێیە..)).

د ڤێ پەیڤا کورت دا وی بەرێخۆدانا مرۆڤێن خودێ بۆ دنیایێ و نەخۆشییێن وێ کۆمکر: ژڤان خودێیە، بلا چەند رێک یا دویر بت ژی، بلا چەند نەخۆشی هەبن و زاد یێ کێم بت، قەیدی ناکەت، ژڤان خودێیە، ل نک خودێ چو ڤەشارتی نامینن، چو حەق بەرزە نابن.

ما دەم هۆیە بۆچی ئەو ب خەم بکەڤن؟

رۆژەکێ مرۆڤەک هاتە نک پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: ئەی پێغەمبەرێ خودێ! ئەرێ رۆژا قیامەتێ خودێ ب خۆ دێ حوکمی د ناڤبەرا مە دا

کەت؟ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- گۆتێ: بەلێ. ئینا ئەو مرۆڤ ب کەیف ڤە ڕابوو و گۆت: مەعنا دێ ب سلامەتی دەرباس بین.

چەند باوەرییەکا مەزنە.. چەند هزرەکا باشە!

مەلکەک ژ مەلکێن دنیایێ ئەگەر یێ مەرد و دلفرەه بت، گاڤا تو ل دیوانا وی ئامادەبووی، بلا بەری هنگی تە چەند تەخسیری د دەر حەقا وی دا کربت ژی، تو دێ یێ دلخۆش بی؛ چونکی تو دزانی ئەو دێ تە عەفی کەت و ل تە ناگرت، پا هوین چ دبێژن بۆ خودێ، ئەوێ مەدینی و ڕەحما وی عەرد و عەسمان ڤەگرتین؟

مرۆڤێن خودێ باوەرییەکا هندا مەزن ب خودێ هەیە چیایان دلەقینت و کەڤران دحەلینت، ئەگەر تو وان باخێڤی و ژێ بخوازی ئەو ڕێبازا ژینا خۆ هەمییێ د نیڤ ڕێزکەکێ دا بۆ تە کۆم بکەن ئەو دێ بێژنە تە: کو تو ب هەمی ڤە بۆ خودێ ب تنێ بی.

د فەرهەنگا مرۆڤێن خودێ دا ب تنێ ئەو کەس یێ ئازادە یێ بۆ خودێ ب تنێ عەبد بت، بشر ئەلحافی د گۆتنەکا خۆ دا دبێژت: ((هەچییێ بڤێت تام بکەتە ئازادییێ، و ژ کۆلەتییێ ڕزگار ببت، بلا د ناڤبەرا خۆ و خودێ دا پاقژ بکەت)).

کەنگی د ناڤبەرا تە و خودێ دا دێ پاقژ بت؟

- ئەگەر خۆ تە ب خۆ ژی چو پشک و بار د خۆ دا نەبت، ئەگەر تە فەرمانا ڤێ ئایەتێ ب دورستی ب جهئینا: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝١٦٢﴾ (الأنعام: ١٦٢).

مرۆڤی ئەگەر ب دورستی (تەجەررود) بۆ خودێ کر و (تەوەککولا) خۆ دا سەر وی خودێ وی ناهێلتە ب تنێ، و دێ بەرێ وی دەتە خۆشییێن ڤیانێ، ئەو ڤیانا نە چو د بەر ڕا و نە چو د پشت ڕا.. ڤیانا خودێ، ئەو مێرگا شین یا

مرۆڤێن خودێ خۆ ددەنە بەر سیبەرا وێ دا ژ گەرما ڤێ دنیایێ رزگار ببن، ڤیانا خودێ ئەو ژییە یێ ل ژییێ مرۆڤی زێدە دبت، لەو ئێک ژ وان وێ رۆژێ حسێب دکەت رۆژا بوونا خۆ رۆژا ئەو تێدا ب سەر ڤیانا خودێ هلبووی.

و ل دووماهییێ دێ بێژین: ئەی خودا! ئەگەر چ تە ئەم نەکربینە ژ توخمێ مرۆڤێن خۆ ژی، هیڤییا مە ژ تە ئەوە تو دلێن مە ب ڤیانا وان ئاڤا بکەی، ل دنیایێ مە ژ هەڤالینییا وان و ل ئاخرەتێ مە ژ مەهدەرا وان بێ بار نەکەی.

دهۆک ٢٥ / رەمەزان / ١٤١٨

# ناڤەرۆك

بسم الله الرحمن الرحيم

أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٢) الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ (٦٣) لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٦٤) وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٦٥)

سورة (يونس)






